# مێژوو تەبەری

نوسینی: محمد بن جرير طبری

وەرگێڕانی: زانەر محمد

بەرگی هەشتەم

چاپی یەکەم

سلێمانی

٢٠١٢

# پێڕست

## ڕووداوەکانی ساڵی پەنجا و پێنج

بەوتەی واقدی لەڕووداوەکانی ئەم ساڵە جەنگی زستانەی سوفیان کوڕی عەوف ئەزدی لەسەرزەمینی ڕۆم بوو.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە: ئەوەی لەم ساڵەدا جەنگی زستانەی لەسەرزەمینی ڕۆم ئەنجامدا، عوروە کوڕی موحریز بوو.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە: عەبدوڵڵە کوڕی قەیسی فەزاری جەنگی زستانەی ئەنجامدا.

دەستەیەکی دیکە ئاماژەیان بەناوی مالیك کوڕی عەبدوڵڵە داوە.

لەم ساڵەدا معاویە، عەبدوڵڵە کوڕی عەمرۆ غەیلانی لەکارگوزاری بەسرە دوورخستەوە و عوبەیدڵڵە کوڕی زیادی وەك کارگوزاری ئەو شارە دەستنیشان کرد.

## هۆکاری ئەوەی معاویە، عەبدوڵڵەی لەبەسرە لابرد و عوبەیدڵڵەی لەجێگەی ئەودانا

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: عەبدوڵڵە کوڕی عەمرۆی غەیلانی لەسەر مینبەری بەسرە وتاری دەخوێندەوە کەیەکێك لەمناڵەکانی زەببە، ورتکە بەردی تێگرت.

بەوتەی باوکی حەسەن ناوی ئەم کەسە جوبەیر کوڕی زوحاك و یەکێك لەمناڵەکانی زەرار بوو.

دەڵێت: عەبدوڵڵە فەرمانیدا و دەستیان بڕییەوە و هۆنراوەیەکی بەم ناوەڕۆکە خوێندەوە:

((گوێڕایەڵی و ملکەچی و فەرمانبرداری

بۆ مناڵەکانی تەمیم باشترە و گونجاوتر))

دواتر مناڵەکانی زەببە هاتن و وتیان: هاوڕێکەی ئێمە کارێکی خراپی کرد و ئەمیریش لەسزادانی ئەودا زێدەڕۆی کرد. دەترسین ئەم هەواڵە بەسەروەری

باوەڕداران بگات و ئەویش فەرمانی سزادانی تایبەت یا گشتی دەربکات. ئەگەر ئەمیر پەسەندی بکات، یەکێك لەئێمە دەڕواتە لای سەروەری باوەڕداران و ئاگاداری دەکاتەوە کەدەستی ئەم کەسە لەڕووی گومانەوە بڕاوە و هۆکارەکەی ئاشکرا نییە.

عەبدوڵڵە نامەیەکی بۆ معاویە نووسی. نامەیەکیان لای خۆیان هێشتەوە تا ساڵی تازە دەستی پێکرد.

بەوتەی باوکی حەسەن زیاتر لەشەش مانگ نامەکەیان لای خۆیان گلدایەوە.

دەڵێت: عەبدوڵڵە ڕۆشتە لای معاویە. مناڵەکانی زەببەیش ڕۆشتن و وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، دەستی هاورێکەی ئێمە بەستەم بڕاوە و ئەمەیش ئەو نامەی بۆ تۆی نووسیوە.

معاویە نامەکەی خوێندەوە و وتی: تۆڵەکردنەوە لەکارگوزارەکانی من ڕەوا و ڕێگەپێدراو نییە، ئەگەر هاورێکەی ئێوە ڕازی بێت، قەرەبووی دەکەینەوە.

وتیان: قەرەبووی بکەرەوە.

دەڵێت: معاویە قەرەبووی ئەوی لەسامانی موسوڵمانان‌دا و عەبدوڵڵەی لەسەر کار لابرد و وتی: کەسێك وەك کارگوزاری شارەکەی خۆتان دەستنیشان بکەن.

وتیان: سەروەری باوەڕداران خۆی کەسێك بۆ ئێمە دیاری بکات.

دەڵێت: معاویە بۆچوونی خەڵکانی بەسرەی سەبارەت بەکوڕی عامر دەزانی، لەبەر ئەمە وتی: بەکوڕی عامر کە لەداوێنپاکی و چاکەکاری ئەو ئاگادارن، ڕازی دەبن؟

وتیان: سەروەری باوەڕداران باشتر دەزانێت.

معاویە ئەم وتەی دووبارە دەکردەوە تا ئەوانی پێ تاقیبکاتەوە، دواتر وتی: عوبەیدڵڵەی برازام وەك کارگوزاری ئێوە دیاریکرد.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: معاویە لەساڵی پەنجا و پێنجەم، عەبدوڵڵە کوڕی عەمرۆی لەکارگوزاری بەسرە دوورخستەوە و عوبەیدڵڵە کوڕی زیادی وەك کارگوزاری ئەو شارە دەستنیشان کرد. عوبەیدڵڵەیش، ئەسلەم کوڕی زەرعەی وەك کارگوزاری خوراسان دەیاریکرد. ئەسلەم نەجەنگی کرد و نەتوانی ناوچەیەکی

تازە بەسنووری موسوڵمانان زیاد بکات.

دەڵێت: عوبەیدللە، عەبدوڵڵە کوڕی حوسنی وەك سەرکردەی پاسەوانەکانی خۆی دیاریکرد. کاروباری دادی بە زەرارە کوڕی ئەوفی سپارد، دواتر ئەوی لابرد و کاروباری دادی بەکوڕی ئوزەینەی عەبدی سپارد.

لەم ساڵەدا معاویە، عەبدوڵڵە کوڕی خالید کوڕی ئەسیدی لەکارگوزاری کوفە دوورخستەوە و زوحاك کوڕی قەیسی فەهری لەوێ دانا.

لەم ساڵەدا مەروان کوڕی حەکەم ڕێوڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. باوکی مەعشەر ئاماژەی بەمەداوە.

ساڵی پەنجا و شەشەم دەستی پێکرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی پەنجا و شەشەم

لەم ساڵەدا جونادە کوڕی باوکی ئومەییە و بەوتەیەك عەبدولڕەحمان کوڕی مەسعود جەنگی زستانەی لەسەرزەمینی ڕۆم ئەنجامدا.

دەڵێن: لەم ساڵەدا یەزید کوڕی شەجەرەی ڕەهاوی جەنگی دەریای ئەنجامدا و عەیاز کوڕی حارس لەوشکانی.

لەم ساڵەدا وەك لەگێڕانەوەی باوکی مەعشەر ئاماژەی پێدراوە، عوتبە کوڕی باوکی سوفیان ڕێوڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

معاویە لەمانگی ڕەجەبی ئەمساڵەدا عەمرەی کرد.

لەم ساڵەدا معاویە داوای لەخەڵکان کرد بەیعەت لەگەڵ یەزیدی کوڕی ببەستن و ئەوی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد.

## جێگری یەزید

شەعبی دەڵێت: موغەیرە ڕۆشتە لای معاویە و داوای لێکرد ئەو لەکاروبارەکان دووربخاتەوە و ئامـاژەی بەناتـەوانی و لاوازی خـۆی کـرد. معاویـە ئـەوی لـەکاروبارەکان دوورخـستەوە و دەیویـست سـەعید کـوڕی عـاس وەك کـارگوزار دەستنیشان بکات. نووسەرەکەی معاویە لەم مەبەستە ئاگادار بوویەوە و ڕۆشتە لای سەعید و ئەم هەواڵەی پێڕاگەیاند. یەکێك لەخەڵکانی کوفەی ڕەبیعە لەخەڵکی خوزاعە لای سەعید دانیشتبوو. ئەو ڕۆشتە لای موغەیرە و وتی: ئەی موغەیرە گومـان دەکـەم سـەروەری بـاوەڕداران لـەتۆ ڕەنجـاوە، کـوڕی خونەیسم (دەبیرەکـەی معاویـە یـا موغـەیرە؟!) لای سـەعید کـوڕی عـاس بـینی کـەپێی وت سـەروەری باوەڕداران بەنیازە تۆ وەك کارگوزاری کوفە دەستنیشان بکات.

موغەیرە وتی: بۆ هۆنراوەکەی ئەعشای لەبیر نەبوو کەدەڵێت:

((مەگەر پەروەردگارت لەویٚ نەبوو کەگرفتاری ڕەنج بوویت

ئەگەری هەیە پەروەردگار هاوکاریت بکات)).

دەبێت چاوەڕێ بین تا من دەڕۆمە لای یەزید. دواتر ڕۆشتە لای یەزید و

سەبارەت بەبەیعەت قسەی لەگەڵ کرد. یەزید ئەمەی لەگەڵ باوکی باس کرد و دووبارە موغەیرەیان وەك کارگوزاری کوفە ڕەوانە کردەوە.

دەڵێت: دەبیرەکەی موغەیرە، کوڕی خونەیس ڕۆشتە لای و وتی: ڕێگەی فرت و فێڵم نەگرتۆتەبەر و خیانەتم لەتۆ نەکردووە و بەفەرمانڕەویەتی تۆیش دڵگران نیم، بەڵام سەعید چاکەی لەگەڵ من کردبوو و ویستم بەشێوەیەك قەرەبووی بکەمەوە. موغەیرە لێی ڕازی بوو و کارەکەی جارانی پێسپاردەوە.

دەڵێت: موغەیرە بۆ بەستنی بەیعەت لەگەڵ یەزید هەوڵیدا و بۆ ئەم مەبەستە کەسی بۆ لای معاویە نارد.

مەسلەمە دەڵێت: کاتێك معاویە دەیویست بەیعەت بۆ یەزید وەربگرێت، نامەیەکی بۆ زیاد نووسی و ڕاوێژی لەگەڵ کرد. زیاد، عوبەید کوڕی کەعبی نومەیری بانگ کرد و وتی:

(( هەر ڕاوێژکارێك پێویستی بەچەند کەسێکی بڕواپێکراو هەیە و هەر ڕازێك پێویستی بەپاراستن هەیە. خەڵکان دوو تایبەتمەندییان هەیە: ئاشکرا کردنی ڕاز و نهێنییەکان و ئامۆژگاری کردنی خراپەکان. ڕازدار یەکێك لەم دوو کەسەیە: یا پیاوی ئاخیرەت کەچاوەڕوانی پاداشتی خوایی دەکات یا پیاوی دنیا کەخاوەن شەرفە و ئاوزی هەیە تا پێگەی و جێگەکەی بپارێزێت. ئەم شتانەم لەتۆدا ئەزموون کردووە و پەسەندم کردوون، بۆ مەبەستێك تۆم بانگ کردووە کە بەنامە ناتوانم باسی بکەم. سەروەری باوەڕداران نامەی بۆ نووسیوم و دەڵێت دەخوازێت بەیعەت بۆ یەزید وەربگرێت. لەشۆڕشی خەڵکان دەترسێت و هیوادارە بەم کارە ڕەزامەند بن و داوای بۆچوونی منی کردووە. بەڕێوەبردنی کاروباری موسوڵمانان دژوارە و گرنگ، یەزید کەسێکی سەرەڕۆیە و تامەزرۆی ڕاو. برۆ لای سەروەری باوەڕداران و لەپەیامەکەی من ئاگاداری بکەرەوە، کەموکوڕییەکانی یەزیدی بۆ باس بکە و پێی بڵێ، دەبێت دوورئەندێش بێت تا بەباشترین شێوە بەمەبەستەکەی بگات، پەلە نەکات چوونکە ئەگەر درەنگ بەمەبەستەکەت بگەیت، باشترە لەوەی پەلە بکەیت و هیچکات نەگەیت)).

عوبەیدڵڵە وتی: جگە لەمە بابەتێکی دیکە نییە؟

وتی: چ بابەتێك؟

وتی: هەوڵی گۆڕینی بۆچوونی معاویە مەدە و کوڕەکەی لەبەرچاو ناشیرین و بێزراو مەکە. من بەشێوەیەکی نهێنی چاوم بەیەزید دەکەوێت و بەنوێنەرایەتی تۆ ..ڵێم کەسەروەری باوەڕداران نامەی بۆ نووسیویت و سەبارەت بەبەیعەتی یەزید ڕاوێژی پێکردوویت و تۆ لەدژایەتی خەڵکان دەترسیت بەهۆی ئەو کردەوانەی تۆ (یەزید) کەخەڵکان پەسەندی ناکەن و بۆچوونی تۆ ئەوەیە کەیەزید دەبێت دەست لەو کردەوانەی هەڵبگرێت تا سەروەری باوەڕداران پشتگەرم و خاوەن بەڵگە بێت. بەمشێوەیە هەم مۆجیاری یەزیدت کردووە و هەم ڕەزامەندی سەروەری باوەڕدارانت بەدەست هێناوە و لەنیگەرانی سەبارەت بەکاروباری موسوڵمانان دوور دەکەویتەوە.

زیاد وتی: بۆچوونەکەت ڕاستە، پشت بەخوا بەڕێکەوە. ئەگەر ئەنجامێکی باشت بەدەستهێنا، سپاست دەکەین و ئەگەر هەڵەیەك ڕوویدا، بەمەبەستەوە نییە و هیوادارم خواوەند بتپارێزێت.

وتی: ئێمە ئەوەی دەیزانین دەیڵێین و قەزاوقەدەر لەدەستی خواوەندە.

دەڵێت: عوبەید ڕۆشتە لای یەزید و گفتوگۆی لەگەڵ کرد. زیاد نامەی بۆ معاویە نووسی و پێشنیاری کرد چاوەڕوان بێت و پەلە نەکات. معاویە بەمە ڕازی بوو. یەزید دەستی لەکارەکانی خۆی هەڵگرت. دواتر عوبەید بۆ لای زیاد گەڕایەوە و خەڵاتکرا.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: کاتێك زیاد مرد، معاویە نامەیەکی هێنا وبۆ خەڵکانی خوێندەوە، تیایدا هاتبوو: ئەگەر بمرێت، یەزید جێگریەتی. یەزیدی وەك جێگر دەستنیشان کرد و لەهەموو خەڵکان بەیعەتی بۆ وەرگرت جگە لەپێنج کەس.

کوڕی عەون دەڵێت: خەڵکان بەگشتی لەگەڵ یەزید کوڕی معاویە بەیعەتیان کرد جگە لەحسەین کوڕی عەلی و عەبدوڵڵە کوڕی عومەر و عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر و عەبدولڕەحمان کوڕی ئەبی بەکر و عەبدوڵڵە کوڕی عەباس. کاتێك معاویە هاتە مەدینە، حسەین کوڕی عەلی بانگ کرد و وتی: ئەی کوڕی برام، خەڵکان هەموو

بەم كارە ڕازی بوون مەگەر پێنج كەس كەتۆ هانیان دەدەیت. تۆ چ نیازێكت بەدژایەتی كردنی من هەیە.؟

وتی: من هانیان دەدەم؟

وتی: بەڵێ، تۆ هانیان دەدەیت.

وتی: بانگیان بكە، ئەگەر بەیعەتیان كرد منیش یەكێكم لەوان و گەرنە سەبارەت بەمن بڕیاریكی پەلەت داوە.

وتی: ئەوسا بەیعەت دەبەستیت؟

وتی: بەڵێ.

وتی: بەڵێنی لێوەرگرت تا كەس لەو گفتوگۆیە ئاگادار نەكاتەوە.

دەڵێت: سەرەتا خۆی دەدزییەوە بەڵام سەرئەنجام بەڵێنیدا و ڕۆشتەدەر.

كوڕی زوبەیر یەكێكی لەسەر ڕێگەی ئەودانابوو كەوتی: زوبەیری برات دەپرسێت چی ڕوویدا؟ ئەوەندە پێداگری كرد تا شتێكی پێدركاند.

دەڵێت: معاویە دوای حسەین كوڕی عەلی، كوڕی زوبەیری بانگ كرد و وتی: هەموو خەڵك بەم بەیعەتە ڕازی بوون جگە لەپێنج كەس لەقوڕیش كەتۆ هانیان دەدەیت؟ ئەی برازا، چ نیازێكت بەدژایەتی كردنی من هەیە؟

وتی: من هانیان دەدەم؟

وتی: بەڵێ، تۆ هانیان دەدەیت.

وتی: بانگیان بكە، ئەگەر بەیعەتیان كرد، منیش یەكێك لەوان دەبم، جیاواز لەوە سەبارەت بەمن پەلەت كردووە؟

وتی: ئەوسا بەیعەت دەبەستیت؟

وتی: بەڵێ.

دەڵێت: ویستی بەڵێنی لێوەربگرێت تا كەس لەو گفتوگۆیە ئاگادار نەكاتەوە بەڵام كوڕی زوبەیر وتی: ئەی سەروەرەی باوەڕداران، ئێمە لەحەرەمی خواوەندین و پەیمان لەگەڵ خواوەند دژوارتر و سەنگینترە. بەڵێنی نەدا و هاتەدەر.

دەڵێت: دوای ئەوە بانگی عەبدوڵڵە كوڕی عومەری كرد و بەشێوەیەكی نەرمتر قسەی لەگەڵ كرد، وتی: نامەوێت ئۆمەتی محەممەد دوای خۆم وەك گایەلی بێ

شوان بەجێبێڵم. خەڵکان هەموو بەم کارە ڕازی بوون جگە پێنج کەس لەقورەیش کەتۆ هانیان دەدەیت. تۆ چ نیازێکت بەدژایەتی کردنی من هەیە؟

وتی: دەتەوێت کارێك بکەیت خوێنەکان بپارێزێت و تۆیش بەمەبەستەکەی خۆت بگەیت؟

وتی: بەڵێ دەمەوێت.

وتی: خەڵکان کۆبکەرەوە و من دێم بەیعەتت لەگەڵ دەبەستم و لەدوای تۆ خەڵك لەسەر هەرکەس ڕێککەوتن، بەیعەت لەگەڵ ئەویش دەبەستم. سوێند بەخوا ئەگەر دوای تۆ خەڵك لەسەر خەلافەتی کۆیلەیەکی حەبەشی ڕێککەون، شوێن خەڵك دەکەوم.

وتی: بەیعەت دەبەستیت؟

وتی: بەڵێ.

دەڵێت: گەڕایەوە بۆماڵەکەی خۆی و دەرگاکەی داخست. خەڵکان دەڕۆشتنە لای و داوای مۆڵەتی بینینیان دەکرد بەڵام ڕێگەی بەکەس نەدا.

دەڵێت: ئەوسا معاویە، عەبدولڕەحمان کوڕی ئەبی بەکری بانگ کرد و وتی: ئەی کوڕی ئەبی بەکر، بەکام دەست و بەکام پێ، نافەرمانی من دەکەیت؟

وتی: هیوادارم خێر بێت.

وتی: سوێند بەخوا دەمویست بتکوژم.

وتی: ئەگەر ئەو کارەت دەکرد، خواوەند لەم دنیا بەنەحلەتی دەکردیت و لەودنیا دەیخستیتە جەهەننەم.

دەڵێت: ئامارژەی بەکوڕی عەباس نەدا.

لەم ساڵەدا کارکوزاری مەدینە، مەروان کوڕی حەکەم بوو.

کارگوزاری کوفە، زوحاك کوڕی قەیس بوو.

کارگوزاری بەسرە، عوبەیدڵڵە کوڕی زیاد بوو.

کارگوزاری خوراسان سەعید کوڕی عوسمان بوو.

چۆنیەتی کارگوزاری سەعید کوڕی عوسمان لەخوراسان بەمشێوەیە کەمحەممەد کوڕی حەفس دەڵێت: سەعید کوڕی عوسمان داوای لەمعاویە کرد

وەك كارگوزاری خوراسان دەستنیشانی بكات.

وتی: عوبەیدللە لەوێیە.

وتی: باوكم تۆی پەروەردە كرد و بەهاوكاری ئەو پێگەیەكەت بەدەستهینا، كەس چاوی تەماحی تێنابڕێت، بەلآم سپاسی ئەوت نەكرد و وەلآمی چاكییەكانی ئەوت نەدایەوە و ئەم كەسەت -مەبەست یەزیدە- پێش من خست و بەیعەتت بۆ وەرگرت. سوێند بەخوا، هەم خۆم و هەم دایك و باوكم لەو باشتر و ڕێزدارترین.

معاویە وتی: هەوڵەكانی باوكت شیاوی پاداشتە و سپاسكردنی من بەو شێوە بوو كە بۆ سەندنەوەی تۆڵەی خوێنی ئەو، ئەوەندە هەوڵەمدا كەكاروباری موسوڵمانان پەرێشان بوو و بۆ ئەم كارە سەركۆنەی خۆم ناكەم. بەلآم لەپێشی باوكت لەباوكی یەزید، سوێند بەخوا باوكت لەمن باشترە و لە پێغەمبەر (د.خ) نزیكترە، لەپێشی دایكیشت نەشیاوە بۆ حاشا لێكردن چوونكە ژنێكی قوڕەیشی باشترە لەژنێكی كەلبی. چەند خۆشە ئەم گۆڕەپانە پڕ بێت لەپیاوانی وەك تۆ كەهاوكاری یەزید بن.

یەزید وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، كوڕە مامی تۆیە و تۆ لەهەمووان شیاوتریت گرنگی پێ بدەیت. لەبەر من سەركۆنەی تۆی كرد، ڕەزامەندی ئەو بەدەست بێنە.

دەڵێت: معاویە ئەوی كردە كارگوزاری خوراسان و ئیسحاق كوڕی تەڵحەی وەك سەرپەرەستی كۆكردنەوەی باج و خەراج دیاریكرد.

دەڵێت: ئیسحاق كوڕە خاڵی معاویە بوو و دایكی، دایكی ئەبان كچی عوتەبە كوڕی ڕەبیعە بوو. كاتێك گەیشتە ڕەی، لەوێ مرد و بەمپێیە، سەعید كاروباری جەنگ و خەراجی خوراسانی لەئەستۆ گرت.

مەسلیمە دەڵێت: سەعید ڕێگەی خوراسانی گرتەبەر، ئەوس كوڕی سەعلەبەی تەیمی، خاوەنی كۆشكی ئەوس و تەڵحە كوڕی عەبدوللە كوڕی خەلەف خوزاعی و موهەلیب كوڕی باوكی سوفرە و ڕەبیعە كوڕی عەسەلە لەمناڵەكانی عەمرۆ كوڕی یەربوع، لەگەڵ ئەودا بوون.

دەڵێت: دەستەیەك لەسارانشینەكان بوون كە لەدۆڵی فەلەج ڕێگەیان

لەحاجییەکان دەگرت. بەسەعیدیان وت: لێرە دەستەیەك هەیە کەڕێگە لەحاجییەکان دەگرن و ڕێگەکەیان نائەمن کردووە، چی دەبێت ئەگەر ئەوان لەگەڵ خۆت ببەیت.

دەڵێت: دەستەیەك لەمناڵەکانی تەمیمی لەگەڵ خۆیدا برد کەمالك کوڕی ڕەیبی مازنی یەکێك بوو لەوان لەگەڵ ئەو کۆیلانەی لەگەڵیدا بوون و شاعیر سەبارەت بەوان دەڵێت:

((خواوەند لەقەسیم ڕزگارت بکات
و لەباوکی حوڕی خراپەکار
و غەویسی داگیرکەری بارەکان و
لەمالك و شمشێرە ژەهراوییەکەی)).

دەڵێت: سەعید کوڕی عوسمان گەیشتە خوراسان، لەڕووبار پەڕییەوە و ڕوویکردە سەمەرقەند. خەڵکی سەغد ڕووبەڕووی بوونەوە. بۆ ماوەیەك شەو و ڕۆژێك لەبەرابەر سوپاکەی ئەو ڕیزیان بەست و دواتر بێ جەنگ گەڕانەوە. مالك کوڕی ڕەیب بۆ سەرکۆنە کردنی سەعید هۆنراوەیەکی هەیە بەم ناوەڕۆکە:

( لەبەرابەر سەغد ترسایت و بەشێوەیەك کەوتیتە لەرزین
کەدەترسام باوەڕ بەئایینی مەسیحی بێنیت
عوسمان کاتێك مرد، تا ئەو جێگەی دەزانم
جگە لەمناڵەکانی خۆی هیچی نەبوو
بەڵام ئەگەر مناڵەکانی حەرب نەدەبوون
خوێنی ئێوە بەفیڕۆ چووبوو)).

دەڵێت: ڕۆژی دواتر سەعید بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سەغدییەکان ئەسپی تاودا. سەغدییەکانیش هاتن و سەرئەنجام لەسەر دەستی سەعید شکستیان خوارد و لەشارەکەیان گەمارۆ دران. دواتر ڕێگەی ئاشتییان گرتەبەر و پەنجا مێردمنداڵی گەورەکانی خۆیان وەك بارمتە لای موسوڵمانان دانا.

دەڵێت: دواتر لەڕووبار پەڕییەوە و لەتەرمز نیشتەجێ بوو.

دەڵێت: سەعید بەڵێنەکەی خۆی نەبردە سەر و مێردمنداڵە بارمتەکانی لەگەڵ

خۆی بۆ مەدینە هێنا.

دەڵێت: کاتێک سەعید هاتە خوراسان، ئەسلەم کوڕی زەرعەی کەلابی بەنوێنەرایەتی عوبەیدللە کوڕی زیاد لەوێ بوو و لەوێ مایەوە تا عوبەیدللە کوڕی زیاد جارێکی دیکە فەرمانی فەرمانڕەوایەتی خوراسانی بۆ ناردەوە. کاتێک نامەکەی عوبەیدللە بەدەستی ئەسلەم گەیشت، شەوانە ڕۆشتە لای سەعید کوڕی عوسمان و بووە هۆی ئەوەی یەکێک لەکەنیزەکانی کوڕەکەی لەبار بچێت. سەعید دەیوت: لەتۆڵەی ئەو، یەکێک لەمناڵەکانی حەرب دەکوژم. کاتێک گەڕایەوە بۆ لای معاویە، سکالای دژی ئەسلەم بەرز کردەوە و قەیسییەکان تووڕە بوون.

دەڵێت: هومام کوڕی قەبیسەی نەموری لەکاتێکدا چاوی سوور بووبوویەوە، ڕۆشتە لای معاویە. معاویە پێی وت: ئەی هومام چاوت سوورە.

وتی: لەشەڕی سەفین لەمە سوورتر بوو. معاویە لەم وتەیە پەشۆکا و کاتێک سەعید ئەمەی بینی، چاوپۆشی لەئەسلەم کرد. ئەسلەم کوڕی زەرعە بۆ ماوەی دووساڵ بەنوێنەرایەتی عوبەیدللە کوڕی زیاد فەرمانڕەوایەتی خوراسانی کرد.

## ساڵی پەنجا و حەوتەم دەستی پێکرد

لەم ساڵەدا عەبدوللە کوڕی قەیس جەنگی زستانەی لەسەرزەمینی ڕۆم ئەنجامدا. بەوتەی واقدی، لەم ساڵەدا و لەمانگی زیقەعدە، مەروان لەکارگوزاری مەدینە دوورخرایەوە و بەوتەیەکی دیکە، مەروان لەم ساڵەدا وەک ساڵی پێشوو کارگوزاری مەدینە بوو.

بەوتەی واقدی کاتێک معاویە، مەروانی لەکارگوزاری مەدینە لابرد، وەلید کوڕی عوتەبە کوڕی باوکی سوفیانی وەک کارگوزار دەستنیشان کرد. باوکی مەعشەریش گێڕانەوەیەکی هاوشێوەی هەیە.

لەم ساڵەدا کارگوزاری کوفە زوحاک کوڕی قەیس بوو.

کارگوزاری بەسرە عوبەیدللە کوڕی زیاد بوو.

کارگوزاری خوراسان سەعید کوڕی عوسمان.

ساڵی پەنجا و هەشتەم دەستی پێکرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی پەنجا و هەشت

بەوتەی باوکی مەعشەر لەم ساڵەدا، لەمانگی زیقەعدە، معاویە، مەروانی لەکارگوزاری مەدینە دوورخستەوە و وەلید کوڕی عوتەبە کوڕی باوکی سوفیانی وەك کارگوزاری مەدینە دەستنیشان کرد.

لەم ساڵەدا مالك کوڕی عەبدوڵڵە خوسعەمی، بەمەبەستی جەنگ ڕوویکردە سەرزەمینی ڕۆم.

لەم ساڵەدا وەلید کوڕی عوتەبە کوڕی باوکی سوفیان، ڕێوڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. باوکی مەعشەر و واقدی ئاماژەیان بەم گێڕانەوە داوە.

لەم ساڵەدا معاویە، عەبدولڕەحمان کوڕی عەبدوڵڵەی سەقەفی وەك کارگوزاری کوفە دەستنیشان کرد و زوحاك کوڕی قەیسی لەکارەکەی دوورخستەوە. عەبدولڕەحمان کوڕی دایکی حەکەمی خوشکی معاویە بوو. لەڕۆژگاری ئەو، خەواریج کە لەسەر دەستی موغەیرە کوڕی شوعبە زیندانی کرابوون، ئازاد کران. ئەو کەسانەی لەگەڵ مەستورد کوڕی عەلەفە بەیعەتیان بەستبوو و کاتێك موغەیرە بەسەریاندا سەرکەوت، زیندانی کرد. دوای مەرگی موغەیرە لەزیندان هاتنەدەر.

عەبدوڵڵە کوڕی عەقەبەی غەنەوی دەڵێت: حەییان کوڕی زەببیان سولەمی هاوەڵانی خۆی کۆکردەوە. دواتر سپاسی خواوەندی کرد و پێی وتن: خواوەند جیهادی کردۆتە ئەرکی سەرشانی ئێمە، دەستەیەك لەئێمە ئەرك و بەڵێنەکەی خۆمان بەسەر بردووە و دەستەیەکمان بەجێ ماوین. ئەوان چاکەکاران بوون و پێگە و ڕێزی خۆیان هەیە و هەرکەس لەئێمە بەجێماوە، هاوشێوەی کەسانی پێشووترە و هەرکەس لەئێوە خواوەند و پاداشتی خوایی دەوێت، ڕێگەی برا و هاوڕێکانی بگرێتەبەر تا خواوەند لەم دنیا و لەو دنیا جەزای بەخێری بداتەوە چوونکە خواوەند لەگەڵ چاکەکارانە.

مەعاز کوڕی جوەینی تایی وتی: ئەی موسوڵمانان، سوێند بەخوا ئەگەر دەمزانی لەکاتی جەنگ دژی ستەمکاران و ڕووبەڕوو بوونەوەی ستەم، لای خواوەند ڕووسوور دەبین، پشتگوێ خستنی جەنگ ئاسانتر و خۆشتر لەخودی

جەنگ بوو، بەڵام زانیومانە و دڵنیایین کەڕووسوور نابین، چوونکە خواوەند ئیمان و دڵ و گوێچکەی پێداوین تا ڕووبەڕووی ستەم ببینەوە و نادادپەروەرییەکان بگۆڕین و دژی ستەمکاران بجەنگین.

دواتر وتی: دەستت بێنە پێش تا بەیعەتت لەگەڵ ببەستم. بەیعەتی لەگەڵ حەییان بەست و کەسانی دیکەیش بەیعەتیان بەست و دەستیان خستە ناودەستی حەییان کوڕی زەببیان و ڕێوڕەسمی بەیعەت بەستنیان ئەنجامدا. ئەم بەیعەتە لەڕۆژگاری فەرمانڕەوایەتی عەبدولڕەحمان کوڕی عەبدوڵڵەی سەقەفی بوو. ئەو کوڕی دایکی حەکەم و سەرکردەی پاسەوانەکانی، زائیدە کوڕی قودامەی سەقەفی بوو.

دەڵێت: چەند ڕۆژ دواتر خەڵکان لەماڵی مەعاز کوڕی جوەینی تایی کۆبوونەوە. حەییان کوڕی زەببیان پێی وتن: ئەی بەندەکانی خوا! بۆچوونی خۆتان بڵێن، پێم دەڵێن ڕوویکەمە کوێ؟

مەعاز وتی: بۆچوونی من ئەوەیە ئێمە بەرەو حیلوان ببەیت چوونکە ویلایەتێکە لەنێوان دەشت و کێو و لەنێوان ئەم شارە و سنوور-مەبەستی لەسنوور، ڕەی بوو- و هەرکەس لەخەڵکی ئەم شارە و سنور و چیاکان و سواد، بۆچوونی ئێمەیان هەبێت، پەیوەستی ئێمە دەبن.

حەییان پێی وت: دوژمن پێش ئەوەی خەڵکان پەیوەستی تۆ ببن، دوژمن دەستی خۆی دەوەشێنێت و سوێند بەخوا ناهێڵن ئاسوودە بن و خەڵکان لەدەوری ئێوە کۆببنەوە. بۆچوونی من ئەوەیە بڕۆینە یەکێك لەناوچەکانی دەرەوەی کوفە، بۆ سوێرەلان یا زەرارە یا حیرە، ئەوسا ڕووبەڕوویان ببینەوە تا پەیوەستی خواوەند دەبین. سوێند بەخوا دەزانم ژمارەی ئێوە لەسەد کەمترە و ناتوانن بەسەر دوژمندا سەرکەوتن بەدەست بێنن یا زیانێکی قورسیان لێ بدەن، بەڵام کاتێك خواوەند بزانێت ئێوە لەڕێگەی ئەودا ڕووبەڕووی دوژمن دەبنەوە و خۆتان گرفتاری ڕەنج و ئازار دەکەن، ڕووسوور دەبن و گوناحتان لەسەر نامێنێت.

باوکی سولەیمانی شەیبانی، عەتریس کوڕی عەرقوب وتی: بەڵام لەگەڵ بۆچوونەکەی ئێوەدا نیم. لێکۆڵینەوە لەبۆچوونەکانی خۆتان بکەن. دڵنیام

هەمووتان دەزانن من پیاوی جەنگم و خاوەن ئەزموون.

وتیان: بۆچوونی تۆ چییە؟

وتی: بۆچوونی من ئەوەیە کە لەم شارەدا دژی کەس شۆڕش نەکەن. ژمارەی ئێوە کەمە. سوێند بەخوا هیچ کارێك ئەنجام نادەن جگە لەوەی خۆتان تەسلیم بەوان و بەکوژرانی خۆتان دڵخۆشیان دەکەن. ئەمە ڕێگەچارە نییە، کاتێك دەتانەوێت دژی خەڵکەکەی خۆتان شۆڕش بکەن، بیر لەڕێگەچارەیەك بکەنەوە کەزیان لەدوژمنەکەتان بدات.

وتیان: بەمپێیە بۆچوونی ڕاست کامەیە؟

وتی: بڕۆنە ئەو ویلایەتەی کەمەعاز کوڕی جوەین وتی، یانی حیلوان یا بەرەو عەین ئەلتەمر دەڕۆین و لەوێ دەمێنینەوە و کاتێك براکانمان ئاگادار ببنەوە، لەهەموو ناوچەکانەوە بۆ پەیوەست بوون بەئێمە ملی ڕێگە دەگرنەبەر.

حەییان کوڕی زەببیان وتی: سوێند بەخوا ئەگەر تۆ و هەموو هاوەڵانت بڕۆنە یەکێك لەم دوو شارە، هێشتا لەئەسپ دانەبەزیون کەسوارەکانی ئەو شارانە دەورتان دەگرن. بۆ خۆتان بەکوشت دەدەن؟ سوێند بەخوا ژمارەتان زۆر نییە تا بتوانن لەم دنیا بەسەر ستەمکاراندا سەرکەوتن بەدەست بێنن. بڕۆنە ناوچەکانی دەوروبەری ئەم شارە و لەگەڵ ئەو کەسانەی دژی فەرمانی خواوەند دەجووڵێنەوە، بجەنگن و چاوەڕێ مەبن چوونکە بەمکارە دەچنە بەهەشت و خۆتان لەفیتنە دوور دەخەنەوە.

وتیان: ئەگەر ڕێگەچارەمان نەبێت، دژایەتی تۆ ناکەین. بۆ هەر شوێنێك دەخوازیت، ئێمە ببە.

دەڵێت: حەییان کوڕی زەببیان چاوەڕێی کرد تا دوا ساڵی فەرمانڕەوایەتی کوڕی دایکی حەکەم دەستی پێکرد. سەرەتای ساڵ کەیەکەم ڕۆژی مانگی ڕەبیع ئەلئاخەر بوو، هاوەڵانی لەدەوری کۆبوونەوە و پێی وتن: ئەی خەڵکینە، خواوەند ئێوەی بەچاکە و بۆ چاکە ئافڕاندووە، سوێند بەوخوایەی جگە لەو خوایەك نییە، لەو کاتەوەی موسوڵمان بووم، لەهیچ شتێکی دنیا بەئەندازەی جەنگ دژی ستەمکاران ڕازی و ڕەزامەند نەبووم، سوێند بەخوا نامەوێت هەموو دنیا مڵکی من

بێت بەلاّم خواوەند لەم شۆڕشەدا لەشەهیدبوون بێبەشم بکات. بۆچوونی من ئەوەیە بڕۆین و لەناوچەی دارجەریر دابەزین و کاتێك دەستەی ستەمکاران ڕووبەڕوومان دەبنەوە، بجەنگین.

عەتریس کوڕی عەرقوبی بەکری وتی: ئەگەر لەناو شاردا ڕووبەڕوویان ببینەوە، پیاوەکانیان ڕووبەڕوومان دەبنەوە و ژنان و منالاّن و کەنیزەکان لەسەر بانەکانەوە بەردبارانمان دەکەن.

یەکێك لەوان وتی: کەواتە دەڕۆینە دەرەوەی شار بۆ نزیك پردەکە.

دەڵێت: ئەویَ ناوچەی زەرارە بوو کەدوای ئەوە بناغەی بۆ دارێژرا. پێشتر تەنیا چەند ماڵێك لەو ناوچەیە دەبینرا.

مەعاز کوڕی جوەینی تایی وتی: نا، دەڕۆین و لەبانقیا جێگیر دەبین. زۆر بەخێرایی دوژمن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەمان دێت. کاتێك هاتن، ڕووبەڕوویان دەبینەوە و ماڵەکانی شار لەپشت سەرمان دەبێت و تەنیا لەیەك بەرەوە دژی ئەوان دەجەنگین.

دەڵێت: بەرێکەوتن. سوپایەك بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانەکرا کەهەموویان کوژران. دوای ئەوە خەڵکی کوفە عەبدولڕەحمان کوڕی دایکی حەکەمیان لەشارەکە دەرکرد.

هوشام کوڕی محەممەد دەڵێت: معاویە، کوڕی دایکی حەکەمی وەك کارگوزاری کوفە دەستنیشان کرد بەلاّم لەبەر هەڵسوکەوتی خراپی لەشارەکە دەرکرا و گەڕایەوە بۆ لای معاویە. معاویە پێی وت: تۆ دەکەمە کارگوزاری ویلایەتێکی باشتر لەکوفە، یانی میسر. ئەوی وەك کارگوزاری میسر دەستنیشان کرد و کوڕی دایکی حەکەم ڕێگەی ئەو سەرزەمینەی گرتەبەر. معاویە کوڕی حودەیجی سەکونی ئاگادار بوویەوە و هاتەدەر و لەدوو مەنزڵی میسر ڕووبەڕووی بوویەوە. معاویە کوڕی حودەیج پێی وت: بۆ لای خاڵت بگەڕێرەوە چوونکە ئەو هەڵسوکەوتەی لەگەڵ براکانی ئێمە لەکوفە کردت، ئێمە پێی رازی نابین.

دەڵێت: عەبدولڕەحمان بۆ لای معاویە گەڕایەوە. معاویە کوڕی حودەیجیش هاتە لای معاویە.

دەڵێت: بەوشێوە بوو کاتێك دەهات، ڕێگەکەیان بۆ دەڕازاندەوە.

دەڵێت: کاتێك ڕۆشتمە لای معاویە، حەکەم لەوێ بوو، وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران ئەمە کێیە؟

وتی: ئەمە معاویە کوڕی حودەیجە.

وتی: بەخێر نەیێت، دەنگی دەهۆڵ لەدوور خۆشە.

معاویە کوڕی حودەیج وتی: ئەی دایکی حەکەم ئارام بگرە چوونکە شووت کرد و بەڕێزەوە شووت نەکرد، مناڵت خستەوە و مناڵەکەت شیاو نەبوو، دەتویست کوڕە خراپەکارەکەت ببێتە کارگوزاری ئێمە و هەمان هەڵسوکەوتمان لەگەڵ بکات کە لەگەڵ براکانمان لەکوفە کردی، خوا سەرکەوتووی نەکات و ئەگەر ئەو کارە بکات، بەشێوەیەك لێی دەدەین ملکەچی خۆی نیشان بدات هەرچەند ئەم کەسەی دانیشتووە، پێی خۆش نییە.

دەڵێت: معاویە سەیری کرد و وتی: بەسە.

لەم ساڵەدا عوبەیدڵڵە کوڕی زیاد بارودۆخی لەخەواریج دژوار کرد و ژمارەیەکی زۆری ئەوانی بەدەست بەستراوی کوشت و دەستەیەکی دیکەی لەکاتی جەنگدا کوشت. یەکێك لەو کەسانەی بەدەست بەستراوی کوژرا، عوروە کوڕی ئەدیە برای باوکی بیلال، مەرداس کوڕی ئەدیە بوو.

## هۆکاری ئەوەی زیاد خەواریجی کوشتار کرد؟

عیسا کوڕی عاسمی ئەسەدی دەڵێت: کوڕی زیاد بەمەبەستی پێشبڕکێی ئەسپ سواری ڕۆشتەدەر و کاتێك چاوەڕێی ئەسپەکانی دەکرد، خەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە. عوروە کوڕی ئەدیە لەناو ئەواندا بوو کەڕوویکردە کوڕی زیاد و وتی: پێنج شت لەناو ئۆمەتەکانی پێشوو دەبینرا و لەناو ئێمەیشدا دەرکەوت. بۆ لەهەر شوێنێك بەبێهۆ، نیشانەیەك دادەنێن و ئاوبەندەکان دروست دەکەن، مەگەر دەتانەوێت بۆ هەمیشە زیندووبن؟ و کاتێك ڕەقی دەنوێنن، هاوشێوەی ستەمکاران ڕەقی دەنوێنن.

و دوو شتی دیکە کەگێڕەوەی ئەم بابەتە لەبیری کردبوو.

کوڕی زیاد زانی عوروە ئەگەر بەهاوەڵانی پشت ئەستوور نەبێت، بوێری وتنی ئەو وتانەی نەبوو. کوڕی زیاد هەستا و پێشبڕکێکەی بەجێهێشت.

دەڵێت: بەعوروەیان وت: چیت کرد؟ سوێند بەخوا دەتکوژێت.

دەڵێت: عوروە هەڵات و کوڕی زیاد بەدوایدا دەگەڕا و کاتێك هاتە کوفە، گرتیان و بردیانە لای کوڕی زیاد. کوڕی زیاد فەرمانیدا و هەردوو دەست و قاچیان بڕییەوە. دواتر ئەویان بردە لای کەپێی وت: چی دەبینی؟

وتی: دەبینم کەئەم دنیای منت وێران کرد و ئەو دنیای خۆت بەفیڕۆدا.

دەڵێت: زیاد کوشتی. هەروەها کچەکەیشی هێنا و کوشتی.

دەڵێت: مەرداس کوڕی ئەدیە لەئەهواز شۆڕشی کرد. پێشتر کوڕی زیاد ئەوی زیندانی کردبوو.

جەلاد کوڕی یەزیدی باهلی دەڵێت: کوڕی زیاد، مەرداس کوڕی ئەدیەی زیندانی کردبوو و زیندانوان کەپارانەوە و نوێژکردنی ئەوی دەبینی، شەوانە ڕێگەی پێدەدا کەدەڕۆشت و بەرەبەیان دەگەڕایەوە بۆ زیندان. یەکێك لەهاوەڵانی مەرداس، هاونشینی کوڕی زیاد بوو. شەوێك کوڕی زیاد باسی خەواریجی کرد و وتی مەبەستی ئەوەی کردووە بەیانی بیانکوژێت. هاورێکەی مەرداس ڕۆشتە ماڵەکەی و لەمەبەستی کوڕی زیاد ئاگاداری کردەوە و وتی: کەسێك بۆ لای باوکی بیلال لەزیندان بنێرن تا وەسیەت بکات چوونکە دەکوژرێت. مەرداس ئەمەی بیست و زیندانوانیش ئاگادار بوویەوە و شەوێکی دژواری بەسەر برد لەترسی ئەوەی نەکا مەرداس ئاگادار ببێتەوە و چیتر نەگەڕێتەوە بۆ زیندان. بەڵام لەکاتی خۆیدا گەڕایەوە.

زیندانوان پێی وت: بیستووتە کەئەمیر مەبەستی چی هەیە؟

وتی: بەڵێ.

وتی: لەگەڵ ئەوەیشدا گەڕایتەوە؟

وتی: پاداشتی چاکەی تۆ ئەوە نەبوو لەبری من سزا بدرێیت.

دەڵێت: بەرەبەیان عوبەیدللە کوشتنی خەواریجی دەستپێکرد و مەرداسی بانگ کرد. کاتێك هات، زیندانوان کەمێردی پووری کوڕی زیاد بوو، هەستا و قاچی

گـرت و وتـی: ئەمـە بـەمن ببەخـشە. بەسـەرهاتەکەی بـۆ گێڕایـەوە و کـوڕی زیـاد مەرداسی بەو بەخشی و ئازادی کرد.

یونس کوڕی عوبەید دەڵێت: باوکی بیلال مەرداس کە لەمناڵەکانی رەبیعە بوو، لەگەڵ چل کەس ڕوویکردە ئەهواز. کوڕی زیـاد سـوپایەکی بـۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی ئەوان نارد کەسەرکردەکەیان کوڕی حەسینی تـەمیمی بـوو. سـوپاکەی کـوڕی زیـاد شکـستی بەسـوپاکەی کـوڕی مـەرداس هێنـا و شکـستیان خـوارد و یـەکێك لەمناڵەکانی تیم ئەللە هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناورەۆکە:

(( گومانتان کرد دوو هەزار کەسەکەی ئێوە باوەڕدار بوون

کەئەوانتان کوشتار کرد

درۆ دەکەن، بەو شێوەیە نییە کەگومان دەکەن

چوونکە خەواریج ئیمانیان هەیە

و بەسەر سوپایەکی گەورەدا سەرکەوتن بەدەست دێنن)).

دەڵـێن: لـەم سـاڵەدا عومـەیرە کـوڕی یەسـربی، دادوەری بەسـرە مـرد و هوشـام کوڕی هوبەیرە کاروباری دادی گرتەدەست.

لەم ساڵەدا کارگوزاری کوفە، عەبدولڕەحمان کوڕی دایکی حەکەم بوو.

دەسـتەیەك وتوویانـە زوحـاك کـوڕی قەیـسی فـەهری بـوو. کـارگوزاری بەسـرە عوبەیدللە کوڕی زیاد و کاروباری دادی کوفە لەدەستی شورەیحدا بوو.

بەوتەی باوکی مەعشەر و واقدی، وەلیـد کـوڕی عوتەبـە لـەم سـاڵەدا ڕێـوڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

ساڵی پەنجا و نۆیەم دەستی پێکرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی پەنجا و نۆیەم

جەنگی زستانەی عەمرۆ کوڕی موڕەی جوهنی لەسەرزەمینی ڕۆم لەم ساڵەدا بوو کە لەڕێگەی وشکانییەوە ڕۆشت.

واقدی دەڵێت: لەم ساڵەدا لەدەریا جەنگ نەکرا. بەڵام بەپێی گێڕانەوەیەکی دیکە جونادە کوڕی باوکی ئومەییە لەم ساڵەدا جەنگی دەریای ئەنجامدا.

لەم ساڵەدا عەبدولڕەحمان کوڕی دایکی حەکەم لەکوفە دوورخرایەوە و نەعمان کوڕی بەشیری ئەنساری وەك کارگوزاری کوفە دیاریکرا. پێشتر ئاماژەمان بەهۆکاری لابردنی عەبدولڕەحمان کوڕی دایکی حەکەمدا.

لەم ساڵەدا معاویە، عەبدولڕەحمان کوڕی زیاد کوڕی سومەییەی وەك کارگوزاری خوراسان ڕەوانە کرد.

## بۆچی معاویە کاروباری خوراسانی بەعەبدولڕەحمان سپارد؟

باوکی عەمرۆ دەڵێت: عەبدولڕەحمان کوڕی زیاد ڕۆشتە لای معاویە و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران مەگەر ئێمە مافمان نییە؟

وتی: بۆ نا.

وتی: کاروباری کام ویلایەت بەمن دەسپێریت؟

وتی: نەعمان کەپیاوێکی بیرمەندە و یەکێکە لەهاوەڵانی پێغەمبەر (د.خ)، کاروباری کوفەی لەدەستدایە، عوبەیدڵڵە کوڕی زیاد، کاروباری بەسرە و خوراسانی لەدەستدایە، عوباد کوڕی زیاد لەسیستانە، کارێك کەشیاوی تۆ بێت نەماوە جگە لەوەی لەکاروبارەکاتی عوبەیدڵڵەی برات بتکەمە شەریك.

وتی: ئەو کارە بکە چوونکە سنووری فەرمانڕەوایەتی ئەو بەرینە و ڕازی دەبێت.

دەڵێت: معاویە ئەوی وەك کارگوزاری خوراسان دیاریکرد.

باوکی حەفسی ئەزدی لەعەمرۆ دەگێڕێتەوە: قەیس کوڕی هەیسەم هاتە خوراسان (عەبدولڕەحمان کوڕی زیاد ئەوی ناردبوو) و ئەسلەم کوڕی زەرعەی

گرت و زیندانی کرد. دواتر عەبدولڕەحمان هات و سێسەد هەزار درەمی وەك قەرەبوو لەئەسلەم کوڕی زەرعە سەند.

موقاتیل کوڕی حەییان دەڵێت: عەبدولڕەحمان کوڕی زیاد ڕوویکردە خوارسان، پیاوێکی بەخشندە و تەماحکار و ناتەوان بوو. هیچ جەنگێکی نەکرد. دوو ساڵ لەخوراسان مایەوە.

عەوانە دەڵێت: عەبدولڕەحمان کوڕی زیاد دوای کوژرانی حسەین کوڕی عەلی ڕۆشتە لای یەزید و قەیسم کوڕی هەیسەمی وەك جێگری خۆی لەخوراسان داریکرد.

باوکی حەفس دەڵێت: یەزید بەعەبدولڕەحمانی وت: چەندە سامانت لەخوراسانەوە هێناوە؟

وتی: بیست هەزار هەزار درهەم.

وتی: ئەگەر دەخوازیت، لێکۆڵینەوەت لەگەڵ دەکەین، پارەکەت لێ دەسێنین و دووبارە فەرمانڕەوای خوراسانت پێدەبەخشینەوە و ئەگەر دەخوازیت لەکار دوورت دەخەینەوە و دەبێت پێنسەد هەزار درهەم بە عەبدوڵڵە کوڕی جەعفەر بدەیت.

وتی: لێکۆڵینەوەم لەگەڵ مەکە و کەسێکی دیکە بۆ کاروباری خوراسان دیاریبکە. دواتر عەبدولڕەحمان کوڕی زیاد هەزار هەزار درەمی بۆ عەبدوڵڵە کوڕی جەعفەر نارد و وتی: پێنسەد هەزار درهەم لەلایەن سەروەری باوەڕداران و پێنسەد هەزار درهەم لەلایەن خۆمەوە.

لەم ساڵەدا عوبەیدوڵڵە کوڕی زیاد، لەگەڵ گەورەکانی خەڵکی بەسرە ڕۆشتە لای معاویە. معاویە ئەوی لەکارەکەی دوورخستەوە بەڵام دووبارە فەرمانی فەرمانڕەوایەتی ئەو ویلایەتەی بۆ نووسی.

## هۆکاری لابردن و دانانەوەی دووبارەی عوبەیدلڵە کوڕی زیاد

عەلی دەڵێت: عوبەیدلڵە کوڕی زیاد لەگەڵ خەڵکی عێراق ڕۆشتە لای معاویە و پێی وت: بەپێی پێگە و ڕێز، مۆڵەتی هاتنیان پێبدە.

دەڵێت: معاویە مۆڵەتی پێدان. ئەحنەف لەدوای هەموویانەوە هات چوونکە پێگەی ئەو لای عوبەیدلڵە بەرز نەبوو. کاتێك معاویە، ئەحنەف بینی، بەگەرمی بەخێرهاتنی کرد و ئەوی لای تەختەکەی خۆی دانیشاند. دواتر هەمووان دەمیان کردەوە و وەسفی عوبەیدلڵەیان کرد بەڵام ئەحنەف بێدەنگ بوو.

معاویە پێی وت: ئەی باوکی بەجر بۆ هیچ ناڵێیت؟

وتی: ئەگەر قسە بکەم، دژی ئەوان دەبم.

وتی: هەستن، عوبەیدلڵەم لەکارگوزاری ئێوە لابرد. کەسێك بدۆزنەوە کەهەمووتان پێی رازی دەبن.

دەڵێت: هەرکام لەوان ڕۆشتنە لای یەکێك لەمناڵەکانی ئومەییە یا یەکێك لەگەورەکانی شام وبەدوای کارگوزارێکدا دەگەڕان. بەڵام ئەحنەف لەماڵەکەی خۆی دانیشت و نەڕۆشتە لای کەس.

دەڵێت: چەند ڕۆژێك تێپەڕی. معاویە ئەوانی بانگ کردەوە. کاتێك ڕۆشتنە لای، پرسی: کێتان هەڵبژارد؟

بەڵام بۆچوونەکانیان جیاواز بوو و هەرکام ئاماژەی بەکەسێك دەدا و ئەحنەف وەك پێشووتر بێدەنگ بوو.

دەڵێت: معاویە بەئەحنەفی وت: ئەی باوکی بەجر بۆ قسە ناکەیت؟

وتی: ئەگەر بڕیارە کەسێك لەبنەماڵەکەی خۆت ببێتە کارگوزاری ئێمە، عوبەیدلڵە لەهەمووان باشترە و ئەگەر جگە لەبنەماڵەکەی خۆت کەسێك دیاریدەکەیت، خۆت یەکێك هەڵبژێرە.

معاویە وتی: عوبەیدلڵە بۆ بەسرە دەگەڕێنمەوە. دواتر بەعوبەیدلڵەی وت ڕێز لەئەحنەف بگرێت و بۆ ئەوەی خۆی لەئەحنەف دوور خستۆتەوە، سەرکۆنەی کرد.

دەڵێت: لەکاتی فیتنەدا، کەس جگە لەئەحنەف بە عوبەیدڵڵە ئەمەکدار نەبوو.

لەم ساڵەدا بەسەرهاتی یەزید کوڕی مەفرەغی حومەیری و عیباد کوڕی زیاد ڕوویدا کەیەزید کوڕەکانی زیادی هەجوو کرد.

## بۆ مەفرەغ کوڕەکانی زیادی هەجوو کرد؟

باوکی عوبەیدە موعەممەر کوڕی موسەنا دەڵێت: یەزید کوڕی ڕەبیعە کوڕی مەفرەغی حومەیری لەگەڵ عیباد کوڕی زیاد لەسیستان بوو. عیباد سەرقاڵی جەنگی تورکەکان و لەو بێ ئاگا مابوویەوە. سوپا بۆ دابینکردنی ئالیکی چوارپێکان ڕووبەڕووی کێشە بوویەوە. کوڕی مەفرەغ هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەڕۆکە:

((خۆزگە ڕیشەکان ئالیك بوون

تا ئەسپی موسوڵمانان لێی بخۆن))

عیباد کوڕی زیاد ڕیشی چڕوپڕ و درێژ بوو، کاتێك ئەم هۆنراوەی کوڕی مەفرەغی بیست، پێیان وت: مەبەستی تۆ بووە. عیباد شوێنی کەوت و کوڕی مەفرەغ هەڵات و چەندین قەسیدەی بۆ هەجوو کردنی ئەو هۆنییەوە. بۆ نمونە هۆنراوەیەك بەم ناوەڕۆکە:

((ئەگەر معاویە کوڕی حەرب بمرێت

قاپی دارینی تۆ تێکدەشکێت

شایەتی دەدەم کە دایکت

بێ دەمامك لەگەڵ ئەبوسوفیان نەخەوت

چوونکە کارێکی گوماناوی بوو

و بەترسێکی زۆرەوە ئەنجامدرا)).

و هۆنراوەیەکی دیکە کەناوەڕۆکەکەی ئەمەیە:

(( لەزمانی پیاوێکی یەمەنی بەمعاویە کوڕی حەرب بڵێ

مەگەر دەڕەنجێیت ئەگەر بڵێن باوکت داوێنپاك بووە

و خۆشحاڵ دەبیت ئەگەر بڵێن باوکت داوێنپیس بووە

شایەتی دەدەم خزمایەتی تۆ لەگەڵ زیاد
وەك خزمایەتی فیل و مێچکە کەرە)).

باوکی زەید دەڵێت: کاتێك کوڕی مەفرەغ، عیباد کوڕی زیادی هەجوو کرد و لێی جیابوویەوە، ڕوویکردە بەسرە. لەو کاتەدا عوبەیدوڵڵە ڕۆشتبووە لای معاویە. عیباد بەسەرهاتی هەجوو کردنەکەی بۆ عوبەیدوڵڵە نووسی. کاتێك عوبەیدوڵڵە هۆنراوەکەی خوێندەوە، ڕۆشتە لای معاویە و بۆ ئەویشی خوێندەوە و داوای لێکرد ڕێگەی بدات کوڕی مەفرەغ بکوژێت بەڵام معاویە ڕێگەی کوشتنی پێنەدا و وتی: تەمێی بکە بەڵام خوێنی مەڕێژە.

دەڵێت: کوڕی مەفرەغ هاتە بەسرە و پەنای بۆ ئەحنەف برد.

ئەحنەف وتی: دژی کوڕی سومەییە پەنا بەکەس نادەم. ئەگەر دەخوازیت شاعیرەکانی مناڵەکانی تەمیم لەتۆ دوور دەکەمەوە.

وتی: ئەوە گرنگ نییە.

دەڵێت: ڕۆشتە لای خالید کوڕی عەبدوڵڵە کەبەڵێنی پێدا پەنای بدات. دوای ئەوە ڕۆشتە لای ئومەییە و بەڵێنی پێدا. دواتر ڕۆشتە لای عومەر کوڕی عوبەیدوڵڵە و ئەویش بەڵێنی پێدا. دواتر ڕۆشتە لای مونزەر کوڕی جارد و پەنایدا و لەماڵەکەی خۆی جێی کردەوە.

دەڵێت: بەحرییە کچی مونزەر ژنی عوبەیدوڵڵە بوو. کاتێك عوبەیدوڵڵە هاتە بەسرە، ئاگادار بوویەوە کەکوڕی مەفرەغ لەماڵی مونزەرە. کاتێك مونزەر بۆ بەخێرهاتنی عوبەیدوڵڵە ڕۆشت، ئەو پاسەوانەکانی بۆ ماڵی مونزەر نارد و کوڕی مەفرەغیان گرت. مونزەر لای عوبەیدوڵڵە بوو کە لەناکاو بینی کوڕی مەفرەغیان لای ئەو ڕاگرتووە. هەستایە سەرپێ و بە عوبەیدوڵڵەی وت: ئەی ئەمیر، من پەنام داوە.

عوبەیدوڵڵە وتی: ئەی مونزەر، وەسفی تۆ و باوکت دەکات و جوێن بەمن و باوکم دەدات و تۆ پەنای دەدەیت.

دەڵێت: فەرمانیدا و دەرمانێکیان دەرخواردی کوڕی مەفرەغدا و سوار کەرێکیان کرد. کوڕی مەفرەغ خۆی پیس دەکرد و بەناو بازاڕەکاندا دەیانسووڕاندەوە. پیاوێکی پارسی بینی و وتی: ئەمە چییە؟

کوڕی مەفرەغ تێگەیشت و وتی:

(( ئاوە و گمیز نییە

گوشراوی کشمیشە

سومەییە ڕووسپییە))

دەڵێت: دوای ئەوە مونزەر هەجووی کوڕی جارودی کرد، هۆنراوەیەك بەم ناوەرۆکە:

((پەنام بۆ قوڕەیش نەبرد

پەنام بۆ منداڵەکانی قەیس برد

پەنایان دام بەڵام پەنادانی ئەوان

تۆفانێك لەبای بێدەنگی عێراقییەکان بوو

پەنادەرەکەی من خەوتبوو

پیاوێکی ئامادە دەبێت پەنای خەڵکان بدات)).

هەروەها سەبارەت بە عوبەیدللە هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

(( ئەوەی لەگەڵ من کردت بەئاو دەشۆردرێت

بەڵام وتەکانی من لەسەر ئێسقانە ڕزاوەکانت دەمێنێتەوە))

دەڵێت: عوبەیدللە، کوڕی مەفرەغی بۆ سیستان و بۆ لای عیباد نارد. خەڵکی یەمەن لەشام سەبارەت بەو قسەیان لەگەڵ معاویە کرد. معاویە کەسی بۆ لای عیباد نارد و کوڕی مەفرەغیان بردە لای معاویە. لەڕێگەدا سەبارەت بەئەسپەکەی خۆی هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

((بلەز بوو چوونکە کەس بەسەر تۆدا زاڵ نییە

ڕزگارت بوو و ئەوەی دەیبەیت ئازادە

سوێند بەگیانی خۆم کەپێشەوا و پەیوەندی بەهێزی خەڵکان

تۆی لەگێژاوی مەرگ ڕزگار کرد

سپاسی دەکەم

و کەس هاوشێوەی من سپاسگوزاری ئەو نابێت)).

دەڵێت: کاتێك کوڕی مەفرەغ گەیشتە لای معاویە، دەستی بەگریان کرد و وتی:

بەڵایەکیان بەسەردا هێناوم کەبەسەر هیچ موسوڵمانێکدا نەهاتووە. بێ ئەوەی کارێکم کردبێت یا گوناحێکم ئەنجامدابێت.

معاویە وتی: مەگەر تۆ نەبوویت کەوتت: بەمعاویە کوڕی حەرب..........

وتی: نە، سوێند بەخوا من ئەوەم نەوتووە.

وتی: مەگەر تۆ نەتوت شایەتی دەدەم کە دایکت....... و لەچەندین هۆنراوەی دیکەدا کوڕی زیادت هەجوو کرد... بڕۆ لەگوناحەکەی تۆ خۆش بووم، بڕۆ لەکوێ دەخوازی بمێنەرەوە.

دەڵێت: مەفرەغ ڕۆشتە موسڵ، دواتر ویستی لەبەسرە بمێنێتەوە و ڕۆشتە لای عوبەیدللە و ئەمانی پێبەخشرا.

بەڵام گێرانەوەی باوکی عوبەیدە بەمشێوەیە کەکاتێك کوڕی مەفرەغ ڕۆشتە لای معاویە و پێی وت: مەگەر تۆ نەبوویت کەوتت: بەمعاویە کوڕی حەرب..... هتد) کوڕی مەفرەغ سوێندی خوارد کەئەمە هۆنراوەی ئەو نییە و هۆنراوەی عەبدولڕەحمان کوڕی حەکەم برای مەروانە و منی کردۆتە داردەست چوونکە زیاد پێشتر ئەوی سەرکۆنە کردبوو.

دەڵێت: معاویە لەعەبدولڕەحمان کوڕی حەکەم تووڕە بوو و مانگانەکەی پێنەدا تا ئەوەی ڕووبەڕووی دژواری بوویەوە. سەبارەت بەو قسەیان لەگەڵ معاویە کرد و وتی: ڕازی نابم تا عوبەیدللە رازی دەبێت. ڕۆشتە عێراق بۆ لای عوبەیدللە و هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

(( تۆ کەپەیوەستی بنەماڵەی حەرب بوویت

لای من لەکچەکەم ئازیزتریت

تۆ وەك برا و مام و ئامۆزای خۆم دەبینم

بەڵام نازانم چۆن تۆمن نابینیت))

عوبەیدللە وتی: سوێند بەخوا تۆ وەك شاعیرێکی خراپ دەبینم. لێی خۆش بوو.

دەڵێت: معاویە بەکوڕی مەفرەغی وت: مەگەر تۆ نەبوویت کەوتت شایەتی دەدەم کەدایکت..... هتد. چیتر لەم کارانە مەکە، تۆم بەخشی. کوڕی مەفرەغ

بەرەو موسڵ ڕۆشت و ژنی هێنا. بەرەبەیانی شەوی بووکێنی ڕۆشتە ڕاو و ڕۆنفرۆش یا بۆنفرۆشێکی بینی کەسوار لەسەر کەرەکەی بوو. پێی وت: لەکوێوە دێت؟

وتی: ئەهواز

کوڕی مەفرەغ وتی: ئاوی مەسرەقان لەچ دۆخێکدایە؟

وتی: وەك خۆیەتی.

دەڵێت: دوای ئەوە بێ ئاگادار کردنەوەی کەسانی خۆی بەرەو بەسرە بەڕێکەوت و ڕۆشتە لای کوڕی زیاد. کوڕی زیاد ئەمانی پێبەخشی و لای ئەو مایەوە. دواتر مۆڵەتی ڕۆشتن بۆ کرمانی کرد و کوڕی زیاد مۆڵەتی پێدا و فەرمانی بەکارگوزارەکەی خۆی لەکرمان کرد تا ڕێزی بگرێت. لەو کاتەدا کارگوزاری کرمان، شەریك کوڕی ئەعوەری حارسی بوو.

بەوتەی واقدی و باوکی مەعشەر لەم ساڵەدا عوسمان کوڕی محەممەد کوڕی باوکی سوفیان ڕێوڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. کارگوزاری مەدینە، عوتەبە کوڕی باوکی سوفیان بوو. کارگوزاری کوفە نەعمان کوڕی بەشیر. کاروباری دادی کوفە لەدەستی شورەیحدا بوو. کارگوزاری بەسرە عوبەیدوڵڵە کوڕی زیاد بوو. کاروباری دادی بەسرە لەدەستی هوشام کوڕی هوبەیرەدا بوو. کارگوزاری خوراسان عەبدولڕەحمان کوڕی زیاد بوو. سیستان لەژێر دەستی عیباد کوڕی زیاد و شەریك کوڕی ئەعوەر بەنوێنەرایەتی کوڕی زیاد فەرمانڕەوایەتی کرمانی دەکرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی شەستی کۆچی

بەوتەی واقدی لەم ساڵەدا مالیک کوڕی عەبدوڵڵە بۆ جەنگ ڕوویکردە سەرزەمینی سووریا و جونادە کوڕی باوکی ئومەییە ڕۆشتە ناو رودس و شارەکەی وێران کرد.

هەروەها لەم ساڵەدا معاویە لەنێردراوانی بەسرە کە لەگەڵ عوبەیدللە کوڕی زیاد هاتبوونە لای، بۆ یەزیدی کوڕی بەیعەتی وەرگرت و کاتێك نەخۆش کەوت سەبارەت بەو چەند کەسەی بەیعەتیان نەکردبوو، پێشنیاری کرد. پێشنیارەکەی ئەوە بوو کە لەگێڕانەوەی عەبدولمەلیکدا هاتووە و دەڵێت: کاتێك معاویە نەخۆش کەوت، یەزیدی بانگ کرد و وتی:

((کوڕم، سەفەری هاتن و چوونم لەڕێگەی تۆ لابرد و کارەکانم بۆ ئاسان کردیت، دوژمنەکانتم ڕیسوا و عەرەبەکانم ملکەچی تۆ کرد و هەموویانم لەدەوری تۆ کۆکردۆتەوە. سەبارەت بەخەلافەتی تۆ لەهیچ ناترسم مەگەر چوار کەس لەقورەیش: حسەین کوڕی عەلی و عەبدوڵڵە کوڕی عومەر و عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر و عەبدولڕەحمان کوڕی ئەبی بەکر.

عەبدوڵڵە کوڕی عومەر پیاوێکە کەپاڕانەوە و خواپەرەستی لەپێی خستووە و ئەگەر کەس جگە لەو نەمێنێت، بەیعەتت لەگەڵ دەبەستێت. بەڵام خەڵکی عێراق دەست لەحسەین کوڕی عەلی هەڵناگرن تا بەشۆڕش کردن ناچاری دەکەن. ئەگەر دژی تۆ شۆڕشی کرد و سەرکەوتنت بەدەستهێنا، بیبەخشە چوونکە خزمێکی نزیکی تۆیە و مافێکی گەورەی لەدڵی ئێمەدایە. عەبدولڕەحمان کوڕی ئەبی بەکر کەسێك کاتێك ببینێت هاورێکانی کارێکیان ئەنجامداوە، ئەویش ئەنجامی دەدات. هەموو ئارەزووەکانی لەژن و سەرقاڵبووندا کۆدەبێتەوە. کەسێك کە وەك شێر ئامادەی پەڕینە و هاوشێوەی ڕێوی فێڵبازە و ئەگەر دەرفەتی دەستکەوێت دەپەڕێت، کوڕی زوبەیرە. ئەگەر ئەو کارەی کرد و بەردەستت کەوت، لەت لەتی بکە)).عەوانە دەڵێت: لەگێڕانەوەیەکی دیکە بیستوومە کەکاتێك وادەی مەرگی معاویە نزیك بوویەوە (لەساڵی شەستی کۆچ) یەزید ئامادە نەبوو. زوحاك کوڕی

قەیسی فەهری (سەرکردەی پاسەوانەکانی) و موسلیم کوڕی عوقەبەی موڕی بانگ کرد و وەسیەتی بۆ کردن. وتی: یەزید لەوەسیەتەکەی من ئاگادار بکەنەوە و پێی بڵێن گرنگی بەخەڵکی حیجاز بدات چوونکە ڕەگ و ڕیشەی تۆن و هەرکەس لەوان هاتە لای تۆ، ڕێزی بگرە و هەرکەس نەهات، بەڕێزەوە سەیری بکە. گرنگی بەخەڵکی عێراق بدە و ئەگەر هەموو ڕۆژێك داوایان لێکردی کارگوزارەکەیان بگۆڕیت، ئەو کارە بکە چوونکە بەبۆچوونی من لابردنی کارگوزارێك باشترە لەوەی سەد هەزار شمشێر دژی تۆ بەرز ببێتەوە. گرنگی بەخەڵکی شام بدە چوونکە کەسانی نزیك و تایبەتی تۆن، ئەگەر ڕووبەڕووی دوژمن بوویتەوە، داوای هاوکاری لەوان بکە و کاتێك دوژمنت لەناو برد، خەڵکی شام بۆ سەرزەمینەکەی خۆیان بگەڕێنەرەوە چوونکە ئەگەر لەدیارێك جگە دیاری خۆیان نیشتەجێبن، خوو و عادەتی ئەوان دەگرن. لەقوڕەیشییەکان ناترسم جگە لەسێ کەس: حسەین کوڕی عەلی و عەبدوڵڵە کوڕی عومەر و عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر. کوڕی عومەر پیاوێکە خواپەرەستی لەپێی خستووە، حسەین کوڕی عەلی پیاوێکی کەم مەترسییە و هیوادارم خواوەند بەدەستی ئەو کەسانەی باوکیان کوشت و براکەیان بەتەنیا جێهێشت، لەناوی ببات، ڕەچەڵەکی لەپێشترە و مافی گەورەتر و لە پێغەمبەر (د.خ) نزیکترە. گومان دەکەم خەڵکی عێراق ئەو بەشۆڕش ناچار دەکەن. ئەگەر بەسەر حسەیندا سەرکەوتیت، بیبەخشە چوونکە ئەگەر من بم دەیبەخشم. کوڕی زوبەیر فێڵبازە و ئەگەر بەقینەوە مەبەستی هێرشکردنەسەر تۆی کرد، هێرشی بکەسەر مەگەر ئەوەی ئاڵای ئاشتی بەرز بکاتەوە. تا ئەو جێگەی دەتوانی خوێنی خەڵکان بپارێزە.

لەم ساڵەدا معاویە کوڕی ئەبوسوفیان لەدیمەشق مرد. سەبارەت بەکاتی مردنی ئەو بۆچوونەکان جیاوازە بەڵام هەمووان لەسەر ئەوە کۆکن کە لەساڵی شەست و لەمانگی ڕەجەب مردووە.

واقدی دەڵێت: معاویە لەنیوەی مانگی ڕەجەب مرد.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: ڕۆژی پێنج شەممە، هەشت ڕۆژ بۆ کۆتایی مانگی ڕەجەب مرد.

## ساڵەکانی فەرمانڕەوایەتی معاویە

باوکی مەعشەر دەڵێت: لەئەزرەح بەیعەتیان لەگەڵ معاویە بەست. حەسەن کوڕی عەلی لەجومادی ئەلئەوەلی ساڵی چل و یەك بەیعەتی لەگەڵ بەست. ئەو لەڕەجەبی ساڵی شەست مرد. ماوەی خەلافەتی معاویە نۆزدە ساڵ و سێ مانگ بوو.

سەعید کوڕی دیناری سەعدی دەڵێت: معاویە شەوی پێنجشەممە، نیوەی ڕەجەبی ساڵی شەست مرد و ماوەی خەلافەتی نۆزدە ساڵ و سێ مانگ و بیست و حەوت ڕۆژ درێژەی کێشا.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: خەڵکی شام لەساڵی سی و حەوت، مانگی زیقەعدە، لەکاتی جیابوونەوەی حەکەمەکان (داوەرەکان) بەیعەتیان لەگەڵ معاویە بەست. پێشتر بەیعەتیان لەگەڵ بەستبوو تا تۆڵەی خوێنی عوسمان کوڕی عەففان وەربگرێت. دواتر لەساڵی چل و یەك و پێنج ڕۆژ بۆ کۆتایی مانگی ڕەبیع ئەلئەوەل حەسەن کوڕی عەلی بەیعەتی لەگەڵ بەست و کاروبارەکانی بەو سپارد و خەڵکان بەگشتی بەیعەتیان لەگەڵ بەست و بەم ساڵە دەڵێن ساڵی (جەماعەت).

مەرگی معاویە لەساڵی شەستی کۆچ، ڕۆژی پێنجشەممە، هەشت ڕۆژ بۆ کۆتایی مانگی ڕەجەب و لەدیمەشق ڕوویدا. ماوەی خەلافەتەکەی نۆزدە ساڵ و دوو مانگ و سێ ڕۆژ بوو.

هوشام کوڕی محەممەد دەڵێت: لەجومادی ئەلئەوەلی ساڵی چل و یەك وەك خەلیفە بەیعەتیان لەگەڵ معاویە بەست. ماوەی خەلافەتی ئەو نۆزدە ساڵ و سێ مانگ، چەند ڕۆژ کەمتر بوو. معاویە لەیەکی ڕەجەبی ساڵی شەستی کۆچ مرد.

سەبارەت بەماوەی تەمەنی معاویە بۆچوونەکان جیاوازە: دەستەیەك وتوویانە لەکاتی مەرگ، حەفتا و دوو ساڵ تەمەنی بوو.

کوڕی شەهابی زوهری دەڵێت: وەلید سەبارەت بەتەمەنی خەلیفەکان پرسیاری لێکردم، وتم: معاویە لەکاتی مەرگ حەفتا و پێنج ساڵە بوو.

وەلید وتی: تەمەن یانی ئەوە.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: کاتێك معاویە مرد، حەفتا و سێ ساڵ بوو و بەوتەیەك هەشتا ساڵ و بەوتەیەك حەفتا و هەشت ساڵ بوو.

عەبدولمەلیك کوڕی عومەیر دەڵێت: کاتێك نەخۆشییەکەی معاویە تەشەنەی کرد و خەڵك وتیان پیاو نییە، بەکەسەکانی خۆی وت: چاوەکانم پڕکەن لەکل و سەرم چەور بکەن.

دەڵێت: ئەو کارەیان کرد و ڕوخساری ئەویان بەڕۆن چەور کرد. دواتر نشینگەیەکیان بۆ ئامادە کرد، وتی: بەدانیشتنانەوە دامنێن. دواتر وتی: مۆڵەتی هاتنەژوور بەخەڵکان بدەن. دەبێت هەموویان بەپێوە بێستن و کەس دانەنیشێت.

یەکێك هات و بەپێوە سلاوی کرد. بینی کلی کردۆتە چاوی و ڕۆنی لەخۆی داوە و بەخۆی دەوت: خەڵك دەڵێن لەسەرەمەرگدایە، بەلام لەهەمووان ساغترە.

کاتێك خەڵکان ڕۆشتن، هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( لای سەرکۆنەکەران، خۆم دەپارێزم

تا بزانن لەکارەساتەکانی ڕۆژگار خۆم نادزمەوە

بەلام کاتێك مەرگ چەنگاڵەکانی خۆی تیژ بکات

دەردەکەوێت کەهیچ شتێك سوودی نابێت)).

خوێن لەسنگییەوە دەهاتەدەر و هەمانڕۆژ مرد.

عەبدولمەلیك کوڕی میناسی کەلبی دەڵێت: معاویە لەسەرە مەرگ بەدوو کچەکەی (کە لەسەر تەختەکەی ئەمبارەوباریان پێدەکرد) وت: کەسێك دەسووڕێنن کەساتێك پشووی نەدا و سامانی دنیای کۆکردەوە، ئەگەر نەچێتە جەهەننەم. هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( بۆ ئێوە هەوڵمدا و ڕەنجم برد

و لەسەرگەردانی و سەفەر بێ نیازم کردن)).

عەبدولعەلی کوڕی مەیمون دەڵێت: معاویە لەکاتی نەخۆشییەکەی وتی: پێغەمبەر (د.خ) کراسێکی پێدام کە لەبەرم نەکرد، ڕۆژێك نینۆکی دەکرد و وردە نینۆکەکانی ئەوم کۆکردەوە و خستمە ناو قاپێك. کاتێك مردم، ئەو کراسەم لەبەر بکەن و وردە نینۆکەکان بکوتن و بیهاڕن و بیکەنە ناو چاو و دەمم، ئەگەری هەیە

بەو هۆیەوە خواوەند لێم خۆش بێت.

یەکێك لەکچەکانی وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، خواوەند دەتپارێزێت و ئەو ئەم هۆنراوەی خوێندەوە:

(( کاتێك مەرگ نزیك بێتەوە

دەردەکەوێت کەهیچ تویشووێك سوودی نییە))

دەڵێت: ئەوسا لەهۆش چوو و کاتێك هۆشی هاتەوە، بەکەسانی دەوروبەری خۆی وت: لەخواوەند بترسن چوونکە خواوەند ئەو کەسە دەپارێزێت کەلێی دەترسێت و هەرکەس لەخوا نەترسێت، پارێزراو نییە. دوای ئەمە مرد.

محەممەد کوڕی حەکەم دەڵێت: کاتێك مەرگ بەرۆکی معاویەی گرت، وەسیەتی کرد نیوەی سامانەکەی بدەن بەخەزێنەی گشتی وەك بڵێی دەیویست خۆی پاك بکاتەوە لەبەر ئەوەی عومەر کوڕی خەتاب سامانی کارگوزارەکانی خۆی دابەش دەکرد.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: زوحاك کوڕی قەیسی فەهری نوێژی لەسەر معاویە خوێند چوونکە لەکاتی مردنی، یەزید ئامادە نەبوو.

عەبدولمەلیك کوڕی نەوفل دەڵێت: کاتێك معاویە مرد، زوحاك کوڕی قەیس هات و ڕۆشتە سەر مینبەر. کفنەکانی معاویەی بەدەستەوە بوو، سپاسی خواوەندی کرد و وتی: معاویە کەسی دیاری عەرەبەکان و هێزەی عەرەب بوو. خواوەند لەسەر دەستی ئەو فیتنە و ئاژاوەی لەناو برد و ئەوی کردە فەرمانڕەوای بەندەکانی خۆی و لەسەر دەستی ئەو ویلایەتەکان دەستیان بەسەردا گیرا بەلاّم ئەو مرد و ئەمە کفنەکانی ئەوە کەتێوەی دەپێچین و بەخاکی دەسپێرین و لەگەڵ کردەوەکانی بەجێیدێڵین، دوای ئەوە بەرزەخە تا ڕۆژی پسلاّن، هەرکەس دەیەوێت ئامادە بێت، لەکاتی نوێژی نیوەڕۆ بێت.

دەڵێت: کەسێکی بۆ لای یەزید نارد و لەنەخۆشی معاویە ئاگاداری کردەوە و یەزید هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((پەیك بەخێرایی نامەیەکی هێنا

کە دڵ لەنامەکەی کەوتە خورپە

وتم: هاوار لەتۆ، چی لەنامەکەدایە؟

وتی: خەلیفە لەجێگەدا کەوتووە و نەخۆشە

زەوی لەرزی یا خەریك بوو بلەرزێت

دەتوت خاکی لێڵ لەکۆڵەکەکانی جیابۆتەوە

هەرکەس گیانی بەشەرەفەوە پێبەند بێت

ترسی ئەوەی هەیە کلیلی گیانی بکەوێت

کاتێك گەیشتین دەرگای ماڵەوە بەسترابوو

و دڵ لەناڵەی ڕەمڵە ترسا و شکا)).

خولەید کوڕی عەجەلان، کۆیلەی عیباد دەڵێت: کاتێك معاویە مرد، یەزید لەحەوارین بوو. بەنامە لەنەخۆشی معاویە ئاگاداریان کردبوویەوە، بەڵام کاتێك گەیشت، معاویە بەخاك سپێردرابوو. ڕۆشتە سەر قەبرەکەی، نوێژی کرد و پاڕایەوە. دواتر ڕۆشتە ماڵەوە و ئەو هۆنراوەی نووسی (مەبەست ئەو هۆنراوەی سەرەوەیە).

معاویە کوڕی ئەبوسوفیان بوو. ناوی ئەبوسوفیان سەخرە کوڕی حەرب کەرەچەڵەکی دەگاتەوە بەقوسەی کوڕی کەلاب. دایکی، هیند کچی عوتبە کوڕی ڕەبیعە بوو. نازناوەکەی باوکی عەبدولڕەحمانە.

لەژنەکانی معاویە: مەیسون کچی بەجدەل بوو لەتایەفەی کەلب کەیەزید لەو ژنە چاوی بەدنیا هەڵهێنا و کچێك بەناوی (رب المشارق) کە لەمناڵیدا مرد. هوشام ناوی ئەم کچەی لەڕیزی مناڵەکانی معاویە ناو نەبردووە.

یەکێکی دیکە لەژنەکانی فاختە کچی قورزە کوڕی عەبد عەمرۆ کوڕی نەوفل بوو کەعەبدولڕەحمان و عەبدوڵڵەی بۆ هێنایە دنیا. عەبدوڵڵە ئەحمەق و ڕیسوا و نازناوی ئەبولخەیریان پێبەخشیبوو.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: ڕۆژێك عەبدوڵڵە کوڕی معاویە لای ئاشەوانێك تێپەڕی کەئێسترەکەی بەئاشەکەوە بەستبوویەوە و چەندین زەنگۆڵەی بەگەردنییەوە هەڵواسیبوو، پێی وت: بۆ ئەم زەنگۆڵانەت بەگەردنی ئێسترەکەتەوە هەڵواسیوە؟

ئاشەوان وتی: هەڵمواسیوە تا ئەگەر وەستا و ئاشەکە لەکار کەوت، ئاگادار بیمەوە.

وتی: ئەگەر بێستێت و سەری تەکان بدات چۆن دەزانی کەئاشەکە ناگێڕێت؟

ئاشەوان وتی: خواوەند ئەمیر ببەخشێت، ئاوزی ئێسترەکەی من وەك ئاوزی ئەمیر نییە.

عەبدولڕەحمان لەتەمەنی منداڵیدا مرد.

یەکێکی دیکە لەژنەکانی ئەو نایلە کوڕی عەمارە لەتایفەی کەلب بوو.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: کاتێك معاویە لەگەڵ نایلە پەیوەندی هاوسەرگیری بەست، بەمەیسونی وت: بڕۆ و کچە مامەکەت ببینە.

کاتێك ئەوی بینی، پرسی: کچە مامەکەت چۆن بوو؟

وتی: جوانە، بەڵام ژێر ناوکی بەتاڵە، سەری هاوسەرەکەی لەسەر دامێنی بەجێدێڵێت.

دەڵێت: معاویە، نایلەی تەڵاقدا و حەبیب کوڕی مەسلیمەی فەهری ئەوی کردە هاوسەری خۆی.

دوای حەبیب، نەعمان کوڕی بوشری ئەنساری ئەوی کردە هاوسەر. حەبیب کوژرا و سەری ئەویان خستە داوێنی نایلە.

یەکێکی دیکە لەژنەکانی معاویە، کتوە کچی قورەزە خوشکی فاختە بوو کەکاتێك بۆ جەنگی قوبرس ڕۆشت، هاوڕێیەتی دەکرد و لەوێ مرد.

## کردار و هەڵسوکەوتەکانی معاویە

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: کاتێك بەیعەتیان لەگەڵ معاویە بەست، قەیس کوڕی حەمزەی هەمەدانی وەك سەرکردەی پاسەوانەکانی دیاریکرد، دواتر ئەوی لابرد و زەمیل کوڕی عەمرۆ عوزری و بەوتەیەك سەکسەکی لەجێگەی ئەو دانا. دەبیر و بەڕێوەبەری کارەکانی، سەرجون کوڕی مەنسوری ڕۆمی بوو. سەرکردەی ئێشکچییەکانی یەکێك لەکۆیلەکان بوو بەناوی موختار و بەوتەیەك پیاوێك بوو بەناوی مالیك و موالی هۆزی حومەیر.

معاویە یەکەم کەس بوو ئێشکچی دانا. سالاری پەردەدارەکانی، سەعدی کۆیلەی بوو. کاروباری دادی بەفەزالە کوڕی عوبەیدی ئەنساری سپاردبوو و کاتێك ئەو مرد، باوکی ئیدریس عائیز ئەللە کوڕی عەبدوڵڵە خەولانی بۆ ئەو کارە ڕاسپارد.

دەڵێن: دیوانی خاتەمی معاویە بەعەبدوڵڵە کوڕی موحسینی حومەیری سپێردرابوو. معاویە یەکەم کەسە دیوانی خاتەمی هەیە و هۆکارەکەی ئەوەیە کەوتبووی سەد هەزار درهەم بۆ هاوکاری و دانی قەرزەکان بەعەمرۆ کوڕی زوبەیر بدەن و لەمبارەوە نامەیەکی بۆ زیاد کوڕی سومەییە نووسی کەفەرمانڕەوای عێراق بوو. بەڵام عەمرۆ کوڕی زوبەیر نامەکەی کردەوە و بڕی پارەکەی لەسەد هەزارەوە بۆ دووسەد هەزار گۆڕی و کاتێك زیاد حسابەکەی خۆی ڕەوانە کرد، معاویە ڕازی نەبوو و عەمرۆی بەگەڕاندنەوەی پارەکە ناچار و دواتر زیندانی کرد تا عەبدوڵڵەی برای پارەکەی بۆ بداتەوە. بەمپێیە معاویە دیوانی خاتەم و مۆر کردنی نامەکانی هێنایە ئاراوە. پێشتر نامەکان مۆر نەدەکران و نەدەبەستران.

سەعیدی مەقبەری دەڵێت: عومەر وتی: باسی خوسرەو و قەیسەر و دوورئەندێشی ئەوان دەکەن لەکاتێکدا معاویەتان هەیە.

فەلیح دەڵێت: بیستم کەعەمرۆ کوڕی عاس هاتە لای معاویە. خەڵکانی میسریش هاوڕێیەتیان دەکرد. عەمرۆ پێی وتن: کاتێك ڕۆشتنە لای کوڕی هیند وەك خەلیفە سڵاوی لێ مەکەن چوونکە بەمکارە ئێوە لای گەورە و ڕێزدار دەبن و تا ئەو جێگەی دەتوانن بچووکی بکەن.

دەڵێت: کاتێك ڕۆشتنە لای، معاویە بەپەردەدارەکانی خۆی وت: ئەم کوڕی خراپەکارە، منی لای خەڵکان بەبچووك و کەم نیشانداوە، کاتێك نێردراوان هاتنە لای من بەخراپترین شێوە بیانڕەجێنن تا هەرکەس لەوان گەیشتە لای من، هەست بەمەترسی لەناوچوون بکات.

دەڵێت: یەکەم کەس کەڕۆشتە لای کەسێك لەخەڵکی میسر بەناوی کوڕی خەیات بوو کە لەکاتی هاتن ئازاریان دابوو، وتی: سڵاو لەتۆ ئەی پێغەمبەری خوا.

دەڵێت: هەمووان ئەو کارەیان کرد و کاتێک ڕۆشتنەدەر، عەمرۆ وتی: خوا بەنەحلەتتان بکات، وتم وەك خەلیفە سڵاوی لێمەکەن بەلاّم ئێوە وەك پێغەمبەر سڵاوتان لێکرد.

دەڵێت: ڕۆژێك معاویە دەستارە حەرقانییەکەی کردەسەر و سورمەی لەچاویدا. کاتێك ئەم کارەی دەکرد، لەهەمووان جوانتر بەرچاو دەکەوت.

باوکی محەممەدی ئومەوی دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب هاتە شام و چاوی بەمعاویە کەوت کە لەگەڵ تاقمێکدا هات و شەویش لەگەڵ تاقمێکی دیکە و بەشێوەیەکی دیکەهات. عومەر پێی وت: ئەی معاویە، شەو لەگەڵ تاقمێك و بەجۆرێك دێت و بەیانی بەجۆرێکی دیکە، بیستوومە بەیانیان خەوتوویت و نیازمەندان بەتۆ لەبەردەرگاکەتن؟

وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، دوژمن نزیکە و سیخوڕ و هەواڵنێریان هەیە، ویستم گەورەیی و ڕێزی ئیسلام ببینن.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: ئەمە فریوی پیاوێکی بیرمەندە یا فێڵی پیاوێکی زانا.

معاویە وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران هەرچی فەرمان دەدەیت، ئەنجامی دەدەم.

وتی: هاوار لەتۆ! باسی هەرچیم کرد و ڕەخنەم لەهەرچی گرت، کارێکت کرد کەنازانم فەرمان بدەم یا ڕێگریت لێ بکەم.

جەعفەر کوڕی یەرەقان دەڵێت: موغەیرە نامەی بۆ معاویە نووسی:

((ساڵەکانی تەمەنم زیادی کردووە و ئێسقانەکانم لاواز و قوڕەیشییەکان بوونەتە دوژمنم، ئەگەر دەخوازیت من لەسەر کار لاببەیت، ئەو کارە بکە)).

دەڵێت: معاویە نووسی:

(( نامەکەت گەیشت کەنووسیبووت ساڵەکانی تەمەنت زیادی کردووە،، سوێند بەخوا کەسی دیکە تەمەنی تۆی بەسەر نەبردووە. وتووتە قوڕەیشییەکان بوونەتە دوژمنت، سوێند بەخوا هەرچاکەیەکت بینیوە، لەوانەوە بووە، داوات لەمن کردووە لەکاروبارەکان دوورت بخەمەوە کەکردم، ئەگەر ڕاست بکەیت، بەمەبەستەکەت

گەشتوویت، ئەگەر فێڵت کردبێت، فێڵم لێکردوویت)).

عەلی کوڕی موجاهید دەڵێت: معاویە وتبووی: ئومەوی ئەگەر سامانەکانی خۆی ڕێکنەخات و خۆڕاگر نەبێت، ئومەوی نییە و هاشمی ئەگەر دەستبلاو و بەخشندە نەبێت، هاشمی نییە. لەزمان پاراوی و بەخشندەیی و ئازایەتی، ناتوانرێت پێش هاشمییەکان بکەوین.

خالید کوڕی عوبەید دەڵێت: ڕۆژێك معاویە لەسەر سفرە دانیشت. عوبەیدڵڵە کوڕی ئەبی بەکرەیشی لێبوو و کوڕەکەی( بەشیر، و بەوتەیەك کوڕێکی دیکەی) هاوڕێیەتی دەکرد کەزۆری خوارد و معاویە سەیری دەکرد. عوبەیدڵڵە هەستی پێکرد و ویستی ئیشارەیەك لەکوڕەکەی بکات بەڵام سەری بەرز نەکردەوە تا خواردنەکەی تەواو کرد.

دەڵێت: کاتێك ڕۆشتەدەر، بۆ ئەو کارەی، سەرکۆنەی کوڕەکەی کرد. جارێکی دیکە هاتە لای معاویە بەڵام کوڕەکەی لەگەڵدا نەبوو. معاویە وتی: کوڕە ورگ دڕاوەکەت چی بەسەرهات؟

وتی: نەخۆش کەوت.

وتی: دەمزانی زۆرخۆری نەخۆشی دەخات... .

جوێرییە کوڕی ئەسما دەڵێت: ئەبوموسا ڕۆشتە لای معاویە، کلاوێکی درێژی لەسەردا بوو و وتی: سلاو لەتۆ ئەی ئەمینی خواوەند.

معاویە وتی: سلاویش لەتۆ بێت.

دەڵێت: کاتێك ئەبوموسا ڕۆشت، معاویە وتی: ئەم پیرە پیاوە هاتووە بیکەمە کارگوزاری ویلایەتێك، بەڵام سوێند بەخوا ئەو کارە ناکەم.

باوکی بەردە دەڵێت: کاتێك معاویە دومەڵی لێهاتبوو، ڕۆشتمە لای، وتی: برازاکەم وەرە سەیرکە.

دەڵێت: کاتێك سەیرم کرد، دومەڵەکە دەمی کردبوویەوە، وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران نیگەران مەبە. دواتر یەزید هات. معاویە پێی وت: ئەگەر کاروباری خەڵکانت گرتەدەست، چاکە لەگەڵ ئەمە بکە چوونکە باوکی هاوڕێی من بوو- یا شتێکی لەم بابەتەی وت- بەڵام من لەجەنگ ئەزموون و شتی زۆرم بینیوە کەئەم

نەیدیوە.

یەزید کوڕی سوەید دەڵێت: معاویە مۆڵەتی سەردانی بەئەحنەف دا و پێش هەمووان مۆڵەتی بەو دەدا، دوای ئەو محەممەد کوڕی ئەشعەس هات و لەنێوان ئەو و ئەحنەفدا دانیشت. معاویە پێی وت: زووتر مۆڵەتم بەو نەدا کە تۆ نزیکتر لەمن دانیشیت، وەك کەسێك هەڵسوکەوت دەکات کەخۆی سووك و ڕیسوا دەکات. بەهەمانشێوە کەکاروباری ئێوەمان لەدەستدایە، مۆڵەتپێدانی ئێوەیشمان لەدەستدایە، کەواتە بەوشێوەیە هەڵسوکەوت بکەن کەئێمە دەخوازین چوونکە ئەمە بۆ ئێوە باشترە.

سەحیم کوڕی جەفس دەڵێت: ڕەبیعە کوڕی عەسەلی یەربوعی ڕۆشتە لای معاویە بۆ خوازبێنی.

معاویە وتی: سوەیقی پێ بدەن.[1]

دواتر معاویە پێی وت: ئەی ڕەبیعە، خەڵکی ئێوە چۆنن؟

وتی: چەندین دەستەن.

وتی: تۆ لەکامیانیت؟

وتی: کارم بەکاری ئەوان نییە.

معاویە وتی: گومان دەکەم زیاتر لەو دەستانە بن کەئاماژەت پێدا.

ئەوسا ڕەبیعە وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، دوانزە هەزار قەدی دار هاوکاری من بکە تا ماڵەکەم دروست بکەم.

معاویە وتی: ماڵەکەت لەکوێیە؟

وتی: لەبەسرە و لەئەزد و فەرسەخێك لەدوو فەرسەخ زیاترە.

معاویە وتی: ماڵەکەت لەبەسرەیە یا بەسرە لەماڵەکەت؟

دەڵێت: دواتر یەکێك لەمناڵەکانی ڕۆشتە لای کوڕی هوبەیرە و وتی: خواوەند تەندروستی بەئەمیر ببەخشێت، من کوڕی گەورەی خەڵکەکەی خۆمم، باوکم بۆ خوازبێنی ڕۆشتبووە لای معاویە.

کوڕی هوبەیرە بەسەلەم کوڕی قوتەیبەی وت: ئەمە چی دەڵێت؟

---

[1] سوەیق: ئاوی تێکەڵ بەئارد. ئەم قسەیان بۆ سووك کردنی کەسێك بەکار دەبرد (لەبرسانا وڕێنە دەکات)

وتی: ئەمە کوڕی ئەو کەسەیە کەنەزانی خەڵکەکەی بوو.

کوڕی هوبەیرە وتی: معاویە ژنی بەباوکتدا؟

وتی: نە.

وتی: کەواتە باوکت هیچی نەکردووە.

محەممەد کوڕی زەکوانی قورەشی دەڵێت: عوتەبە و عەنبەسە، کوڕەکانی ئەبوسوفیان مشتومڕیان بوو، دایکی عوتەبە هیند و دایکی عەنبەسە کچی باوکی ئەزیهری دوسی بوو. معاویە بەتوندی لەگەڵ عەنبەسە هەڵسوکەوتی کرد. عەنبەسە وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، تۆیش؟

وتی: ئەی عەنبەسە، عوتەبە کوڕی هیندە.

عەنبەسە هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( لەچاکە نزیك بووم و ئاشتی لەنێوانماندا

بەڵام هیند جیابوونەوەی لەنێوان ئێمەدا دروست کرد

ئەگەر هیند منی نەهێناوەتە دنیا

لەژنێکی سەربڵند لەدایك بووم

کەگەورە و ناودارەکان پەروەردەیان کردووە

باوکی لەهەر زستانێك باوکی میوانەکانە

و پەناگەی لاوازەکان کە دەست لەهەوڵدان هەڵناگرێت

سینییەکانی ئەو بەردەوام بۆ خەڵکانی تەهامە و نەجد ئامادەیە)).

معاویە وتی: چیتر بەمشێوەیە هەڵسوکەوتت لەگەڵ ناکەم.

حەرمەلە کوڕی عیمران دەڵێت: شەوێك معاویەیان ئاگادار کردەوە کەقەیسەر و سوپاکەی مەبەستی هێرشکردنیان هەیە و ناتل کوڕی قەیسی جوزامی دەستی بەسەر فەلەستیندا گرتووە و خەزێنەی ئەو سەرزەمینە ئێستا لەبەردەستی ئەودایە و ئەو میسرییانەی لەزینداندا بوون، هەڵاتوون و عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەیەوێت لەگەڵ سوپاکەی هێرشی بکاتەسەر.

دەڵێت: معاویە بەبانگبێژەکەی وت: ئێستاکە بانگ بدە. هێشتا نیوە شەو بوو.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی عاس هات و وتی: بۆ کەست بەدوای مندا ناردووە؟

وتی: من کەسم بەدوای تۆدا نەناردووە.

وتی: بانگی ئەم بانگبێژە لەم کاتەدا بۆ بانگێشتکردنی من بوو.

وتی: لەچوار کەوانەوە تیریان بۆ هاویشتووم.

عەمرۆ وتی: ئەوانەی لەزیندانەکانی تۆ هەڵاتوون، لەئێستادا لەزیندانی خواوەندن، ئەوان خەڵکانێکن لەگیانی خۆیان خۆشبوون و دوور ناکەونەوە. فەرمان بدە هەرکەس سەری یەکێك لەوان بێنێت، خوێنبایيەکەی وەردەگرێت چوونکە هەموویان دێنن. ڕێگەی ئاشتی لەگەڵ قەیسەر بگرەبەر و بڕێك سامان و بەشێك لەحیللەکانی میسری پێبدە چوونکە لەتۆ ڕازی دەبێت. لێکۆڵینەوە لەکاری ناتل کوڕی قەیس بکە چوونکە سوێند بەگیانی خۆم لەبەر دین شۆڕشی نەکردووە و مەبەستی تەنیا ئەوە بووە کەبەدەستی هێناوە. نامەی بۆ بنووسە و ئەوەی گرتوویەتی، پێی ببەخشە و پیرۆزبایی لێبکە. ئەگەر بەردەستت کەوت چ باشتر و گەرنە خەم مەخۆ و هێزی خۆت بۆ کەسێك بەکار ببە کەدوژمنی خوێنی کوڕە مامەکەی تۆیە.

دەڵێت: هەموو زیندانییەکان لەزیندان هەڵاتبوون جگە لە ئەبرەهە ئەلسەباح.

معاویە بەئەبرەهەی وت: تۆ بۆ لەگەڵ هاورێکانت نەڕۆشتیت؟

وتی: دوژمنایەتی عەلی یا هاورێیەتی تۆ نەبووە لەمپەر لەڕۆشتنی من، بەڵام ناتوانم بڕۆم.

دەڵێت: معاویە ئازادی کرد.

عەبدوڵڵە کوڕی مەسعەدەی فەزاری دەڵێت: معاویە لەیەکێك لەویلایەتەکانی شام دابەزی و لەسەر لێواری بانێك لەسەر ڕێگە، فەرشێکیان بۆ ڕاخست. مۆڵەتی بەمندا و لەگەڵی دانیشتم. کاروانەکان و بارەکان وئەسپەکان لەوێوە تێدپەڕین. وتی: ئەی کوڕی مەسعەدە، خواوەند لەئەبوبەکر خۆش بێت، خوازیاری دنیا نەبوو، دنیایش ئەوی نەویست. بەڵام عومەر - یا وتی کوڕی حەنتەمە- دنیا ئەوی ویست بەڵام ئەو دنیای نەویست، عوسمان کەڵکی لەدنیا برد و دنیایش کەڵکی لەو برد. بەڵام ئێمە لەدنیادا نوقم بووین.

دەڵێت: وەك بڵێی لەم قسەی پەشیمان بوویەوە کەوتی: سوێند بەخوا ئەمە

پاشایەتییەکە خواوەند بەئێمەی بەخشیوە.

عەلی کوڕی عوبەیدللە دەڵێت: عەمرۆ کوڕی عاس نامەی بۆ معاویە نووسی و داوای کرد کارگوزاری میسر کە بەوی بەخشیبوو، بەکوڕەکەیشی ببەخشێت.

معاویە وتی: باوکی عەبدوللە مەبەستەکەی نووسیوە و هەڵیت و پلیتی نووسیوە. شایەت بن ئەگەر دوای ئەو زیندووبووم، فەرمانەکەی هەڵدەوەشێنمەوە.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی عاس دەیوت: هەرکات معاویەم دەبینی کەقاچی خستۆتە سەرقاچی و چاو بەستراو بەکەسێك دەڵێت (بلێ) بەزەییم پیایدا دەهاتەوە.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: عەمرۆ کوڕی عاس بەمعاویەی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، مەگەر من لەهەموو خەڵکان زیاتر چاکەی تۆم ناوێت؟

وتی: هەرچیت هەیە، لەوەت هەیە.

جویریە کوڕی ئەسما دەڵێت: بوسر کوڕی باوکی ئەرتات لای معاویە خراپەی عەلی هێنایە سەرزمان. زەید کوڕی عومەر کوڕی خەتاب دانیشتبوو، بەداردەستەکەی لێیدا و برینداری کرد. معاویە بەزەیدی وت: لەیەکێك لەپیرەکانی قوڕەیشتدا کەسەروەری خەڵکی شامە. دواتر ڕوویکردە بوسر و وتی: خراپەی عەلی دەڵێیت کەباوەگەورێی ئەوە و کوڕی فاروق لێرەیە، گومان دەکەیت ئەو بەمە ڕازی دەبێت؟ دواتر ڕەزامەندی هەردووکیانی بەدەستهێنا.

دەڵێت: معاویە دەیوت: خۆم بەگەورەتر لەوە دەزانم کەهەڵەیەك گەورەتر لەبەخششی من بێت، یا خراپەیەك زیاتر لەچاکەی من بێت، یا نەزانییەك فراوانتر لەخۆڕاگری من بێت.

دەڵێت: معاویە دەیوت: هۆکاری ڕازاندنەوەی پیاوانی شەریف، داوێنپاکییە.

دەڵێت: دەیوت: هیچ شتێکم بەئەندازەی کانییەکی هەڵقولاو لەسەر زەوییەکی نەرم خۆش ناوێت.

عەمرۆ کوڕی عاس وتی: لەهەموو شتێك زیاتر حەز دەکەم بەیەکێك لەبێهۆشکەرەکانی عەرەب، بڕۆمە ناو پەردەی بووکێنییەوە.

وەردان کۆیلەکەی عەمرۆ کوڕی عاس دەیوت: هیچ شتێکم بەئەندازەی بەخشش بەهاوڕێکانم پێخۆش نییە.

معاویە وتی: من بۆ ئەم کارە لەتۆ شیاوترم.

وتی: ئەوەی حەزی پێدەکەیت، ئەنجامی بدە.

محەممەد کوڕی ئیبراهیم لەباوکی دەگێڕێتەوە: کارگوزاری مەدینە کاتێک دەیویست کەسێك بۆ لای معاویە بنێرێت، بەجارچییەکەی خۆی دەوت تا جار بدات بۆ ئەوەی هەرکەس نیازێکی لای سەروەری باوەڕدارانە، بێت و بینووسێت.

دەڵێت: زەر کوڕی حەبیش یا ئەیمەن کوڕی حەریەم، نامەیەکی بچووکی نووسی و خستیە ناو نامەکان کەهۆنراوەیەکی تیا نووسرابوو بەم ناوەڕۆکە:

(( کاتێك پیاوان منداڵەکانیان هێنایە دنیا

و بازوویان لەبەر پیری لاواز بوو

و نەخۆشییەکان بەسەریاندا زاڵ بوو

هاوشێوەی کێڵگەن

کەکاتی دروێنە کردنیان هاتووە)).

دەڵێت: کاتێك نامەکان گەیشتنە لای معاویە و ئەم نامەی خوێندەوە، وتی: باسی مەرگی من دەکەن.

دەڵێت: معاویە دەیوت: هیچ شتێك بۆ من خۆشتر نییە لەوەی بەسەر توڕەیی خۆمدا زاڵ ببم.

دەڵێت: معاویە بەعەبدولڕەحمان کوڕی حەکەم کوڕی باوکی عاسی وت: برازاکەم، تۆ هۆنراوە دەڵێیت، ئاگادار بە غەزەڵ بۆ ژنان نەڵێیت چوونکە ژنانی شەریف و داوێنپاك دەڕەنجێنیت یا هەجوو بکەیت و ڕێزدارێك دڵگران کەیت و ڕیسوایەك بەرز بکەیتەوە، یا وەسف بکەیت کەتەماحی پیاوی قێزەونە، باسی شانازییەکانی خەڵکەکەی خۆت و مۆجیاری بکە تا پێگەی خۆت بەرز بکەیتەوە و ئەدەب فێری کەسانی دیکە بکەیت.

باوکی حەسەن کوڕی حیماد دەڵێت: معاویە چاوی بەسەما کەوت کەعابای لەبەردابوو و ڕیسوای کرد.

وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەوە عابا نییە لەگەڵ تۆ دەپەیڤێت، ئەوەی لەناو عاباکەیە، قسە لەگەڵ تۆ دەکات.

سلێمان دەڵێت: معاویە وتی: دووکەس هەیە ئەگەر بمرن، نەمردوون و کەسێک هەیە ئەگەر بمرێت، مردووە، من ئەگەر بمرم، کوڕەکەم جێگەم دەگرێتەوە، سەعید ئەگەر بمرێت، عەمرۆ جێگەی دەگرێتەوە، بەڵام عەبدوڵڵە کوڕی عامر ئەگەر بمرێت، مردووە.

دەڵێت: ئەم قسە بەمەروان گەیشتەوە و وتی: باسی عەبدولمەلیکی کوڕی منی نەکرد؟

وتی: نە.

وتی: حەز ناکەم لەجیاتی کوڕەکەم، هەردوو کوڕەکەی ئەوانم هەبێت.

عەبدوڵڵە کوڕی ساڵح دەڵێت: کەسێک بەمعاویەی وت: چ کەسێکت زیاتر لەهەمووان خۆش دەوێت؟

وتی: ئەو کەسەی زیاتر لەهەمووان ڕێزی خەڵک بگرێت.

دەڵێت: معاویە دەیوت: ئاوز و خۆڕاگری باشترین لەپێشی پیاوە چوونکە کاتێک ئاگاداری بکەنەوە، لەگوێی دەگرێت و کاتێک شتێکی پێدەبەخشن، سپاس دەکات و کاتێک گرفتار بێت، خۆڕاگری دەکاتە پیشە و کاتێک تووڕە دەبێت، خۆی دەخواتەوە و کاتێک خراپە دەکات، تۆبە دەکات و کاتێک بەڵێن بدات، ئەنجامی دەدات.

عەبدولمەلیک کوڕی عومەیر دەڵێت: یەکێک بەتوندی قسەی لەگەڵ معاویە کرد و زۆری وت: وتیان: بەمە ڕازی دەبیت؟

وتی: تا ئەو کاتەی لەنێوان ئێمە و خەڵکی شام نەبنە لەمپەر، لەنێوان ئەوان و زمانیان نابمە لەمپەر.

محەممەد کوڕی عامر دەڵێت: معاویە، عەبدوڵڵە کوڕی جەعفەری سەرکۆنە کرد چوونکە شەیدای ئاواز بوو. ڕۆژێک ڕۆشتە لای معاویە و بەدیحیش هاوڕێیەتی دەکرد. معاویە قاچی خستبووە سەر قاچی. عەبدوڵڵە بەبەدیحی وت: بەدیح بڵێ.

دەڵێت: بەدیح ئاوازی خوێند و معاویە قاچی خۆی تەکاندا.

عەبدوڵڵە وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران چی بوو.

وتی: ئازادە خوازیاری گۆرانی و بەزمە.

دەڵێت: عەبدوڵڵە کوڕی جەعفەر ڕۆشتە لای معاویە. سایب خاسر موالی مناڵەکانی لەیسی لەگەڵ خۆی هێنابوو کەپیاوێکی خراپەکار بوو. معاویە بە عەبدوڵڵەی وت: نیازەکانی خۆت بڵێ.

عەبدوڵڵە نیازەکانی خۆی وت کەیەکیان نیازی سایب بوو.

معاویە وتی: ئەمە کێیە؟

عەبدوڵڵە ناوەکەی وت.

معاویە وتی: با بێت.

دەڵێت: کاتێك لەبەر دەرگا وەستا، گۆرانییەکی خوێند.

معاویە وتی: دەنگ خۆش بوو و نیازەکانی بەراوەردە کرد.

هومام کوڕی مونەبە دەڵێت: بیستم کوڕی عەباس دەیوت: کەس وەك معاویە شیاوی پاشایەتی نەبوو چوونکە کەسێکی دەستبلاو بوو و وەك ئەمە (عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر) کورت بین نییە.

قەبیسە کوڕی جابری ئەسەدی دەیوت: باسی هاونشینەکانی خۆم دەکەم: هاونشینی عومەر کوڕی خەتاب بووم و کەسم لەو بەزاناتر و بیرمەندتر نەبینیوە. هاونشینی معاویە بووم و کەسم وەك ئەو نەرم و نیان نەبینیوە، ناخ و ڕواڵەتی یەك شت بوو. موغەیرەیش بەشێوەیەك بوو ئەگەر دەیانبردە شارێك کەهاتنەدەر لێی تەنیا بەفێڵ و فریو دەکرا، دەهاتەدەر.

### خەلافەتی یەزید کوڕی معاویە

لەم ساڵەدا بەیعەتیان لەگەڵ یەزید بەست. بەوتەیەك لەنیوەی ڕەجەب و بەوتەیەك هەشت ڕۆژ بۆ کۆتایی ئەو مانگە. بەهەمانشێوە کە لەکاتی ئاماژەدان بەمەرگی باوکی، باسمان کرد.

یەزید، عوبەیدڵڵە کوڕی زیادی وەك کارگوزاری بەسرە و نەعمان کوڕی بەشیری وەك کارگوزاری کوفە هێشتەوە.

باوکی میخنەف دەڵێت: یەزید لەیەکی ڕەجەبی ساڵی شەستی کۆچ، جڵەوی کاروبارەکانی گرتەدەست.

کارگوزاری مەدینە، وەلید کوڕی عوتەبە کوڕی ئەبی سوفیان بوو.

کارگوزاری کوفە نەعمان کوڕی بەشیری ئەنساری بوو.

کارگوزاری بەسرە، عوبەیدللە کوڕی زیاد بوو.

کارگوزاری مەککە، عەمرۆ کوڕی سەعید کوڕی عاس بوو.

کاتێك یەزید جڵەوی کاروبارەکانی گرتەدەست، بیری لەهیچ نەدەکردەوە جگە لەوەی بەیعەت لەو کەسانە وەربگرێت کەبەیعەتیان لەگەڵ نەبەستبوو. بۆ ئەم مەبەستە نامەی بۆ وەلید نووسی:

((بەناوی خواوەندی بەخشندە و میهرەبان

لەیەزید سەروەری باوەڕداران بۆ وەلید کوڕی عوتەبە. معاویە یەکێك لەبەندەکانی خودا بوو کەخواوەند ڕێزی گرت و کردی بەخەلیفە و دەسەڵات و هێزی پێبەخشی. ماوەی تەمەنی خۆی بەسەر برد و لەکاتی دیاریکراودا مرد. خوا بیبەخشێت، وەك کەسێکی چاکەکار ژیا و وەك کەسێکی چاکەکار مرد. والسلام)

دواتر لەلاپەرەیەکی بچووکدا وەك لەگوێچکەی مشك دەچوو، نووسی:

(( بەڵام دواتر، حسەین و عەبدوڵڵە کوڕی عومەر و عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر بۆ بەیعەت بەستن ناچار بکە تا بەیعەت ببەستن. والسلام))

دەڵێت: کاتێك هەواڵی مەرگی معاویە بەوەلید گەیشت، ترسا و بەڕووداوێکی گەورەی زانی. کەسی نارد و مەروانی بانگ کرد. بەوشێوە بوو کاتێك وەلید هاتبووە مەدینە، مەروان نابەدڵ ڕۆشتە لای و کاتێك وەلید ئەمەی بینی، بەئامادەبوونی کەسانی دیکە، جوێنی پێدا. کاتێك مەروان جوێنەکانی بیستەوە، چیتر نەڕۆشتە لای و خۆی بەدوور گرت تا ئەو کاتەی هەواڵی مەرگی معاویە گەیشت. لەبەر ئەوەی مەرگی معاویە و فەرمانی وەرگرتنی بەیعەت لەو کەسانەی بەدژوار دەزانی، پەنای بۆ مەروان برد و ئەوی بانگ کرد و کاتێك نامەکەی یەزیدی بۆ خوێندەوە، انالله ی وت و ڕەحمەتی بۆ نارد. دواتر وەلید سەبارەت بەم پرسە ڕاوێژی پێکرد و وتی: بەبۆچوونی تۆ دەبێت چی بکەم؟

وتی: بۆچوونی من ئەوەیە پێش ئەوەی ئەم کەسانە لەمەرگی معاویە ئاگادار

بینەوە، بانگیان بکەیت و پێشنیاری بەیعەت و فەرمانبرداریيان پێبکەیت. ئەگەر بەیعەتیان بەست، ڕازی بە و دەستیان لێهەڵبگرە و ئەگەر ڕازی نەبوون، بیانکوژە چوونکە ئەگەر لەمەرگی معاویە ئاگادار ببنەوە، هەرکام ڕوودەکاتە ناوچەیەك و شۆڕش دەکەن و دوژمنایەتی دەکەنە پیشە و خەڵکان لەدەوری خۆیان کۆدەکەنەوە. نازانم بەڵام کوڕی عومەر تامەزرۆی جەنگ نییە و بەجۆرێك حەزی لەخەلافەتە کەبێ خوێنرێژی و جەنگ بەدەستی بێنێت.

دەڵێت: وەلید، عەبدوڵڵە کوڕی عەمرۆ کوڕی عوسمانی (گەنجێکی تازەپێگەیشتوو بوو) بۆ لای حسەین و عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر نارد و ئەوانی بانگ کرد. لەکاتێکدا وەلید لەگەڵ کەس کۆنەدەبوویەوە و کەس نەدەڕۆشتە لای. وتی: ئەمیری داوای ئێوەی کردووە، بڕۆنە لای.

وتیان: بڕۆ، خۆمان دێین.

دواتر یەکیان ڕوویکردە ئەوی دیکە و عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر بەحسەینی وت: گومان بکە لەم کاتەدا کەدانانیشێت و کەس نابینێت، بۆچی ئێمەی بانگ کردووە؟

حسەین وتی: گومان دەکەم ستەمکاری گەورە لەناوچووبێت و ئێمەی بانگ کردووە تا پێش ئەوەی هەواڵەکە ئاشکرا ببێت، بەیعەتمان لێوەربگرێت.

عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر وتی: بۆچوونی منیش ئەوەیە، دەتەوێت چی بکەیت؟

وتی: کۆیلەکانم کۆدەکەمەوە و دەڕۆم و لەبەردەرگای وەلید دایاندەنێم و خۆم دەچمە ژوور.

وتی: کاتێك بڕۆیتەژوور، دەترسم بەڵایەکت بەسەر بێنێت.

وتی: کاتێك دەچمەلای کەتوانای بەرگری کردنم هەبێت.

دەڵێت: حسەین ڕۆشت و کۆیلەکان وکەسانی بنەماڵەکەی کۆکردەوە و ڕۆشت تا گەیشتە بەردەرگای ماڵی وەلید و بەهاوەڵانی خۆی وت: دەڕۆمە ژوور، ئەگەر بانگم کردن یا دەنگی بەرزی ئەوتان بیست، هەمووتان وەرنەژوور وەگەرنە لێرە بمێننەوە تا دەگەڕێمەوە.

دەڵێت: ڕۆشتە لای وەلید و هاوشێوەی ئەمیر سڵاوی لێکرد. مەروان لای ئەو دانیشتبوو.

دەڵێت: حسەین وەك ئەوەی هەستی بەمەرگی معاویە نەکردبێت، وتی: پەیوەست بوون باشترە لەجیابوونەوە. خواوەند چاکسازی لەناو ئێوەدا بێنێتە ئاراوە. بەڵام وەڵامیان نەدایەوە.

حسەین هات و دانیشت. وەلید نامەکەی یەزیدی پێدا کەخوێندییەوە. دواتر باسی مەرگی معاویە و پێشنیاری بەیعەتی پێکرد.

حسەین وتی: ((انا لله و انا الیه راجعون)). خواوەند معاویە ببەخشێت و پاداشتی چاکەی تۆ بداتەوە. ئەوەی پێشنیار دەکەیت، بەیعەت ببەستم، کەسێکی وەك من بەنهێنی بەیعەت نابەستێت، گومان ناکەم بەبەیعەتی نهێنی من بەسەندە بکەیت و دەبێت خەڵکان لێی ئاگادار بن.

وتی: بەڵێ.

وتی: کاتێك دێیتە ناو خەڵکان و پێشنیاری بەیعەتیان پێدەکەیت، پێشنیاریش بەئێمە بکە.

وەلید کەکەسێکی ئاشتیخواز بوو، وتی: بەناوی خوا بڕۆ تا لەگەڵ خەڵکان بگەڕێیتەوە،

مەروان وتی: ئەگەر ئەمە بڕوات و بەیعەت نەکات، هەرگیز دەرفەتێکی لەمشێوەت دەست ناکەوێت مەگەر ئەو کاتەی ژمارەی کوژراوانی ئێوە و ئەوان فراوان بێت. ئەم پیاوە بگرە و ڕێگە مەدە لێرە بڕوات تا بەیعەت دەبەستێت یا دەیکوژیت.

لەم کاتەدا حسەین هەستا و وتی: ئەی کوڕی ژنی چاوشین، تۆ من دەکوژیت یا ئەو؟ سوێند بەخوا ناڕاستت وت و هەڵەت کرد.

دەڵێت: حسەین هاتەدەر و لەگەڵ هاوەڵانی خۆی بۆ ماڵ گەڕایەوە.

مەروان بەوەلیدی وت: گوێت لەپێشنیارەکەی من نەگرت، سوێند بەخوا هەرگیز دەرفەتێکی لەوشێوەت دەست ناکەوێت.

وەلید وتی: ئەی مەروان، سەرکۆنەی کەسێکی دیکە بکە، کارێکی بۆ من هەڵبژارد بووە هۆی ئەوەی دینەکەم لەدەست بدەم، سوێند بەخوا حەز ناکەم هەموو دنیا مڵکی من بێت بەڵام حسەینم کوشتبێت. سوبحان الله، حسەین بکوژم

کەدەڵێت بەیعەت نابەستم. ئەو کەسەی بەهۆی خوێنی حسەینەوە لێکۆڵینەوەی لەگەڵ دەکەن، لای خواوەند کردەوەکانی هیچە.

مەروان پێیوت: ئەگەر بۆچوونی تۆ ئەوەیە، باشترین کارت ئەنجامدا. ئەمەی وت بەلاّم بۆچوونەکەی ئەوی پەسەند نەکرد.

دواتر ڕۆشتە ماڵەوە و مایەوە. وەلید کەسی بەدوایدا نارد و دەرکەوت لەناو هاولاّنی خۆیدا پارێزراوە. بەردەوام نێردراوی دەنارد.

حسەین وتبووی: چاوەڕێبە تا لێکۆڵینەوە بکەیت و لێکۆڵینەوە بکەین و بیر بکەیت و بیر بکەینەوە.

کوڕی زوبەیر وتی: پەلە مەکەن، مۆڵەتم پێبدەن. بەلاّم ئەو شەوە پێداگری زۆریان کرد بۆ ئەوەی بەیعەتیان لێوەربگرن.

وەلید کۆیلەکانی خۆی بۆ لای کوڕی زوبەیر نارد کەجونێیان پێدا و بەتوندی قسەیان لەگەڵ کرد و وتیان: ئەی کوڕی ژنی کاهیلی، یا دێیتە لای ئەمیری ئێمە یا دەکوژرێیت. شەو و ڕۆژی یەکەمی بەمشێوە بەسەر برد و دەیوت: ئێستا دێم، پەلە مەکەن با کەسێك بۆ لای ئەمیر بنێرم تا بۆچوون و فەرمانی ئەو وەربگرێت.

جەعفەر کوڕی زوبەیر، برای عەبدوللە، کەسی بۆ لای وەلید نارد و وتی: خوا بتبەخشێت، دەست لەعەبدوللە هەڵبگرە، ئەوەندە نێردراوت ناردووە کەترساوە، بەخواستی خواوەند بەیانی دێتە لای تۆ، بەنێردراوانی خۆت بڵێ، ئێرە جێبێڵن.

دەڵێت: وەلید کەسی نارد و نێردراوان گەڕانەوە. کوڕی زوبەیر لەتاریکی شەو هاتەدەر. جەعفەری برای هاورێیەتی دەکرد. لەترسی ئەوەی نەکا شوێنپێیان هەڵگرن، لەلارێوە ڕێگەی مەککەی گرتەبەر.

بەرەبەیان وەلید کەسی نارد و دەرکەوت کەکوڕی زوبەیر مەدینەی بەجێهێشتووە. مەروان وتی: سوێند بەخوا ڕێگەی مەککەی گرتۆتەبەر. سوارەکان بەدوای ئەودا بنێرە.

دەڵێت: وەلید سوارێك لەموالییەکانی منالەکانی ئومەییەی لەگەڵ هەشتا کەس نارد و شوێنپێیان هەڵگرت بەلاّم نەیاندۆزییەوە و گەڕانەوە. ئەو ڕۆژە بەدوای عەبدوللە کوڕی زوبەیر دەگەڕان و لەحسەین بێ ئاگا بوون. کاتی شەو کەسی بۆ

لای حسەین نارد کەوتی: تا بەیانی چاوەڕێ بن.

دەڵێت: ئەو شەوە دەستیان لەحسەین هەڵگرت و پێداگرییان نەکرد. حسەین لەتاریکی شەو مەدینەی بەجێهێشت و ئەم شەوە، یەکشەممە، دوو شەو بۆ کۆتایی ڕەجەبی ساڵی شەستی کۆچ بوو.

هاتنەدەرەوەی کوڕی زوبەیر لەمەدینە شەوێك پێش حسەین کوڕی عەلی بوو. جەعفەر کوڕی زوبەیر کاتێك لەڕێگەی لاوەکی لەگەڵ عەبدوڵڵەی برای دەڕۆشت، ئەم هۆنراوەی دەخوێندەوە:

(( هەموو منداڵەکانی دایکیك شەوێك دەبینن

کە لەهەموویان جگە لەیەك کەس نەماوەتەوە)).

عەبدوڵڵە وتی: سوبحان الله لەوەی دەیبیستم، مەبەستت چییە؟

وتی: سوێند بەخوا مەبەستم شتێکی خراپ نییە

وتی: سوێند بەخوا ئەمە خراپترە کە بێ هیچ مەبەستێك ئەو هۆنراوەت خوێندەوە.

دەڵێت: ئەم هۆنراوەی بەشێوەیەکی خراپ لێکدایەوە.

دەڵێت: بەڵام حسەین لەگەڵ منداڵەکان و براکان و برازاکان و زۆربەی کەسەکانی خۆی مەدینەی بەجێهێشت جگە لەمحەممەد کوڕی حەنیفە کەپێی وت: ئەی براکەم، لای من لەهەموو کەس ئازیزتر و خۆشەویستتریت، ناتوانم مۆجیاری کەس بکەم لەتۆ شیاوتر بێت. تا ئەو جێگەی دەتوانیت لەگەڵ هاوڕێکانی خۆت لەیەزید و لەشارەکان خۆت بەدوور بگرە، دواتر نێردراوان بۆ لای خەڵك بنێرە و لەدەوری خۆت کۆیان بکەرەوە، ئەگەر بەیعەتیان لەگەڵ تۆ بەست، سپاسی خواوەند دەکەین و ئەگەر بەکەسێکی دیکە ڕازی بوون، خواوەند لەبیرمەندی و ئاوزی تۆ کەم ناکاتەوە و جوامێری و لەپێشی تۆ لەناو ناچێت. دەترسم بڕۆیتە یەکێك لەشارەکان و لای ژمارەیەك لەخەڵکان کە لەنێوان خۆیاندا ببن بەدوو بەرە و دەستەیەکیان لەگەڵ تۆ بن و دەستەیەکیان دژی تۆ بن و بجەنگن و ببیتە ئامانجی یەکەم ڕمەکان و بەمشێوەیە خوێنی کەسێك کەخۆی و باوکی و دایکی لەهەموو خەڵکان باشترە، بێهۆ برژێت.

حسەین وتی: برام، من دەڕۆم.

وتی: براکەم، بەردو مەککە بڕۆ، ئەگەر لەوێ پارێزراو بوویت چ باشتر و گەرنە ڕوو بکەرە ڕیخەڵانەکان و پەنا بۆ لووتکەی چیا بەرزەکان ببە و لەشارێکەوە بڕۆ بۆ شارێکی دیکە تا ببینی چارەنووسی خەڵکان بەکوێ دەگات بۆ ئەوەی بزانیت دەتەوێت چی بکەیت چوونکە بۆچوونی ڕاست و دووربینیشی ئەوەیە لەپێشەوە خۆتی بۆ ئامادە بکەیت بەڵام ئەگەر لەکاتی ڕوودان بخوازیت بیریان لێ بکەیتەوە، کاروبارەکان ئاڵۆز دەبێت.

وتی: ئەی برام، مۆجیاریت کردم و بەزەییت پێمدا هاتەوە، هیوادارم بۆچوونەکەت ڕاست بێت.

باوکی سەعدی مەقبەری دەڵێت: حسەینم بینی کەڕۆشتە ناو مزگەوتی مەدینە، دەڕۆشت و پشتی بەدوو کەس دەبەست، جارێك دەستی دەخستە سەر شانی ئەم و جارێك ئەوی دیکە و هۆنراوەکەی کوڕی مەفرەغی دەخوێندەوە کەناوەڕۆکەکەی ئەمەیە:

(( لەبەرەبەیان وشترەکان
لەهێرشی من ناترسێت
و ناوی بڵند نابێت
ئەگەر لەترس، بەستەم ڕازی ببم
و ترسی مەرگ لەڕێ بەدەرم بکات)).

دەڵێت: بەخۆم وت: ئەم هۆنراوەی بۆیە خوێند چوونکە مەبەستێکی هەیە. دوو ڕۆژ دواتر ئاگادار بوومەوە کەبەرەو مەککە ڕۆشتووە.

دەڵێت: دوای ئەوە وەلید، عەبدوڵڵە کوڕی عومەری بانگ کرد و وتی: بۆ بەیعەت نابەستیت؟ دەتەوێت دووبەرەکی لەناو خەڵکان دروست بێت و بجەنگن و لەناو بچن و کاتێك کاروبارەکان دژوار بوو، بڵێن: لەدەوری عەبدوڵڵە کوڕی عومەر کۆببنەوە و بەیعەتی لەگەڵ ببەستن چوونکە جگە لەو کەس نەماوەتەوە.

عەبدوڵڵە کوڕی عومەر وتی: نامەوێت بجەنگن یا دووبەرەکی دروست ببێت یا لەناو بچن، بەڵام کاتێك هەموو خەڵك بەیعەتیان کرد و جگە لەمن کەس نەمایەوە،

بەیعەت دەبەستم.

دەڵێت: ئەویان ئازاد کرد چوونکە لەو نەدەترسان.

دەڵێت: کوڕی زوبەیر ڕۆشت تا گەیشتە مەککە کەعەمرۆ کوڕی سەعید کارگوزاری ئەو شارە بوو. کاتێك گەیشت، وتی: پەنام هێناوە. لەنوێژی گشتی ئەواندا بەشداری نەدەکرد و لەڕێوڕەسمی حەج ئامادە نەدەبوو. لەگەڵ هاوەڵانی خۆی لەسووچێك دەوەستا و نوێژ و ڕێوڕەسمەکانی بەجێدەهێنا.

دەڵێت: کاتێك حسەین ڕووی لەمەککە کرد، ئەم ئایەی خوێندەوە:

((فخرج منها خائفا يترقب قال رب نجني من القوم الظالمين))[٢]

واتاکەی: لەو شارە ترساو و نیگەران هاتەدەرو وتی: پەروەردگارا، لەدەستەی ستەمکاران ڕزگارم بکە.

کاتێك ڕۆشتە مەککە، ئەم ئایەی خوێند:

((فلما توجه تلقاء مدين قال عسى ربي ان يهديني سواء السبيل))[٣]

واتاکەی: و کاتێك ڕووی لەمەدینە کرد، وتی: ئەگەری هەیە پەروەردگار بۆ ڕێگەی ڕاست ڕێنوێنیم بکات.

لەم ساڵەدا و لەمانگی ڕەمەزان، یەزید، وەلید کوڕی عوتەبەی لەمەدینە لابرد و عەمرۆ کوڕی سەعیدی ئەشدەقی وەك کارگوزاری ئەو شارە دەستنیشان کرد و لەڕەمەزانی ئەم ساڵەدا بوو عەمرۆ کوڕی سەعید هاتە مەدینە.

بەوتەی واقدی، کاتێك هەواڵی مەرگی معاویە و بەیعەت لەگەڵ یەزید بەوەلید گەیشت، عەبدوڵڵە کوڕی عومەر لەمەدینە نەبوو و کاتێك پێشنیاری بەیعەتیان بەکوڕی زوبەیر و حسەیندا، ڕازی نەبوون و هەمانشەو ڕێگەی مەککەیان گرتەبەر و کوڕی عەباس و کوڕی عومەر کە لەمەککە دەگەڕانەوە، ئەوانیان بینی و پرسیان: دەنگ و باس چییە؟

وتیان: مەرگی معاویە و بەیعەتی یەزید.

کوڕی عومەر وتی: لەخوا بترسن و دووبەرەکی لەنێوان موسوڵمانان دروست

---

[٢] سورەی قصص ٢٨ ئایەی ٢٠

[٣] – سورەی قصص ٢٨ ئایەی ٢١

مەکەن.

دەڵێت: کوڕی عومەر گەڕایەوە بۆ مەدینە و چەند ڕۆژێك مایەوە تا هەواڵی بەیعەتی بەستنی خەڵکان لەویلایەتەکانەوە هات، دواتر ڕۆشتە لای وەلید و بەیعەتی بەست. کوڕی عەباسیش بەیعەتی بەست.

لەم ساڵەدا عەمرۆ کوڕی سەعید، عەمرۆ کوڕی زوبەیری بۆ جەنگی براکەی، یانی عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر نارد.

## بەڕێکەوتنی عەمرۆ کوڕی زوبەیر بۆ جەنگی عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر

محەممەد کوڕی عومەر دەڵێت: عەمرۆ کوڕی سەعد کوڕی عاس، ناسراو بەئەشدەق، لەمانگی ڕەمەزانی ساڵی شەستی کۆچی هاتە مەدینە. خەڵکی مەدینە لەدەوری کۆبوونەوە و ئەویان بەپیاوێکی بەتوانا و زمان پاراو بینی.

شەیبە کوڕی نەساح دەڵێت: نێردراوان لەنێوان یەزید و عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر سەبارەت بەبەیعەت هاتوچۆیان دەکرد. یەزید سوێندی خواردبوو ئەگەر بەبەیعەت ڕازی نەبێت، زنجیر لەدەست و پێ دەبێت بڕواتە لای.

حارس کوڕی خالیدی مەخزمی پێشنوێژی دەکرد. کوڕی زوبەیر ڕێگەی لێگرت و کاتێك ئەم کارەی کرد، یەزید فەرمانی بۆ سەعید نووسی تا سوپایەك بۆ جەنگی کوڕی زوبەیر ڕەوانە بکات.

دەڵێت: کاتێك عەمرۆ کوڕی سەعید هاتە مەدینە، عەمرۆ کوڕی زوبەیری وەك سەرکردەی پاسەوانەکانی خۆی دەستنیشان کرد چوونکە دەیزانی لەنێوان ئەو و عەبدوڵڵەی برای دوژمنایەتی لەئارادایە. عەمرۆ کوڕی زوبەیر چەند کەسێك لەخەڵکانی مەدینەی گرت و بەسەختی لێیدان.

شورەحبیل کوڕی باوکی عەون دەڵێت: عەمرۆ کوڕی زوبەیر لەو کەسانەیدا کەخوازیاری پەیوەست بوون بەعەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر بوون، یەکێك لەوان مونزەر کوڕی زوبەیر و محەممەدی کوڕی، و عەبدولڕەحمان کوڕی ئەسوەد و عوسمان کوڕی عەبدوڵڵە کوڕی حەکیم کوڕی حوزام و خەبیب کوڕی عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر و محەممەد کوڕی عەمار کوڕی یاسر. بەگشتی لەچل کەسیدا.

دەڵێت: عەبدولڕەحمان کوڕی عوسمان و عەبدولڕەحمان کوڕی عەمرۆ کوڕی سەهل و چەند کەسی دیکە بۆ مەککە هەڵاتن.

عەمرۆ کوڕی سەعید بەعەمرۆ کوڕی زوبەیری وت: چ کەسێك بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی براکەت ڕەوانە بکەین؟

وتی: هیچکەس نانێریت کە لەمن زیاتر دژ و نەیاری ئەو بێت.

دەڵێت: پارە لەخەڵکان وەربگرە. دەیان کەسی ڕەوانە کرد. ژمارەیەکی زۆر لەکۆیلەکانی مەدینە بەڕێکەوتن. ئەنیس کوڕی عەمرۆ ئەسلەمی و حەوتسەد کەس لەگەڵ عەمرۆ کوڕی زوبەیر بەڕێکەوتن. عومەر ئەوی وەك پێشەنگی سوپاکەی خۆی نارد کە لەجورف ئوردووی لێدا.

دەڵێت: مەروان کوڕی حەکەم ڕۆشتە لای عەمرۆ کوڕی سەعید و وتی: کەس بۆ جەنگی مەککە مەنێرە لەخوا بترسە و ڕێزیماڵی خواوەند مەشکێنە. گرنگی بەعەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر مەدە چوونکە پیاوێکی بەتەمەنە و شەست و چەند ساڵ لەتەمەنی تێپەڕیوە، سوێند بەخوا ئەگەر نەیکوژیت، بەزوویی دەمرێت.

عەمرۆ کوڕی زوبەیر وتی: سوێند بەخوا بەپێچەوانەی ئەو کەسانەی پێیان ناخۆشە، دژی ئەو دەجەنگین و لەناو کەعبەدا هێرشی دەکەینەسەر.

مەروان وتی: سوێند بەخوا ئەم کارەم پێخۆش نییە.

دەڵێت: ئەنیس کوڕی عەمرۆ ئەسلەمی تازی تەوی ڕۆشت. عەمرۆ کوڕی زوبەیر تا ئەبتەح پێشڕەوی کرد و کەسی بۆ لای براکەی نارد و وتی سوێندەکەی خەلیفە بەجێبێنێت و زنجیرێك لەزیو لەملی بکات تا کەس نەیبینێت و موسوڵمانان نەکەونە گیانی یەك، لەخوا بترسە چوونکە لەمانگی حەرام و لەشاری حەرامدایت.

عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر وەڵامی بۆ ناردەوە: شوێنی کۆبوونەوە لەمەسجد ئەلحەرام.

دەڵێت: عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر، عەبدوڵڵە کوڕی سەفوانی جومەحی و دەستەیەك لەخەڵکی مەککە کەپەیوەستی بووبوون بەرەو زی تەوی، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەنیس کوڕی عەمرۆ نارد کەجەنگان و ئەنیس بەسەختی تێکشکا. هاوەڵانی عەمرۆ کوڕی زوبەیر بڵاوەیان لێکرد و ئەو ڕۆشتە ماڵی

عەلەقەمە و عوبەیدە کوڕی زوبەیر هات و پەنای پێبەخشی. دواتر ڕۆشتە لای عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر و وتی: پەنام پێداوە.

وتی: دژی ماف و بەرژەوەندی خەڵك پەنای پێدەدەیت، ئەمە ڕەوا نییە.

محەممەد کوڕی عەمرۆ دەڵێت: ئەم بابەتەم لای محەممەد کوڕی عوبەید کوڕی عەمرۆ گێڕایەوە کەوتی: یەزید کوڕی معاویە نامەی بۆ عەمرۆ کوڕی سەعید نووسیبوو کەعومەر کوڕی زوبەیر وەك فەرماندەی سوپایەك دەستنیشان بکە و بۆ جەنگی عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر ڕەوانە بکە و ئەنیس کوڕی عەمرۆیش هاوڕێیەتی بکات.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی زوبەیر ڕۆشت تا لەنزیك ماڵەکەی خۆی لەسەفا جێگیر بوو. ئەنیس کوڕی عەمرۆیش لەزی تەوی دابەزی. عەمرۆ کوڕی زوبەیر پێشنوێژی دەکرد. عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیریش لەپشت سەری ئەو نوێژی دەکرد و کاتێك نوێژیان تەواو دەکرد، دەستی دەخستە ناو دەستی براکەی. کەس لەقورەیشییەکان نەمابوویەوە نەچێتە لای عەمرۆ کوڕی زوبەیر مەگەر عەبدوڵڵە کوڕی سەفوان کەبەجێمابوو. عەمرۆ وتی: چی بووە کەعەبدوڵڵە کوڕی سەفوان نابینم؟ سوێند بەخوا ئەگەر بۆ جەنگی ئەو بڕۆم، دەبینێت کەمناڵەکانی جومەح و خەڵکانی دیکە کەپەیوەستی بوون، زۆر کەم و بێ بەهان.

دەڵێت: ئەم وتەیە بەگوێی عەبدوڵڵە کوڕی سەفوان گەیشتەوە و تووڕە بوو، بە عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیری وت: بەشێوەیەك دەتبینم وەك بڵێی دەتەوێت براکەت بەجێبێڵیت.

وتی: ئەی باوکی سەفوان، من ئەو بەجێبێڵم؟ سوێند بەخوا ئەگەر هاوکاری لەمێروولەکان وەربگرم، ڕووبەڕووی ئەو دەبمەوە.

کوڕی سەفوان وتی: من ڕووبەڕووی ئەنیس کوڕی عەمرۆ دەبمەوە. تۆیش ڕووبەڕووی براکەت ببەرەوە.

عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر وتی: ڕازیم.

دەڵێت: عەبدوڵڵە کوڕی سەفوان بۆ جەنگی ئەنیس ڕۆشت کە لەزی تەوی بوو. بەهاوکاری ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکانی مەککە جەنگی دەستپێکرد و سەرئەنجام

ئـەنیس کـوڕی عـەمرۆ و سـوپاکەی شکـستیان خـوارد. هـەڵاتووانیان کوشـت و گیانیان لەبریندارەکان سەند.

دەڵێـت: مەسعەب کوڕی عەبدولڕەحمان بۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی عـەمرۆ کـوڕی زوبـەیر ڕۆشـت کـەهاوەڵانی بڵاوەیـان لێکردبـوو. مەسـعەب بەعـەمرۆ گەیـشت. عوبەیدە کوڕی زوبەیر بەعەمرۆی وت: وەرە من، پەنات پێ دەدەم.

دەڵێت: عوبەیدە کوڕی زوبەیر ڕۆشتە لای عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر و وتی: من بەپەنام بەعەمرۆ بەخشیوە، تۆیش پشتڕاستی بکەرەوە و لەسزای ئەو کەسانەی لەمەدینە بەدەستی عەمرۆ لێدانیان خواردبوو، لێیدا و دواتر زیندانی کرد.

واقـدی دەڵێـت: سـەبارەت بەگێڕانـەوەی عـەمرۆ کـوڕی زوبـەیر بۆچـوونەکان جیاوازە و من هەموویانم نووسیوە.

ڕەبـاح کـوڕی موسـلیم دەڵێـت: عـەمرۆ کـوڕی سـەعیدیان بـۆ جـەنگی عەبدوڵڵـە کوڕی زوبەیر نارد. باوکی شورەیح پێی وت: هێرش مەکە سەر مەککە چوونکە بیستوومە پێغەمبەر (د.خ) دەیفەرموو: تەنیا بەشێکی ڕۆژ خواوەند مۆڵەتی جەنگ لەمەککەیدا و دواتر ڕێزەکەی بۆ گەڕاندەوە.

دەڵێـت: بـەڵام عـەمرۆ نەیویـست گـوێ لەبۆچـوونەکانی بگرێـت و وتـی: ئـەی پیرەپیاو، ئێمە ڕێزی مەککە باشتر دەزانین لەتۆ.

دەڵێت: عـەمرۆ کـوڕی سـەعید سـوپایەکی لەگـەڵ عـەمرۆ کـوڕی زوبـەیر ڕەوانـە کـرد. ئـەنیس کـوڕی عـەمرۆ و زەیـد کۆیلـەی محەممـەد کـوڕی عەبدوڵڵـە کـوڕی مەخزومی هاوڕێیـەتیان دەکرد کەژمارەیان دوو هـەزار کەس بوو. خەڵکی مەککە ڕووبـەڕوویان بوونـەوە و ئـەنیس کـوڕی عـەمرۆ و موهـاجیر مـوالی قـەلموس و ژمارەیـەکی زۆری دیکـە کـوژران. سـوپاکەی عـەمرۆ شکـستی خـوارد و عوبەیـدە کوڕی زوبەیر هات و بەعەمرۆی برای وت: تۆ لەپـەنای مندایت و من پشتیوانیت لێدەکەم. ئەوی بردە لای عەبدوڵڵە کوڕی زوبـەیر و کاتێك ئەوی بینی، وتـی: ئـەی خراپەکار، ئەم خوێنە چییە بەناوچاوتەوە؟

عەمرۆ هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( ئێمە لەپشتەوە بریندار نابین

بەڵکو خوێن دەڕژێتە سەر قاچەکانمان))

دەڵێت: عەبدوڵڵە ئەوی زیندانی کرد و ڕیزی لەپەناکەی عوبەیدە نەگرت و وتی: کێ پێی وتی ئەم خراپەکارە ناموسوڵمانە پەنا بدەیت؟

دواتر سزای هەموو ئەو کەسانەی لەعەمرۆ سەندەوە کە لەسەر دەستی ئەو لێدانیان خواردبوو جگە لەمونزەر و کوڕەکەی کەنەیانویست تۆڵە بکەنەوە.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی زوبەیر، لەژێر قامچییەکاندا گیانیدا.

دەڵێت: زیندانەکەیان بەزیندانی عارەم ناو دەبرد لەبەر کۆیلەیەك کە بەزەیدی عارەم بەناو بانگ بوو. ناوی زیندانەکە لەناوی ئەو وەرگیرابوو. عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر، عەمرۆی برای لەو زیندانەدا زیندانی کرد.

لەم ساڵەدا خەڵکی کوفە کەسانی خۆیان بۆ لای حسەین کوڕی عەلی نارد کە لەمەککە بوو. داوایان کرد بڕواتە کوفە و ئەو کوڕە مامەکەی خۆی یانی موسلیم کوڕی عەقیل کوڕی ئەبی تالبی بۆ لای ئەوان نارد.

## گێڕانەوەی ئەوەی خەڵکی کوفە نێردراویان بۆ لای حسەین کوڕی عەلی نارد و بەسەرهاتی موسلیم کوڕی عەقیل

عەماری دەهنی دەڵێت: بەباوکی جەعفەرم وت: چۆنیەتی کوژرانی حسەینم بۆ باس بکە بەشێوەیەك وەك بڵێی خۆم لەوێ بووم.

وتی: کاتێك معاویە مرد، وەلید کوڕی عوتبە کوڕی باوکی سوفیان کارگوزاری مەدینە بوو و حسەینی بانگ کرد تا بەیعەتی لێوەربگرێت بەڵام حسەین وتی: مۆڵەتم پێبدە و چاوەڕێبە.

وەلید مۆڵەتی پێدا و حسەین ڕووی لەمەککە کرد. خەڵکی کوفە و نێردراوەکان بەردەوام دەڕۆشتنە لای و دەیانوت ئێمە خۆمان بۆ تۆ دانا و لەگەڵ کارگوزارانی ئومەوی بەشداری نوێژی هەینی ناکەین، وەرە بۆ لای ئێمە.

دەڵێت: لەم کاتەدا نەعمان کوڕی بەشیری ئەنساری کارگوزاری کوفە بوو.

دەڵێت: حسەین، موسلیم کوڕی عەقیل کوڕی ئەبی تالب، کوڕە مامی خۆی بانگ کرد و پێی وت: بڕۆ بۆ کوفە و سەبارەت بەوەی خەڵکی ئەو شارە بۆ منیان

نووسیوە، لێکۆڵینەوە بکە تا ئەگەر ڕاست بوو، ڕێگەی ئەو شارە بگرینەبەر.

دەڵێت: موسلیم بەڕێکەوت تا گەیشتە مەدینە و لەوێ دوو بەڵەدی هەڵگرت و ئەویان لەڕێگەی بیابانەوە برد تا ئەو جێگەی گرفتاری تینوویێتی بوون و یەکێك لەبەڵەدەکان مرد.

موسلیم نامەی بۆ حسەین نووسی تا لەم کارە بیبەخشێت، بەڵام حسەین وەڵامی دایەوە:

بەرەو کوفە بڕۆ. موسلیم ڕۆشت تا گەیشتە کوفە و لەماڵی یەکێك لەخەڵکانی ئەو شارە نیشتەجێ بوو بەناوی کوڕی عەوسەجە.

دەڵێت: کاتێك خەڵکی کوفە باسی هاتنی موسلمیان دەکرد، ڕۆشتنە لای و بەیعەتیان بەست. دوانزە هەزار کەس بەیعەتیان لەگەڵ موسلیم بەست.

دەڵێت: یەکێك لەوان خوازیاری خەلافەتی یەزید کوڕی معاویە بوو، ڕۆشتە لای نەعمان کوڕی بەشیر و پێی وت: تۆ لاوازیت یا خۆت بەلاواز نیشان دەدەیت، کاروباری ئەم ویلایەتەت بەفیڕۆداوە.

نەعمان وتی: ئەوەی کە لاواز بم بەڵام گوێڕایەڵی خواوەند باشترە لەوەی بۆ ئەنجامدانی تاوان و گوناحەکان پێداگری بکەم، من کەسێك نیم پەردەیەك بدڕم کەخواوەند دایپۆشیوە.

دەڵێت: ئەو کەسە وتەکانی نەعمانی بۆ یەزید نووسی. یەزید کۆیلەکەی خۆی بەناوی سەرجونی بانگ کرد و لەم پێشهاتە ئاگاداری کردەوە.

سەرجون وتی: ئەگەر معاویە زیندوو بوایە بەبۆچوونەکەی ڕازی دەبووی.

وتی: بەڵێ.

وتی: کەواتە بەبۆچوونی من ڕازی ببە کەکەس جگە لە عوبەیدوڵڵە کوڕی زیاد شیاوی فەرمانڕەوایەتی کوفە نییە. ئەو وەك کارگوزاری ئەو شارە دەستنیشان بکە.

دەڵێت: یەزید لە عوبەیدوڵڵە توڕە بوو و دەیویست ئەو لەبەسرە دوور بخاتەوە، بۆ ئەم مەبەستە نامەی بۆ نووسی کەلێی ڕازی بووە و فەرمانڕەوایەتی هەردوو شاری بەسرە و کوفەی بەو سپاردووە. هەروەها فەرمانی پێدا بەدوای موسلیم

کوڕی عەقیلدا بگەڕێت و ئەگەر گرتی، بیکوژێت.

دەڵێت: عوبەیدللە بەسەروچاوی بەستراو لەگەڵ گەورەکانی خەڵکی بەسرە روویکردە کوفە و لای هەر دەستەیەك کەتێدەپەڕی و سڵاوی دەکرد، دەیانوت: سڵاو لەتۆ ئەی کوڕی کچی پێغەمبەری(د.خ) خوا، چوونکە گومانیان دەکرد ئەو حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیبە.

دەڵێت: کاتێك ڕۆشتە ناو کۆشك، کۆیلەکەی خۆی بانگ کرد و سێ هەزاری پێدا و وتی: بڕۆ و ئەو کەسە بدۆزەرەوە کەخەڵکی کوفە بەیعەتی لەگەڵ دەبەستن و بڵێ کەیەکێکی لەدانیشتووانی حیمس و بۆ ئەم مەبەستە هاتوویت و ئەو پارەی پێدەدەیت تا هێزی زیاتر ببێت.

دەڵێت: عوبەیدللە بەشێوەیەك بەچاکی هەڵسوکەوتی کرد تا ئەویان بەیەکێك لەپیرەکانی خەڵك ناساند کەبەیعەتی لەخەڵکان وەردەگرت. کۆیلە ئەوی بینی و لەمەبەستەکەی خۆی ئاگاداری کردەوە.

پیر وتی: لەبینینی تۆ شادمانم و نیگەران. شادمانم لەوەی خواوەند ڕێگەی ڕاستی نیشان داویت و نیگەرانم لەوەی هێشتا پێگە وبارودۆخی ئێمە جێگیر نییە. دواتر ئەوی بردە لای موسلیم و پارەکەی وەرگرت و بەیعەتی لەگەڵ بەست.

دەڵێت: کۆیلە گەڕایەوە بۆ لای عوبەیدللە و ئاگاداری کردەوە.

دەڵێت: کاتێك عوبەیدللە کوڕی زیاد هات، موسلیم لەوماڵەوە ڕۆشتە ماڵی هانی کوڕی عوروەی موورادی.

دەڵێت: موسلیم نامەی بۆ حسەین نووسی و پێی ڕاگەیاند کەدوانزە هەزار کەس بەیعەتیان لەگەڵ بەستووە و بەڕێکەوێت.

دەڵێت: عوبەیدللە کوڕی زیاد بەگەورەکانی خەڵکی کوفەی وت: بۆ هانی کوڕی عوروە لەناو ئێوەدا بۆ لای من نەهاتووە؟

دەڵێت: محەممەد کوڕی ئەشعەس و کەسانێك لەخەڵکەکەی ڕۆشتنە لای هانی. ئەو لەماڵەکەیدا بوو. پێیان وت: ئەمیر باسی تۆی کردووە و چاوەڕوانی تۆیە، بڕۆ بۆ لای. ئەوەندە پێداگرییان کرد تا سوار بوو و ڕۆشتە لای عوبەیدللە. شورەیحی قازی دانیشتبوو و کاتێك هانی بینی، وتی: بەقاچی خۆی هات.

دەڵێت: کاتێك هانی سلاوی لێکرد، وتی: ئەی هانی، موسلیم لەکوێیە؟

وتی: نازانم.

عوبەیدللە، کۆیلەکەی خۆی کەدرهەمەکانی پێدابوو، بانگ کرد و کاتێك هانی ئەوی بینی، بێدەنگ بوو و وتی: خواوەند ئەمیر ببەخشێت، سوێند بەخوا ئەوم بانگێشتی ماڵەکەم نەکردبوو، خۆی هات و خۆی بەسەر مندا سەپاند.

وتی: ئەو بێنە لای من.

وتی: سوێند بەخوا ئەگەر لەژێر قاچمدا بێت، قاچم هەڵناگرم.

وتی: نزیکی بکەنەوە.

کاتێك هانییان لێ نزیك کردەوە، لەبرۆیدا و برینداری کرد. هانی پەلاماری شمشێری یەکێك لەپاسەوانەکانیدا و دەریهێنا، بەلام رێگەی ئەو کارەیان لێگرت. عوبەیدللە وتی: خواوەند خوێنی تۆی حەلاڵ کرد. دواتر فەرمانیدا لەسووچێکی کۆشکەکدا بیبەستنەوە.

بەوتەیەکی دیکە، ئەو کەسەی هانی بردە لای عوبەیدللە کوڕی زیاد، عەمرۆ کوڕی حەجاجی زوبەیدی بوو.

عیزار کوڕی حورەیس دەڵێت: عەمارە کوڕی عوقبە کوڕی باوکی موعیت لای کوڕی زیاد دانیشتبوو، قسەی کرد و وتی: ئەمرۆ شوێن چەندین کەر کەوتم و قاچی یەکێك لەوانم شکاند.

عەمرۆ کوڕی حەجاجی زوبەیدی وتی: ئەو کەرەی تۆ قاچی بشکێنێت، کەرێکە وادەی تۆپانی هاتووە بەلام دەتەوێت بزانیت ئێستا کاتی مەرگی کێیە؟ پیاوێك کاتێك باوکە کافرەکەیان بردە لای پێغەمبەر (د.خ)، فەرمانیدا سەری بڕن و ئەو وتی: ئەی محەممەد کێ وەك سەرپەرەستی منداڵەکانم بمێنێتەوە؟

پێغەمبەر (د.خ) وتوویەتی: جەهەننەم.

دواتر زوبەیدی وتی: تۆ لەو منالانەیت و لەجەهەننەمدایت.

دەڵێت: کوڕی زیاد پێکەنی.

باوکی جەعفەر دەڵێت: لەم کاتەدا خەڵکی مەزحەج ئاگادار بوونەوە و لەناکاو لەبەردەم دەرگای کۆشکەکە دەنگە دەنگ بەرز بوویەوە. کوڕی زیاد بیستی و

پرسی: ئەوە چییە؟

وتیان: خەڵکی مەزحەجن.

کوڕی زیاد بەشورەیحی وت: بڕۆ لایان و بڵێ کوڕی زیاد هانی لای خۆی هێشتۆتەوە بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکات. کوڕی زیاد یەکێك لەکۆیلەکانی خۆی لەگەڵ نارد تا بزانێت چی دەڵێت. شورەیح لەڕێگەدا چاوی بەهانی کەوت. هانی پێی وت: ئەی شورەیح، لەخوا بترسە، ئەو ددمکوژێت.

دەڵێت: شورەیح ڕۆشت و لەبەردەرگای کۆشك وەستا و وتی: هیچ نییە، ئەوی هێشتۆتەوە بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکات.

وتیان: ڕاست دەکات، هیچ نییە و بلاوەیان لێکرد.

دەڵێت: موسلیم ئاگادار بوویەوە و جاڕیدا و دروشمی بەرز کردەوە و چوار هەزار کەس لەدەوری کۆبوونەوە. پێشەنگی سوپاکەی لەپێشەوە نارد، باڵی ڕاست و چەپی ڕازاندەوە و خۆی لەناو دڵی سوپاکەیدا وەستا و بەرەو کۆشکەکەی عوبەیدڵڵە بەڕێکەوت.

دەڵێت: عوبەیدڵڵە کەسی بەدوای سەرکردەکانی خەڵکی کوفە نارد تا ئەوان لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە و کاتێك موسلیم گەیشتە بەردەم کۆشکەکە، سەرکردەکانی خەڵك لەسەرەوەی کۆشکەکە دەرکەوتن و لەگەڵ خەڵکەکەی خۆیان قسەیان کرد و ئەوانیان گەڕاندەوە.

هاوەڵانی موسلیم بلاوەیان لێکرد و تا کاتی شەو پێنسەد کەس مایەوە و کاتێك تاریکی داهات، ئەوانیش ڕۆشتن. کاتێك موسلیم خۆی بەتەنیا بینی، لەناو کۆڵانەکاندا بەڕێکەوت و گەیشتە بەر دەرگایەك، لەوێ وەستا. ژنێك هاتەدەر و پێی وت: ئاوم پێ بدە. ژنەکە ئاوی پێدا. دواتر ڕۆشتە ژوور و تا ئەو کاتەی خواوەند ویستی، نوێژی خوێند و دواتر هاتە بەردەرگا و بینی کەهێشتا لەبەر دەرگایە. وتی: ئەی بەندەی خوا، دانیشتنت لێرە دەبێتە هۆی دروستبوونی گومان، هەستە.

وتی: من موسلیم کوڕی عەقیلم، ئایا دەتوانم لای تۆ بمێنمەوە؟

وتی: بەڵێ، وەرە ژوور.

دەڵێت: کوڕی ئەو ژنە کۆیلەی محەممەد کوڕی ئەشعەس بوو و کاتێك لەم پێشهاتە ئاگادار بوویەوە، ڕۆشتە لای محەممەد کوڕی ئەشعەس و ئاگاداری کردەوە. محەممەد ڕۆشتە لای عوبەیدللە و ئاگاداری کردەوە. عوبەیدللە، عەمرۆ کوڕی حورەیسی مەخزومی (سەرکردەی پاسەوانەکانی) عەبدولڕەحمان کوڕی محەممەد کوڕی ئەشعەس لەگەڵی ڕۆشت.

موسلیم بێ ئاگا بوو تا ئەو کاتەی گەمارۆی ماڵەکەیاندا و کاتێك ئەمەی بینی، شمشێر بەدەست هاتەدەر و جەنگی. عەبدولڕەحمان ئەمانی پێبەخشی و موسلیم تەسلیم بوو. ئەویان بردە لای عوبەیدللە کوڕی زیاد کەفەرمانیدا بیبەنە بەرزترین شوێنی کۆشکەکە و گەردنی بپەڕێنن و جەستەی فڕێبدەنە ناو خەڵك. هانییان لەبازار هەڵواسی. شاعیر لەمبارەوە هۆنراوەیەکی هەیە بەم ناوەرۆکە:

((ئەگەر نازانی مەرگ چییە

سەیری هانی بکە لەبازار

و کوڕی عەقیل.... هتد))

سەبارەت بەموسلیم کوڕی عەقیل و ڕۆشتنی بۆ کوفە و کوژرانی، گێڕانەوەیەکی تەواوتر و گشتگیرتریان لەزمانی عوقەبە کوڕی سەمعان، کۆیلەی ڕەبابی کەلبی کچی ئەمرۆئەلقەیس ئاماژە پێداوە. ڕەباب هاوسەری حسەین بوو و لەگەڵ سەکینەی کچی حسەین دەژیا و عوقەبە کۆیلەی باوکی بوو.

سەکینە لەو کاتەدا منداڵ بوو.

عوقەبە دەڵێت: ڕۆشتین و ڕێگەی گەورەمان گرتەبەر. کەسانی بنەماڵەکەی حسەین پێیان وت: باشترە لەڕێگەی گەورە (ڕێگەی سەرەکی) بگەڕێیتەوە. کوڕی زوبەیر لەم ڕێگەوە نەڕۆشتووە.

وتی: نا، سوێند بەخوا لەم ڕێگەیە جیا نابمەوە و چاوەڕوانی قەدەری خواوەند دەبم.

دەڵێت: عەبدوللە کوڕی موتیع بۆ پێشوازیمان هات و بەحسەینی وت: بەقوربانت بم، بۆ کوێ دەڕۆیت؟

وتی: لەئێستادا بەرەو مەککە و دواتر بەدوای خێری خوادا دەگەڕێم.

وتی: هیوادارم خێر بەتۆ ببەخشێت و ئێمە بیکاتە فیدای تۆ، ئەگەر بۆ مەککە ڕۆشتیت، بەهیچ جۆرێك لەکوفە نزیك نەکەویتەوە چوونکە شارێکی شوومە و باوکی تۆیان لەوێ کوشتووە و براکەتیان لەوێ بەتەنیا جێهێشت و بەناکاو گورزێکیان لێدا کەزۆری نەمابوو لەناو بچێت، لەحەرەمی خواوەند بمێنەرەوە چوونکە سەروەری عەرەبیت. سوێند بەخوا خەڵکی حیجاز کەس بەهاوتای تۆ نازانن و خەڵکان لەهەموو ناوچەکانەوە لەدەوری تۆ کۆدەبنەوە. خاڵم و مامم بەفیدای تۆ بێت لەحەرەم دوور مەکەوەرەوە چوونکە ئەگەر تۆ لەناو بچێت، ئێمە لەدوای تۆ دەبینە کۆیلە.

دەڵێت: حسەین ڕۆشت تا گەیشتە مەککە و خەڵکی ئەوێ لەدەوری کۆبوونەوە و هاتوچۆیان بۆ ماڵەکەی دەکرد. ئەوانەی بەمەبەستی عەمرە ڕوویان لەمەککە دەکرد، سەردانی ماڵی حسەینیان دەکرد. کوڕی زوبەیریش لەمەککە و بەردەوام لەنزیك کەعبە بوو. زۆربەی کاتەکانی لەوێ بەنوێژ خوێندن بەسەر دەبرد یا بەدەوری کەعبەدا دەسووڕایەوە. ئەویش لەگەڵ خەڵکانی دیکە دەهاتە لای حسەین کوڕی عەلی. دوو ڕۆژ بەدوای یەکدا دەهات، دوو ڕۆژ جارێك دەهات و ڕاوێژی پێدەکرد. کوڕی زوبەیر ڕقی حسەینی لەدڵدا بوو چوونکە دەیزانی خەڵکی مەککە بەبوونی حسەین کوڕی عەلی بەیعەت لەگەڵ ئەو ناکەن و زیاتر خوازیاری ملکەچی و فەرمانبرداری ئەون.

دەڵێت: کاتێك خەڵکی کوفە لەمەرگی معاویە ئاگادار بوونەوە، خەڵکانی عێراق دژی یەزید کەوتنە خۆیان و وتیان: حسەین و کوڕی زوبەیر خۆڕاگرییان کردووە و ڕێگەی مەککەیان گرتۆتەبەر. دواتر خەڵکی کوفە نامەیان بۆ حسەین نووسی. کارگوزارەکەیان نەعمان کوڕی بەشیر بوو.

محەممەد کوڕی بەشیری هەمەدانی دەڵێت: شیعەکان لەماڵی سلێمان کوڕی سەرد کۆدەبوونەوە. باسی مەرگی معاویەمان کرد و بەهۆیەوە سەری کڕنوشمان بۆ خواوەند دانەواند. سلێمان کوڕی سەرد پێی وتین: معاویە مرد و حسەین بەیعەتی لەگەڵ یەزید نەکردووە و ڕێگەی مەککەی گرتۆتەبەر. ئێوە شیعەکانی ئەون و شیعەکانی باوکی. ئەگەر دەزانن دەتوانن هاوکاری بکەن و دژی

دوژمنەکەی بجەنگن، نامەی بۆ بنووسن و ئەگەر هەست بەترس و لاوازی دەکەن، ئەم پیاوە فریو مەدەن چوونکە گیانی دەکەوێتە مەترسییەوە.

وتیان: لەگەڵ دوژمنەکەی دەجەنگین و خۆمان بۆ پاراستنی گیانی ئەو بەکوشتن دەدەین.

وتی: کەواتە بۆی بنووسن:

و شیعەکان نووسیان:

(( بەناوی خواوەندی بەخشندەی میهرەبان

بۆ حسەین کوڕی عەلی لەلایەن سلێمان کوڕی سەرد و موسەییب کوڕی نوجبە و روفاعە کوڕی شەداد و حەبیب کوڕی موزاهیر و شیعەکانی دیکە و باوەڕداران و موسوڵمانانی کوفە

سلاّو لەتۆ بێت کەئێمە ستایشی خواوەندێك دەکەین کەجگە لەو خواوەندێك نییە،

بەلاّم دواتر: سپاس بۆ خوا کەدوژمنی ستەمکار و سەرسەختی تۆی لەناو برد، دوژمنێك کەهێرشی کردە سەر ئەم ئۆمەتە و بەناڕەوا دەستی بەسەر تەختی خەلافەتدا گرت و تالاّنییەکانی زەوت و فەرمانڕەوایەتی گرتەدەست و چاکەکارانی کوشت و پێگەی خراپەکارانی بەرز کردەوە و بەهێز و دەوڵەمەندی کردن. بەنەحلەتی خواوەند بێت هاوشێوەی نەتەوەی سەموود. لەئێستادا ئیمام و پێشەوامان نییە، بۆ ئێرە وەرە ئەگەری هەیە خواوەند بەهۆی تۆوە لەدەوری ڕاستییەکان کۆمان بکاتەوە. نەعمان کوڕی بەشیر لەکۆشکی دەسەلاّتدایە و ئێمە لەنوێژی هەینی و نوێژی جەژنی ئەودا بەشداری ناکەین و ئەگەر ئاگادار ببینەوە کە بەرەو ئێرە دێیت، ئەو لەشارەکەمان دەردەکەین و بۆ شامی دەگەڕێنینەوە. سلاوی و درودی خواوەند لەتۆ بێت)).

دەڵێت: نامەکەمان بەعەبدوڵڵە کوڕی سەبعی هەمەدانی و عەبدوڵڵە کوڕی وال ڕەوانە کرد و وتمان: پەلە بکەن. هەردووکیان بەخێرایی ڕۆشتن و لەڕۆژی دەی مانگی ڕەمەزان لەمەککە گەیشتنە لای حسەین. دوو ڕۆژ دواتر قەیس کوڕی مەسهەری سەیداوی و عەبدولڕەحمان کوڕی عەبدوڵڵەی کەدانی ئەرحەبی و

عـەمارە کـوڕی عوبەیـدی سـەلولیمان بـۆ لای ئـەو نـارد کەنزیکـەی پـەنجا و سـێ نامەیان پێبوو و هەر نامەیەك لەلایەن دوو یا سێ کەسەوە نووسرا بوو.

دەڵێـت: دوو ڕۆژ دواتـر دووبـارە هـانی کـوڕی هـانی سـەبیعی و سـەعید کـوڕی عەبدوڵڵەی حەنەفیمان بۆ لای ئەو نارد و نامەیەکمان بەواندا نارد:

((بەناوی خواوەندی بەخشندەی میهرەبان

بۆ حسەین کوڕی عەلی لەلایەن شیعەکان و باوەڕدارانی ئەو، بەڵام دواتر، زووتر وەرە چوونکە خەڵکان چاوەڕوانی تۆن و تەنیا تۆیان دەوێت و بەتۆ ڕازی دەبن. پەلە بکە، سڵاو لەتۆ بێت)).

دەڵێت: شەبس کوڕی و حەجار کوڕی ئەبجەر و یەزید کوڕی حارس و یەزید کوڕی رویەم و عوزرە کوڕی قەیس و عەمرۆ کوڕی حەجاجی زوبەیدی و محەممەد کوڕی عومەیری تەمیمیش بۆیان نووسی:

((هەموو شوێنێك سەرسەوزە و مییوەکان پێگەیشتوون و چاڵاوەکان پڕ ئاون. ئەگەر دەخوازیت وەرە چوونکە سوپاکەی تۆ ئامادەیە. سڵاو لەتۆ بێت))

دەڵێت: هەموو نێردراوان لای حسەین بەیەك گەیشتن کەنامەکانی خوێندەوە و لەنێردراوەکان سەبارەت بەخەڵك پرسیاری کرد. دواتر ئەوانی لەگەڵ هانی کوڕی هانی سەبیعی و سەعید کوڕی عەبدوڵڵەی حەنەفی کەدووایین نێردراوەکان بوون، ئەمەی نووسی:

(( بەناوی خواوەندی بەخشندەی میهرەبان

لەحسەین کـوڕی عـەلی بـۆ بـاوەڕداران و موسـوڵمانان، بـەڵام دواتـر: هـانی و سـەعید لەگـەڵ نامـەکانی ئێـوە هاتنـە لای مـن، لـەوەی نووسـیبووتان و وتووتانە، ئاگـادار بوومـەوە. وتـەی زۆربـەتان ئەوەیـە کـەئیمامتان نییـە، وەرە، ئەگـەری هەیـە بەهۆی تـۆوە خواوەنـد ئێمـە بـۆ ڕێگـەی ڕاسـت ڕێنـوێنی بکـات. ئێـستا بـرا و کـوڕە مامەکەم و بڕواپێکراوی بنەماڵەکەم بۆ لای ئێوە دەنێرم و ڕامسپاردووە لـەکاروبار و بـارودۆخی ئێـوە ئاگـادارم بکاتـەوە، ئەگـەر بـۆم بنووسـێت کەبۆچـوونی خـەڵکان وبیرمەنـدان و زاناکـان بـەو شـێوەیە کـە لەنامەکانـدا نووسـراوە و نێـردراوان پێیـان ڕاگەیاندووم، بەزووترین کات بۆ لای ئێوە بەڕێدەکەوم. سوێند بـەخوا، ئیمـام ئـەو

کەسـەیە پـشت بـەکتێبی خواوەنـد ببەسـتێت و دادپـەروەری بکاتـە پیـشە و جێبـەجێکاری ڕاسـتییەکان بێـت و خـۆی تـەرخان بکـات بـۆ خواپەرەسـتی. والسلام)).

باوکی موخارقی ڕاسبی دەڵێت: خەڵکانێك لەشیعەکان لەبەسرە لەماڵی ژنێك بەعەبدولقەیس بەناوی ماریە کچی سەعد یا مەنقەز کۆبوونەوە و چەند ڕۆژێك مانەوە. ماریە خۆی شیعە بوو و ماڵەکەی شوێنی کۆبوونەوەی شیعەکان کەلەوێ گفتوگۆیان دەکرد. کوڕی زیاد لەهاتنی حسەین ئاگادار بووبوویەوە و فەرمانی بەکارگوزارەکەی خۆی لەبەسرەدا تا سیخوڕ دابنێت و ڕێگەکان بپارێزێت.

دەڵێـت: یەزیـد کـوڕی نـەبیت لەخـەڵکانی عەبدولقـەیس بڕیاریـدا بڕواتـە لای حسەین کوڕی عەلی. ئەو دە کوڕی هەبوو، وتی: کامتان لەگەڵ من دێن؟ دووان لـەکوڕەکانی بـەناوی عەبدوڵڵـە و عوبەیدڵڵـە ئامادە بوون. یەزیـد لـەماڵی ئـەو ژنـە وتی: مەبەستی ڕۆشتنم کردووە و دەڕۆم.

وتیان: دەترسین بکەویتە دەستی هاوەڵانی کوڕی زیاد.

وتـی: کاتێـك چوارپێکەی مـن لەدەشـت بەڕێکـەوت، کـێ دەخوازێـت بـا شـوێنم کەوێت.

دەڵێت: یەزید بەڕێکەوت و بەخێرایی ڕۆشت تا بەحسەین کوڕی عەلی گەیشت و لەئەبتـەح ڕۆشـتە لای. حـسەین لـەهاتنی ئـەو ئاگـادار بوویـەوە و بـۆ پێشوازی ڕۆشـت. ئـەو پیـاوە بـۆ شـوێنی مانـەوەی حـسەین ڕۆشـت، پێیـان وت: بـەرەو مەنزڵگـەی تـۆ هـاتووە. بـەدوای ئـەودا ڕۆشـت و کاتێـك حسەین ئـەوی نـەبینی، لەشوێنی مانەوەی چاوەڕوانی کرد. دواتر یەزید هات وبینی حسەین کوڕی عەلی لەمەنزڵەکـەی ئـەو دانیـشتووە، وتـی: بەبـەزەیی و ڕەحمـەتی خواوەنـد دەبێـت شادمان بین.

دواتـر سـڵاوی کـرد و لای حـسەین دانیـشت و لەمەبەسـت و نیازەکـەی خـۆی ئاگـاداری کـردەوە و حـسەین دۆعـای خێـری بـۆ کـرد. لەگـەڵ ئـەو مایـەوە تـا بەڕێکەوت. یەزید شان بەشانی حسەین کوڕی عەلی جەنگی و خۆی و دوو کوڕی کوژران.

دەڵێت: حسەین، بانگی موسلیم کوڕی عەقیلی کرد و ئەوی لەگەڵ قەیس کوڕی مەسهەری سەیداوی و عەمارە کوڕی عوبەیدەی سەلولی و عەبدولڕەحمان کوڕی عەبدوللەی ئەرحەبی ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا لەخوا بترسێت و کەس لەمەبەستی سەفەرەکەی ئاگادار نەکاتەوە و ئەگەر بینی خەڵکانی کوفە لەسەر هاتنی ئەو هاودەنگ و کۆکن، ئاگاداری بکاتەوە.

دەڵێت: موسلیم بەڕێکەوت تا گەیشتە مەدینە و لەمزگەوتی پێغەمبەر (د.خ) نوێژی خوێند و ماڵئاوایی لەبنەماڵەکەی کرد. دواتر دوو بەڵەدی لەخەڵکانی قەیس بەکرێ گرت و بەڕێکەوتن بەڵام ڕێگەیان ون کرد و لەڕێگە دوورکەوتنەوە و گرفتاری تینویەتی بوون. دوو بەڵەدەکە وتیان ڕێگە ئەمەیە تا بە ئاو دەگات. لەتاو تینوویەتی، مەرگ تەنگی پێهەڵچنیبوون.

موسلیم کوڕی عەقیل لەگەرووی دۆڵی خەبیت، هاوڕێ لەگەڵ قەیس کوڕی مەسهەری سەیداوی بۆ حسەینی نووسی:

(( بەڵام دواتر، لەمەدینەوە هاتم و دوو بەڵەدم لەگەڵدا بوو کەڕێگەیان ون کرد و ون بووین و گرفتاری تینویەتی. دوو بەڵەدەکە مردن و ئێمە هاتین تا بەئاو گەیشتین و گیانمان دەرباز کرد. ئەم ئاوە لەشوێنێکە کە بەگەرووی دۆڵی خەبیت بەناو بانگە. من ئەم سەفەرە بەباش نازانم. ئەگەر بۆچوونی تۆی لەسەر بێت، من لەم کارە ببەخشە و کەسێکی دیکە ڕەوانە بکە. والسلام)).

حسەین وەڵامی دایەوە:

((بەڵام دواتر، دەترسم ئەو نامەت لەڕووی ترسەوە نووسیبێت. لەڕێگەکەت بەردەوام بە. والسلام)).

موسلیم بەو کەسەی وت کەنامەکەی دەخوێندەوە: لەبەر ئەو شتە نییە کە لەگیانی خۆم دەترسم. بەڕێکەوت تا لەچاڵاوێك نزیك کەوتەوە کەتایبەت بوو بەهۆزی تەی. لای ئەوان دابەزی.

دەڵێت: کاتێك ئەو ناوچەی بەجێهێشت، پیاوێکی بینی سەرقاڵی ڕاو کردن بوو. کاتێك گەیشتە لای پیاوەکە، لەئاسکێکیدا و لەپێی خست. موسلیم وتی: هیوادارم دوژمنەکەی ئێمە بکوژرێت. بەڕێکەوت تا گەیشتە ناو کوفە و لەماڵی

موختار کوڕی باوکی عوبەید جێگیر بوو. ئەوماڵەی ئێستا بەماڵی موسلیم کوڕی موسەییب ناوی دەرکردووە. شیعەکان لەدەوری کۆبوونەوە و هاتوچۆ کردن دەستی پێکرد و کاتێك ژمارەیەك لەوان کۆبوونەوە، نامەکەی حسەین کوڕی عەلی بۆ خوێندنەوەو ئەوان دەستیان کرد بەگریان.

دەڵێت: عەباس کوڕی باوکی شەبیبی شاکری لەشوێنەکەی هەستا، سپاسی خواوەندی کرد و وتی:

(( من باسی کەسانی دیکە ناکەم و نازانم چی لەدڵیاندایە و لەزمانی ئەوانەوە بەڵێنی فریودەر نادەم. سوێند بەخوا سەبارەت بەو بڕیارەی گرتوومە، قسە دەکەم: کاتێك بانگێشتم بکەن، ڕازی دەبم. لەگەڵ ئێوە دژی دوژمنەکانتان دەجەنگم و بەشمشێرەکەم بەرگریتان لێدەکەم تا دەگەڕێمەوە بۆ لای خواوەند و لەم کارەم جگە لەپاداشتی خوایی هیچی دیکەم ناوێت)).

دەڵێت: حەبیب کوڕی موزاهیری فەقعەسی هەستا و وتی: خوات بتبەخشێت، مەبەستەکەی خۆت زۆر بەکورتی باسکرد. دواتر وتی: سوێند بەخوا، بڕیار و مەبەستی منیش هاوشێوەی ئەم پیاوەیە.

دەڵێت: دواتر حەنەفی هاوشێوەی ئەم دووانە قسەی کرد.

بێژەر دەڵێت: بەمحەممەد کوڕی بوشرم وت: تۆیش هیچت وت؟

وتی: من دەمویست خواوەند سەرکەوتن بەهاوەڵانم ببەخشێت، بەڵام حەزم بەکوژران نەبوو و نەمدەویست درۆ بکەم.

دەڵێت: کاتێك شیعەکان لەشوێنی موسلیم ئاگادار بوونەوە، هاتووچۆیان دەکرد و نەعمان کوڕی بەشیر لەمە ئاگادار بوویەوە.

باوکی ئەلوەداك دەڵێت: نەعمان کوڕی بەشیر ڕۆشتە سەر مینبەر، سپاسی خواوەندی کرد و وتی: بەڵام دواتر: ئەی بەندەکانی خوا، لەخوا بترسن و بەرەو فیتنە و ئاژاوە غار مەدەن چوونکە دەبێتە هۆی کوژرانی پیاوەکان و ڕژانی خوێنەکان و زەوتکردنی سامانەکان.

دەڵێت: نەعمان پیاوێکی خۆڕاگر و خواپەرەست و خوازیاری ئاشتی بوو. وتی: من دژی ئەو کەسە ناجەنگم کەبۆ جەنگی من نەیێت و هێرش ناکەمە سەر ئەو

کەسەی هێرش نەکاتە سەر من، جوێن بەئێوە نادەم و هانتان نادەم، گرنگی بەبوختان وتۆمەت نادەم بەڵام ئەگەر دووڕوویی بکەنە پیشە و بەیعەتت بشکێنن و دژی پێشەواکەتان بوەستنەوە، سوێند بەو خوایەی جگە لەو خوایەك نییە، تا ئەو کاتەی شمشێرم لەدەستا بێت، گورزتان لێ دەدەم تەنانەت ئەگەر لەنێوان ئێوەدا هیچ هاوەڵ و هاورێیەکەم نەبێت. هیوادارم لەناو ئێوەدا ژمارەی ئەو کەسانە زیاتر بێت کەپێبەندی ڕاستین لەو کەسانەی ناخیان بەرەو مردنیان دەبات.

دەڵێت: عەبدوڵڵە کوڕی موسلیمی حەزرەمی، خزمی مناڵەکانی ئومەییە هەستا و پێی وت: ئەوەی تۆ دەیبینیت، تەنیا بەتوندوتیژی کۆتایی پێدێت و ئەم کردارەی تۆ لەگەڵ دوژمنان نیشانەی لاوازی تۆیە.

نەعمان وتی: ئەوەی بۆ گوێڕایەڵی کردن و ئەنجامدانی فەرمانەکانی خواوەند لەڕیزی لاوازەکان بم باشترە لەوەی بۆ ئەنجامدانی تاوان و گوناحەکان لەڕیزی بەهێزەکاندا بم.

دەڵێت: نەعمان کوڕی بەشیر لەسەر مینبەرەکەی هاتەخوار. عەبدوڵڵە کوڕی موسلیم ڕۆشت و ئەم نامەی بۆ یەزید نووسی:

((بەڵام دواتر: موسلیم کوڕی عەقیل هاتۆتە کوفە و شیعەکان لەگەڵ ئەو بەیعەتیان بەحسەین کوڕی عەلی داوە. ئەگەر پێویستت بەکوفەیە پیاوێکی بەهێز ڕەوانە بکە تا فەرمانەکانی تۆ جێبەجێ بکات و دژی دوژمنەکەی تۆ بجەنگێت چوونکە نەعمان کوڕی بەشیر پیاوێکی لاوازە یا خۆی لەلاواز نیشان دەدات)).

دەڵێت: عەبدوڵڵە کوڕی موسلیم یەکەم کەس بوو لەمبارەوە نامەی بۆ یەزید نووسی. دواتر عەمارە کوڕی عوقبەیش نامەیەکی هاوشێوەی نووسی. دواتر عومەر کوڕی سەعد کوڕی باوکی وەقاس نامەیەکی بۆ یەزید نارد.

عەوانە دەڵێت: کاتێك نامەکان لەماوەی دوو ڕۆژدا بەدەستی یەزید گەیشت، سەرجون، کۆیلەی معاویەی بانگ کرد و وتی: بۆچوونی تۆ چییە؟ حسەین بەرەو کوفە بەڕێکەوتووە و موسلیم کوڕی عەقیل لەکوفە بەیعەتی بۆ وەردەگرێت. بیستوومە کەنەعمان کوڕی بەشیر لاوازە و قسە و وتاری نابەجێ دەدات. دواتر نامەکانی نیشانی سەرجوندا و خوێندییەوە، وتی: بەبۆچوونی تۆ کێ وەك

کارگوزاری کوفە دەستنیشان بکەم؟

دەڵێت: لەو کاتەدا یەزید لە عوبەیداللە کوڕی زیاد ڕەنجا بوو، بەڵام کاتێك سەرجون وتی: ئەگەر معاویە زیندوو ببێتە، گوێرایەڵی فەرمانەکانی دەبیت؟

وتی: بەڵێ.

سەرجون فەرمانی فەرمانڕەوایەتی عوبەیداللەی لەکوفە دەرهێنا و وتی: ئەمە بۆچوونی معاویە بوو و کاتێك مرد، ئەم نامەی تەسلیم بەمن کرد.

دەڵێت: یەزید ڕازی بوو و فەرمانڕەوایەتی ئەو دوو شارەی بە عوبەیداللە سپارد و فەرمانی خۆی سەبارەت بەکوفە بۆ نارد. دواتر موسلیم کوڕی عەمرۆ باهلی بانگ کرد و فەرمانی فەرمانڕەوایەتی بەسرەی بۆ عوبەیداللە نارد و نووسی:

((بەڵام دواتر: لایەنگرانی من لەخەڵکی کوفە ئاگاداریان کردوومەتەوە کەکوڕی عەقیل لەکوفە خەڵکان کۆدەکاتەوە تا دووبەرەکی و ئاژاوە لەنێوان موسوڵمانان دروست بکات. کاتێك نامەکەی منت خوێندەوە، بەڕێکەوە و بڕۆ لای خەڵکانی کوفە و بەدوای کوڕی عەقیلدا بگەڕێ تا دەیدۆزیتەوە و زیندانی دەکەیت یا دەیکوژیت یا دووری دەخەیتەوە. والسلام)).

دەڵێت: موسلیم کوڕی عەمرۆ بەڕێکەوت و لەبەسرە گەیشتە لای عوبەیداللە کوڕی زیاد. عوبەیداللە فەرمانیدا کەرەستەی پێویست ئامادە بکەن تا بەیانی ڕێگەی کوفە بگرنەبەر.

دەڵێت: حسەین نامەیەکی بۆ خەڵکی بەسرە نووسیبوو.

باوکی عوسمانی نەهدی دەڵێت: حسەین لەیەکێك لەکۆیلەکانی خۆی بەناوی سلێمان نامەیەکی نووسی و پێنج نوسخەی بۆ هەرکام لەسەرکردەکانی پێنج ناوچەکەی بەسرە و گەورەکانی ئەو شارە نارد. کەسانی وەك: مالیك کوڕی مەسمەعی بەکری و ئەحنەف کوڕی قەیس و مونزەر کوڕی جارود و مەسعود کوڕی عەمرۆ و قەیس کوڕی هەیسەم و عەمرۆ کوڕی عوبەیداللە کوڕی مەعمەر. ناوەرۆکی نامەکە:

((بەڵام دواتر، خواوەند، پێغەمبەری (د.خ) لەناو ئافرێنراوەکانی خۆی هەڵبژارد

و پێگەی پێغەمبەری پێبەخشی و ئەوی کردە پێغەمبەری خۆی و دواتر ئەوی بۆ لای خـۆی گەڕانـدەوە کـەمۆجیاری بەنـدەکانی کردبـوو و پەیامەکـەی خـۆی گەیاندبوو. ئێمە بنەماڵە و شوێنکەوتە و میرات هەڵگرانی ئەو بووین ولەهەموو خەڵکان، بۆ جێگەی ئەو، لەناو خەڵکان شیاوتر بووین. بەڵام خەڵك کەسانی دیکەیان پێش ئێمە خست لەکاتێکدا دەمانزانی ماف ئێمە بۆ ئەم کارە لەوکەسانەی جڵەوی کاروبارەکانیان گرتەدەست و چاکسازییان کرد و ماف کەسانی دیکەیان پاراست، زیاتر بوو. خواوەند هەم لەوان خۆشبێت هەم ئێمە. ئێستا نێردراوەکەی خۆم لەگەڵ ئەم نامەدا بۆ لای ئێوە ڕەوانە کردووە و ئێوە بۆ گەڕانەوە بۆ کتێبی خواوەند و سوونەتی پێغەمبەر (د.خ) بانگێشت دەکەم چوونکە سوونەتەکانیان مراندووە و دیاردەی تازەیان لەئیسلام هێناوەتە ئاراوە. ئەگەر وتاری من ببیستن و فەرمانەکانم جێبەجێ بکەن، بۆ ڕێگەی ڕاست ڕێنوێنیتان دەکەم. سلاو و ڕەحمەتی خوا لەئێوە بێت)).

دەڵێت: هەموو سەرکردەکان کاتێك نامەکانیان خوێندەوە، شاردیانەوە جگە لەمونزەر کوڕی جارود چوونکە دەترسا لەوەی ئەم پیلانێکی عوبەیداللە کوڕی زیاد بێت و هەمانشەو کە عوبەیداللە دەیویست بەیانییەکەی بەرەو کوفە بەڕێکەوێت، نامەکەی پێدا. عوبەیداللە نامەکەی خوێندەوە و نێردراوەکەی گرت و کوشتی و دواتر ڕۆشتە سەر مینبەری بەسرە، سپاسی خواوەندی کرد و وتی: ((سوێند بەخوا لەسەختی و دژوارییەکان ترسم نییە، دوژمن و ڕکەبەرەکان لەناو دەبەم.

ئەی خەڵکی بەسرە، سەروەری باوەڕداران، منی وەك کارگوزاری کوفە دەستنیشان کردووە و من بەیانی بۆ ئەو شارە دەڕۆم. عوسمان کوڕی زیاد کوڕی باوکی سوفیانم وەك جێگری خۆم لەم شارە دەستنیشان کردووە، لەنەیاری و ئاژاوەگێری خۆتان بەدوور بگرن. سوێند بەو خوایەی جگە لەو خوایەك نییە، ئەگەر ببیستم کەسێك دەیەوێت ئاژاوە بنێتەوە، خۆی و دارودەستە و هاوڕێکانی دەکوژم. نزیك بەگوناحی کەسانی دوور دەگرم تا گوێڕایەڵی دەکەنە پیشە و دووبەرەکی و ئاژاوە لەناو ئێوەدا نامێنێت. من کوڕی زیادم و زیاتر لەهەموان

هاوشێوەی ئەوم چوونکە هاوشێوەی خاڵ و ئامۆزا، منی لەو جیا نەکردۆتەوە))

دەڵێت: دواتر بەسرەی بەجێهێشت و عوسمانی برای وەك جێگری خۆی دانا و ڕێگەی کوفەی گرتەبەر. موسلیم کوڕی عەمرۆی باهلی و شەریك کوڕی ئەعوەری حارسی و کەسانی دیکە هاوڕێیەتیان دەکرد. کاتێك ڕۆشتە ناو کوفە، دەستارێکی ڕەشی بەسەرەوە بوو و ڕوخساری داپۆشیبوو. خەڵك کە لەهاتنی حسەین ئاگادار بووبوونەوە و چاوەڕوانی هاتنی ئەویان دەکرد، کاتێك عوبەیداللە هات، گومانیان کرد حسەین کوڕی عەلییە. لای هەر دەستەیەك لەخەڵك کەگوزەری دەکرد، سڵاویان لێدەکرد و دەیانوت: بەخێربێیت ئەی کوڕی پێغەمبەری خوا. عوبەیداللە لەم کارە زیاد لەڕادە توڕە بوو.

دەڵێت: کاتێك لەمبارەوە زۆر دووان، موسلیم کوڕی عەمرۆ وتی: بڕۆنە دواوە، ئەمە ئەمیر، عوبەیداللە کوڕی زیادە.

دەڵێت: ئەوەندە بەخێرایی هاتبوو کە لەو کاتەدا ژمارەیان لەدە و چەند کەس تێپەڕی نەدەکرد. کاتێك ڕۆشتە ناو کۆشك و خەڵك زانیان عوبەیداللە کوڕی زیادە، خەمبار و مەلول بوون. عوبەیداللەیش لەوتاری خەڵکان وئەوەی بیستبووی، توڕە بوو، وتی: بۆ خەڵك بەو شێوەیە دەبینم؟

باوکی وەداك وتی: کاتێك عوبەیداللە ڕۆشتە ناو کۆشك، جاڕی نوێژیدا.

دەڵێت: خەڵکان کۆبوونەوە، هاتەدەر و سپاسی خوای کرد و وتی: سەروەری باوەڕداران، منی وەك کارگوزار و فەرمانڕەوای شار و سنوری ئێوە دەستنیشان کردووە و فەرمانی پێداوم، لەگەڵ ستەملێکراوان دادپەروەری بکەمە پیشە و نیازمەندانتان بێ نیاز بکەم، چاکە لەگەڵ کەسانی گوێڕایەڵ و ملکەچ بکەم و لەگەڵ نەیار و دوژمنان توندی بنوێنم. سەبارەت بەئێوە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەوم و جێبەجێیان دەکەم. لەگەڵ چاکەکاران و گوێڕایەڵان هاوشێوەی باوکم چاکەکارم بەڵام شمشێر و قامچی من دژی ئەو کەسەیە کەفەرمانم پشتگوێ بخات یا دژایەتی وتەکانم بکات، هەرکەس بیر لەپاراستنی ماڵ و ژیانی خۆی بکاتەوە.

دەڵێت: لەمینبەر هاتەخوار و بارودۆخی لەگەورەکان و سەردەستەکان دژوار کرد و وتی: بێگانەکان و هەڵاتووان لەدەست سەروەری باوەڕداران و

حەرورییەکان و خەڵکانی گوماناوی و ئاژاوەچییەکانی ناو خۆتان بۆ من بنووسن. هەرکەس ناوەکان بنووسێت، لێپرسراویەتی لەسەر شان نامێنێت و هەرکەس نایبنووسێت دەبێت دەستەبەری ئەوە بکات کەس لەخەڵکەکەی ئەو دژایەتی ئێمە نەکات و هەرکەس دەستەبەری نەکات، لەلایەن ئێمەوە پشتیوانی لێناکرێت و ماڵ و خوێنی بۆ ئێمە حەلاڵە. هەر سەردەستەیەك ئەگەر کەسێك لەنەیارانی سەروەری باوەڕداران لەناو دەستەکەیدا بێت، لەماڵەکەی خۆی لەدار دەدرێت و مانگانەی ئەو دەستەیە هەڵدەوەشێنرێتەوە و بۆ عەممان دوور دەخرێنەوە.

عیسا کوڕی یەزیدی کەنانی دەڵێت: کاتێك نامەی یەزید، بەدەستی عوبەیداڵڵە کوڕی زیاد گەیشت، لەخەڵکانی بەسرە پێنسەد کەسی هەڵبژارد، کەسانی وەك عەبدوڵڵە کوڕی حارس کوڕی نەوفل و شەریك کوڕی ئەعوەر کەشیعەی عەلی بوو. یەکەم کەس لەڕێگەدا کەوت، شەریك بوو و کەسانی دیکەیش کەوتن و وەستان بەو هیوایەی عوبەیداڵڵە سەرقاڵی ئەوان بێت و حسەین کوڕی عەلی زووتر بگاتە کوفە. بەڵام عوبەیداڵڵە گرنگی بەوان نەدا و بەڕێکەوت تا گەیشتە قادسیە. لەقادسیە میهرانی کۆیلەی لەپێکەوت کەپێی وت: ئەی میهران ئەگەر لەم بارودۆخە خۆت بگریت تا دەگەینە کۆشك، سەد هەزار درهەمت پێدەدەم.

وتی: نا، سوێند بەخوا ناتوانم.

دەڵێت: عوبەیداڵڵە لەئەسپەکەی دابەزی و چەند پارچەیەکی ڕەنگاوڕەنگی یەمەنی هەڵگرت و لەسەری پێچا و سوار ئێسترەکەی بوو. دواتر دابەزی و پیادە بەڕێکەوت و کاتێك لەبازگەی پاسەوانەکان نزیك دەبوویەوە و سەیریان دەکرد، گومانیان نەبوو کەحسەین کوڕی عەلییە و پێیان دەوت: ئەی کوڕی پێغەمبەری (د.خ) خوا، بەخێربێیت. بەڵام ئەو وەڵامی نەدەدانەوە.

دەڵێت: خەڵکان لەماڵەکانی خۆیان دەهاتنە لای و نەعمان کوڕی بەشیر دەنگی ئەوانی بیست و دەرگای لەسەر خۆی و کەسەکانی داخست. کاتێك عوبەیداڵڵە گەیشتە لای، گومانی دەکرد کەحسەینە. ئەو خەڵکەی لەگەڵ ئەودا بوون، دەنگیان بەرز کردەوە. نەعمان قسەی لەگەڵ کرد و وتی: سوێندت دەدەم بەخوا ڕوو لەویلایەتێکی دیکە بکەیت چوونکە ئەمانەتی خۆم تەسلیم بەتۆ ناکەم و نیازم

بەکوشتنی تۆ نییە. بەڵام عوبەیدالله وەڵامی نەدەدایەوە. عوبەیدالله نزیك بوویەوە و نەعمان لەنێوان دوو بالکۆنەی کۆشکەکە، بۆ خوارەوە چەمایەوە. عوبەیدالله قسەی لەگەڵ کرد و وتی: دەرگا بکەرەوە، خوا نەتبەخشێت، شەوێکی درێژمان بەسەر بردووە. یەکێك لەپشتەوە دەنگی بیست و گەرایەوە بۆ ناو خەڵکان و وتی: ئەی خەڵکینە، سوێند بەو خوایەی جگە لەو خوایەك نییە، ئەمە کوڕی مەرجانەیە.

دەڵێت: نەعمان دەرگای کردەوە و عوبەیدالله ڕۆشتە ژوور و دەرگایان بەسەر خەڵکدا بەست و بلاوەیان لێکرد.

بەرەبەیان عوبەیدالله ڕۆشتە سەر مینبەر و وتی: ئەی خەڵکینە، دەزانم ئەو کەسانەی دوژمنی حسەین بوون، کاتێك گومانیان کرد، حسەین هاتۆتە ناو شارەکەیان و دەستی بەسەر شارەکەدا گرتووە، شوێنم کەوتن و گوێڕایەڵی خۆیان نیشاندا، سوێند بەخوا کەس لەئێوەم نەناسیوە.

دەڵێت: دواتر لەمینبەر هاتەخوار و ئاگادار بوویەوە کەموسلیم کوڕی عەقیل لەشەوێك پێشتر، هاتۆتە ناو کوفە.

دەڵێت: یەکێك لەموالییەکانی مناڵەکانی تەمیمی بانگ کرد و بڕە پارەیەکی پێدا و وتی: وەك کەسێکی شیعە خۆت نیشان بدە و ئەم پارەی بۆ ببە و بڕۆ بۆ لای هانی و موسلیم و لای ئەوان جێگەی خۆت بکەرەوە.

دەڵێت: ئەو کەسە ڕۆشتە لای هانی و وتی شیعەیە و پارەی هێناوە.

دەڵێت: کاتێك شەریك کوڕی ئەعوەر هات، نەخۆش بوو، بەهانی وت: بەموسلیم بڵێ با لای من بێت چوونکە عوبەیدالله بۆ سەردانی من دێت.

هەروەها شەریك بەموسلیمی وت: ئەگەر عوبەیدالله بێنمە بەردەستی تۆ، بەشمشێر لێی دەدەیت؟

وتی: بەڵێ، سوێند بەخوا ئەو کارە دەکەم.

دەڵێت: عوبەیدالله لەماڵی هانی، سەردانی شەریك کوڕی ئەعوەری کرد. شەریك بەموسلیمی وتبوو: کاتێك بیستت کەداوای ئاو دەکەم، وەرە ژوور و بەشمشێر لەعوبەیدالله بدە.

دەڵێت: عوبەیدالله لای جێگەکەی ئەعوەر دانیشتبوو و میهران لەپشت سەری

عوبەیدالله بوو.

شەریك وتی: ئاوم بۆ بێنن. ژنێك كاسە بەدەست هات بەڵام موسلیمی بینی و گەڕایەوە.

جارێكی دیكە شەریك وتی: ئاوم بۆ بێنن. و جاری سێیەم وتی: هاوار لەئێوە، ئاوم بۆ بێنن ئەگەر تەنانەت ببێتە هۆكاری مەرگم.

دەڵێت: میهران هەستی پێكرد و ئیشارەی بۆ عوبەیدالله كرد كە لەشوێنەكەی هەستا.

شەریك وتی: ئەی ئەمیر، دەمەوێ وەسیەت لای تۆ بكەم.

وتی: بۆ لای تۆ دەگەڕێمەوە.

میهران ئەوی بەخێرایی برد و وتی: سوێند بەخوا مەبەستی كوشتنی تۆ بوو.

وتی: چۆن شتی وا دەبێت، من ڕێزم لەشەریك گرت و لەماڵی هانیدا بووم كەباوكم چاكەی لەگەڵ كردووە.

دەڵێت: كاتێك عوبەیدالله گەڕایەوە، ئەسما كوڕی خارجە و محەممەد كوڕی ئەشعەسی بانگ كرد و وتی: هانی بێننە لای من.

وتیان: تا ئەمان وەرنەگرێت، نایێت.

وتی: ئەمان بۆچی، مەگەر چی كردووە. بڕۆن ئەگەر بێ وەرگرتنی ئەمان نەهات، ئەمانی پێببەخشن.

دەڵێت: ئەوان ڕۆشتنە لای هانی و ئاگاداریان كردەوە.

وتی: ئەگەر بڕۆمە بەردەستی، دەمكوژێت.

بەڵام پێداگرییان كرد تا ئەویان برد. عوبەیدالله وتاری نوێژی هەینی دەخوێند، هانی لەكۆڕەكەی دانیشتبوو. پرچی بەهەردوولادا شۆڕ كردبوویەوە. دوای خوێندنی نوێژ، عوبەیدالله، هانی بانگ كرد كەدوای ئەو ڕۆشتە ژوور و سڵاوی كرد.

عوبەیدالله وتی: هانی مەگەر نازانی كەباوكم هاتە ئەم شارەوە و هەموو شیعەكانی كوشت جگە لەباوكی تۆ و حوجر. بەسەرهاتی حوجر بەوشێوە بوو كەدەزانی. دوای ئەوە بەردەوام حەزی لەهاونشینی تۆ دەكرد و نامەی بۆ

کارگوزاری کوفە نووسی و پێی وت نیازێکم لای تۆ هەیە و ئەویش هانییە؟

وتی: بۆ؟

وتی: پاداشتی من ئەوە بوو یەکێك لەماڵەکەت بشاریتەوە تا من بکوژێت؟

وتی: ئەو کارەم نەکردووە؟

دەڵێت: ئەو پیاوە تەمیمییەی وەك سیخوڕی ئەوان دانابوو، بانگی کرد و کاتێك هانی ئەوی بینی، زانی عوبەیداڵڵەی لەهەموو شتێك ئاگادار کردۆتەوە و وتی: ئەی ئەمیر بەوشێوە بوو کەئاگادار کراویتەوە، بەڵام پشتیوانیم لەتۆ دریغ ناکەم، تۆ و کەسەکانت لەئەماندان، بۆ کوێ دەخوازن بڕۆن.

دەڵێت: عوبەیداڵڵە پەشۆکا و میهران کە داربەدەست لەپشت سەریەوە وەستابوو، وتی: چ ڕیسواییەك! ئەم بەندە، لەناو سنووری خۆت ئەمانت پێدەبەخشێت!

عوبەیداڵڵە وتی: بیگرە.

میهران داردەستەکەی هاویشت و دوو پرچی هانی گرت و ڕوخساری بەرز کردەوە. عوبەیداڵڵە داردەستەکەی هەڵگرت و کێشای بەڕوخساری هانیدا. ئاسنی داردەستەکە دەرهات و لەدیوارەکە چەقی. ئەوەندە لەڕوخساریدا تا لووت و دەم و چاوی شکا. خەڵکان دەنگەدەنگەکەیان بیست و تایەفەی مەزحەج ئاگادار بوونەوە و هاتن و دەوری ماڵەکەیان گرت.

عوبەیداڵڵە فەرمانیدا و هانییان فڕدایە ژوورێکەوە. دەنگی مەزحەجییەکان بەرز بوویەوە. عوبەیداڵڵە بەمیهرانی وت شورەیح بێنێت. میهران ڕۆشت و شورەیحی هێنا و ئەوی بۆ لای هانی نارد و کەسێکی کردە هاوڕێی ئەو. هانی وتی: ئەی شورەیح دەبینی، چ بەڵایەکی بەسەر هێنام؟

وتی: تۆ هێشتا زیندوویت.

وتی: زیندووم بەو شێوەی کەدەبینی؟ بەخەڵکەکەی من بڵێ ئەگەر بڕۆن من دەکوژێت.

دەڵێت: شورەیح ڕۆشتە لای عوبەیداڵڵە و وتی: ئەوم بەزیندوویی بینی، بەڵام برینەکانی قورسە.

وتی: پەسەندی ناکەیت فەرمانڕەوایەك ژێردەستەکانی خۆی سزا بدات؟ بڕۆ لای خەڵك و ئاگاداریان بکەرەوە.

دەڵێت: شورەیح ڕۆشتەدەر و عوبەیدالله فەرمانی بەو پیاوەدا لەگەڵی بڕوات.

شورەیح بەخەڵکانی مەزحەجی وت: ئەم نەزانییە چییە؟ هانی زیندووە و فەرمانڕەوا تەنیا لێیداوە و مەترسی لەسەر گیانی نییە. بڕۆن و مەبنە ئەرك بۆ خۆتان و هاوڕێکەتان. خەڵکان بلاوەیان لێکرد.

باوکی وەداك دەڵێت: شەریك کوڕی ئەعوەر لەماڵی هانی کوڕی عوروەی موردای جێگیر بوو. شەریك شیعە بوو و هاوڕێ لەگەڵ عەمار بەشداری جەنگی سەفینی کردبوو. موسلیم کوڕی عەقیل لەهاتنی عوبەیدالله کوڕی زیاد و وهەڕەشەکانی و تەنگ هەڵچنین بەسەرکردەی خەڵکان ئاگادار بوویەوە و لەماڵەکەی موختار هاتەدەر چوونکە شوێنەکەی بۆ هەمووان ئاشکرا بووبوو. موسلیم ڕوویکردە ماڵی هانی و ڕۆشتە ژوور و کەسی بۆ لای هانی نارد.

دەڵێت: هانی هات و کاتێك ئەوی بینی، لەهاتنەکەی نیگەران بوو.

موسلیم وتی: هاتووم پەنام بدەیت و بمکەیتە میوانی خۆت.

وتی: خوا بتبەخشێت، داواکەت قورسە و دژوار. ئەگەر نەهاتبوویتە ناو ماڵەکەم و باوەڕت بەمن نەکردبوو، داوام لێدەکردیت بڕۆیت، بەلام ڕێز و پێگەی تۆ ڕێگرە لەوەی بڵێم ماڵەکەم بەجێبێڵیت. کەسێکی وەك من بەنەزانی کەسێکی وەك تۆ لەخۆی دوور ناخاتەوە. فەرموو.

دەڵێت. دواتر ئەوی بردە ژوور و پەنای پێبەخشی و شیعەکان لەماڵی هانی سەردانیان دەکرد.

دەڵێت: کوڕی زیاد یەکێك لەکۆیلەکانی خۆی بەناوی مەعقەل بانگ کرد و پێی وت: سێ هەزار درهەم هەڵگرە و بڕۆ بەدوای موسلیم کوڕی عەقیلدا بگەڕێ و هاوڕێکانی بدۆزەرەوە و ئەم سێ هەزار درهەمەیان پێبدە و بڵێ بۆ جەنگ دژ بەدوژمنەکانیان کەڵکی لێوەربگرن. پێیان بڵێ کەیەکێکی لەوان و کاتێك ئەم پارەیان پێبدەیت، ئەوان باوەڕت پێدەکەن و هیچ شتێکت لێ ناشارنەوە. دواتر شەوان و بەرەبەیانان سەردانیان بکە.

دەڵێت: کۆیلە ئەو کارەی کرد و بیستی کەخەڵکان دەڵێن: ئەم کەسە بەیعەت بۆ حسەین وەردەگرێت. هات و دانیشت تا موسلیم کۆتایی بەنوێژەکەی هێنا و پێی وت: ئەی بەندەی خوا، یەکێکم لەخەڵکانی شام، موالی زوئەلکەلاع، خواوەند خۆشەویستی ئەم خەڵکەی پێبەخشیوم. سێ هەزار درهەمم هێناوە تا ئەو کەسە ببینم کەدەڵێن هاتۆتە کوفە و بەیعەت بۆ کوڕی کچی پێغەمبەری (د.خ) خوا وەردەگرێت. بەدوای ئەودا دەگەڕێم و کەسم نەدۆزییەوە من بۆ لای ئەو ڕێنوێنی بکات. ئێستا لەمزگەوت دانیشتبووم کەچەند کەس لەموسوڵمانان وتیان: ئەمە ئەو کەسەیە ئەندامانی ئەو بنەماڵەیە دەناسێت، هاتمە لای تۆ، تا ئەم سامانە وەربگریت و بمبەیتە لای هاورێکەی خۆت تا بەیعەتی لەگەڵ ببەستم. ئەگەر دەتەوێت، پێش ئەوەی بمبەیتە لای ئەو، بەیعەتم لێ وەربگرە.

موسلیم کوڕی عەوسەجە وتی: سپاس بۆ خواوەند کەهاتیتە لای من. شادمانم لەوەی بەمەبەستەکەی خۆت گەشتوویت و خواوەند بەهۆی کەسانی وەك تۆ، هاوکاری پێغەمبەر (د.خ) و بنەماڵەکەی دەکات، بەڵام دڵگرانم لەوەی پێش ئەوەی ئەم کارە بەسەرکەوتن بگات، منت ناسی چوونکە لەو ستەمکارە خوێنرێژە دەترسم. دواتر پێش ئەوەی بڕوات، بەیعەت و بەڵێنی قورسی لێوەرگرت تا چاکەخواز بێت و ڕازدار. کۆیلەی زیاد بەڵێنیدا و موسلیم شادمان بوو. دواتر پێی وت: چەند ڕۆژێك سەردانم بکە تا لەهاورێکەم مۆڵەتی سەردانت بۆ وەربگرم.

دەڵێت: دوای ئەوە مەعقەل لەگەڵ کەسانی دیکە سەردانی ماڵی موسلیمی دەکرد تا ئەوەی مۆڵەتی سەردانیان بۆ وەرگرت. لەم ناوەدا هانی کوڕی عوروە نەخۆش کەوت. عوبەیداڵڵە کوڕی زیاد بۆ سەردانی هات. عەمارە کوڕی عوبەیدی سەلولی بەهانی وتبوو: کۆبوونەوەی ئێمە و ڕێگەچارەی ئێمە، کوشتنی ئەم ستەمکارەیە، ئێستا کەخواوەند ئەوەی هێناوەتە بەردەستی تۆ، خوێنی بڕێژە.

هانی وتبووی: نامەوێت لەماڵەکەی مندا بکوژرێت.

دەڵێت: حەفتەیەك تێپەڕی و شەریك کوڕی ئەعوەر نەخۆش کەوت. ئەو لای کوڕی زیاد و کارگوزارانی دیکە، کەسێکی ڕێزدار بوو. عوبەیداڵڵە کەسی نارد و ئاگاداری کردەوە: ئەمشەو بۆ سەردانی تۆ دێم.

دەڵێت: شەریك بەموسلیمی وت: ئەم خراپەکارە ئەمشەو سەردانی من دەکات، کاتێك دانیشت، وەرە و خوێنی بڕێژە و دواتر بڕۆ ناو کۆشك چوونکە کەس ڕێگریت لێناکات. ئەگەر دوای ئەم ڕۆژانە باشبوومەوە، ڕوودەکەمە بەسرە و کاروباری ئەو شارەیشت بۆ ڕێکدەخەم.

دەڵێت: کاتێك شەو داهات و عوبەیداللە سەردانی ماڵی شەریکی کرد، موسلیم هەستا چوونکە شەریك وتبووی کاتێك دانیشت مۆڵەتی پێمەدە بەلاّم هانی کوڕی عوروە هەستا و وتی: نامەوێت لەماڵەکەی مندا بکوژرێت. وەك بڵێی ئەم کارەی بەقێزەون دەزانی.

دەڵێت: عوبەیداللە کوڕی زیاد هات و دانیشت. لەنەخۆشییەکەی شەریکی پرسی و وتی: چۆن و کەی نەخۆش کەوتیت؟ کاتێك پرسیارەکانی زۆر بوو و شەریك بینی کەهێشتا موسلیم نەهاتووە، ترسا ئەم دەرفەتە لەدەست بچێت و دەیوت: چاوەڕوانی چین کە درود بۆ سەملی نانێرن؟ ئاوم بۆ بێنن تەنانەت ئەگەر ببێتە هۆکاری مردنم. دووجار یا سێ جار ئەم وتانەی دووبارە کردەوە.

عوبەیداللە کەهەستی بەهیچ نەکردبوو، وتی: چی دەڵێت؟ ئایا وڕێنە دەکات؟

هانی وتی: خوا بتبەخشێت، بەلاّم لەبەیانییەوە بەمشێوەیە وڕێنە دەکات.

دواتر عوبەیداللە هەستا و ڕۆشت و موسلیم هات. شەریك وتی: بۆ نەتکوشت.

وتی: بەدوو هۆکار، یەك ئەوەی هانی نەیدەویست لەماڵەکەی ئەودا بکوژرێت، دووەم حەدیسێك کە لە پێغەمبەر (د.خ) گێڕاویانەتەوە کەئیمان و بڕوا، لەناکاو کوشتنی کەسێك بەڕەوا نازانێت و کەسی باوەڕدار بەشێوەیەکی لەناکاو کەس ناکوژێت.

هانی وتی: سوێند بەخوا ئەگەر ئەوت دەکوشت، کەسێکی خراپەکارت دەکوشت بەلاّم حەزم نەکرد لەماڵەکەی مندا بکوژرێت.

دەڵێت: شەریك کوڕی ئەعوەر دوای سێ ڕۆژ لەم بەسەرهاتە مرد و کوڕی زیاد هات و نوێژی لەسەر جەنازەکەی خوێند.

دەڵێت: دوای ئەوەی کوڕی زیاد، هانی و موسلیمی کوشت، پێیان وت: وتەکانی ئەو شەوەی شەریك، هانی موسلیمی دەدا تا بێت و تۆ بکوژێت.

عوبەیداللە وتی: سوێند بەخوا چیتر لەسەر جەنازەی هیچکام لەخەڵکانی عێراق نوێژ ناخوێنم. ئەگەر گۆڕی زیاد لێرە نەدەبوو، گۆڕی شەریکم هەڵدەدایەوە.

دەڵێت: مەعقەل کۆیلەی زیاد کەکوڕی زیاد ئەوی لەگەڵ سێ هەزار درهەم بۆ لای موسلیم کوڕی عەقیل و هاوەڵانی ناردبوو، چەند ڕۆژێك هاتووچۆی موسلیم کوڕی عەوسەجەی کرد تا ئەوەی ئەوی بردە لای موسلیم کوڕی عەقیل. دوای مەرگی شەریك ئەوی بردە لای موسلیم کوڕی عەقیل و بەسەرهاتی ئەوی بەتەواوی گێڕایەوە. موسلیم بەیعەتی لێوەرگرت و فەرمانی بەباوکی تەمامەی سایدیدا پارەی کابراکە وەربگرێت. کۆکردنەوەی دیاری و سامانەکان لەئەستۆی باوکی تەمامەی سایدی بوو کەسیلاح و شمشێری بۆ هاوەڵانی موسلیم دەکری چوونکە لەم کارەدا شارەزا و یەکێك لەشاسوارەکانی عەرەب و شیعە بوو.

دەڵێت: ئەو پیاوە بەردەوام هاتووچۆی ئەوانی دەکرد، یەکەم کەس دەهات و دوواهەمین کەس دەڕۆشت، هەواڵەکانی دەبیست و لەنهێنییەکان ئاگادار دەبوویەوە. دواتر دەڕۆشت و کوڕی زیادی لەهەموو شتێك ئاگادار دەکردەوە.

دەڵێت: هانی هاتووچۆی کوڕی زیادی دەکرد و کاتێك موسلیم لەماڵەکەی ئەو جێگیر بوو، چیتر سەردانی کوڕی زیادی نەکرد و خۆی بەنەخۆش نیشاندا و لەماڵەکەی نەهاتەدەر.

کوڕی زیاد بەهاودەم و هاونشینەکانی خۆی وت: بۆ هانی نابینم؟ وتیان: نەخۆشە. وتی: ئەگەر دەمزانی نەخۆشە، سەردانم دەکرد.

موجالید کوڕی سەعید دەڵێت: عوبەیداللە، محەممەد کوڕی ئەشعەس و ئەسما کوڕی خارجەی بانگ کرد.

باوکی میحنەف لەحسەین کوڕی عوقبەی موورادی دەگێڕێتەوە کەکوڕی زیاد، عەمرۆ کوڕی حەجاجی زوبەیدی لەگەڵ ئەواندا نارد.

هەروەها باوکی میحنەف لەباوکی وەداك دەگێڕێتەوە کەرەوعە خوشکی عەمرۆ کوڕی حەجاج، ژنی هانی کوڕی عوروە و دایکی یەحیا کوڕی هانی بوو.

دەڵێت: عوبەیداللە پێی وتن: بۆ هانی سەردانی ئێمە ناکات؟

وتیان: خوا بتبەخشێت، نازانین، پێمان وابێت نەخۆشە.

وتی: بیستوومە باش بۆتەوە و لەبەردەرگای ماڵەکەی خۆی دادەنیشێت. پێی بڵێن ئەرکەکانی سەرشانی پشتگوێ نەخات چوونکە حەز ناکەم کەسانی وەك ئەو (کە لەسەرکردەکانی عەرەبن) ڕێز و پێگەی خۆیان لای من لەدەست بدەن.

دەڵێت: ئەو دوو کەسە (یا سێ کەسە) ڕۆشتنە لای هانی و لەئێوارێدا ئەویان بینی کە لەبەردەرگای ماڵەکەی دانیشتبوو. وتیان: بۆ سەردانی ئەمیر ناکەیت؟

وتی: نەخۆشی ڕێگە نادات.

وتیان: پێیان وتووە کەشەوانە لەبەردەرگای ماڵەکەت دادەنیشیت، ئەمیر چاوەڕوانی تۆیە، ئەو ناتوانێت بەرگەی چاوەڕوانی و گۆشەگیری بگرێت، سوێندت دەدەین لەگەڵ ئێمەدا بێیت.

دەڵێت: هانی داوای جلوبەرگی کرد، لەبەری کرد و ئێسترێکی داوا کرد و سوار بوو، کاتێك لەکۆشك نزیك کەوتەوە، وەك بڵێی شتێکی بەمێشکدا هاتبێت، بەئەسما کوڕی خارجەی وت: ئەی برازا، سوێند بەخوا من لەم پیاوە دەترسم. بۆچوونی تۆ چییە؟

وتی: سوێند بەخوا مامەگیان سەبارەت بەتۆ نیگەرانی هیچ شتێك نیم، بۆ خۆت پەرێشان کردووە؟

دەڵێن: ئەسما نەیدەزانی عوبەیداللە بۆچی ئەوی ناردووە، بەڵام محەممەد ئاگادار بوو.

دەڵێت: ئەوان ڕۆشتنە لای کوڕی زیاد. هانیش لەگەڵیان ڕۆشت و کاتێك دەرکەوت، کوڕی زیاد وتی: ئەوەی ئەجەلی هاتبوو، بەپێی خۆی هات.

دەڵێت: لەو کاتەدا عوبەیداللە لەگەڵ دایکی نافیع کچی عەمارە کوڕی عوقبە پەیوەندی هاوسەرگیری دەبەست.

دەڵێت: کاتێك هانی لەکوڕی زیاد نزیك بوویەوە کەشورەیحی قازی لای ئەو دانیشتبوو. سەیری دەکرد و هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

((من ژیانی ئەوم دەوێت

بەڵام ئەو مەبەستی کوشتنی منیەتی))

دەڵێت: کوڕی زیاد سەرەتا ڕێزی لەهانی گرت و بەشێوەیەکی ڕێزدارانە مامڵەی

لەگەڵ کرد.

هانی وتی: ئەی ئەمیر، مەبەست لەم بانگێشتە چییە؟

وتی: بەسە هانی! ئەم کارانە چییە، بۆ لەماڵەکانت دژی سەروەری باوەڕداران و موسوڵمانان پیلان دادەڕێژیت، موسلیم کوڕی عەقیلت هێناوە و لەماڵەکەی خۆت جێگیرت کردووە و لەماڵەکانی دەوروبەر، پیاو و سیلاحت بۆ کۆکردۆتەوە و گومان دەکەیت، ئەم بابەتە لەچاوی من دوور دەبێت.

وتی: کاری لەو شێوەم نەکردووە و موسلیم لای من نییە.

وتی: دڵنیام ئەو کارەت کردووە.

وتی: نەمکردووە.

وتی: کردووتە.

دەڵێت: کاتێک ئەم قسە دووبارە بوویەوە و هانی بەردەوام حاشای دەکرد، کوڕی زیاد، سیخوڕەکەی یانی مەعقەلی کۆیلەی بانگ کرد کەهات و لای کوڕی زیاد وەستا. بەهانی وت: ئەم پیاوە دەناسیت؟

وتی: بەڵێ. هانی زانی مەعقەل سیخوڕی ئەوان بووە و هەواڵەکانی بۆ کوڕی زیاد هێناوە. کەمێك تێڕاما. دواتر وتی: گوێ لەوتەکانم بگرە و قسەکانم بەڕاست بزانە، سوێند بەخوا درۆت لەگەڵ ناکەم، سوێند بەو خوایەی جگە لەو خوایەك نییە، من ئەوم بانگێشتی ماڵەکەم نەکردووە و لەکارەکانی ئەو ئاگادار نەبووم تا ئەو کاتەی بینیم لەبەردەگای ماڵەکەم دانیشتووە و داوای لێکردم لەماڵەکەم جێگیر ببێت. شەرمم کرد ئەگەر بەداواکەی ڕازی نەبم. ئەوم لەماڵەکەم جێکردەوە و ڕێزم گرت و پەنام پێبەخشی. کارەکانی بەوشێوەیە کەئاگادار بوویتەوە. ئێستا پەیمان دەدەم تا دڵنیا بیت چوونکە خراپەی تۆم ناوێت. ئەگەر دەخوازێت کەسانێك وەك بارمتە لای تۆ دادەنێم بۆ ئەوەی دڵنیا بیت دەگەڕێمەوە لای تۆ. ئەگەر ڕێگە بدەیت، دەگەڕێمەوە بۆ ماڵ و پێی دەڵێم ماڵەکەم بەجێبێڵێت و بۆ کوێ دەخوازێت بڕوات.

وتی: نا، سوێند بەخوا لای من ناڕۆیت تا ئەو دەهێنیتە لای من.

وتی: نا، سوێند بەخوا هەرگیز ئەو ناهێنمە لای تۆ. میوانەکەم بێنمە لای تۆ تا

بیکوژیت؟

وتی: سوێند بەخوا دەبێت بیهێنیت.

وتی: سوێند بەخوا نایهێنم.

دەڵێت: کاتێك ئەم قسانە دووبارە بوونەوە، موسلیم کوڕی عەمرۆ باهلی- لەکوفە تەنیا ئەو خەڵکی بەسرە و شام بوو- کەسەرسەختی و پێداگری هانی لەبەرابەر کوڕی زیاد سەبارەت بەتەسلیم کردنی موسلیم بینی، هەستا و وتی: خواوەند ئەمیر ببەخشێت، ئەو بەمن بسپێرە تا قسەی لەگەڵ بکەم.

دواتر بەهانی وت: وەرە ئێرە با قسەت لەگەڵ بکەم.

دەڵێت: هانی هەستا و ئەوی بردە سووچێکی چۆڵ. بەلام لەکوڕی زیاد نزیك بوون بەشێوەیەك کەدەیبینین و ئەگەر بەدەنگی بەرز قسەیان دەکرد، دەیبیست و ئەگەر بەهێواشی قسەیان دەکرد، تێنەدەگەیشت. دواتر موسلیم بەهانی وت: سوێندت دەدەم بەخوا خۆت بەکوشتن مەدە و عەشیرەکەت گرفتاری بەلا و بەدبەختی مەکە. سوێند بەخوا پێم ناخۆشە خۆت بەکوشتن بدەیت -هانی گومانی دەکرد عەشیرەکەی بەرگری لێدەکەن- ئەم پیاوە ئامۆزای ئەم خەڵکەیە، ئەو ناکوژن و زیانی پێناگەیێنن. ئەو تەسلیم بەکوڕی زیاد بکە چوونکە بەهۆیەوە ڕیسوا نابیت و ڕێزت کەم نابێتەوە.

وتی: بۆنا، سوێند بەخوا بەم کارە ڕیسوا دەبم، میوانەکەم تەسلیم بکەم و خۆم زیندوو وتەندروست بم و ببیستم و ببینم و کەسانێکی زۆرم لەدەور بێت. سوێند بەخوا ئەگەر یەك کەس هاوکاری نەدەکردم، میوانەکەم تەسلیم ناکەم تا لەپێناو بەرگری کردن لەو گیانم دەبەخشم.

موسلیم ئەوی سوێند دەدا و هانی دەیوت: سوێند بەخوا هەرگیز ئەو تەسلیم ناکەم.

دەڵێت: کوڕی زیاد ئەمەی بیست و وتی: بیهێنن. کاتێك ئەویان نزیك کردەوە، وتی: سوێند بەخوا دەبێت موسلیم بێنیت جیاواز لەوە سەرت دەبڕم.

وتی: ئەو کاتە بروسکەی شمشێرەکان دەوری کۆشکەکەت دەدەن. هانی گومانی دەکرد عەشیرەکەی پشتیوانی لێدەکەن.

وتی: ئەی بەدبەخت، من لەبروسکەی شمشێرەکانت دەترسێنیت.

دواتر وتی: زیاتر نزیکی بکەنەوە.

کاتێک نزیکیان کردەوە، بەداردەستەکەی لەسەر و ڕوخساریدا بەشێوەیەک لووت و ڕوخسار و ناوچاوی شکا و خوێن بەسەر چەناکەیدا هاتەخوار و گۆشتی دەم و چاوی شۆڕ بوویەوە و داردەستەکەی دەستی کوڕی زیاد شکا.

دەڵێت: هانی دەستی بۆ شمشێری یەکێک لەپاسەوانەکان برد بەڵام پاسەوانەکە ڕێگەی نەدا شمشێرەکەی لێوەربگرێت.

کوڕی زیاد وتی: بوویتە حروروی، شیاوی سزادانیت. خوێنی تۆ بۆ ئێمە حەڵاڵە. بیگرن و لەیەکێك لەژوورەکان زیندانی و دەرگای لەسەر دابخەن. ئەو کارەیان کرد.

دەڵێت: ئەسما کوڕی خارجە هەستا و وتی: ئێمە نێردراوە خیانەتکارەکان بووین. فەرمانت بەئێمەدا بڕۆین و ئەم پیاوە بێنینە لای تۆ و کاتێك هێنامان، لێتدا و سەر و ڕوخساریت شکاند و خوێنت ڕژاند و سوێند دەخۆیت کەدەیکوژیت.

عوبەیدالله کوڕی زیاد وتی: تۆ هێشتا لێرەیت. فەرمانی گرتنی ئەویدا و ئەشکەنجەیان کرد. دواتر دەستیان هەڵگرت و زیندانییان کرد.

بەڵام محەممەد کوڕی ئەشعەس وتی: فەرمانی ئەمیر هەرچی بێت و لەبەرژەوەندی ئێمەدا بێت یا لەزیانمان، شادمانین ئەگەر ئەمیر تەمێمان بکات.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی حەجاج هەواڵی کوژرانی هانی پێگەیشت و لەگەڵ خەڵکانی مەزحەج هات و گەمارۆی کۆشکەکەیدا. ژمارەیەکی زۆری لەگەڵدا بوو. دواتر جارپدا و دەنگی بەرز کردەوە کە: من کوڕی حەجاجم و ئەمانە شاسوار و گەورەکانی مەزحەجن. نەسەرپێچمان کردۆتە پیشە و نە لەموسوڵمانان جیا بووینەتەوە. ئاگادار بووینەوە کەهاورێکەیان دەکوژن و ئەمە بەکارەساتێکی گەورە دەبینین.

دەڵێت: بەعوبەیداللەیان وت: خەڵکی مەزحەج لەدەرەوەی کۆشکن.

عوبەیدالله بەشورەیحی قازی وت: بڕۆ لای هاورێکەیان و ببینە و دواتر بڕۆ و

پێیان بڵێ کەزیندووە و نەکوژراوە و تۆ ئەوت بینیوە.

دەڵێت: شورەیح ڕۆشت و هانی بینی.

عەبدولڕەحمان کوڕی شورەیح دەڵێت: بیستم کەباوکم بەئیسماعیل کوڕی تەڵحەی دەوت:

(( ڕۆشتمە لای هانی و کاتێك منی بینی، وتی: ئەی موسوڵمانان، عەشیرەکەی من مردوون! باوەڕداران چییان بەسەر هاتووە! دانیشتووانی شار لەکوێن! لەناوچوون و منیان لەگەڵ دوژمنەکەیان و کوڕی دوژمنەکەیان بەتەنیا جێهێشتووە! خوێن لەڕیشی دەچۆڕا. لەم کاتەدا دەنگەدەنگی لەدەرەوەی کۆشکەکە بیست. من هاتمەدەر و ئەویش بەدوامدا هات و وتی: ئەی شورەیح، گومان دەکەم ئەمە دەنگی هاوەڵانی من لەخەڵکی مەزحەجە و ئەو موسوڵمانانەی هاوڕێی منن، ئەگەر دەکەس بێن، ڕزگارم دەکەن)).

شورەیح دەڵێت: من ڕۆشتمە لای ئەوان. حەمید کوڕی بەکری ئەحمەریشم لەگەڵ بوو. کوڕی زیاد ئەوی لەگەڵ من ناردبوو. یەکێك بوو لەو پاسەوانانەی لەسەر سەری زیاد دەوەستا. کاتێك گەیشتمە لایان، وتم: کاتێك ئەمیر لەهاتنی ئێوە و وتەکانتان سەبارەت بەهاوڕێکەتان ئاگادار بوویەوە، فەرمانی بەمندا برۆمە لای. کاتێك ڕۆشتم و ئەوم بینی، پێی وتم: بێمە لای ئێوە و پێتان بڵێم کەزیندووە و هەواڵی کوژرانی ئەو بەدرۆ بەئێوە گەیشتووە.

دەڵێت: عەمرۆ و هاوڕێکانی وتیان: سپاس بۆ خوا کەنەکوژراوە. ڕۆشتن.

محەممەد کوڕی بەشیری هەمەدانی دەڵێت: کاتێك کوڕی زیاد لەهانیدا و زیندانی کرد، ترسا لەوەی خەڵك شۆڕش بکەن، لەبەر ئەمە ڕۆشتەدەر و چووە سەر مینبەر. سەرکردەکانی خەڵك و پاسەوانەکان و هاوڕێکانی لەگەڵدا بوون، سپاسی خوای کرد و دواتر وتی: ئەی خەڵکینە، گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خواوەند و سەروەری باوەڕداران بن، ئاژاوە مەنێنەوە چوونکە لەناو دەچن و ڕیسوا دەبن و دەکوژرێن و ڕووبەڕووی توندوتیژی دەبنەوە. برای ئێوە کەسێکە ڕاستییەکانتان پێدەڵێت. هەرکەس ئێوەی لەمەترسییەکان ئاگادار کردەوە، پاساو بۆ کەس ناهێڵێتەوە.

دەڵێت: دەیویست لەمینبەرەکە بێتەخوار و هێشتا لەسەر مینبەرەکە بوو کەبینەران لەلای بازاری خورما فرۆشەکانەوە، بەخێرایی هاتنە ناو مزگەوت و دەیانوت: کوڕی عەقیل هات. عوبەیداللە بەخێرایی ڕۆشتە ناو کۆشك و دەرگاکانی بەست.

عەبدوڵڵە کوڕی حازم دەڵێت: سوێند بەخوا من نێردراوی کوڕی عەقیل بۆ کۆشکی کوڕی زیاد بووم تا بزانم چ بەڵایەك بەسەر هانی هاتووە.

دەڵێت: کاتێك لێیاندا و زیندانییان کرد، سوار ئەسپەکەم بووم و بینیم چەند کەس لەژنەکانی تایەفەی موراد کۆبوونەتەوە و هاوار دەکەن: ئەی هاوار لەم بەڵایە، هاوار لەم کارەساتە. ڕۆشتمە لای کوڕی عەقیل و ئاگادارم کردەوە. فەرمانی پێدام سوپاکەی و هاوەڵانی کۆبکەمەوە.ماڵەکانی دەوروبەر پڕ بوو لەهاوڕێیان و شوێنکەوتەکانی ئەو. نزیکەی هەژدە هەزار کەس بەیعەتیان لەگەڵ بەستبوو. چوار هەزار کەس لەماڵەکانی دەوروبەردا بوون. پێی وتم: جاڕبدە و هاوار بکە و بڵێ ئەی مەنسور وەرە. جاڕمدا. خەڵکی کوفەیش جاریاندا و کۆبوونەوە. موسلیم، عوبەیداللە کوڕی عەمرۆ کوڕی عەزیزی کیندی وەك سەرکردەی خەڵکانی کیندە و ڕەبیعە هەڵبژارد و وتی: لەگەڵ سوارەکان، پێش من بەرێکەوە. دواتر موسلیم کوڕی عەوسەجەی ئەسەدی وەك سەرکردەی خەڵکانی مەزحەج و ئەسەد دەستنیشان کرد و وتی: لەگەڵ پیادەکان بەڕێکەوە چوونکە سەرکردەی ئەوانیت. کوڕی سەمامەی سامدی وەك سەرکردەی خەڵکانی هەمەدان و تەمیم دەستنیشان کرد و عەباس کوڕی جەعدەی جەدەلی وەك سەرکردەی دانیشتووانی بەرد. دواتر بەرەو کۆشك بەڕێکەوت و کاتێك کوڕی زیاد لەهاتنی ئەو ئاگادار بوویەوە، پەنای بۆ کۆشکەکەی برد و دەرگاکانی بەست.

عەباسی جەدەلی دەڵێت: کاتێك لەگەڵ کوڕی عەقیل بەڕێکەوتین، چوار هەزار کەس بووین، بەڵام هێشتا نەگەشتبووینە کۆشك کەسێسەد کەس ماینەوە.

دەڵێت: موسلیم لەگەڵ خەڵکانی موراد هاتەپێش و گەمارۆی خستە سەر کۆشکەکە. دواتر خەڵکان لەدەوری ئێمە کۆبوونەوە و زۆری نەخایاند کەمزگەوت و بازاڕ لەسوارەکان پڕ بوو. هاتنی خەڵك تا شەو بەردەوام بوو. بارودۆخ بۆ

عوبەیدالڵە دژوار بوو. پاراستنی کۆشك دژوار بوو چوونکە جگە لەسی پاسەوان و بیست کەس لەسەرکردەکانی خەڵك و کۆیلەکانی کەسیتری لەگەڵدا نەبوو.

سەرکردەکانی خەڵك لەدەرگای پشتەوە دەڕۆشتنە لای کوڕی زیاد. ئەوانەی لەناو کۆشکدا بوون، لەسەرەوە سەیری خەڵکیان دەکرد و دەترسان بەردبارانیان بکەن و جوێنیان پێبدەن و هەروەها جوێن بە عوبەیدالڵە و باوکی بدەن.

دەڵێت: عوبەیدالڵە، کەسیری کوڕی شەهابی حارسی بانگ کرد و فەرمانی پێدا لەگەڵ شوێنکەوتەکانی خۆی لەخەڵکی مەزحەج بڕوات و بەناو کوفەدا بسووڕێتەوە و خەڵك لەکوڕی عەقیل دوور بخاتەوە و لەجەنگ بیانترسێنێت و لەسزای حکومەت ئاگاداریان بکاتەوە. فەرمانی بەمحەممەد کوڕی ئەشعەسیشدا کە لەگەڵ شوێنکەوتەکانی خۆی لەهۆزی کێندە و حەزرەموت بڕوات و بۆ ئەو کەسانی لەدەوری ئەو کۆدەبنەوە، ئالآی ئەمان هەڵبکات، فەرمانێکی هاوشێوەی بەقەعقاع کوڕی شوری زوهەلی و شیبس کوڕی رەبعی تەمیمی و حەجار کوڕی ئەبجەری عیجلی و شیمر کوڕی زوئەلجەوشەنی عامریشدا و سەرکردەکانی دیکەی خەڵکی لای خۆی هێشتەوە تا هاوکارییان لێوەربگرێت چوونکە ژمارەی کەسەکانی خۆی کەم بوو.

دەڵێت: کەسیر کوڕی شەهاب ڕۆشتەدەر تا خەڵکان لەدەوری موسلیم کوڕی عەقیل دووربکاتەوە.

کوڕی جەنابی کەلبی دەڵێت: کەسیر یەکێك لەخەڵکانی کەلبی بینی بەناوی عەبدولعەلی کوڕی یەزید کەسیلاحی هەڵگرتبوو و لەگەڵ ژمارەیەك لەمناڵەکانی فەتیان کەدەیویست پەیوەستی کوڕی عەقیل بێت، ئەوی گرت و بردییە لای کوڕی زیاد کەپێی وت: مەبەستم هاتن بۆ لای تۆ بوو.

کوڕی زیاد وتی: بەڵێنت بەمندا و فەرمانی هێشتنەوەی ئەویدا.

دەڵێت: محەممەد کوڕی ئەشعەسیش ڕۆشت و لەنزیكماڵەکانی مناڵەکانی عەمارە وەستا. عەمارە کوڕی سەلخەبی ئەزدی هات کەدەیویست پەیوەستی کوڕی عەقیل بێت. ئەوی گرت و بردییە لای کوڕی زیاد و ئەوی هێشتەوە.

دەڵێت: موسلیم کوڕی عەقیل لەمزگەوتەوە، عەبدولڕەحمان کوڕی شورەیحی

شـەبامی بـۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی کـوڕی ئەشـعەس ڕەوانـە کـرد و کاتێـك کـوڕی ئەشعەس زۆری ژمارەی ئەوانی بینی، پاشەکشێ کردنی دەستپێکرد.

قەعقاع کوڕی شوری زوهـەلی کەسـی بۆ لای محەممـەد کوڕی ئەشعەس نـارد و ئاگـاداری کـردەوە کەلـە عـەرارەوە هێرشـی کردۆتـە سـەر کـوڕی عـەقیل. دواتـر لەجێگەکەی خۆی پاشەکشێی کـرد و لـەلای دار ئەلرومییینـەوە گەڕایـەوە بـۆ لای کـــوڕی زیـــاد و کاتێـــك کەســـیر کـــوڕی شـــەهاب و محەممـــەد و قـــەعقاع و شوێنکەوتەکانیان کەهـەموویان لایـەنگری کوڕی زیـاد بوون، لای ئـەو کۆبوونـەوە، کەسیر پێی وت: خواوەنـد ئـەمیر ببەخشێت، لەکۆشك، ژمارەیـەکی زۆر لەخەڵك و پاسەوانەکان و کۆیلەکانی تۆ دەبینـرێن، ئێمـە بۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی نـەیارەکانت ببە.

بەڵام عوبەیداللە ڕازی نەبوو و ئالآیەکی بۆ شەبس کوڕی ڕەبعی بەست و ئەوی بۆ دەرەوە نارد.

دەڵێـت: خـەڵك لەگـەڵ کـوڕی عەقیلـدا بـوون و تـا ئێـوارێ، تـەکبیریان دەوت و لەجموجوڵـدا بـوون. عوبەیداللـە کەسـی بـۆ لای سـەرکردەکان نـارد و ئـەوانی کۆکردەوە و وتـی: لەسـەرەوەی کۆشك قسە لەگـەڵ خـەڵکان بکـەن و بـەڵێنی زیـاتر کردنـی مانگانـە و داهـات بەگوێڕایـەڵان بـدەن و نافـەرمانان لەئـەنجامی کارەکانیـان بترســێنن و پێیــان بڵــێن، ســوپا لەشــامەوە بــۆ ڕووبەڕووبونــەوەی نــەیاران بەڕێکەوتووە.

عەبدوللە کوڕی حازمی کەبیری لەمناڵەکانی کەبیری ئـەزد دەڵێت: سـەرکردەکان لەسەرەوەی کۆشك دەرکەوتن، کەسیر کوڕی شەهاب پێش هەمووان دەستی بەقسە کردن کرد و تا نزیك ئاوابوونی خۆر قسەی کرد، وتی: ئەی خەڵکینـە، بۆ لای مـاڵ و منالی خۆتان بگەڕێنەوە و بۆ هەڵگیرسانی ئاژاوە و فیتنە پەلـە مەکەن و خۆتـان ڕووبەڕووی کوشتن مەکەنەوە. سوپای یەزید، سەروەری باوەڕداران دەگـات. ئـەمیر بڕیاریـداوە ئەگـەر ئـەم شـەو بـۆ جـەنگ پێـداگری بکـەن و نـەڕۆن، لەتالآنییـەکان بێبەشتان دەکـات و شـەڕکەرانتان لەگۆڕەپانـەکانی شام بڵاو دەکاتـەوە بـێ ئـەوەی مانگانــەیان پێبــدات، کەســانی تەندروســت لــەجیاتی نەخۆشــەکان دەگرێـت و

ئامادەبووان لەجێگەی ئامادەنەبووان، تا کەس لەیاخییان و نافەرمانان نەمێنێتەوە سزای کارەکەی خۆی نەبینێت.

سەرکردەکانی دیکەیش هاوشێوەی ئەو قسەیان کرد و کاتێك خەڵکان وتەی ئەوانیان بیست، بڵاوبوونەوە و ڕۆشتن.

موجالید کوڕی سەعید دەڵێت: دەبینرا ژنەکان دەهاتنە لای کوڕ یا براکەی خۆیان و دەیانوت: با بڕۆین، ئەوانەی دەمێننەوە، بەسە. پیاوەکان دەهاتنە لای کوڕ یا براکەی خۆیان و دەیانوت: بەیانی سوپای شام دەگات، لەم جەنگە چی بەدەست دێنێت، با بڕۆین و ئەوی لەگەڵ خۆی دەبرد. بەمشێوەیە خەڵك بڵاوەیان لێدەکرد و دەڕۆشتن بەشێوەیەك لەکاتی شەو، زیاتر لەسی کەس لەگەڵ کوڕی عەقیل لەمزگەوت نەمایەوە و کاتێك نوێژی ئێوارێی خوێند، تەنیا سی کەس نوێژی لەگەڵ خوێند.

دەڵێت: موسلیم کاتێك بینی جگە لەو دەستەیە کەسی لەگەڵ نەماوەتەوە، ڕوویکردە کۆڵانەکانی کێندە و کاتێك گەیشت، دە کەس هاوڕێیەتی دەکرد و کاتێك لەکۆڵانەکان گوزەری کرد، کەسی لەگەڵدا نەمابوو. کاتێك لەدەورووبەری خۆی ڕوانی، کەسی نەبینی بۆ ئەوەی ڕێنوێنی بکات یا ڕێگەی ماڵەوەی نیشان بدات یا ئەگەر دوژمنێك ڕووبەڕووی بێتەوە، پارێزگاری لێبکات. بەمشێوەیە لەکۆڵانەکانی کوفە سەرگەردان دەڕۆشت تا گەیشتە دەرگای ژنێك بەناوی توعە کەکەنیزی ئەشعەس کوڕی قەیس بوو. (لەئەشعەس مناڵی بوو). ئەشعەس ئەم ژنەی ئازاد کردبوو و ئەسیدی حەزرەمی ئەوی وەك هاوسەر هەڵبژاردبوو و بیلالی هێنابووە دنیا. بیلال لەگەڵ خەڵکان ڕۆشتبووە دەر و دایکی چاوەڕوانی گەڕانەوەی ئەوی دەکرد.

دەڵێت: کوڕی عەقیل سڵاوی لەژنە کرد و وەڵامی دایەوە. دواتر پێی وت: ئەی کەنیزی خوا، کەمێك ئاوم بدەرێ.

ژنەکە ڕۆشتە ژوور و تێراوی کرد.

کوڕی عەقیل دانیشت. ژنەکە قاپەکەی بردە ژوور و گەڕایەوە و وتی: ئەی بەندەی خوا، مەگەر ئاوت نەخوارد؟

وتی: بۆنا، خواردم.

وتی: کەواتە بگەڕێرەوە بۆ لای کەس و کارت.

بەڵام کوڕی عەقیل بێدەنگ بوو.

ژن دووبارە وتەکەی دووبارە کردەوە، بەڵام کوڕی عەقیل بێدەنگ بوو و پێی وت: لەخوا بترسە، سبحان الله ئەی بەندەی خوا، بگەڕێوە بۆ لای کەس و کارت خوا بتبەخشێت. دانیشتن لەبەردەرگای من گونجاو نییە و بەکارێکی باشی نازانم.

کوڕی عەقیل هەستا و وتی: ئەی کەنیزی خوا، لەم شارەدا ماڵ و تایەفەم نییە. دەتەوێت کارێکی باشە ئەنجام بدەیت، ئەگەری هەیە دواتر بتوانم پاداشتی کارەکەت بدەمەوە.

وتی: ئەی بەندەی خوا، چ کارەیت؟

وتی: من موسلیم کوڕی عەقیلم، ئەم خەڵکە درۆیان لەگەڵ کردم و فریویان دام.

وتی: تۆ موسلیمیت؟

وتی: بەڵێ.

وتی: وەرە ژوور.

دەڵێت: ئەوی بردە ژوورێکی ماڵەکەی، ڕاخەرێکی بۆ ڕاخست و نانی بۆ هێنا بەڵام نەیخوارد.

دەڵێت: زۆر زوو کوڕی ئەو ژنە گەڕایەوە و بینی دایکی زۆر هاتوچۆی ئەو ژوورە دەکات، وتی: سوێند بەخوا لەم هاتوچۆ کردنەت بۆ ئەو ژوورە گومان دەکەم، شتێك ڕوویداوە.

وتی: کوڕم واز لەوە بێنە.

وتی: سوێند بەخوا دەبێت پێم بڵێیت.

وتی: کوڕم ئەوەی بەتۆی دەڵێم، نابێت لای کەس باسی بکەیت.

دەڵێت: دواتر سوێندیدا و کوڕەکە سوێندی خوارد و دایك هەموو شتێکی بۆ گێڕایەوە. کوڕەکە بێدەنگ بوو و خەوت.

دەڵێت: کەسێکی سەرسەری بوو. دەستەیەك وتوویانە لەگەڵ هاوڕێکانی خۆی مەی دەخواردەوە.

دەڵێت: ماوەیەك تێپەڕی و كوڕی زیاد دوای ئەوەی دەنگی هاوەڵانی عەقیلی نەبیست، بەهاوەڵانی خۆی وت: لەسەرەوە سەیر بكەن بزانن كەس لەوان دەبینن؟ كاتێك سەیریان كرد، كەسیان نەبینی.

كوڕی زیاد وتی: جوان بڕوانن ئەگەری هەیە لەژێر سێبەرەكاندا بن و بۆسەیان نابێتەوە. سەیری هەموو شوێنێكی مزگەوتیان كرد. بڵێسەكانی ئاگریان بەدەست بۆ خوارەوە نارد تا شوێنەكەیان بۆ ڕووناك بكاتەوە. دواتر چراكانیان بەتەنافەكانەوە بەست و شۆڕیان كردەوە و زۆر كاری دیكە. دوای ئەوەی كەسیان نەبینی، كوڕی زیادیان ئاگادار كردەوە. كوڕی زیاد دەرگای ڕووبەڕووی مزگەوتی كردەوە و ڕۆشتە سەر مینبەر. هاوەڵانیشی بەدوایدا ڕۆشتن و پێش نوێژی خەوتنان لەدەوری كۆبوونەوە. فەرمانی بەعەمرۆ كوڕی نافیعدا جاڕ بدات: هەركەس لەپاسەوانەكان و سەردەستەكان و بڕواپێكراوان یا جەنگاوەران، ئەگەر نوێژی خەوتنان لەمزگەوت نەخوێنێت، پێگە و جێگەی خۆی لەدەست ددات.

زۆری نەخایاند مزگەوت لەخەڵكان پڕ بوو. دواتر بانگی نوێژیان بەرز كردەوە. حەسین كوڕی تەمیم وتی: ئەگەر دەتەوێت نوێژ لەگەڵ خەڵكان بكە یا كەسێكی دیكە ئەو كارە بكات، تۆ بگەڕێرەوە بۆ كۆشك چوونكە دەترسم یەكێك لەدوژمنەكانت بەناكاو بتكوژێت.

وتی: بەپاسەوانەكانم بڵێ وەك هەمیشە لەپشت سەرمەوە ڕیز ببەستن چوونكە ناگەڕێمەوە بۆ ناو كۆشك.

دەڵێت: نوێژی لەگەڵ خەڵكان خوێند. دواتر هەستا و سپاسی خواوەندی كرد و وتی: كوڕی عەقیلی نەزان، ئەم ئاژاوە و دووبەرەكییەی دروست كرد. ئەو لەماڵی هەركەسێك بدۆزمەوە، ڕێز و پێگەی لەدەست دەدات و هەركەس ئەو بێنێت، خوێنباییەكەی وەردەگرێت. ئەی بەندەكانی خوا، لەخوا بترسن و ملكەچ و فەرمانڕەوا بن و خۆتان ڕووبەڕووی مەترسی مەكەنەوە. ئەی حەسین كوڕی تەمیم ئەگەر یەكێك لەدەربەندەكانی كوفە بكرێتەوە یا ئەم پیاوە بڕواتەدەر و ئەو نەهێنیتە لای من، دایك لەپرسەكەتا دادەنیشێت. دەسەڵاتی تەواوی كوفەم پێداویت، پاسەوانەكان لەسەر ڕێگەكان دابنێ و بەربەیانان ماڵەكانی كوفە بگەڕێ

تا ئەو پیاوە دەدۆزیتەوە و دەیهێنیتە لای من.

دەڵێت: حەسین سەرکردەی پاسەوانەکان و یەکێك لەمناڵەکانی تەمیم بوو.

دەڵێت: کوڕی زیاد لەمینبەر هاتەخوار و گەڕایەوە بۆ ناو کۆشك و ئالآیەکی بۆ عەمرۆ کوڕی حورەیس بەست و ئەوی کردە سەرکردەی خەڵکان. کاتێك بەیانی بوویەوە، دانیشت و خەڵکان دەوریان گرت. محەممەد کوڕی ئەشعەسیش هات. کوڕی زیاد پێی وت: سلآو لەو کەسەی فریو ناکات و جێگەی گومان نییە. دواتر ئەوی لای خۆی دانیشاند.

دەڵێت: کوڕی ئەو پیرێژنە، بیلال کوڕی ئەسید کەدایکی پەنای بەکوڕی عەقیل بەخشیبوو، بەرەبەیان ڕۆشتە لای عەبدولڕەحمان کوڕی ئەشعەس و ئاگاداری کردەوە کەکوڕی عەقیل لەماڵی دایکیەتی.

دەڵێت: عەبدولڕەحمان ڕۆشتە لای باوکی کەلای کوڕی زیاد دانیشتبوو و بەهێواشی بەگوێیدا چرپاند.

کوڕی زیاد پێی وت: چی دەڵێت؟

وتی: دەڵێت کوڕی عەقیل لەیەکێك لەماڵەکانی ئێمەدایە.

کوڕی زیاد وتی: هەستە و هەر ئێستاکە بیهێنە.

قودامە کوڕی سەعیدی سەقەفی دەڵێت: کاتێك کوڕی ئەشعەس هەستا بڕوات بۆ ئەوەی کوڕی عەقیل بێنێت، کوڕی زیاد کەسی بۆ لای عەمرۆ کوڕی حورەیس نارد کە لەو کاتەدا لەمزگەوت بوو، وتی: شەست یا حەفتا کەس لەگەڵ کوڕی ئەشعەس ڕەوانە بکە و دەبێت هەموویان لەتایەفەی قەیس بن.

دەڵێت: نەیویست لەتایەفەی ئەشعەس کەس بنێرێت چوونکە دەیزانی هیچ تایەفەیەك ناخوازێت کوڕی عەقیل لەناو ئەواندا بدۆزنەوە.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی عوبەیداڵڵەی سولەمی لەگەڵ شەست یا حەفتا کەس لەتایەفەی قەیسی لەگەڵ ئەو نارد کەڕوویان کردە ئەو ماڵەی کوڕی عەقیل لەوێ بوو. کوڕی عەقیل کاتێك دەنگی ئەسپەکانی بیست، زانی بۆ گرتنی ئەو هاتن و شمشێر بەدەست هاتەدەر.

هێرشبەران، پەلاماری ماڵەکەیاندا. موسلیم بەشمشێر هێرشی دەبرد و

دەیوەشاند تا لەماڵەکە دووری خستنەوە. دواتر جارێکی دیکە هێرشیان برد و دووبارە بەرەنگاریان بوونەوە. شمشێرێك لەنێوان موسلیم و بوکەیر کوڕی حیمرانی ئەحمەری ئاڵوگۆڕ کرا. بوکەیر گورزێکی لەدەمی موسلیمدا کەلێوی سەرەوەی قەڵشت و قرتاندی و نووکی شمشێرەکە لەلێوی خوارەوەی چەقی و دوو ددانی پێشەوەی شکاند. موسلیمیش گورزێکی قورسی لەسەریدا و شمشێرێکی بۆ شانی داهێنا کەزۆری نەمابوو لەسکی بچەقێت. کاتێك ئەمەیان بینی، لای سەرەوەیان لێگرت وبەردبارانیان کرد. قامیشیان ئاگر تێبەردەدا و دەیانهاویشتە خوار. موسلیم کاتێك ئەمەی بینی، شمشێر بەدەست هاتە ناو کۆڵانەکە و جەنگی دەستپێکرد.

محەممەد کوڕی ئەشعەس هاتەپێش و وتی: ئەی موسلیم، لەئەماندایت، بۆ خۆت بەکوشتن دەدەیت. بەڵام ئەو دەجەنگا و هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( سوێندم خواردووە وەك ئازادەیەك بمرم

هەرچەند مەرگ کەم و دەگمەن بێت

هەرکەس ڕۆژێك گرفتاری شەڕ دەبێت

تیشکی خۆر بێنەپێش تا پایەدار بیت

چوونکە دترسم درۆ بکەن و فریوم بدەن)).

محەممەد کوڕی ئەشعەس وتی: سوێند بەخوا درۆ ناکەن و فریوت نادەت و فێڵت لیّ ناکەن. ئەوان کوڕە مامەکانی تۆن، تۆ ناکوژن و ئەشکەنجەت نادەن.

موسلیم بەهۆی بەردەکانەوە هێزی لێبڕابوو و توانای جەنگانی نەمابوو، هەناسە برکێی پێکەوت و پشتی بەدیواری ماڵەکەوەدا. محەممەد کوڕی ئەشعەس لێی نزیك بوویەوە و وتی: لەئەماندایت؟

وتی: لەئەماندام؟

وتی: بەڵیّ.

ئەوانی دیکەیش وتیان: بەڵیّ تۆ لەئەماندایت. جگە لەعەمرۆ کوڕی عوبەیداللەی سولەمی کەوتی: ئەمە پەیوەندی بەمنەوە نییە و خۆی بەدوور گرت.

کوڕی عەقیل وتی: ئەگەر ئەمانتان پێ نەدەدام، دەستم نەدەخستە ناو دەستی ئێوە.

دەڵێت: ئێسترێکیان هێنا و سوار ئێسترەکەیان کرد و لەدەوری کۆبوونەوە. شمشێرەکەیان لێسەند. لەم کاتەدا وەك بڵێی لەگیانی خۆی بێ هیوا بوو، فرمێسك لەچاوەکانی کۆبوویەوە و وتی: ئەمە سەرەتای خیانەتە.

محەممەد کوڕی ئەشعەس وتی: هیوادارم هیچ مەترسییەکت لەسەر نەبێت.

وتی: تەنیا هیواداری؟ مەگەر ئەمانتان پێنەبەخشیم، انا لله و انا الیه راجعون. دەستی بەگریان کرد.

عەمرۆ کوڕی عوبەید پێی وت: هەکەرس بەدوای شتێکدا بگەڕێت کەتۆ دەگەڕایت و بەو شتە بگات کەتۆ گەشتیت، نابێت بگری.

وتی: سوێند بەخوا بۆ خۆم ناگریم، بەداخ نیم بۆ ئەوەی دەکوژرێم، هەرچەند هەرگیز بیرم لەمەرگی خۆم نەکردۆتەوە، بەڵام بۆ کەسەکانم دەگریم کەبۆ لای من دێن، بۆ حسەین و بنەماڵەی حسەین دەگریم.

دواتر ڕوویکردە محەممەد کوڕی ئەشعەس و وتی: ئەی بەندەی خوا، سوێند بەخوا دەزانم توانای پاراستنی منت نییە، ئایا دەتوانیت کارێکی باشەم لەگەڵ بکەیت، لەلای خۆتەوە کەسێك بۆ لای حسەین بنێرە تا لەزمانی منەوە پەیامی بۆ ببات، دەزانم ئەمرۆ لەگەڵ بنەماڵەکەی خۆی بەرەو ئێرە بەڕێکەوتووە یا بەیانی بەڕێدەکەوێت و ئەوەی دەبینی خەمبار و دڵ پەرێشانم، هۆکارەکەی ئەوەیە. پێی بڵێت: کاتێك کوڕی عەقیل منی بۆ لای تۆ نارد، ئەسیری دەستی خەڵکان بوو و دەیزانی دەکوژرێت، وتی با لەگەڵ بنەماڵەکەت بگەڕێیتەوە، فریوی خەڵکی کوفە مەخۆ چوونکە ئەو کەسانەن باوکت (عەلی کوڕی ئەبی تالیب) ئارەزووی دەکرد بەمەرگ یا کوژران لەوان جیا ببێتەوە. خەڵکی کوفە درۆیان لەگەڵ کردیت، درۆیشیان لەگەڵ من کرد و کەسانی درۆزن، بۆچوون و بڕیاریان جێگەی بڕوا نییە.

کوڕی ئەشعەس دەڵێت: سوێند بەخوا ئەو کارە دەکەم و بەکوڕی زیادیش دەڵێم کەئەمانم پێبەخشیویت.

جەعفەر کوڕی حوزەیفەی تایی دەڵێت (سەعید کوڕی شەیبانیش ئەم گێڕانەوەی پشتڕاست کردەوە)، دەڵێت: محەممەد کوڕی ئەشعەس، بەئەیاس کوڕی عەسلی تایی کەپیاوێکی شاعیر بوو و هاتوچۆی محەممەدی دەکرد، وت: برۆ لای حسەین کوڕی عەلی و ئەم نامەی بەدەست بگەیێنە. لەنامەکەدا وتەکانی کوڕی عەقیل نووسرابوو و وتی: ئەمە توێشوو و ئەمە کەرەستەی پێویست و ئەمە بەشی ماڵ و منداڵەکەت.

وتی: ئەی چوارپێ، چوونکە چوارپێکەم لەپێ کەوتووە.

وتی: ئەوە چوارپێ، سواربە و بەڕێکەوە.

دەڵێت: ئەیاس ڕۆشت و لەزوباڵە (چوار مەنزڵی کوفە) حسەینی بینی و لەپێشهات و ڕووداوەکان ئاگاداری کردەوە و نامەکەی پێدا.

حسەین پێی وت: ئەوەی چارەنووس بێت، ڕوودەدات، قەزا و قەدەری خۆمان و خراپەکاری ئەم خەڵکە بەخوا دەسپێرین.

دەڵێت: کاتێك موسلیم کوڕی عەقیل ڕۆشتە ماڵی هانی و هەژدە هەزار کەس بەیعەتیان لەگەڵ بەست، بەعابس کوڕی باوکی شەبیبی شاکری، نامەیەکی بۆ حسەین کوڕی عەلی نووسی:

((پێشەنگ درۆ لەگەڵ کەسەکانی خۆی ناکات، هەژدە هەزار کەس لەخەڵکانی کوفە بەیعەتیان لەگەڵ بەستووم، کاتێك نامەکەم بەدەستی تۆ گەیشت، لەزووترین کات بەڕێکەوە چوونکە خەڵك هەمووان لەگەڵ تۆن و خوازیاری جیابوونەوە لەبنەماڵەی معاویەن. والسلام)).

دەڵێت: محەممەد کوڕی ئەشعەس، کوڕی عەقیلی بردە کۆشك و داوای مۆڵەتی کرد. کوڕی زیادیان ئاگادار کردەوە کەکوڕی بوکەیر بەشمشێر لەکوڕی عەقیلی داوە، وتی: دوور بێت.

محەممەد کوڕی ئەشعەس سەبارەت بەبەخشینی ئەمان بەموسلیم قسەی کرد.

عوبەیدالڵە وتی: تۆ چۆن ئەمان دەبەخشیت، ئێمە تۆمان نەنارد ئەمانی پێ ببەخشیت، تۆمان نارد ئەومان بۆ بێنیت. کوڕی ئەشعەس بێدەنگ بوو.

دەڵێت: کوڕی عەقیل کاتێك گەیشتە بەر دەرگای کۆشك، تینوو بوو. لە

بەردەرگای کۆشک، چەند کەسێك چاوەڕوانی مۆڵەتی ڕۆشتنە ژووریان دەکرد کەعەمارە کوڕی عوقبەبە کوڕی باوکی موعیت و عەمرۆ کوڕی حورەیس و موسلیم کوڕی عەمرۆ و کەسیر کوڕی شەهاب لەناویاندا دەبینران.

قودامە کوڕی سەعد دەڵێت: کاتێك موسلیم کوڕی عەقیل گەیشتە بەردەرگای کۆشك، گۆزەیەك ئاوی فێنکی لێبوو، وتی: کەمێك لەو ئاوەم پێ بدەن.

موسلیم کوڕی عەمرۆ وتی: دەبینی کەزۆر فێنك و ساردە، سوێند بەخوا یەك دڵۆپی لێ ناخۆیت تا لەئاگری جەهەننەم ئاوی کوڵاو بخۆیت.

کوڕی عەقیل پێی وت: هاوار لەتۆ، تۆ کێیت؟

وتی: من کوڕی کەسێکم کەکاتێك تۆ حاشات لەڕاستییەکان دەکرد، ئەو ڕاستییەکانی ناسیبوو و کاتێك فێڵت لەپێشەوا کرد، چاکەخوازی ئەو بوو و کاتێك ئاژاوەگێریت کردە پیشە، ئەو گوێڕایەڵ و ملکەچ بوو، من موسلیم کوڕی عەمرۆ باهلیم.

کوڕی عەقیل وتی: دایکت لەپرسەتا دانیشێت، چەندە ستەمکار و دڵڕەقیت، تۆ ئەی کوڕی باهیلە، زیاتر لەمن شیاوی بۆ ئەوەی لەجەهەننەمدا بسووتێیت.

دەڵێت: موسلیم کوڕی عەقیل دانیشت وپاڵی بەدیوارەکەوەدا.

قودامە کوڕی سەعد دەڵێت: عەمرۆ کوڕی حورەیس کۆیلەکەی خۆی نارد و گۆزەیەك ئاوی هێنا و دەرخواردیدا.

سەعید کوڕی مەدرەك کوڕی عەمارە دەڵێت:عەمارە کوڕی عەقەبە، کۆیلەکەی خۆی بەناوی قەیسی نارد کەگۆزەیەکی هێنا و پارچەیەکی پێوە بوو. کاسەیەکیشی لەگەڵ گۆزەکەدا هێنا. ئاوی کردە ناو کاسەکە و بەموسلیمیدا و کاتێك دەیویست لەئاوەکە بخواتەوە، کاسەکە پڕ دەبوو لەخوێن. کاتێك بۆ جاری سێیەم کاسەکەی پڕ کردەوە و ویستی بیخواتەوە، دوو ددانی کەوتە ناو کاسەکە و وتی: سپاس بۆ خوا، ئەگەر ڕۆژی من دەبوو، تا ئێستا لێم خواردبوو.

دەڵێت: موسلیم کوڕی عەقیلیان بردە لای کوڕی زیاد. وەك ئەمیر سڵاوی لێنەکرد. پاسەوان وتی: بۆ سڵاو لەئەمیر ناکەیت؟

وتی: ئەگەر مەبەستی کوشتنی منی هەبێت، بۆ سڵاوی لێ بکەم و ئەگەر

مەبەستی کوشتنی منی نەبێت، سوێند بەگیانی خۆم، هەزار سڵاوی بۆ دەنێرم.

کوڕی زیاد پێی وت: سوێند بەگیانی خۆم، دەکوژرێت.

وتی: هەر بەمشێوەیە؟

وتی: بەڵێ.

وتی: ڕێگە بدە لای یەکێك لەخەڵکەکەم، وەسیەت بکەم.

دەڵێت: دواتر سەیری هاونشینەکانی عوبەیداللەی کرد کەعومەر کوڕی سەعد لەناویاندا دەبینرا.

پێی وت: ئەی عومەر، پەیوەندی خزمایەتی لەنێوان من و تۆدا هەیە، من پێویستم بەتۆیە و ئەنجامدانی نیازەکەم، ئەرکی سەرشانی تۆیە. ئەمە نهێنییە.

دەڵێت: بەڵام عومەر نەیدەویست مۆڵەتی قسە کردنی پێبدات.

بەڵام عوبەیداللە پێی وت: گوێ لەنیازی کوڕە مامەکەت بگرە.

دەڵێت: عومەر هەستا و لەگەڵ موسلیم لەسووچێکدا دانیشت و کوڕی زیاد سەیری دەکردن. موسلیم پێی وت: من لەکوفە نزیکەی حەوتسەد درهەم قەرزارم، لەو کاتەوەی هاتووم، وەرم گرتووە، لەمنەوە قەرزەکەم بۆ بدەرەوە. داوا لەکوڕی زیاد بکە جەنازەی من بەتۆ ببەخشێت و دواتر بەخاکم بسپێرە. کەسێك بۆ لای حسەین کوڕی عەلی بنێرە و بیگەڕێنەرەوە چوونکە ئاگادارم کردۆتەوە کەخەڵك هەموو لەگەڵ ئەون و دڵنیام ئێستا بەڕێکەوتووە.

عومەر بەکوڕی زیادی وت: دەزانی چی بەمن دەڵێت؟ ئەمە وەسیەتەکەیەتی.

کوڕی زیاد وتی: ئەمانەتدار خیانەت ناکات. بەڵام هەندێکات بەناچاری خیانەتکارەکان دەکەنە ئەمانەتدار. سامانی خۆت، تایبەتە بەخۆت و هەر چۆنێك خەرجی بکەیت، پەیوەندی بەمنەوە نییە. بەڵام حسەین ئەگەر مەبەستی هێرش کردنە سەر ئێمە نەکات، هێرشی ناکەینەسەر. جەنازەکەی بەتۆ نابەخشم چوونکە بەبۆچوونی من شیاوی ئەوە نییە لەبەر ئەوەی دژایەتی ئێمەی کردووە و بۆ لەناو بردنی ئێمە هەوڵیداوە.

بەوتەیەك، وتی: بەڵام جەنازەکەی، کاتێك کوشتمان، پەیوەندی بەئێمەوە نییە چی لەجەنازەکەی دەکەن.

دەڵێت: دوای ئەوە کوڕی زیاد وتی: هێی! کوڕی عەقیل! خەڵکان کۆك و تەبا بوون، هاتی دووبەرەکی و ئاژاوە بنێیتەوە و ئەوان بۆ شەڕی یەکتر ناچار بکەیت.

وتی: هەرگیز، من نەهاتووم، خەڵکی شار دەیانوت: باوکی تۆ، باب و باپیران و چاکەکارانی ئەوانی کوشتووە و خوێنی ڕژاندوون و هاوشێوەی کەسرا و قەیسر مامڵەیان لەگەڵ دەکەیت و ئێمە هاتین تا دادپەروەری بکەینە پێشە و پێشنیاری گەڕانەوە بۆ کتێبی خواوەند بکەین.

وتی: ئەی خراپەکار، تۆ کارت بەم کارانە چییە، مەگەر ئەو کاتەی تۆ لەمەدینە شەرابت دەخوارد، ئێمە بەمشێوە لەگەڵ خەڵکان هەڵس و کەوتمان دەکرد؟

وتی: من شەرابم دەخوارد؟ سوێند بەخوا، خوا دەزانێت کەتۆ ڕاستگۆ نیت و لەخۆوە ئەم قسەت هێنایە سەرزمان و من بەو شێوە نیم تۆ باسم دەکەیت. ئەو کەسەی خوێنی خەڵکان دەمژێت و مرۆڤێك دەکوژێت کەکوشتنی حەرامە و بێ تۆڵە، کەسەکان دەکوژێت و خوێنی ناڕەوا دەڕژێت و لەبەر توڕەیی و گومان سەری کەسەکان دەپەڕێنێت و سەرقاڵی ڕابواردن و بەزمی دنیایە وەك بڵێی هەرگیز کارێکی ناڕەوای نەکردووە، زیاتر شیاوە بەشەرابخۆر ناوی بێنین.

کوڕی زیاد وتی: ئەی خراپەکار، گیانت ئارەزووی سەروەری دەکات و خواوەند ڕێگرە چوونکە تۆی بەشیاو نەزانیوە.

وتی: کەواتە کێ شیاوە؟

وتی: سەروەری باوەڕداران، یەزید.

وتی: بەهەرحاڵ سپاسی خواوەند دەکەم و داوەری لەنێوان خۆمان و ئێوە بەخواوەند دەسپێرین.

وتی: پێم وابێت گومان دەکەیت ماف خەلافەتت هەیە؟

وتی: گومانم نییە، دڵنیام.

وتی: خواوەند بمکوژێت، ئەگەر بەشێوەیەك نەتکوژم کە لەسەردەمی ئیسلام کەس بەو شێوەیە نەکوژرا بێت.

دەڵێت: تۆ لەهەمووان زیاتر شیاوی کەدیاردەی تازە لەئیسلامدا بێنیتە ئاراوە چوونکە کوشتاری نامرۆڤانە و بڕینی ئەندامەکانی جەستە و کردەوەی

خراپەکارانە، لەکردەکانی تۆیە و کەس لەتۆ زیاتر بۆ ئەنجامدانی ئەو کارانە شیاو نییە.

دەڵێت: کوڕی سومەییە جوێنی بە حسەین و عەلی و عەقیل و خۆیدا بەڵام موسلیم هیچی نەوت.

شارەزایان دەڵێت کە عوبەیداللە فەرمانیدا و ئاویان بۆ هێنا و ئاویان لەسواڵەتێکدا بۆ هێنا و وتی: نەمانویست لەدەفرێکی دیکەدا ئاوت بۆ بێنین چوونکە دەفرەکە پیس دەبێت و دەتکوژین. لەبەر ئەمە لەم سواڵەتەدا ئاومان بۆ هێنایت.

دواتر وتی: بیبەنە سەرەوەی کۆشك و ملی بپەڕێنن و دواتر جەستەی فڕێبدەنە خوار.

موسلیم وتی: ئەی کوڕی ئەشعەس! سوێند بەخوا ئەگەر ئەمانت پێنەدەدام، تەسلیم نەدەبوون، هەستە و بەشمشێرەکەت بەرگریم لێبکە چوونکە ڕێزیان لەئەمانەکەی تۆ نەگرت.

دواتر بەکوڕی زیادی وت: سوێند بەخوا ئەگەر پەیوەندی خزمایەتی ئێمەی پێکەوە دەبەستەوە، منت نەدەکوشت.

کوڕی زیاد وتی: ئەو کەسەی کوڕی عەقیل بەشمشێر لەسەر و شانیداوە، لەکوێیە؟

دەڵێت: ئەویان بانگکرد و کوڕی زیاد وتی: بڕۆ و بیکوژە.

دەڵێت: موسلمیان برد و ئەو تەکبیری دەوت و تۆبەی دەکرد و ناوی خواوەند و پێغەمبەری دەهێنایە سەرزمان و دەیوت: خواوەندا، لەنێوان ئێمە و ئەو خەڵکەی فریویانداین و درۆیان کرد و ڕیسوایان کردین، داوەری بکە.

دەڵێت: لەسەرەوەی کۆشك ئەویان بردە شوێنێك کەهەنووکە شوێنی قەسابەکانە و لەوێ کوشتیان و جەستەی بێ گیانیان فڕدایەخوار.

کوڕی جوحەیفە دەڵێت: بوکەیر کوڕی حیمرانی ئەحمەری کەموسلیمی کوشتبوو، هاتەخوار. کوڕی زیاد وتی: کوشتت؟

وتی: بەڵێ.

پرسی: کاتێك دەتبردە سەرەوە چی دەوت؟

وتی: تەکبیری دەوت و ناوی خواوەندی دەهێنایە سەرزمان و کاتێك ویستم بیکوژم، وتی: خواوەندا لەنێوان ئێمە و ئەوانەی درۆیان لەگەڵ کردین و فریویاندایِن و ڕیسوایان کردین و ئێمەیان بەکوشتندا، داوەری بکە.

پێم وت: وەرە پێش، سپاس بۆ ئەو خوایەی تۆڵەی منی لەتۆ سەندەوە. دواتر بەشمشێر لێمدا بەڵام هیچی لێنەهات.

وتی: ئەی کۆیلە، ئەم برینەی لەسەر جەستەم دروستت کرد، لەقەرەبووی خوێنەکەت بەس نییە؟

کوڕی زیاد وتی: لەکاتی مەرگیش، سەرکێشی؟

ئەحمەری وتی: دواتر شمشێرێکی دیکەم وەشاند و کوشتم.

دەڵێت: محەممەد کوڕی ئەشعەس لەبەردەم عوبەیدالله کوڕی زیاد هەستا و سەبارەت بەهانی کوڕی عوروە قسەی کرد و وتی: ڕێز و پێگەی هانی لەناو شار و ڕێزی بنەماڵەکەی لەناو هۆزەکەیدا دەزانی، خەڵکەکەی گومان دەکەن من ئەوم هێناوەتە لای تۆ، سوێندت دەدەم بەخوا، ئەو بەمن ببەخشە چوونکە حەز بەدوژمنایەتی تایەفەکەی ئەو ناکەم چوونکە بەهێزترین تایەفەی ئەم شارەن و لەژمارەدا زۆرترینن.

دەڵێت: کوڕی زیاد بەڵێنیدا بیبەخشێت بەڵام کاتێك موسلیم کوڕی عەقیل کوژرا، بۆچوونەکەی گۆڕا و لەبەڵێنەکەی پەشیمان بوویەوە.

دەڵێت: کاتێك موسلیم کوژرا، سەبارەت بەهانی کوڕی عوروە فەرمانیدا و وتی: بیبەنە بازار و بیکوژن.

دەڵێت: هانییان بردە بازار، شوێنێك کەمەڕیان دەفرۆشت، دەستەکانی بەستراو بوو و دەیوت: هاوار لەمەزحەج کەمەزحەجم نییە، هاوار لەمەزحەج، مەزحەج لەکوێیە؟ کاتێك بینی کەس هاوکاری ناکات، دەستی لەبەندەکەی دەرهێنا و وتی: گۆچان یا کێرد یا بەرد یا ئێسقانێك نییە بتوانم بەرگری لەگیانی خۆم بکەم.

دەڵێت: پەلاماریاندا و بەتوندی بەستیانەوە، دواتر وتیان: گەردنت بێنە پێش.

وتی: ئەوەندە بەخشندە و دەستبڵاو نیم و دژی خۆم، هاوکاری ئێوە ناکەم.

دەڵێت: کۆیلە تورکەکەی کوڕی زیاد بەناوی ڕەشید، بەشمشێری لێیدا بەڵام کاریگەری لەسەر دانەنا.

هانی وتی: گەڕانەوەی هەمووان بۆ لای خواوەندە، خواوەند پشت بەپەنا و ڕەزای تۆ.

دواتر کۆیلە تورکەکە گورزێکی دیکەی لێدا و کوشتی.

دەڵێت: عەبدولڕەحمان کوڕی حەسینی موورادی، ڕەشیدی لەماڵی خازر بینی کەلەگەڵ عوبەیدالله کوڕی زیاد بوو. خەڵکان وتیان: ئەوە بکوژی هانییە.

کوڕی حەسین وتی: خوا بمکوژێت ئەگەر نەیکوژم یا لەم پێناوەدا نەکوژرێم.

دواتر بەڕم پەلاماریدا و کوشتی.

دەڵێت: کاتێک عوبەیدالله کوڕی زیاد، موسلیم کوڕی عەقیل و هانی کوڕی عوروەی کوشت، عەبدولعەلی کەلبی کەکەسیر کوڕی شەهاب لەگەڕەکی مناڵەکانی فەتیان گرتبووی، بانگ کرد. هێنایان و پێی وت: بەسەرهاتی خۆت بگێڕەوە.

وتی: خوا بتبەخشێت، هاتمەدەر تا بزانم خەڵکان چی دەکەن بەڵام شەهاب کوڕی کەسیر منی گرت.

وتی: سوێند دەخۆی تەنیا بۆ ئەو مەبەستە هاتبوویتەدەر؟

بەڵام ئەو سوێندی نەخوارد.

عەبدوڵڵە وتی: بیبەن بۆ گۆڕەپانی سەبیع و لەوێ بیکوژن.

دەڵێت: عەمارە کوڕی سەلخەبی ئەزدییان هێنا کەویستبووی هاوکاری موسلیم کوڕی عەقیل بکات. عوبەیدالله پێی وت: سەر بەکام هۆزیت؟

وتی: ئەزد.

وتی: ئەو بۆ لای هۆزەکەی ببەن. بردیان و لەناو هۆزەکەی سەریان بڕی.

دەڵێت: عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیری ئەسەدی سەبارەت بەکوژرانی موسلیم کوڕی عەقیل و هانی کوڕی عوروەی موورادی هۆنراوەیەکی هەیە بەم ناوەرۆکە:

((ئەگەر نازانی هانی چییە

سەیری هانی بکە لەبازار

و کوڕی عەقیل......))

هۆنراوەیەکی دووردرێژە و بەوتەیەك هۆنراوەی فەرزدەقە.

باوکی جوناب، یەحیای کوڕی باوکی حەییەی کەلبی دەڵێت: کاتێك عوبەیدالڵە موسلیم و هانی کوشت، سەری ئەوانی بەهانی کوڕی باوکی حەییەی وادعی و زوبەیر کوڕی ئەروەحی تەمیمی بۆ یەزید کوڕی معاویە ڕەوانە کرد و فەرمانی بەدەبیرەکەی خۆی عەمرۆ کوڕی نافیعدا، بەسەرهاتی موسلیم و هانی بۆ یەزید بنووسێت.

دەڵێت: عەمرۆ نامەیەکی دووردرێژی نووسی. ئەو یەکەم کەس بوو نامەی دووردرێژی دەنووسی و کاتێك عوبەیدالڵە کوڕی زیاد سەیری نامەکەی کرد، پەسەندی نەکرد و وتی: ئەم درێژدادڕییە چییە؟ بنووسە بەڵام دواتر، سپاس بۆ ئەو خوایەی مافی سەروەری باوەڕدارانی وەرگرت و ئازاری دوژمنەکانی نەهێشت. سەروەری باوەڕداران ئاگادار دەکەمەوە کەموسلیم کوڕی عەقیل پەنای بۆ ماڵی هانی کوڕی عوروە بردبوو، من سیخوڕەکانم دانا و پیاوەکانم بۆ ناو کۆڕ و کۆبوونەوەی ئەوان نارد و فریومدان تا ئەوەی دەستبەسەرم کردن و خواوەند لەسەر دەستی من ئەوانی لەناو برد و سەریانم پەڕاند و سەری ئەوانم بەهانی کوڕی باوکی حەییەی هەمەدانی و زوبەیر کوڕی ئەروەحی تەمیمی بۆ تۆ نارد. ئەم دوو کەسە گوێرایەڵ و ملکەچن و چاکەخوازن، سەروەری باوەڕداران بەدڵخوازی خۆی پرسیاریان لێبکات چوونکە کەسانی ڕاستگۆ و ڕاستکردارن. والسلام

دەڵێت: یەزید وەڵامی دایەوە: بەڵام دواتر، بەو شێوە بوویت کەچاوەڕوان بووم، وەك کەسێکی دوورئەندێش کردەکانت ئەنجامدا و بوێرانە هەنگاوت هەڵگرت. شیاوی و گونجاوی خۆتت سەلماند و چاوەڕوانییەکانی منت بەدیهێنا و بۆچوونی منت سەبارەت بەخۆت پشتڕاست کردەوە. دوو نێردراوەکەی تۆم بانگ کرد و پرسیارم لێکردن و بەنهێنی لەگەڵیان دووام و بەوشێوە بوون کەئاماژەت پێدابوو. چاکەیان لەگەڵ بکە.

ئاگادار بوومەوە کەحسەین کوڕی عەلی ڕێگەی عێراقی گرتۆتەبەر. لەسەر ڕێگاکان پاسەوانەکان دابنێ و پادگانەکان دروستبکە، ئاگاداری کەسانی

گوماناوی بە و بەپشت بەستن بەتۆمەت، خەڵکان دەستگیر بکە بەڵام خوێنی ئەو کەسانە مەڕێژە کەدژی تۆ ناجەنگن و لەهەموو ڕووداوەکان ئاگادارم بکەرەوە. سڵاو لەتۆ و ڕەحمەتی خواوەند لەتۆ.

عەون کوڕی باوکی جوحەیفە دەڵێت: شۆڕشی موسلیم کوڕی عەقیل لەکوفە لەڕۆژی سێشەممە، دوای هەشت ڕۆش لەزیحەججەی ساڵی شەستی کۆچ ڕوویدا. بەوتەیەك لەڕۆژی چوارشەممە و حەوت ڕۆژ دوای عەرەفە و یەك ڕۆژ دوای دەرچوونی حسەین لەمەککە بەردو کوفە و لەساڵی شەستی کۆچی ڕوویدا.

دەڵێت: هاتنەدەرەوەی حسەین لەمەدینە بەرەو مەککە، ڕۆژی شەممە دوو ڕۆژ بۆ کۆتایی ڕەجەبی ساڵی شەستی کۆچی بوو. شەوی هەینی، دوای تێپەڕینی سێ ڕۆژ لەشەعبان گەیشتە مەککە و مانگی شەعبان و ڕەمەزان و شوال و زیقەعدەی لەمەککە بەسەر برد. دواتر دوای هەشت ڕۆژ لەمانگی زیحەججەی و لەڕۆژی سێشەممە، ڕۆژی ترویە، لەو ڕۆژەی موسلیم کوڕی عەقیل شۆڕشەکەی دەستپێکرد، مەککەی بەجێهێشت.

عیسا کوڕی یەزید دەڵێت: موختار کوڕی باوکی عوبەید و عەبدوڵڵە کوڕی حارس لەگەڵ موسلیم شۆڕشیان کرد. موختار بەئاڵای سەوز شۆڕشی کردبوو و عەبدوڵڵە بەئاڵای سوور. خۆیشی جلوبەرگی سووری لەبەردابوو. موختار ئاڵاکەی لەبەردەرگای عەمرۆ کوڕی حورەیس چەقاند و وتی: هاتووم پارێزگاری لەعەمرۆ بکەم.

دەڵێت: ئەشعەس و قەعقاع کوڕی شور و شیبس کوڕی ڕەبعی، ئەو شەوەی کەموسلیم ڕوویکردە کۆشکەکەی کوڕی زیاد و لەگەڵ ئەو وهاوەڵانی جەنگی، شیبس دەیوت: چاوەڕێ بن تا شەو دادێت و دواتر بڵاوەی لێبکەن. قەعقاع پێی وت: ڕێگەی هەڵاتنت لەخەڵکان بەستووە، ڕێگەیان بۆ بکەرەوە با بڕۆن.

دەڵێت: عوبەیدالڵە فەرمانیدا بەدوای موختار و عەبدوڵڵە کوڕی حارسدا بگەڕێن و بۆ هێنانی ئەوان خەڵاتی دیاریکرد. کاتێك ئەوانیان گرت، زیندانی کران.

لەم ساڵەدا حسەین کوڕی عەلی لەمەککە هاتەدەر و ڕێگەی کوفەی گرتەبەر.

## بەسەرهاتی ڕۆشتنی حسەین کوڕی عەلی بەرەو کوفە و ڕووداوەکانی ئەم سەفەرە

عەمرۆ کوڕی عەبدولڕەحمان مەخزومی دەڵێت: کاتێك نامەی خەڵکانی عێراق بەدەستی حسەین گەیشت و بۆ بەڕێکەوتن ئامادە بوو، لەمەککە ڕۆشتمە لای، سپاسی خواوەندم کرد و وتم: ئەی کوڕە مام! هاتمە لای تۆ تا وەك مۆجیاری شتێك بڵێم، ئەگەر بەچاکەخوازم دەزانی گوێ لەقسەکانم بگرە و جیاواز لەوە، لەوتنی چاوپۆشی دەکەم.

وتی: بیڵێ، سوێند بەخوا تۆ بەکەسێکی خراپ و خوازیاری کارە خراپەکان نازنم.

وتم: بیستوومە دەتەوێت بەرەو عێراق بڕۆیت، لەم سەفەرە دەترسم چوونکە بەرەو شارێك دەڕۆیت کەکارگوزاری هەیە و ئەمیرەکان، بەیت ئەلماڵیان لەدەستدایە، خەڵکانیش بەندەی درهەم و دینارن. دەترسم ئەو کەسانەی بەڵێنی هاوکارییان پێداویت و ئەو کەسانەی تۆیان لەنەیارەکانت زیاتر خۆش دەوێت، دژی تۆ بجەنگن.

حسەین وتی: ئەی کوڕە مام، خواوەند پاداشتی چاکەت بداتەوە. دەزانم وەك کەسێکی چاکەخواز هاتوویت و بیرمەندانە دەدوێیت، هەرچی پێشبێت، پشت بەبۆچوونەکانی تۆ دەبەستم چوونکە باشترین ڕاوێژکاری و باشترین مۆجیار.

دەڵێت: لای ئەو ڕۆشتم و چوومە لای حارس کوڕی خالیدی مەخزومی. لێی پرسیم: چاوت بەحسەین کەوت؟

وتم: بەڵێ.

وتی: چیی وت و چیت پێوت؟

دەڵێت: ئەوەم پێ وت و ئەوەی وت.

وتی: سوێند بەخواوەند مۆجیاریت کردووە. سوێند بەپەروەردگاری کەعبە بۆچوونی ڕاست ئەوەیە، ڕازی ببێت یا نە. دواتر هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

(( ئەگەری هەیە ئەو کەسەی ڕاوێژ دەکات، فریو بدرێت
و لەناو بچێت))

عوتەبە کوڕی سەمعان دەڵێت: کاتێك حسەین بڕیاریدا بەرەو کوفە بەڕێکەوێت؛ عەبدوڵڵە کوڕی عەباس هاتە لای و پێی وت: ئەی کوڕە مام، خەڵك دەڵێن بەرەو عێراق دەڕۆیت، لەمەبەستی خۆت ئاگادارم بکەرەوە.

وتی: مەبەستی ئەوەم هەیە و بەخواستی خواوەند لەم یەك دوو ڕۆژەدا بەڕێدەکەوم.

کوڕی عەباس پێی وت: خواوەند بتپارێزێت، خواوەند بتبەخشێت، پێم بڵێ ئایا بۆ لای خەڵکانێك دەڕۆی کەفەرمانڕەواکەیان کوشتووە و دەستیان بەسەر ویلایەتەکەدا گرتووە و دوژمنەکەی خۆیان دەرپەڕاندووە، ئەگەر ئەو کارەیان کردووە، بەرەو لای ئەو بەڕێکەوە بەڵام ئەگەر پێشنیاری ڕۆشتنیان پێداویت و هێشتا فەرمانڕەواکەیان لەوێیە و فەرمانڕەوایەتییان دەکات و کارگوزارەکانی باج و خەراج کۆدەکەنەوە، دڵنیابە بۆ جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوە تۆیان بانگێشت کردووە و دەترسم فریوت بدەن و دژایەتی تۆ بکەن و هاوکاریت نەکەن و لەهەموان زیاتر بۆ دژایەتی و جەنگی تۆ پێداگر بن.

حسەین وتی: پشت بەخوا دەبەستم، تا بزانین چی پێش دێت.

دەڵێت: کوڕی عەباس ڕۆشت و کوڕی زوبەیر هات و ماوەیەك دووان و وتی: نازانم بۆ ئەو خەڵکەمان پشتگوێ خست و دەستمان لێ هەڵگرتن، لەکاتێکدا ئێمە منداڵی موهاجیرەکانین و خاوەنانی خەلافەت نەك ئەوان، پێم بڵێ دەتەوێت چی بکەیت؟

حسەین وتی: دەمەوێت بەرەو کوفە بڕۆم چوونکە شیعەکانی ئەو شارە و سەرکردەی خەڵکان نامەیان بۆ نووسیوم و پشت بەخوا دەبەستم.

کوڕی زوبەیر پێی وت: ئەگەر هاوشێوەی تۆ خەڵکانێك وەك شیعەکان لەدەورم کۆ دەبوونەوە، دەستم لێهەڵنەدەگرتن.

دەڵێت: دواتر لەترسی ئەوەی نەکا حسەین گومانی خراپی لا دروست بێت، وتی: ئەگەر لەحیجاز بمێنیتەوە و لێرە بانگەشەی خەلافەت بکەیت، دڵنیابە کەس

دژایەتی تۆ ناکات.

دواتر هەستا و ڕۆشت، حسەین وتی: ئەم پیاوە بەهیچ شتێك زیاتر لەمە خۆشحاڵ نابێت کە من لەحیجازەوە بەرەو عێراق بڕۆم چوونکە دەزانێت بەبوونی من ناتوانێت خەلافەت بگرێتەدەست و خەڵکان زیاتر منیان دەوێت تا ئەو. دەخوازێت لێرە بڕۆم تا حیجاز بۆ ئەو تەخت ببێت.

دەڵێت: کاتێك شەو داهات یا بەیانی ڕۆژی دواتر، عەبدوڵڵە کوڕی عەباس هاتە لای حسەین و وتی: ئەی کوڕە مام! من خۆڕاگری نیشان دەدەم بەڵام تاقەتم نییە، دەترسم لەم سەفەرە لەناو بچیت. خەڵکی عێراق خەڵکانێکی فێڵبازن، لێیان نزیك مەبەرەوە. لەم شارە بمێنەرەوە چوونکە سەروەری خەڵکانی حیجازیت. ئەگەر خەڵکی عێراق بەو شێوەی کەدەڵێن خوازیاری تۆ و فەرمانڕەوایەتی تۆن، نامەیان بۆ بنووسە و فەرمانیان پێبدە دوژمنەکەی خۆیان لەشارەکە دەربەرێنن، دواتر بەرێکەوە. ئەگەر تەنیا مەبەستت ڕۆشتنە، بەرەو یەمەن بڕۆ چوونکە لێوانلێوە لەقەڵاکان و دۆڵەکان، سەرزەمینێکی پان و بەرینە، شوێنکەوتەکانی باوکت لەوێن، لەوێ لەخەڵکان بەدووریت و نامەیان بۆ دەنووسیت و نێردراوەکان ڕەوانە دەکەیت، لەم شێوەدا هیوادارم بێ ئەوەی ڕووبەڕووی مەترسی ببیتەوە، بەمەبەستی خۆت بگەیت.

حسەین پێی وت: ئەی کوڕە مام، سوێند بەخوا دەزانم مۆجیارکەرێکی شیاوی و نیگەرانی منیت، بەڵام بڕیارمداوە و مەبەستی ڕۆشتنم لەسەردایە.

کوڕی عەباس وتی: ئەی کوڕە مام، ئەگەر دەڕۆیت، ژن و منداڵەکان لەگەڵ خۆت مەبە، سوێند بەخوا دەترسم بەو شێوەیە بکوژرێیت کەعوسمان کوڕی عەفان کوژرا و ژن و منداڵەکانی سەیریان دەکرد.

دەڵێت: دوای ئەوە کوڕی عەباس وتی: چاوی کوڕی زوبەیر ڕوون دەکەیتەوە و حیجازی بۆ بەجێدێڵیت. ئەمڕۆ بەبوونی تۆ کەس گرنگی بەو نادات، سوێند بەو خوایەی جگە لەو خوایەك نییە، ئەگەر دەمزانی، گەر قژی ناوچاوانت بگرم تا خەڵك لەدەوری من و تۆ کۆببنەوە و پشت بەبۆچوونی من دەبەستیت، ئەو کارەم دەکرد.

دەڵێت: کوڕی عەباس ڕۆشت و لای عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر تێپەڕی، وتی: ئەی کوڕی زوبەیر، چاوت و دڵت ڕوون. دواتر هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

(( ئەی پەرەسێلکە کە لەماڵەوەیت

ماڵەکەت چۆڵ بوو

هێلکە بکە و چەهچەهە لێدە

و هەرچەند دەتوانی هێلکە بکە)).

دواتر وتی: حسەین بەرەو عێراق دەڕوات، حیجاز بپارێزە.

عەبدوڵڵە کوڕی سەلیمی ئەسەدی و موزری کوڕی مەشمەعەل (هەردووکیان ئەسەدی)، دەڵێن: بەمەبەستی حەج کوفەمان بەجێهێشت و گەشتینە مەککە، لەڕۆژی ترویە گەشتینە ئەو شارە. حسەین و عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیرمان بینی کە لەکاتی هەڵاتنی خۆر لەنێوان حوجر و دەرگاکە وەستابوون.

دەڵێن: نزیک بووینەوە و بیستمان کەکوڕی زوبەیر بەحسەینی دەوت: ئەگەر دەتەوێت، بمێنەرەوە و کاروباری خەلافەت بگرە دەست، دڵنیابە پشتیوانی و هاوکاریت دەکەین، چاکەخوازی تۆ دەبین و بەیعەتت لەگەڵ دەبەستین.

حسەین وتی: باوکم پێی وتووم، سەرکردەیەك هەیە کەڕێزی کەعبە دەشکێنێت، من نامەوێت ئەو سەرکردەیە بم.

کوڕی زوبەیر پێی وت: ئەگەر دەتەوێت بمێنەرەوە و کاروبارەکان بەمن بسپێرە، دڵنیابە ملکەچ و گوێرایەڵ دەبم و نافەرمانی نابینیت.

وتی: ئەوەیشم ناوێت.

دەڵێت: دواتر بەچرپە قسەیان کرد و ئێمە نەمانبیست. بەهەمانشێوە لەقسە کردن بەردەوام بوون تا ئەوەی دۆعای خەڵکانیان بیست کە لەکاتی نیوەڕۆ بەرەو مەنی بەڕێدەکەوتن.

دەڵێن: حسین لەنێوان سەفا و مەروا تەواف کرد و بەشێك لەقژی خۆی هەڵکەند و جلوبەرگی عەمرەی لەبەر کرد و دواتر بەرەو کوفە بەڕێکەوت. ئێمەیش لەگەڵ کەسەکانی خۆمان ڕێگەی مەنی مان گرتەبەر.

باوکی سەعیدی عەقەیسی لەیەکێك لەهاوڕێکانی خۆی دەگێڕێتەوە: لەمەککە

حسەین کوڕی عەلیم بینی کە لەگەڵ عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر وەستا بوو. کوڕی زوبەیر پێی وت: ئەی کوڕی فاتیمە، وەرە پێش. حسەین نزیک بوویەوە و بەچرپە قسەیان کرد.

دواتر حسەین ڕوویکردە ئێمە و وتی: دەزانن کوڕی زوبەیر چی دەڵێت؟

وتمان: نازانین.

وتی: دەڵێت لەم مزگەوتە بمێنەرەوە تا خەڵکان لەدەوری تۆ و بۆ هاوکاری کردنی تۆ کۆبکەمەوە.

دەڵێت: حسەین وتی: سوێند بەخوا ئەگەر یەك بست لەدەرەوەی مزگەوتەکە بکوژرێم باشترە لەوەی یەك بست لەناو مزگەوتەکەدا بم و بکوژرێم. سوێند بەخوا ئەگەر لەکونی یەکێك لەخزۆکەکاندا بم، دەرمدەهێنن و مەبەستی خۆیان ئەنجام دەدەن. سوێند بەخوا دەستدرێژیم دەکەنەسەر بەهەمانشێوە کەجوولەکەکان دەستدرێژییان کردە سەر ڕۆژی شەممە.

عوقەبە کوڕی سەمعان دەڵێت: کاتێك حسەین لەمەککە هاتەدەر، نێردراوەکانی عەمرۆ کوڕی سەعید کوڕی عاس بەسەرکردایەتی یەحیا کوڕی سەعید ڕێگەیان لێگرت و وتیان: بگەڕێرەوە، بۆ کوێ دەڕۆیت؟

دەڵێت: بەڵام حسەین بەرگری کرد و درێژەی بەڕێگەکەیدا و هەردوو دەستەکە دەیانویست یەکتر دوور بخەنەوە و قامچییەکان کەوتنە کار. حسەین و هاوەڵانی خۆڕاگرییان کرد. دواتر حسەین ملی ڕێگەی گرتەبەر کەپێیان وت: ئەی حسەین، مەگەر لەخواوەند ناترسیت، خۆت لەموسوڵمانان جیا دەکەیتەوە و دووبەرەکی لەناو ئەم ئۆمەتەدا دروست دەکەیت. حسەین فەرموودەکانی خواوەندی هێنایە سەرزمان:

((لی عملی و لکم عملکم انتم بریئون مما اعمل و انا بری مما تعملون

واتاکەی: کردەوەی من تایبەتە بەمن و کردەوەی ئێوە تایبەتە بەئێوە، ئێوە لەوەی من دەیکەم بێزارن و منیش لەکردەوەکانی ئێوە بێزارم)).

دەڵێت: حسەین ڕۆشت تا گەیشتە تەنعیم. کاروانێکی بینی کە لەیەمەنەوە دەهات. باری کاروانەکە ڕووناس و حیللە بوو کەبوحەیر کوڕی ریسانی حومەیری

(كارگوزارەكەی یەزید لەیەمەن) بۆ یەزیدی دەنارد. حسەین دەستی بەسەر كاروانەكەدا گرت و لەگەڵ خۆی بردی. دواتر بەوشترەوانەكانی وت: ئێوە ناچار ناكەم لەگەڵ ئێمەدابن، هەركەس بخوازێت لەگەڵ ئێمە بۆ عێراق بێت، كرێكەی دەدەین و خۆشحاڵ دەبین و هەركەس ناخوازێت، دەتوانێت لێرە لێمان جیا ببێتەوە و كرێی تا ئێرەی پێدەدەین.

دەڵێت: ئەو كەسانەی جیا دەبوونەوە، كرێكەیان وەرگرت و گەڕانەوە و ئەوانەی مانەوە، كرێ و جلوبەرگی تازەیان پێدان.

عەبدوڵڵە كوڕی سەلیم و موزری دەڵێن: درێژەمان بەڕێگەدا تا گەشتینە سەفاح. فەرزدق كوڕی غالبی شاعیرمان بینی، لای حسەین وەستا و وتی: خواوەند نیازەكانت بەراوەردە بكات و ئارەزووەكانت بەدیبێنێت.

حسەین وتی: لەهەواڵی ئەو كەسانە ئاگادارمان بكەرەوە كەلایانەوە هاتوویت؟

فەرزدق وتی: لەكەسێكی شارەزات پرسی. دڵی خەڵكان لەگەڵ تۆیە و شمشێرەكانیان دژی منداڵەكانی ئومەییە. چارەنووس لەئاسمانەوە دیاریدەكرێت و چی ڕوودات، لەسەر ویستی خواوەندە.

حسەین وتی: ڕاست دەكەیت. هەموو شتێك لەدەستی خواوەندایە و خواوەند هەرچی بوێت، ئەنجامی دەدات. ئەگەر قەدەر بەدڵخوازی ئێمە بێت، سپاسی نیعمەتەكانی دەكەین و بۆ سپاسگوزاری دەبێت داوای هاوكاری لەپەروەردگار بكەین. ئەگەر قەزا لەنێوان ئێمە و مەبەستەكەمان ببێتە لەمپەر، ئەو كەسەی نییەتی پاك و ئەندێشەی خۆپارێزی هەبێت، گرنگی پێنادات.

دواتر حسەین بەڕێكەوت و وتی: سڵاو و درود لەتۆ. دواتر لەیەك جیابوونەوە.

فەرزدق دەڵێت: دایكم بۆ حەج برد. لەكاتی حەج كەجڵەوی وشترەكەی ئەوم بەدەستەوە بوو، ڕۆشتمە ناو حەرەم. ساڵی شەستی كۆچی بوو. حسەین كوڕی عەلیم بینی كە لەمەككە دەهاتەدەر. هاوەڵانی شمشێر و ڕمیان بەدەستەوە بوو.

وتم: ئەم كاروانە هی كێیە؟

وتیان: ئەمە هاوەڵانی حسەین كوڕی عەلین.

دەڵێت: ڕۆشتمە لای و وتم: ئەی كوڕی پێغەمبەری (د.خ) خوا، بۆ بێ ئەوەی

حەج بکەیت، بەپەلە دەڕۆیت؟

وتی: ئەگەر پەلە نەکەم، دەمگرن.

دەڵێت: لێی پرسیم: لەکوێوە دێیت؟

وتم: پیاوێکی عێراقیم.

دەڵێت: سوێند بەخوا زیاتر لەمەی نەپرسی، بەمە بەسەندەی کرد و وتی: لەهەواڵی خەڵکانی عێراق ئاگادارم بکەرەوە.

وتم: دڵیان لەگەڵ تۆیە و شمشێرەکانیان دژی مناڵەکانی ئومەییە وچارەنووس بەدەستی خواوەندە.

وتی: ڕاست دەکەیت.

دەڵێت: سەبارەت بەنەزر و ڕێوڕەسمەکانی حەج پرسیارم کرد و وەڵامی دامەوە. بەڵام بەهۆی ئەو نەخۆشییەی لەعێراق گیرۆدەی بووبوو، زمانی بەقورسی دەسووڕا.

دەڵێت: ڕۆشتمە و لەناو حەرەم سەراپەردەیەکم بینی کەبەشێوەیەکی جوان ڕازابوویەوە. بەرەو لای ڕۆشتم و دەرکەوت کەتایبەتە بە عەبدوڵڵە کوڕی عەمرۆ کوڕی عاس. هەواڵەکانی لەمن پرسی و پێموت کەحسەین کوڕی عەلیم بینیوە.

وتی: هاوار لەتۆ! بۆ لەگەڵی نەڕۆشتیت، سوێند بەخوا دەسەڵات دەگرێتەدەست و شمشێر، کاریگەری لەسەر خۆی و هاوەڵانی دانانێت.

دەڵێت: سوێند بەخوا مەبەستی ئەوەم کرد بەدوایدا بڕۆم چوونکە وتەکانی عەبدوڵڵە کاریگەری لەسەرم دانابوو. دواتر پێغەمبەران و کوژرانی ئەوانم بیر کەوتەوە و ئەم ئەندێشە، ڕێگەی ڕۆشتنی لێگرتم و بۆ لای کەسەکانی خۆم گەڕامەوە.

دەڵێت: لای ئەوان بووم کاروانێك هات کە لەکوفە توێشووی هەڵگرتبوو، کاتێك لەهاتنی کاروان ئاگادار بوومەوە، بەدوایدا ڕۆشتم و کاتێك لێیان نزیك بوومەوە، هاوارم کرد: حسەین کوڕی عەلی چی کرد؟

دەڵێت: وەڵامیان دامەوە: کوژرا.

دەڵێت: گەڕامەوە و لەبەرخۆمەوە لەعنەتم بۆ عەمرۆ کوڕی عاس دەنارد.

دەڵێت: خەڵکان ئەو ڕۆژانە سەبارەت بەم بابەتە دەدووان و شەو و ڕۆژ چاوەڕوان بوون. عەبدوڵڵە کوڕی عەمرۆ دەیوت: پێش ئەوەی ئەم دارە و ئەم دارخورمایە و ئەم هەتیوە پێبگەن، ئەم بابەتە ڕوون دەبێتەوە.

دەڵێت: ڕۆژێك پێم وت: بۆ ڕەهت نافرۆشیت؟

وتی: نەعلەتی خوا لە فلانەکەس –مەبەستی معاویە بوو– و تۆ.

وتم: نا، لەعنەتی خوا لەتۆ.

دەڵێت: دووبارە نفرینی منی کرد، کەس لەنزیکەکانی لەوێ نەبوو تا بترسم.

دەڵێت: لای ئەو گەڕامەوە و کەس منی نەناسی. ڕەهت باخەکەی عەبدوڵڵە کوڕی عەمرۆ لەتایف بوو. معاویە داوای لە عەبدوڵڵە کردبوو بەبەهایەکی زۆر پێی بفرۆشێت بەڵام ئەو ڕازی نەبوو.

دەڵێت: حسەین بەپەلە ڕۆشت و لەهیچ شوێنێك نەوەستا تا ئەوەی گەیشتە زات عەرەق.

عەلی کوڕی حسەین دەڵێت: کاتێك لەمەککەوە بەڕێکەوتین، نامەی عەبدوڵڵە کوڕی جەعفەر لەگەڵ دوو کوڕەکەی عەون و محەممەد گەیشت کە بۆ حسەین کوڕی عەلی نووسیبوو:

((بەلأم دواتر: سوێندت دەدەم بەخوا، کاتێك ئەم نامەت بینی بگەڕێرەوە چوونکە دەترسم ئەم سەفەرە ببێتە هۆی لەناوچوونی تۆ و بنەماڵەکەت. ئەگەر ئێستا لەناو بچیت، ڕووناکی زەوی دەکوژێتەوە چوونکە تۆ ڕێنیشاندەری موسوڵمانان و هیوای باوەڕدارانیت. لەڕۆشتن پەلە مەکە و خۆم دوای نامەکە دەگەم. والسلام.))

دەڵێت: عەبدوڵڵە کوڕی جەعفەر ڕۆشتە لای عەمرۆ کوڕی سەعید و قسەی لەگەڵ کرد، وتی: نامەیەك بۆ حسەین بنووسە و ئەمانی پێببەخشە و بەڵێنی چاکەی پێبدە. لەنامەکەت بەڵێن بدە و داوای لێبکە بگەڕێتەوە، ئەگەری هەیە دڵنیایی بەدەست بێنێت و بگەڕێتەوە)).

عەمرۆ کوڕی سەعید وتی: هەرچی دەخوازی بینووسە و بیهێنە تا مۆری بکەم.

دەڵێت: عەبدوڵڵە کوڕی جەعفەر نامەیەکی نووسی و بردییە لای عەمرۆ کوڕی

سەعید و پێی وت: مۆری بکە و بەیەحیای برات ڕەوانەی بکە تا دڵنیا بێت و بزانێت بابەتەکە ڕاستە و گومانی لا دروست نەبێت.

دەڵێت: عەمرۆ ئەو کارەی کرد. ئەو بەنوێنەرایەتی یەزید کوڕی معاویە کارگوزاری مەککە بوو.

دەڵێت: یەحیا و عەبدوڵڵە کوڕی جەعفەر گەیشتنە لای حسەین. یەحیا کوڕی عەمرۆ نامەکەی پێدا کەخوێندییەوە، گەڕانەوە و وتیان: نامەکەمان تەسلیم کرد کەخوێندییەوە، زۆر پێداگریمان کرد بەڵام پاساوی دەهێنایەوە و دەیوت: لەخەودا پێغەمبەرم بینیوە و فەرمانی پێداوم و ئێستا بەرژەوەندی منی تیا بێت یا زیان، دەبێت ئەنجامی بدەم.

پێیان وت: چ خەوێك؟

وتی: بەکەسم نەوتووە و بەکەس ناڵێم تا دەگەڕێمەوە بۆ پێشگای خواوەند.

دەڵێت: نامەکەی عەمرۆ کوڕی سەعید بۆ حسەین کوڕی عەلی بەمشێوە بوو:

((بەناوی خواوەندی بەخشندە و میهرەبان

لەعەمرۆ کوڕی سەعید بۆ حسەین کوڕی عەلی، بەڵام دواتر، لەخوا دەخوازم لەوەی دەبێتە هۆی ئازار و ئازابی تۆ، دوورت بخاتەوە و بۆ ئەوەی دەبێتە هۆی سەرکەوتنت، ڕێنوێنیت بکات. بیستوومە بەرەو عێراق دەڕۆیت. خواوەند لەدژایەتی کردن دوورت بخاتەوە چوونکە دەترسم لەناو بچیت. عەبدوڵڵە کوڕی جەعفەر و یەحیا کوڕی سەعیدم بۆ لای تۆ نارد. لەگەڵ ئەوان وەرە لای من چوونکە ئەمانت پێبەخشراوە و چاکە و ڕێزت لێدەگیرێت. خواوەند بەشایەت دەگرم کەوتەکانم ڕاستە. سڵاو لەتۆ بێت)).

دەڵێت: حسەین وەڵامی دایەوە:

((بەڵام دواتر، هەرکەس پێشنیاری خواپەرەستی بکات و کرداری چاکە ئەنجام بدات و بڵێت من لەموسوڵمانانم، پێچەوانەی فەرموودەی خواوەند و پێغەمبەر (د.خ) نەجووڵاوەتەوە. ئەمانت پێبەخشیوم و بەڵێنی ڕێز و چاکەخوازیت پێداوم، باشترین ئەمان، ئەمانی خواوەندە و خواوەند لەڕۆژی هەستانەوە ئەمان بەو کەسە نابەخشێت کە لەجیهان لێی نەترسابێت. لەخوا دەخوازم لەم دنیا ترسێکم

پێببەخشێت کە لەو دنیا ببێتە هۆی ئەوەی ئەمانم پێبدرێت. ئەگەر مەبەستت لەنووسینی نامەکە چاکەخوازی بووە، خواوەند پاداشتت بداتەوە. والسلام)).

هەنووکە دەگەڕێینەوە بۆ گێڕانەوەکەی عەماری دەهەنی لەباوکی جەعفەر:

دەڵێت: بەباوکی جەعفەرم وت: بەسەرهاتی کوژرانی حسەینم بۆ باس بکە بەشێوەك هەست بکەم خۆم لەوێ بووم.

وتی: حسەین کوڕی عەلی دوای نامەکەی موسلیم کوڕی عەقیل بەڕێکەوت و کاتێك گەیشتە ناوچەیەك کەدوورییەکەی لەقادسییە سێ میل بوو، حوڕ کوڕی یەزیدی تەمیمی ئەوی بینی و پێی وت: مەبەستی کوێت هەیە؟

وتی: مەبەستی ڕۆشتن بۆ ئەو شارەم هەیە.

وتی: بگەڕێرەوە چوونکە نابێت چاوەڕوانی خێر بیت.

دەڵێت: دەیویست بگەڕێتەوە، براکانی موسلیم کوڕی عەقیل وتیان: سوێند بەخوا ناگەڕێینەوە تا تۆڵەی براکەمان وەرنەگرین یا دەکوژرێین.

حسەین وتی: ژیان دوای ئێوە مانای نابێت.

دەڵێت: بەڕێکەوت تا ڕووبەڕووی سوارەکانی عوبەیدالله بوویەوە و کاتێك ئەوانی بینی، ڕێگەی بەرەو کەربەلا گۆڕی و لەپشت قامیشەلانێك سەنگەری گرت بۆ ئەوەی تەنیا لەیەك بەرەوە بجەنگێت. لەئەسپ دابەزین و خێوەتەکانیان هەڵدا. هاوەڵانی چل و پێنج سوار و سەد پیادە بوون.

دەڵێت: عوبەیدالله کوڕی زیاد، عومەر کوڕی سەعد کوڕی ئەبی وەقاسی وەك کارگوزاری ڕەی دەستنیشان کردبوو، پێی وت: ڕووبەڕووبوونەوە و جەنگ دژی حسەین بگرە ئەستۆ.

وتی: من لەو کارە ببەخشە.

بەڵام بۆ ئەو کارە ناچاری کرد.

عومەر وتی: ئەمشەو مۆڵەتم پێبدە. مۆڵەتی پێدا. عومەر پێداچوونەوەی بەو کارەدا کرد و بۆ بەیانی، گەڕایەوە بۆ لای عوبەیدالله و ڕەزامەندی خۆی نیشاندا.

دەڵێت: عومەر کوڕی سەعد بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی حسەین بەڕێکەوت و کاتێك گەیشت، حسەین پێی وت: بەیەکێك لەم سێ شتە ڕازی ببە: یا ڕێگە بدە

بگەڕێمەوە بۆ ئەو شوێنەی لێی هاتووم، یا ڕێگە بدە بۆ لای یەزید بڕۆم، یا ڕێگە بدە بۆ سنووری ڕۆم.

دەڵێت: عومەر بەمە ڕازی بوو بەڵام عوبەیداللە نامەی بۆ نووسی: نا، ڕێگەی مەدە تا ئەو کاتەی دەست دەخاتە ناو دەستی من.

حسەین وتی: سوێند بەخوا هەرگیز ئەوە ڕوونادات.

دەڵێت: جەنگ دەستی پێکرد و هەموو هاوەڵانی حسەین کوژران کەدە و چەند گەنجێك لەبنەماڵەکەی خۆی بوون. تیرێك بەر یەکێك لەمناڵەکانی کەوت کە لەئامێزیدا بوو، خوێنەکەی پاك دەکردەوە و دەیوت: خواوەندا لەنێوان ئێمە و ئەو خەڵکەی بانگێشتیان کردین و بەڵێنی هاوکارییان پێدابین، داوەری بکە.

دەڵێت: دواتر داوای پارچەیەکی ڕەشی کرد، پارچەکەی لەت کرد و کردییە بەری، شمشێری هەڵگرت و جەنگا تا کوژرا.

دەڵێت: یەکێك لەخەڵکانی مەزحەج حسەینی کوشت و سەری بڕی و بردییە لای عوبەیداللە و هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

(( چوارپێکەم لەزێڕ و زیو بار بکە

کەشای خاوەن پەردەم کوشت

کەسێکم کوشت کەدایك و باوکی

لەهەموو خەڵکان باشتر بوون

و نەژادی لەنەژادی هەمووان بەرزتر)).

عوبەیداللە ئەوی بۆ لای یەزید کوڕی معاویە نارد، سەری حسەینی پێبوو. یەزید سەری حسەینی خستە بەردەم خۆی. باوکی بوورزەی سولەمی لای یەزید بوو. یەزید بەداردەستەکەی لەدەمی حسەینی دەدا و هۆنراوەیەکی بەم ناوەڕۆکە خوێندەوە:

((سەری پیاوێکیان بڕی

کەلای ئێمە ئازیز بوو

بەڵام خۆیان نا سپاس بوون

و ستەمکار)).

باوکی بورزە وتی: داردەستەکەت لابەرە، سوێند بەخوا چەندینجار بینیومە پێغەمبەر (د.خ) دەمی ماچ دەکرد.

دەڵێت: عومەر کوڕی سەعد حەرەم و بنەماڵەی حسەینی بۆ لای عوبەیداللە نارد. لەبنەماڵەی حسەین جگە لەیەك کوڕی نەخۆش کەس نەمابوویەوە. عوبەیداللە فەرمانی کوشتنی دەرکرد بەڵام زێنەب باوەشی بەمنداڵەکەدا کرد و وتی: سوێند بەخوا ناکوژرێت تا ئەو کاتەی من دەکوژرێم. عوبەیداللە بەزەیی پیایدا هاتەوە و لەکوشتنی منداڵەکە چاوی پۆشی.

دەڵێت: عوبەیداللە کەرەستەی پێویستی بۆ ئامادە کردن و ئەوانەی بۆ لای یەزید ڕەوانە کرد. کاتێك گەیشتنە لای یەزید، هەموو کەسانی نزیکی لەخەڵکی شام کۆکردەوە. دواتر بنەماڵەی حسەینیان هێنا و خەڵکان پیرۆزبایی ئەم سەرکەوتنەیان لێکرد.

دەڵێت: یەکێك لەوان پیاوێکی سەرخڕ و چاو خێل بوو، یەکێك لەکچەکانی بینی و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران ئەمە بە من ببەخشە.

زێنەب وتی: نا، سوێند بەخوا، نەتۆ ڕێزت هەیە نەئەو، ئەوە ڕوونادات مەگەر ئەوەی لەدین هەڵبگەڕێتەوە.

دەڵێت: پیاوەکە داواکەی خۆی دووبارە کردەوە و یەزید پێی وت: چاوی لێبپۆشە.

دواتر یەزید ئەوانی بۆ لای بنەماڵەکەی خۆی نارد، کەرەستەی پێویستی خستە بەردەستیان و دواتر ڕەوانەی مەدینەی کردن. کاتێك گەیشتنە مەدینە، ژنێك لەمناڵەکانی عەبدولموتەلیب، قژ ئاڵۆسکاو و پەرێشان، هاتە لایان، دەگریا و هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( چی دەڵێت ئەگەر
پێغەمبەر (د.خ) پێتان بڵێت
ئێوە کەدوواهەمین ئۆمەت بوون
دوای مەرگی من
چ بەڵایەکتان بەسەر بنەماڵەکەم هێنا

کەدەستەیەکیان ئەسیر کران

و دەستەیەکیان لەخوێنی خۆیان گەوزان

پاداشتی من ئەوە نەبوو

چوونکە مۆجیاریم کردن دوای مەرگی خۆم

خراپە لەگەڵ بنەماڵەکەم نەکەن)).

حەسین کوڕی عەبدولڕەحمان دەڵێت: بیستم خەڵکانی کوفە نامەیان بۆ حسەین نووسی و پێیان ڕاگەیاند کەسەد هەزار کەسی لەگەڵدایە. حسەین، موسلیم کوڕی عەقیلی بۆ لای ئەوان نارد. موسلیم ڕۆشتە کوفە و لەماڵی هانی کوڕی عوروە جێگیر بوو. خەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە و کوڕی زیاد ئاگادار بوویەوە.

بێژەر بەدوای ئەم گێڕانەوەیە دەڵێت: کوڕی زیاد کەسی بەدوای هانیدا نارد کەهات و پێی وت: مەگەر ڕێزم لێنەگرتیت؟ مەگەر لەبەخششەکانم بەهرەمەند نەبوویت؟ مەگەر ئەوەم نەکرد؟

وتی: بۆ نا.

وتی: پاداشتەکەی چییە؟

وتی: ئەوەی پشتیوانیت لێ بکەم.

وتی: پشتیوانیم لێدەکەیت؟

دەڵێت: دواتر داردەستێکی هەڵگرت و لێیدا و فەرمانیدا بازووی ببەستنەوە. دواتر سەری بڕی و موسلیم کوڕی عەقیل لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە و شۆڕشی کرد و خەڵکانێکی زۆر هاورێیەتییان دەکرد. کوڕی زیاد ئاگادار بوویەوە و فەرمانیدا دەرگای کۆشکەکەی ببەستن. فەرمانی بەجاڕچییەکدا جاڕ بدات: ئەی سوارەکانی خواوەند ئامادە بن. بەڵام کەس وەڵامی نەدایەوە لەکاتێکدا گومانی دەکرد خەڵکان پشتیوانی لێدەکەن.

هیلال کوڕی یەساف دەڵێت: ئەو شەوە لەنزیك مزگەوتی ئەنسار ئەوانم بینی و کاتێك ڕێگەیان بۆ ڕاست یا چەپ دەگۆڕی، دەستەیەك لەوان، سی یا چل کەس دەڕۆشتن.

دەڵێت: لەتاریکی شەو گەیشتە بازار و ڕۆشتە ناو مزگەوت. بەکوڕی زیادیان

وت: سوێند بەخوا کەسانێکی زۆر نابینین و دەنگی خەڵکانێکی زۆر نابیستین.

دەڵێت: کوڕی زیاد فەرمانیدا سەقفی مزگەوتەکە هەڵکەنن و بەئاگر ڕووناکی بکەنەوە و بینییان زیاتر لەپەنجا کەس لەوێ نییە.

دەڵێت: کوڕی زیاد هاتەدەر و ڕۆشتە سەر مینبەر، بەخەڵکانی وت: گەڕەك بەگەڕەك جیا ببنەوە. هەردەستە ڕۆشتە لای خەڵکانی خۆی و دەستەیەك بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیان دەهات و جەنگ دەستی پێکرد. موسلیم بەقورسی بریندار بوو و ژمارەیەك لەهاوەڵانی کوژران و شکستیان خوارد. موسلیم ڕۆشت و ڕوویکردە یەکێك لەماڵەکانی کیندە. کەسێك ڕۆشتە لای محەممەد کوڕی ئەشعەس کەلای کوڕی زیاد دانیشتبوو، بەهێواشی قسەی لەگەڵ کرد و وتی: موسلیم لەماڵی فلانەکەسدایە.

کوڕی زیاد وتی: چی دەڵێت؟

وتی: دەڵێت: موسلیم لەماڵی فلانەکەسدایە.

کوڕی زیاد پێی وت: بڕۆ و بیهێنە لای من.

دەڵێت: ئەو دوو کەسە ڕۆشتن و چوونە ناو ماڵەکە. موسلیم لای ژنێك بوو کەئاگری بۆ هەڵکردبوو. ئەو خوێنی خۆی پاك دەکردەوە، پێیان وت: فەرمانڕەوا تۆی دەوێت.

وتی: بەڵێنێکم پێبدەن.

وتیان: دەسەڵاتی ئەو کارەمان نییە.

دەڵێت: لەگەڵ ئەوان ڕۆشت تا گەیشتە لای کوڕی زیاد. کوڕی زیاد فەرمانیدا و دەستیان بەستەوە. دواتر پێی وت: هێی، هێی! ئەی کوڕی ژنی بەرەڵا –لەگێڕانەوەیەکی دیکەدا هاتووە کەدەڵێت: ئەی کوڕی فلان– هاتبوویت دەسەڵاتی لەدەستی ئێمە دەربێنیت؟ دواتر فەرمانی سەر بڕینیدا.

هیلال کوڕی یەساف دەڵێت: کوڕی زیاد فەرمانیدابوو لەواقیسەوە تا ڕێگەی شام و تا ڕێگەی بەسرە ببەستن و ڕێگە نەدەن کەس بێت و کەس بڕوات. حسەین هات و ئاگای لەهیچ نەبوو تا ئەو کاتەی بیابان نشینەکانی بینی و لێی پرسین. وتیان: سوێند بەخوا هیچ نازانین جگە لەوەی ناتوانین بڕۆین و بگەڕێینەوە.

دەڵێت: ڕێگەی شامی گرتەبەر، بۆ لای یەزید بەڵام لەکەربەلا سوارەکان پێی گەیشتنەوە. حسەین لەئەسپ دابەزی و بەخوا و بەئیسلام سوێندیدان.

دەڵێت: کوڕی زیاد، عومەر کوڕی سەعد و شیمر کوڕی زی ئەلجەوشەن و حەسین کوڕی نەمیری بۆ جەنگی ئەو ناردبوو. حسەین بەخوا و ئیسلام سوێندیدان تا بیبنە لای یەزید کوڕی معاویە و دەستی بخەنە ناو دەستی ئەو.

وتیان: نا، دەبێت تەسلیمی کوڕی زیاد ببیت.

دەڵێت: یەکێك لەو کەسانەی کوڕی زیاد بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی حسەین ڕەوانەی کردبوو، حوڕ کوڕی یەزیدی حەنزەلی نەهشەلی بوو. حوڕ سەرکردەی ژمارەیەك لەسوارەکان بوو، کاتێك وتەکانی حسەینی بیست، وتی: بۆ بەوتەکانی ڕازی نابن؟ سوێند بەخوا ئەگەر تورکان و دەیلەمییەکان ئەم داوایان دەکرد، دەبوا پێی ڕازی بن. بەڵام ڕازی نەبوون و تەنیا داوایان دەکرد کەحسەین تەسلیم بەکوڕی زیاد بێت.

دەڵێت: حوڕ جڵەوی ئەسپەکەی خۆی سوڕاند و ڕوویکردە هاوەڵانی حسەین کەگومانیان کرد بەمەبەستی جەنگ هاتووە. کاتێك لێیان نزیك بوویەوە، قەڵغانەکەی ئاوەژۆ کرد و سڵاوی لێکردن. دواتر هێرشی کردە سەر هاوەڵانی کوڕی زیاد و جەنگی دەستپێکرد و دوو کەسی لێکوشتن. دواتر کوژرا.

دەڵێت: زوهەیر کوڕی قینی بوجلی کەبۆ حەج ڕۆشتبوو و چاوی بەحسەین کەوتبوو و دواتر لەگەڵ ئەو گەڕابوویەوە، کوڕی باوکی بەحریەی مورادی و دوو کەسی دیکە، عەمرۆ کوڕی حەجاجی و مەعن کوڕی سولەمیش پەیوەستی حسەین بوون.

بێژەر دەڵێت: من ئەم دوو کەسەم بینیوە.

سەعد کوڕی عوبەیدە دەڵێت: چەند کەس لەپیرەکانی کوفە لەسەر تەپۆڵکەیەك وەستابوون و دەگریان و دەیانوت: خواوەندا، سەرکەوتنی خۆتمان پێببەخشە.

دەڵێت: وتم: ئەی دوژمنانی خوا، بۆ نایێنە خوار و هاوکاری ناکەن؟

دەڵێت: حسەین هاتەپێش و لەگەڵ سوارەکانی کوڕی زیاد گفتوگۆی کرد.

بێژەر دەڵێت: ئەوم بینی کەعابایەکی لەحیللە لەبەردابوو و کاتێك قسەی لەگەڵ

کردن، گەڕایەوە. یەکێك لەمناڵەکانی تەمیم بەناوی عومەری تەهەوی تیرێکی بۆ هاویشت و بینیم تیرەکە لەنێوان دوو شانی بەعاباکەیەوە هەڵواسرابوو. کاتێك بەوتەکانی ڕازی نەبوون، بۆ لای هاوەڵانی خۆی گەڕایەوە. نزیکەی سەد کەس بوون، پێنج کەس لەوەچەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب، شانزە کەس لەمناڵەکانی هاشم، یەکێك لەمناڵەکانی سەلیم و یەکێك لەمناڵەکانی کەنانە، هەردووك خزمانی مناڵەکانی هاشم و کوڕی عومەر کوڕی زیاد.

سەعید کوڕی عوبەیدە دەڵێت: لەگەڵ عومەر کوڕی سەعد مەلەمان دەکرد، کەسێك هاتەلای و بەهێواشی پێی وت: کوڕی زیاد، جویریە کوڕی بەدری تەمیمی بۆ لای تۆ ناردووە و فەرمانی پێداوە، ئەگەر لەگەڵ حسەین و هاوەڵانی نەجەنگیت، بتکوژێت.

دەڵێت: عومەر کوڕی سەعد بەرەو لای ئەسپەکەی ڕایکرد و سواری بوو. دواتر داوای شمشێرەکەی کرد. بەو شێوەیە هێرشی برد و جەنگی دەستپێکرد.

دەڵێت: سەری حسەینیان بردە لای کوڕی زیاد. سەری حسەینی لەبەردەم خۆیدانا و بەداردەستەکەی لێیدەدا.

دەڵێت: ژن و کچەکانی بنەماڵەی حسەینیان هێنا، باشترین کار کەکردی ئەوە بوو فەرمانیدا خێوەتێکیان بۆ هەڵدەن و ڕۆژی بۆ دیاریکردن و خەرجی خۆراکی ئەوانیدا.

دەڵێت: دوو کوڕ لەوان، کوڕی عەبدوڵڵە کوڕی جەعفەر یا کوڕی باوکی جەعفەر، ڕۆشتن و پەنایان بۆ یەکێك لەخەڵکانی تەی برد کەسەری بڕین و سەری براوی ئەوانی بۆ لای کوڕی زیاد هێنا.

دەڵێت: کوڕی زیاد دەیویست سەری ببڕێت بەڵام دواتر فەرمانیداماڵەکەی وێران بکەن.

دەڵێت: یەکێك لەکۆیلەکانی معاویە کوڕی ئەبوسوفیان پێی وتم: کاتێك سەری حسەینیان بردە لای یەزید، لەبەردەم خۆی دانینا.

دەیوت: بینیم کەدەگریا و دەیوت: ئەگەر لەنێوان ئەو و حسەین پەیوەندی خزمایەتی دەبوو، هەرگیز ئەو کارەی نەدەکرد.

دەڵێت: کاتێک حسەین کوژرا، تا دوو سێ مانگ وا دەردەکەوت کە لەکاتی هەڵاتنی خۆر تا ئاوابوونی ڕۆژ، دیوارەکان خوێناوی بوو.

رئەس ئەلجالوت لەباوکی دەگێڕێتەوە: هەرکات لەکەربەلا گوزەرم دەکرد، چوارپێکەم غاردەدا تا لەوێ دوور بکەومەوە.

دەڵێت: پرسیم: بۆ؟

وتی: ئێمە بەردەوام دەمانوت کوڕی پێغەمبەرێک لێرەدا دەکوژرێت.

دەیوت: دەترسام لەوەی من بم و کاتێک حسەین کوژرا، وتمان ئەو بوو کەدەمانوت و دوای ئەوە کاتێک لەوێ گوزەرم دەکرد، بەهێواشی دەڕۆشتم.

جەعفەر کوڕی سلێمانی زەعبی دەڵێت: حسەین وتی: سوێند بەخوا دەستم لێهەڵناگرن تا ئەوکاتەی خوێنم دەڕێژن و کاتێک منیان کوشت، خواوەند کەسێک دەکات بەفەرمانڕەوای ئەوان کەڕیسوایان دەکات بەشێوەیەک ڕیسواتر لەهەر کەنیزێک دەبن.

دەڵێت: ڕێگەی عێراقی گرتەبەر و لەڕۆژی عاشوورای ساڵی شەست و یەک لەنەینەوا کوژرا.

محەممەد کوڕی عومەر دەڵێت: حسەین کوڕی عەلی لەمانگی سەفەری ساڵی شەست و یەکی کۆچی کوژرا. لەو کاتەدا پەنجا ساڵ تەمەنی بوو.

باوکی مەعشەر دەڵێت: حسەین دوای تێپەڕینی دە ڕۆژ لەموحەرەم کوژرا.

واقدی دەڵێت: ئەمە ڕاستترە.

زەڕ کوڕی حەبیش دەڵێت: یەکەم سەر کرا بەنوکی ڕمەوە، سەری حسەین کوڕی عەلی بوو. خواوەند لێی ڕازی بێت.

هوشام کوڕی وەلید دەڵێت: کاتێک حسەین لەگەڵ بنەماڵەکەی مەککەی بەجێهێشت، محەممەد کوڕی حەنیفە لەمەدینە بوو.

دەڵێت: لەناو تەشتێکدا دەستنوێژی دەگرت کەهەواڵی کوژرانی حسەینی بیست.

دەڵێت: دەستی بەگریان کرد تا ئەو جێگەی بیستم کەفرمێسکەکانی دەڕژایە ناو تەشتەکەوە.

یوسف کوڕی باوکی ئیسحاقی سەبیعی دەڵێت: کاتێك عوبەیداللّە ئاگادار بوویەوە لەوەی حسەین ڕێگەی کوفەی گرتۆتەبەر، حەسین کوڕی نومەیر، سەرکردەی پاسەوانەکانی نارد و لەقادسیە جێگیر بوو. لەقادسیە تا خەفان و هەروەها لەقادسییە تا قەتقەتانە و تا لەعلەع سوارەکانی دانا و خەڵکان وتیان: حسەین مەبەستی ڕۆشتن بۆ عێراقی هەیە.

محەممەد کوڕی قەیس دەڵێت: حسەین هات و کاتێك گەیشتە نشێوی وادی ئەلڕەمە، نامەیەکی بەقەیس کوڕی مەسهەری سەیداوی بۆ خەڵکانی کوفە نارد:

((بەناوی خواوەندی بەخشندەی میهرەبان

لەحسەین کوڕی عەلی بۆ برایانی ئەو لەموسوڵمانان و باوەڕداران

سلاو لەئێوە. سپاسی خوایەك دەکەم کەهیچ خوایەك جگە لەو نییە. بەلام دواتر: نامەی موسلیم کوڕی عەقیلم بەدەست گەیشت کە لەبڕیار و کۆبوونەوەی ئێوە بۆ وەرگرتنی مافی ئێمە دەدوا، لەخوا پاڕامەوە چاکەمان لەگەڵ بکات و بۆ ئەم کارە گەورە، پاداشتێکی گەورەتان پێببەخشێت. لەڕۆژی سێشەممە، دوای تێپەڕینی هەشت ڕۆژ لەمانگی زیحەججە و لەڕۆژی ترویە، بەرەو لای ئێوە بەڕێکەوتووم، کاتێك ئەم نێردراوەی من بگاتە لای ئێوە، خۆتان ئامادە بکەن چوونکە لەزووترین کات دەگەمە لای ئێوە. سلاوی خواتان لێبێت)).

دەڵێت: موسلیم کوڕی عەقیل بیست و حەوت ڕۆژ پێش کوژرانی، ئەو نامەی بۆ حسەین کوڕی عەلی نووسیبوو:

((بەلام دواتر: پێشەنگ درۆ لەگەڵ کەسانی خۆی ناکات. خەڵکانی کوفە لەگەڵ تۆن. کاتێك نامەکەت خوێندەوە، بەڕێکەوە، سلاوی خوات لێبێت)).

دەڵێت: حسەین بەڕێکەوت. منداڵ و ژنەکانی لەگەڵدا بوو، درێژەی بەڕێگەی خۆیدا. قەیس کوڕی مەسهەری سەیداوی لەگەڵ نامەی حسەین بەرەو کوفە بەڕێکەوت تا گەیشتە قادسیە. حسەین کوڕی نومەیر ئەوی گرت و ڕەوانەی دەرباری عوبەیداللّە کوڕی زیادی کرد. عوبەیداللّە کوڕی زیاد وتی: بڕۆ سەرەوەی کۆشك و نفرینی دڕۆزنی کوڕی دڕۆزن بکە.

دەڵێت: ئەو ڕۆشتە سەرەوەی کۆشك و وتی: ئەی خەڵکینە، هەنووکە حسەین

کوڕی عەلی، باشترین بەندەی خوا، کوڕی فاتمەی کچی پێغەمبەر (د.خ)، دەگات، من نێردراوی ئەو بۆ لای ئێوەم. لەوادی ئەلڕەمە لێی جیابوومەوە، پێشوازی لێبکەن. دواتر نفرینی عوبەیداللە و باوکی کرد و داوای بەخشینی بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالیب کرد.

دەڵێت: عوبەیداللە کوڕی زیاد فەرمانیدا لەسەرەوەی کۆشك فڕیبدەنەخوار.

دەڵێت: حسەین لەڕۆشتن بەردەوام بوو تا گەیشتە یەکێك لەئاوەکانی عەرەب. عەبدوڵلە کوڕی موتیعی عەدەوی بینی کەلەوێ دابەزیبوو، کاتێك حسەین کوڕی عەلی بینی، هاتەپێش و وتی: ئەی کوڕی پێغەمبەری (د.خ) خوا، بۆ چی هاتوویت؟

دەڵێت: ئەوی بردە ماڵەکەی خۆی و جێگەی کردەوە. حسەین پێی وت: وەك بیستووتە معاویە مردووە و خەڵکانی عێراق نامەیان بۆ نووسیم و پێشنیاری فەرمانڕەوایەتییان پێکردووم.

عەبدوڵلە کوڕی موتیع وتی: ئەی کوڕی پێغەمبەری خوا، سوێندت دەدەم بەخوا ڕێگە مەدە ڕێز و پێگەی ئیسلام بشکێت. سوێندت دەدەم بەخوا ڕێز لەپێگەی پێغەمبەر (د.خ) بگرە، سوێندت دەدەم ڕێز لەپێگەی عەرەب بگرە. سوێند بەخوا ئەگەر خوازیاری وەرگرتنەوەی فەرمانڕەوایەتی لەمناڵەکانی ئومەییە بیت، دەتکوژن و ئەگەر تۆ بکوژن، لەدوای تۆ سڵ لەکوشتنی کەس ناکەنەوە. سوێند بەخوا ئیسلام بێ ڕێز دەبێت، هەروەها پێگە و ڕێزی قوڕەیش و عەرەب لەناو دەچێت. چاو لەکوفە بپۆشە و خۆت لەمناڵەکانی ئومەییە بەدوور بگرە.

دەڵێت: بەڵام حسەین لەسەر ڕۆشتن سوور بوو.

دەڵێت: حسەین بەڕێکەوت تا لەئاوەکانی سەرەوەی زەروود نزیك بوویەوە.

سەدی لەزمانی یەکێك لەمناڵەکانی فەزارە دەڵێت: لەڕۆژگاری حەجاج کوڕی یوسفی سەقەفی لەماڵی حارس کوڕی رەبیعە بووم (لەگەڕەکی خورما فرۆشەکان بوو کەدواتر بەخشرا بەزوهەیر کوڕی قینی یەشکوری). خەڵکی شام بۆ ئەو ناوچەیە نەدەهاتن و ئێمە لەوێ خۆمان حەشاردابوو.

دەڵێت: بەپیاوی فەزاریم وت: سەبارەت بەخۆتان قسەم بۆ بکە ئەو کاتەی

لەگەڵ حسەین کوڕی عەلی هاتن.

وتی: لەگەڵ زوهەیر کوڕی قینی بوجلی بووم، لەمەککەوە بەڕێکەوتین و لەگەڵ حسەین لەسەر یەك ڕێگا بووین بەڵام حەزمان نەدەکرد لەگەڵ ئەودا لەیەك مەنزڵ بین. کاتێك حسەین دەڕۆشت، زوهەیر کوڕی قین دەمایەوە و کاتێك حسەین دادەبەزی، زوهەیر ملی ڕێگەی دەگرتەبەر تا دەگەشتینە مەنزڵگەیەك و بەناچاری دەبوا لەگەڵ ئەو بمێنینەوە. دانیشتبووین و سەرقاڵی خواردن بووین کەنێردراوەکەی حسەین هات، سڵاوی کرد و وتی: ئەی زوهەیر کوڕی قین! باوکی عەبدوڵڵە، حسەین کوڕی عەلی، منی ناردووە تا بڕۆیتە لای.

دەڵێت: هەرکەس هەرچی بەدەستەوەبوو، داینا. دەتوت باڵندەیەك بەسەر سەرمانەوە نیشتۆتەوە. دەلهەم کچی عەمرۆ، هاوسەری زوهەیر کوڕی قین دەڵێت: پێم وت: کوڕی پێغەمبەری خوا، کەس بەدوای تۆدا دەنێرێت و ناچیت؟ سوبحان الله، چی دەبێت ئەگەر بڕۆیت و گوێ لەوتەکانی بگریت و بگەڕێیتەوە.

دەڵێت: زوهەیر کوڕی قین ڕۆشت و زۆری نەخایاند، شادومان گەڕایەوە.

دەڵێت: فەرمانیدا خێوەت و کەلوپەلەکان کۆبکەنەوە و لەخێوەتەکانی حسەین نزیکی بکەینەوە. دواتر بەهاوسەرەکەی وت: تەڵاق دراویت، بگەڕێرەوە بۆ لای کەس و کارت چوونکە نامەوێت بەهۆی منەوە زیان بەتۆ بگات.

دواتر بەهاوەڵانی خۆی وت: هەرکەس لەئێوە دەخوازێت لەگەڵ من بێت، جیاواز لەوە، ئەمە دوا دیدارە. هەنووکە حەدیسێك بۆ ئێوە دەگێڕمەوە: هێرشمانکردە سەر بەلەنجەر، خواوەند سەرکەوتنی پێبەخشین و تاڵانییەکانمان کۆکردەوە. سەلمانی باهلی پێی وتین: لەو سەرکەوتن خواوەند پێی بەخشین و لەو هەموو تاڵانییە، ڕازی بوون؟.

وتمان: بەڵێ.

وتی: کاتێك گەنجانی بنەماڵەی محەممەد دەبینن، لەجەنگان شان بەشانی ئەوان ڕازیتر دەبن لەو هەموو تاڵانییەی کۆتان کردۆتەوە، بەڵام من ئێوە بەخواوەند دەسپێرم.

زوهەیر وتی: سوێند بەخوا دوای ئەوە بەردەوام پێشەنگی جەنگاوەران بوو تا

کوژرا.

عەبدوڵڵە کوڕی سەلیم و موزری کوڕی مەشعەل، هەردووك ئەسەدی دەڵێن: کاتێك کۆتاییمان بەڕێوڕەسمی حەج هێنا، تەنیا بیرمان لەوە دەکردەوە لەڕێگە بەکاروانەکەی حسەین بگەینەوە بزانین سەرئەنجامەکەی بەکوێ دەگات.

دەڵێت: وشترەکانمان بەخێرایی ڕێگەیان دەبری و لەزەرووود بەحسەین گەشتینەوە. کاتێك لێی نزیك بووینەوە، یەکێك لەخەڵکانی کوفەمان بینی و کاتێك هەستی بەکاروانەکەی حسەین کرد، ڕێگەکەی گۆڕی.

دەڵێت: بەلاّم حسەین وەستا. وەك بڵێی دەیویست بیبینێت. دواتر ئەوی پشتگوێ خست و درێژەی بەڕێگەدا. بەرەو لای حسەین بەڕێکەوتین، یەکمان بەوی دیکەی وت: دەڕۆینە لای ئەو کەسە و پرسیاری لێدەکەین تا لەهەواڵەکانی کوفە ئاگادار ببینەوە. بەڕێکەوتین تا پێی گەشتینەوە و وتمان: سلاّو لەتۆ بێت.

وتی: سلاّوی خواتان لێبێت.

وتمان: لەکام هۆزیت؟

وتی: هۆزی ئەسەد.

وتمان: ئێمەیش لەهۆزی ئەسەدین، تۆ کێیت؟

وتی: بوکەیر کوڕی موسعەبە.

دەڵێن: ئێمەیش نەژادی خۆمان پێوت. دواتر وتمان: لەباس و خواسەکانی کوفە ئاگادارمان بکەرەوە.

وتی: بەڵێ، لەکوفە بووم کەموسلیم کوڕی عەقیل و هانی کوڕی عورروە کوژران. بینیم قاچیان بەستبوونەوە و بەبازاردا دەیانگێڕان.

دەڵێن: بەڕێکەوتین تا بەکاروانەکەی حسەین گەشتینەوە و بووینە هاوڕێی. شەو، گەشتینە سەعلەبییە و کاتێك دابەزی، ڕۆشتینە لای و سلاّومان لێکرد و وەلاّمی داینەوە.

وتمان: خوا بتبەخشێت، هەواڵێکمان پێیە ئەگەر دەخوازیت بەئاشکرا باسی دەکەین و ئەگەر بخوازیت بەنهێنی.

دەڵێن: سەیرێکی هاوەلاّنی خۆیکرد و وتی هیچ نهێنییەکم لەگەڵ ئەماندا نییە.

وتمان: ئەو سوارەی دوێ شەوت بینی؟

وتی: بەڵێ و دەمویست پرسیاری لێبکەم.

وتمان: ئێمە پرسیارمان لێکرد و لەباس و خواسەکان ئاگادار بووینەوە. ئەو یەکێك لەمناڵەکانی ئەسەد بوەو، لەهۆزەکەی ئێمە، کەسێکی ڕاستگۆ و ڕاستکردارە. پێی وتین لەکوفە بووە ئەو کاتەی موسلیم کوڕی عەقیل و هانی کوڕی عوروە کوژراوە و بینیویەتی جەنازەی ئەوانیان بەبازاردا گەڕاندووە.

وتی: ((انا لله و انا الیه راجعون)). بەردەوام دووبارەی دەکردەوە.

وتمان: سوێندت دەدەین بەخوا لەبەر گیانی خۆت و بنەماڵەکەت لێرەوە بگەڕێوە چوونکە لەکوفە نەهاوەڵت هەیە نەشوێنکەوتوو، دەترسین هەموان لەدژی تۆبن.

دەڵێن: لەم کاتەدا کوڕەکانی عەقیل کوڕی ئەبی تالیب هاتن.

داوود کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵڵە کوڕی عەباس دەڵێت: کوڕەکانی عەقیل وتیان: سوێند بەخوا ناڕۆین تا تۆڵە وەردەگرینەوە یا هاوشێوەی براکەمان دەکوژرێین.

دوو بێژەری ئەسەدی دەڵێن: حسەین سەیری کردن و وتی: دوای ئەمان ژیان واتای نامێنێت.

دەڵێن: دڵنیا بووین لەوەی کەمەبەستی ڕۆشتنی هەیە، وتمان: خواوەند پاداشتی چاکەت بداتەوە.

وتی: خواوەند ئێوەیش ببەخشێت.

دەڵێن: یەکێك لەهاوەڵانی پێی وت: تۆ هاوشێوەی موسلیم کوڕی عەقیل نیت، ئەگەر بگەیتە کوفە، خەڵك بەخێرایی لەدەورت کۆدەبنەوە.

دوو بێژەری ئەسەدی دەڵێن: حسەین تا بەرەبەیان چاوەڕوان بوو، دواتر بەگەنجەکان و کۆیلەکانی خۆی وت: ئاوی زۆر هەڵگرن.

دەڵێن: ئاویان هەڵگرت و بەڕێکەوتن تا گەیشتنە زەبالە.

بەکر کوڕی مەسعەبی موزنی دەڵێت: حسەین هەرکات دەگەیشتە لای ئاوێك، خەڵکی ئەو ناوچە بەدوایدا دەهاتن تا گەیشتە زەبالە و لەکوژرانی براکەی خۆی

(برای شیری)، عەبدوڵڵە کوڕی بەقتەر ئاگادار بوویەوە. پێشتر عەبدوڵڵەی بۆ لای موسلیم ناردبوو (ئەو کاتەی هێشتا لەکوژرانی موسلیم ئاگادار نەبووبوویەوە). سوارەکانی حەسین کوڕی نومەیر لەقادسییە گرتیان و ڕەوانەی کۆشکی عوبەیدالڵە کوڕی زیادیان کرد کەپێی وت: بڕۆرە سەرەوەی کۆشك و نفرینی درۆزنی کوڕی درۆزن بکە. دواتر وەرەخوار، تا لێکۆڵینەوە لەتاوان و هەڵەکەی تۆ بکەم.

دەڵێت: ڕۆشتە سەرەوەی کۆشك و کاتێك چاوی بەخەڵکان کەوت، وتی: ئەی خەڵکینە، من نێردراوی حسەین کوڕی فاتیمە کچی پێغەمبەری خوام، هاوکاری بکەن و دژی کوڕی مەرجانە کوڕی سومەییە، پشتیوانی بن.

دەڵێت: عوبەیدالڵە فەرمانیدا و لەسەرەوەی کۆشك فڕیاندایەخوار و هەموو ئێسکەکانی ورد و خاش بوون. هێشتا گیانی بەبەردا مابوو، کەسێك بەناوی عەبدولمەلیك کوڕی عومەیر لەخمی هات و سەری بڕی. کاتێك بۆ ئەم کارەی ڕەخنەیان لێگرت، وتی: دەمویست لەو ئازارە ڕزگاری بکەم.

باوکی بەکر کوڕی عەیاش لەموتتەلیعی دەگێڕێتەوە: سوێند بەخوا عەبدولمەلیك کوڕی عومەیر، عەبدوڵڵەی سەر نەبڕی، کەسێك بوو قژ ئاڵۆز و باڵابەرز کە لەعەبدولمەلیك دەچوو.

مەسعەب دەڵێت: حسەین لەزەبالە بوو کەئاگادار بوویەوە و نووسراوێکی دەرهێنا و بۆ خەڵکی خوێندەوە:

(( بەناوی خواوەندی بەخشندەی میهرەبان

بەڵام دواتر: هەواڵێکی کارەساتبارمان بەدەست گەیشتووە، کوژرانی موسلیم کوڕی عەقیل و هانی کوڕی عوروە و عەبدوڵڵە کوڕی یەقتەر. شیعەکان ئێمەیان بەتەنیا جێهێشت. هەرکەس لەئێوە دەخوازێت بگەڕێتەوە چوونکە مافمان بەسەر کەسەوە نییە)).

دەڵێت: خەڵك بەگشتی بڵاوەیان لێکرد و ڕێگەی ڕاست و چەپیان گرتەبەر. حسەین مایەوە لەگەڵ ئەو هاوەڵانەی لەمەدینەوە هاوڕێیەتی دەکردن. ئەم کارەی بۆیە کرد چوونکە دەیزانی سارانشینەکان بۆیە پەیوەستی بوون لەبەر ئەوەی

گومان دەکەن بەرەو شارێك دەڕوات کەخەڵکەکەی ملکەچ و گوێرایەڵن. حسەین نەیدەویست لەگەڵیدا بن بێ ئەوەی بزانن بۆ کوێ دەڕۆن چوونکە دەیزانی لەکاتی جەنگ، جگە لەو کەسانەی لەمەدینەوە هاورێیەتیان دەکرد، کەس ئامادە نابێت لەپێناوی ئەمدا بجەنگێت.

دەڵێت: لەکاتی بەرەبەیان فەرمانی بەکۆیلەکانی خۆیدا ئاوی پێویست هەڵبگرن. دواتر درێژەیان بەڕێگەدا تا گەیشتنە دۆڵی عەقەبە و لەوێ دابەزین.

لوزان، یەکێك لەمناڵەکانی عەکرەمە دەڵێت: یەکێك لەمامەکان لەحسەینی پرسی بەرەو کوێ دەڕوات؟ حسەین وەڵامی دابوویەوە. مامم وتبووی: سوێندت دەدەم بەخوا بگەڕێیتەوە، چوونکە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ڕم و شمشێرەکان دەڕۆیت. ئەوانەی کەسیان بۆ لای تۆ نارد، ئەگەر بەڵێنی جەنگیان دەدا و کاروبارەکانیان ئامادە دەکرد، پێویست بوو وەڵامی بانگێشتەکەیان بدەیتەوە، بەڵام بەم دۆخەی دەیبینی، بۆچوونی من ئەوەیە بگەڕێیتەوە.

دەڵێت: حسەین وتبووی: ئەی بەندەی خوا، دەزانم بۆچوونی ڕاست ئەوەیە بەڵام ناتوانین بەسەر ئیرادەی خواوەند زاڵ ببین. دواتر ئەو ناوچەی بەجێهێشت.

لەم ساڵەدا یەزید کوڕی معاویە، وەلید کوڕی عوتبەی لەکارگوزاری مەککە دوورخستەوە و عەمرۆ کوڕی سەعید کوڕی عاسی وەك کارگوزاری ئەو شارە دەستنیشان کرد. ئەم پێشهاتە لەمانگی ڕەمەزان ڕوویدا.

کارگوزاری یەزید لەمەککە و مەدینە، دوای لابردنی وەلید کوڕی عوتبە، عەمرۆ کوڕی سەعید بوو.

کارگوزاری کوفە و بەسرە و ویلایەتە پەیوەستەکانی دیکەی ئەم دوو شارە، عوبەیدالله کوڕی زیاد بوو.

کاروباری دادی کوفە لەئەستۆی شورەیح کوڕی حارس و کاروباری دادی بەسرە لەئەستۆی هوشام کوڕی هوبەیرەدا بوو.

## ڕووداوەکانی ساڵی شەست و یەکی کۆچ

یەکێك لەڕووداوەکانی ئەم ساڵە کوژرانی حسەین کوڕی عەلی بوو. وەك لەگێڕانەوەی ئەحمەد کوڕی سابت ئاماژەی پێدراوە، حسەین کوڕی عەلی لەموحەڕەمی ئەم ساڵە و دوای تێپەڕینی دە ڕۆژ لەم مانگە، کوژرا. واقدی و هوشامی کەلبیش گێڕانەوەیەکی هاوشێوەیان هەیە.

پێشتر ئاماژەمان پێدا کەحسەین کوڕی عەلی لەساڵی شەست مەککەی بەرەو عێراق بەجێهێشت. هەنووکە ئاماژە بەبەسەرهاتی ئەو لەساڵی شەست و یەکی کۆچی دەدەین و ئەوەی هۆکار و چۆنیەتی کوژرانەکەی چۆن بوو.

عەبدوڵڵە کوڕی سەلیم و موزری کوڕی مەشعەل، هەردووك ئەسەدی، دەڵێن: حسەین هات و لەشەراف جێگیر بوو، لەکاتی بەرەبەیان فەرمانی بەکۆیلەکانیدا ئاوی پێویست هەڵبگرن و دواتر ئەو ناوچەیان بەجێهێشت. سەرەتای ڕۆژ لەڕێگەدا بوون تا کاتی نیوەڕۆ. دواتر یەکێك وتی: الله ئەکبەر.

حسەین وتی: الله ئەکبەر! بۆ تەکبیرت وت؟

وتی: دار خورماکانم بینی.

دوو پیاوی ئەسەدی وتیان: هەرگیز لێرە تەنانەت یەك دارخورمامان نەبینیوە.

حسەین پێی وتن: بەبۆچوونی ئێوە چی بینیوە؟

وتمان: بەبۆچوونی ئێمە ملی ئەسپ و ڕم و شمشێرەکانیان بینیوە.

وتی: سوێند بەخوا بۆچوونی منیش ئەوەیە.

دەڵێن: حسەین وتی: پەناگەیەك هەیە پشتی پێببەستین بۆ ئەوەی تەنیا لەیەك بەرەوە ڕووبەڕووی دوژمن ببینەوە.

وتمان: بەڵێ. زوحەسم لەتەنیشت تۆیە، لای چەپەوە بۆی دەڕۆیت. ئەگەر زووتر لەدوژمن بگەیت، بەو شێوەیە کەخۆت دەتەوێت.

دەڵێن: حسەین لەلای چەپەوە، ڕێگەی ئەو ناوچەی گرتەبەر.

دەڵێن: ئێمەیش بەدوایدا ڕۆشتین و زۆر خێرا گەردنی ئەسپەکان دەرکەوتن. کاتێك ئەوانمان بینی و ئێمەیان بینی کەڕێگەمان گۆڕیوە، شوێنمان کەوتن.

دەڵێن: بەخێرایی بەرەو زی حەسم دەڕۆشتین و زووتر لەدوژمن گەشتینە شوێنی مەبەست. حسەین دابەزی و فەرمانیدا خێوەتی بۆ هەڵبدەن. دواتر سوارەکانی عوبەیداللە هاتن. نزیکەی هەزار کەس دەبوون هاوڕێ لەگەڵ حوڕ کوڕی یەزیدی تەمیمی یەربوعی. ئەو و سوپاکەی لەگەرمای نیمەڕۆ، لەبەرابەر حسەین و هاوەڵانی ڕیزیان بەست. حوڕ و هاوەڵانی دەستاریان لەسەردا بوو، شمشێریان هەڵواسیبوو. حسەین بەکۆیلەکانی وت: ئاویان پێبدەن و تێراویان بکەن. ئاو بەئەسپەکانیشیان بدەن. کۆیلەکان هاتن و ئەسپەکانیان تێراو کرد. دەستەیەك لەوان ئاویان بەپیاوەکان دەدا و دواتر تەشتی گەورەیان پڕ دەکرد لەئاو و دەیانخستە بەردەم ئەسپەکان تا ئەوەی ئاویان بەهەموو سوپاکەدا.

عەلی کوڕی تەعانی موحاربی دەڵێت: لەگەڵ حوڕ کوڕی یەزید بووم، لەگەڵ دووایین دەستە لەهاوەڵانی ئەو گەشتم، کاتێك حسەین بینی، خۆم و ئەسپەکەم تینووین، وتی: برازا، وشترەکەت بخەوێنە.

دەڵێت: وشترەکەم خەواند.

وتی: ئاو بخۆرەوە. دەستم بەئاو خواردنەوە کرد و کاتێك دەمخواردەوە، ئاو لەمەشکەکە دەڕژا.

حسەین وتی: کۆی بکەرەوە.

دەڵێت: نەمدەزانی چی بکەم.

حسەین هات و مەشکەکەی خوار کردەوە و من، ئاوم خواردەوە و ئەسپەکەم تێراو کرد.

دەڵێت: حوڕ کوڕی یەزید لەقادسیەوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی حسەین هاتبوو. کاتێك عوبەیداللە کوڕی زیاد لەهاتنی حسەین ئاگادار بوویەوە، حەسین کوڕی نومەیری تەمیمی، سەرکردەی پاسەوانەکانی ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا لەقادسییە جێگیر ببێت و لەهەموو ناوچەکان لەقەتقەتانەوە تا خەفان دیدەوان دابنێت. حوڕ کوڕی یەزید لەگەڵ هەزار سوار لەقادسییەوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی حسەین کوڕی عەلی هاتبوو.

دەڵێت: حوڕ تا کاتی نوێژی نیوەڕۆ لەبەرابەر سوپاکەی حسەین ڕیزی

بەستبوو. حسەین، فەرمانی بەحەجاج کوڕی مەسروقی جوعەفیدا بانگ بڵێت. حەجاج بانگیدا و حسەین بەمەبەستی نوێژ خوێندن هاتەدەر. سپاسی خواوەندی کرد و وتی:

(( ئەی خەڵکینە! لای خواوەندی میهرەبان ئەو پاساوەم هەیە کەمن ڕوومنەکردە عێراق تا ئەو کاتەی نامەکانی ئێوەم بەدەست گەیشت و نێردراوەکانتان هاتن و ئاگادارتان کردینەوە کەئیمامتان نییە، هیواداریین خواوەند لەسەر دەستی تۆ ڕێنوێنیمان بکات. ئەگەر لەسەر بەڵێن و پەیمانی خۆتان ماون، هاتووم، ئەگەر بەڵێن دەدەن و دڵنیام دەکەنەوە، دێمە ناو شارەکەی ئێوە و ئەگەر بەڵێن نادەن و بەهاتنی من دڵخۆش نابن، دەگەڕێمەوە بۆ زێد و دیاری خۆم)).

دەڵێت: هەمووان بێدەنگ بوون و بەبانگبێژیان وت بانگ بدات.،

دەڵێت: حسەین کوڕی عەلی بەحوڕی وت: دەخوازیت لەگەڵ سوپاکەی خۆت نوێژ بخوێنیت؟

وتی: نا، تۆ پێشنوێژ دەکەیت و ئێمەیش لەدوای تۆ نوێژ دەخوێنین.

دەڵێت: حسەین پێشنوێژی بۆ کردن. دواتر ڕۆشتە ناو خێوەتەکەی و هاوەڵانی لەدەوری کۆبوونەوە. حوڕ بۆ شوێنەکەی گەڕایەوە و ڕۆشتە ناو خێوەتەکەی خۆی. دەستەیەك لەهاوەڵانی دەوریان گرت. ژمارەیەکی دیکە لەسوپاکەی دووبارە لەدەرەوەی ڕیزیان بەستەوە و هەرکام جڵەوی چوارپێکەی خۆی بەدەستەوە گرتبوو. دەمەوئێوارێ، حسەین وتی: بۆ ڕۆشتن ئامادە بن.

دواتر گەڕایەوە بۆ ناو خێوەتەکەی و بەبانگبێژەکەی وت بانگی ئێوارێ بدات. دووبارە حسەین هاتەوە و پێشنوێژی بۆ خەڵکان کرد. دوای ئەوەی سڵاوی نوێژی دایەوە، ڕوویکردە خەڵکان، سپاسی خواوەندی کرد و وتی:

((بەڵام دواتر: ئەی خەڵکینە، ئەگەر خۆپارێز بن و ماف بۆ خاوەن ماف بگێڕنەوە، زیاتر دەبێتە هۆی ڕەزامەندی خواوەند. ئێمە، بنەماڵەی پێغەمبەر (د.خ) بۆ بەدەستەوە گرتنی کاروباری خەلافەت، لەئێوە شیاوترین. ئەگەر ئێمەتان خۆش ناوێت و ئەو مافە بەئێمە نادەن و بۆچوونی ئێوە جیاوازە لەو نامانەی بەنێردراوەکان خۆتان بۆ منتان ناردووە، دەگەڕێمەوە)).

حوڕ کوڕی یەزید وتی: سوێند بەخوا ئاگاداری ئەو نامانە نین.

حسەین وتی: ئەی عوقبە کوڕی سەمعان، ئەو تورەکەی نامەکانی تێدایە، بیهێنە.

دەڵێت: عوقبە تورەکەیەکی پڕ لەنامەی هێنا و لەبەردەم ئەوان هەڵیڕشت.

حوڕ وتی: ئێمە لەناو ئەو کەسانەدا نین کەنامەیان بۆ تۆ نووسیوە. فەرمانیان پێداوین کاتێک بەتۆ گەیشتین، لێت جیا نەبینەوە تا ئەو کاتەی دەتبەینە لای عوبەیدالله کوڕی زیاد.

حسەین وتی: مەرگ لەو کارە بەباشتر دەزانم.

دەڵێت: حسەین بەهاوەڵانی خۆی وت: هەستن و سواربن. هاوەڵانی سوار بوون و چاوەڕێیان کرد تا ژنەکانیش سەرکەوتن. حسەین بەهاوەڵانی خۆی وت: بڕۆین.

دەڵێت: کاتێک مەبەستی ڕۆشتنیان کرد، ڕێگەیان لێگرتن.

حسەین بەحوڕی وت: دایکت لەپرسەتا دانیشێت، چیت دەوێت؟

وتی: سوێند بەخوا ئەگەر جگە لەتۆ کەسێکی دیکە عەرەب ئەوەی پێ دەوتم، بۆ وەڵامدانەوەی بەخراپترین شێوە، یەك چرکەیش درێغم نەدەکرد، بەڵام ناتوانم ناوی دایکی تۆ بێنمە سەرزمان مەگەر بەباشترین شێوە.

حسەین وتی: چیت دەوێت؟

وتی: دەمەوێت تۆ ببەمە لای عوبەیدالله کوڕی زیاد.

حسەین وتی: سوێند بەخوا لەگەڵ تۆدا نایەم.

حوڕ وتی: سوێند بەخوا منیش ناتوانم دەستت لێهەڵگرم. سێ جار ئەم وتەیان دووبارە کردەوە.

کاتێک قسەکردن درێژەی کێشا، حوڕ وتی: فەرمانی جەنگ دژی تۆیان پێنەداوم، تەنیا فەرمانیان پێداوم لێت دوورنەکەومەوە تا ئەو کاتەی دەتبەمە کوفە. ئەگەر بەم کارە ڕازی نابێت، ڕێگەیەك هەڵبژێرە نە بەکوفە بگات، نە بەمەدینە، تا دادپەروەری لەنێوان ئێمەدا ڕوویدا بێت و من کوڕی زیاد لەم پێشهاتە ئاگادار بکەمەوە. تۆیش ئەگەر دەخوازیت نامەیەك بۆ یەزید کوڕی معاویە، یا کوڕی زیاد بنووسە و بینێرە. هیوادارم خواوەند تا ئەو کاتە

ڕێگەچارەیەکمان نیشان بدات تا لەجەنگ دژی تۆ ببەخشرێم.

وتی: لەم ڕێگەوە بڕۆ و لەڕێگەی عوزەیب و قادسییە، بەرەو لای چەپ، بەڕێکەوە.

دەڵێت: حسەین لەگەڵ هاوەڵانی خۆی بەڕێکەوت و حوڕیش هاورێیەتی دەکرد.

عوقەبە کوڕی باوکی ئەلعیزار دەڵێت: حسەین لەبەیزە قسەی بۆ هاوەڵانی خۆی و هاوەڵانی حوڕ کرد، ناوی خواوەندی هێنایە سەرزمان، دواتر وتی:

((ئەی خەڵکینە، پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی، هەرکەس فەرمانڕەوایەکی ستەمکار ببینێت کەحەرامەکانی خواوەند حەڵاڵ بکات و پەیمانی خوا بشکێنێت و پێچەوانەی سوونەتی پێغەمبەر (د.خ) بجووڵێتەوە و دەستدرێژی بکاتە سەر بەندەکانی خوا، ئەگەر بەکردار و وتار ڕەخنەی لێنەگرێت، خواوەند ئەو بۆ شوێنێك دەبات کەدەبێت بیبات. ئاگاداربن ئەوانە گوێڕایەڵی شەیتان دەکەن و چیتر ملکەچی فەرموودەکانی ڕەحمان نین، داردەی تازەیان هێناوەتە ناو ئیسلام و تالانییەکانیان تایبەت کردووە بەخۆیان، حەرامی خواوەندیان حەڵاڵ و حەڵاڵیان حەرام کردووە. من شیاوترین کەسم ڕەخنەیان لێبگرم. نامەکانی ئێوەم بەدەست گەیشتووە و نێردراوانی ئێوە بەیعەتیان لەگەڵ بەستووم و بەڵێنیان پێدام کەمن تەسلیم ناکەن و بەردەوام پشتیوان و هاوکارم دەبن. ئەگەر بەڵێن و بەیعەتەکەی خۆتان ببەنەسەر، ڕزگار دەبن. من حسەین کوڕی عەلیم و کوڕی فاتیمەی کچی پێغەمبەر (د.خ)، گیانم لەگەڵ گیانی ئێوەدایە و کەسەکانم لەگەڵ کەسەکانی ئێوەدایە و پێشەوای ئێوەم. ئەگەر پەیمانەکەی خۆتان بشکێنن و ڕێز لەبەیعەتەکەی من نەگرن، ئەمە یەکەم جار نییە پەیمان دەشکێنن. لەگەڵ باوکم و براکەم و ئامۆزاکەیشم ئەو کارەتان کرد. فریودراو ئەو کەسەیە فریوی ئێوەی خوارد، ڕێگەی خۆتان ونکرد و ڕۆژی خۆتان بەفیڕۆدا. هەرکەس پەیمان بشکێنێت، زیانی خۆی لێدەکەوێتەوە. خواوەند هەمیشە لەئێوە بێ نیازە. سڵاو و ڕەحمەتی خواتان لێبێت)).

هەروەها عوقەبە کوڕی باوکی ئەلعیزار دەڵێت: حسەین لەزی حەسم قسەی بۆ خەڵکان کرد، ناوی خوای هێنایە سەرزمان و وتی:

((بارودۆخ بەو شێوەیە کەدەیبینن، جیهان گۆڕانی بەسەرهاتووە و کارە قێزەونەکان زیادیان کردووە. خێر نەماوە و خراپە بەردەوام جێگەی دەگرێتەوە. مەگەر نابینن دادپەروەری ناکەنە پیشە و لەخراپەکاری دەست هەڵناگرن، باوەڕدار دەبێت تامەزرۆی دیداری خواوەند بێت و بەبڕوای من، مەرگ شەهادەتە و ژیان لەگەڵ ستەمکاران، هۆکاری ڕەنج و ئازارە)).

دەڵێت: زوهەیر کوڕی قینی بوجلی هەستا و بەهاوەڵانی خۆی وت: ئێوە قسە دەکەن یا من قسە بکەم.

وتیان: تۆ قسە بکە.

دەڵێت: سپاسی خواوەندی کرد، ناوی خوای هێنایە سەرزمان و وتی: ئەی کوڕی پێغەمبەر (د.خ)، وتەکانی تۆمان بیست، سوێند بەخوا ئەگەر جیهان بۆ ئێمە ناکۆتا دەبوو و هاوکاری و پشتیوانی کردنی تۆ دەبووە هۆی جیابوونەوەی ئێمە لەدنیا، هاوکاریکردنی تۆمان هەڵدەبژارد.

دەڵێت: حسەین دۆعای بۆ کرد و بۆی پاڕایەوە.

دەڵێت: حوڕ هات و وتی: ئەی حسەین، سوێندت دەدەم بەخوا، بیر لەخۆت بکەیتەوە، ئەگەر بجەنگیت، دەکوژرێیت، ئەگەر دژی تۆ بجەنگن، لەناو دەچیت.

حسەین وتی: من لەمەرگ دەترسێنیت مەگەر زیاتر لەمە هیچی دیکە هەیە منی پێبکوژن؟ نازانم چیت پێبڵێم؟ هۆنراوەی ئەو پیاوەی ئەوسیەت بۆ دەڵێم کە بەکوڕە مامەکەی خۆی وت ئەو کاتەی بۆ هاوکاری کردنی پێغەمبەر (د.خ) دەڕۆشت، پێی وتبوو، بۆ کوێ دەڕۆیت، دەکوژرێیت؟ وەڵامیدابوویەوە:

((دەڕۆم چوونکە مەرگ بۆ پیاو  
ئەگەر نییەتی پاکی هەبێت  
موسڵمان بێت و بجەنگێت  
و بەگیان و دڵ پارێزگاری لەخواپەرەستان بکات  
شەرم نییە)).

دەڵێت: حوڕ کاتێک ئەمەی بیست، خۆی بەدوور گرت. ئەو لەگەڵ سوپاکەی بەلایەکدا دەڕۆشت و حسەین و هاوەڵانی بەلایەکی دیکەدا تا ئەوەی گەیشتنە

عوزەیبی هەجانات. لەناکاو چوار کەسیان بینی کە لەکوفەوە دەهاتن، سوار چوارپێکانی خۆیان بوون و ئەسپێکی نافیع کوڕی هیلالیان بەناوی (کامل) لەگەڵدا بوو. بەڵەدەکەیان، تەرماح کوڕی عودەی، سوار لەسەر ئەسپەکەی خۆی، هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( ئەی وشترەکەی من

لەوەی بۆ پێشەوەت دەبەم مەترسە

و پەلە مەکە چوونکە پێش بەرەبەیان

لەگەڵ باشترین سوارەکان و باشترین ڕێبواران

دەگەیتە لای پیاوێکی خاوەن نەژاد

ڕێزدار و هێژا

کەخواوەند بەمەبەستی ئەنجامدانی باشترین کار بۆ ئێرەی هێناوە

هیوادارم خواوەند بۆ هەمیشە بیهێڵێتەوە)).

دەڵێت: کاتێك گەیشتە لای حسەین، هۆنراوەکانی بۆ خوێندەوە. حسەین وتی: سوێند بەخوا هیوادارم ئەوەی خوا بۆ ئێمەی نووسیوە، یا کوشتن بێت، یا سەرکەوتن.

دەڵێت: حوڕ کوڕی یەزید هات و وتی: ئەم کەسانە کە خەڵکی کوفەن، لەناو هاوەڵانی تۆدا نەبوون، من ئەوان دەگێڕمەوە یا ڕێگەی هەموو شتێکیان لێدەگرم.

حسەین وتی: هاوشێوەی خۆم بەرگری لەوان دەکەم. ئەوان هاوەڵان و پشتیوانانی منن، بەڵێنتدا بوو ڕێگەم لێنەگریت تا ئەو کاتەی نامەی کوڕی زیادت بەدەست دەگات.

وتی: بەڵێ، بەڵام لەگەڵ تۆدا نەهاتبوون.

وتی: ئەوانە هاوەڵانی منن و هاوشێوەی ئەو کەسانەن لەم سەفەرەدا هاوڕێم بوون، ئەگەر بەڵێنەکەی نێوان خۆم و خۆت بەسەر نەبەیت، جەنگ دژی تۆ دەستپێدەکەم.

دەڵێت: حوڕ دەستی لێهەڵگرتن.

دەڵێت: حسەین پێی وتن: لەدەنگ و باسەکان ئاگادارم بکەنەوە.

مەجمەع کوڕی عەبدوللەی عایزی، یەکێك لەو چوارکەسەی هاتبوو، وتی: پارەیەکی زۆریان بەسەرکردەکانی خەڵکداوە و گیرفانیان پڕ کردوون تا هاوڕێیەتی ئەوان بەدەست بێنن و پەیوەستی خۆیانیان بکەن. ئێستا هەمووان دژی تۆ هاودەنگن. خەڵکان دڵیان لەگەڵ تۆیە بەلاّم بەیانی شمشێری دژی تۆ دەردەکێشن.

وتی: پێم بڵێن ئایا هەواڵی نێردراوەکەی منتان هەیە؟

وتیان: کێ بوو؟

وتی: قەیس کوڕی مەسهەری سەیداوی.

وتیان: بەڵێ، حسەین کوڕی نومەیر ئەوی گرت و بۆدەرباری کوڕی زیادی نارد. کوڕی زیاد فەرمانی پێدا نفرینی تۆ بکات بەلاّم ئەو دروودی بۆ خۆت وباوکت نارد و نفرینی کوڕی زیاد و باوکی کرد و داوای لەخەڵك کرد پشتیوانی تۆ بن و لەهاتنی تۆ ئاگاداری کردنەوە. کوڕی زیاد فەرمانیدا لەسەرەوەی کۆشك هەڵیدەنە خوارەوە.

دەڵێت: فرمێسك لەچاوی حسەین کۆبوویەوە و نەیتوانی خۆی بگرێت. وتی: دەستەیەك لەوان بەڵێنەکەی خۆیان بردەسەر و شەهید بوون و دەستەیەك لەوان چاوەڕوانن و هیچ گۆڕانێکیان بەسەر نەهاتووە. خواوەندا بەهەشت بکەرە جێگەی ئێمە و ئەوان و ئێمە لەپەنای بەزەیی و پاداشتەکانی خۆت کۆبکەرەوە.

جەمیل کوڕی موزەیەد دەڵێت: تەرماح کوڕی عودەی لەحسەین کوڕی عەلی نزیك بوویەوە و وتی: سوێند بەخوا سەیر دەکەم و کەس لەگەڵ تۆدا نابینم. ئەگەر تەنیا ئەم کەسانەی بۆ چاودێری کردنی تۆ هاتوون، دژی تۆ بجەنگن، بەسە. بەلاّم ڕۆژێك پێش ئەوەی لەکوفە بێمەدەر و بێم بۆ لای تۆ، دەستەیەکی زۆرم لەدەرەوەی کوفە بینی کەهاوشێوەی نەبینراوە. سەبارەت بەوان پرسیارم کرد، وتیان: کۆبوونەوە بۆ ئەوەی خۆیان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی حسەین کوڕی عەلی ئامادە بکەن. سوێندت دەدەم ئەگەر دەتوانی نەڕۆیتە پێش، یەك هەنگاویش مەڕۆ، ئەگەر دەخوازیت ڕووبکە شارێکی دیکە تا خواوەند بتپارێزێت و تۆیش بتوانی لێکۆڵینەوە لەبارودۆخ بکەیت بۆ ئەوەی باشترین بڕیار بگریت. بڕۆ تا

دەگەیتە کوێستانە پارێزراوەکەی ئێمە (ئەجا). ئێمە لەوێ لەهەموو پاشاکانی غەسان و حەمیر و نەعمان کوڕی مونزەر و سوپای سوور و ڕەش پارێزراو بووین. سوێند بەخوا هەرگیز دوژمنێك دەستی بەوێ نەگەیشتووە، منیش لەگەڵ تۆ دێم، دواتر کەسێك بۆ لای پیاوانی تەی دەنێرم کە لەئەجا و سەلمان. سوێند بەخوا دە ڕۆژ ناخایەنێت خەڵکانی تەی، پیادە و سوار بۆ لای تۆ بەڕێدەکەون. تا ئەو کاتەی دەخوازیت لەناو ئێمەدا بمێنەرەوە. ئەگەر کارەساتێك ڕووبدات، بەڵێن دەدەم بیست هەزار پیاو لەخەڵکانی تەی، شمشێر بەدەست بەرگریت لێ بکەن. سوێند بەخوا تا یەك کەس لەوان زیندوو بێت، دەستیان بەتۆ ناگات.

حسەین وتی: خواوەند پاداشتی چاکەی تۆ و خەڵکەکەت بداتەوە. من و حوڕ بەڵێنێکمان بەیەکداوە، بەپێی ئەو بەڵێنە من ناتوانم بڕۆم و نازانم سەرئەنجامی من لەگەڵ ئەوان چۆن دەبێت.

تەرماح کوڕی عودەی دەڵێت: ماڵئاواییم لێکرد و وتم: خواوەند بەڵای فریشتە و شەیتانت لەکۆڵ بکاتەوە، لەکوفە توێشووم بۆ کەسەکانم کڕیوە و خەرجی ئەوان لای منە، دەڕۆم و ئەمەیان تەسلیم دەکەمەوە، بەخواستی خوا بۆ لای تۆ دەگەڕێمەوە. کەگەڕامەوە، سوێند بەخوا یەکێك دەبم لەهاوەڵانی تۆ.

حسەین وتی: ئەگەر ئەو کارە دەکەیت، پەلە بکە، خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە.

دەڵێت: دڵنیابووم بۆیە دەڵێت پەلە بکە، چوونکە لەکرداری ئەو کەسانە نیگەرانە.

دەڵێت: کاتێك گەڕامەوە بۆ لای کەسەکانم و کەرەستەکانم پێدان و پێشنیاری پێویستم پێکرد، دەیانوت: پێشتر هیچکات بەمشێوەیە هەڵسوکەوتت نەکردووە.

دەڵێت: لەمەبەستەکەی خۆم ئاگادارم کردنەوە و لەڕێگەی مناڵەکانی سەعلەوە بەڕێکەوتم و کاتێك گەیشتمە عوزەیبی هەجانات، سەماعە کوڕی بەدرم بینی و لەهەواڵی کوژرانی حسەین کوڕی عەلی ئاگاداری کردمەوە و بەناچاری گەڕامەوە.

دەڵێت: حسەین ڕۆشت تا گەیشتە کۆشکی مناڵەکانی موقاتیل. لەوێ دابەزی و بینی خێوەتێکیان هەڵداوە.

شەعبی دەڵێت: حسەین پرسی: ئەم خێوەتە هی کێیە؟

وتیان: خێوەتی عوبەیداللە کوڕی حوڕی جوعەفییە؟

وتی: ئەو بۆ لای من بێنن. کەسێکی بەدوای ئەودا نارد.

دەڵێت: کاتێك نێردراو ڕۆشت، وتی: حسەین کوڕی عەلی داوای تۆ دەکات.

عوبەیداللە وتی: انا لله و انا الیه راجعون. سوێند بەخوا کوفەم بەجێهێشت بۆ ئەوەی کاتێك حسەین دەگات، لەوێ نەبم. سوێند بەخوا حەز ناکەم بیبینم و بمبینێت.

دەڵێت: نێردراو گەڕایەوە و حسەینی لەوتەکانی عوبەیداللە ئاگادار کردەوە.

دەڵێت: حسەین پێپۆشەکانی لەپێ کرد و هەستا و ڕۆشتە لای عوبەیداللە. دوای سڵاو پێشنیاری پێکرد لەم شۆڕشەدا هاوکاری بکات. بەڵام کوڕی حوڕ وتەکانی پێشووتری بۆ دووبارە کردەوە.

حسەین وتی: ئەگەر هاوکاریمان ناکەیت، لانیکەم لەڕیزی ئەو کەسانەدا مەبە کەدژی ئێمە دەجەنگن. سوێند بەخوا هەرکەس بانگەوازەکەی ئێمە ببیستێت و هاوکاریمان نەکات، دەکوژرێت.

وتی: بەخواستی خوا، ئەوە هیچکات ڕوونادات.

دەڵێت: حسەین هەستا و بۆ شوێنەکەی گەڕایەوە.

عوقەبە کوڕی سەمعان دەڵێت: کۆتایی شەو، حسەین پێی وتین، ئاوی پێویست هەڵبگرن. دواتر فەرمانی ڕۆشتنی پێداین و بەڕێکەوتین.

دەڵێت: کاتێك لەکۆشکی مناڵەکانی موقاتیلەوە بەڕێکەوتین، حسەین سەرخەوێکی شکاند، دواتر بەخەبەر هاتەوە و وتی: انا لله و انا الیه راجعون و الحمدالله رب العالمین. سێ جار ئەمەی دووبارە کردەوە.

دەڵێت: عەلی کوڕی سوار لەسەر ئەسپەکەی هات و وتی: انا لله و انا الیه راجعون و الحمدالله رب العالمین، ئەمانە بۆ دەڵێیت؟

وتی: کوڕم، سەرخەوێکم شکاند، سوارێکم لەسەر ئەسپ بینی کەدەیوت: خەڵك بەڕێکەوتوون و مەرگیش. زانیم باسی مەرگی ئێمە دەکەن.

وتی: باوە گیان، هیوادارم گرفتاری خراپە نەبین، مەگەر ماف بەئێمە نییە؟

وتی: سوێند بەخوا، ماق ئێمەیە.

وتی: باوەگیان، گرنگ نییە، ئێمە بۆ وەرگرتنی ماف دەمرین.

وتی: خواوەند باشترین پاداشتت بداتەوە.

دەڵێت: کاتێك خۆر هەڵات، دابەزی و نوێژی بەیانی خوێند. دواتر بەپەلە سوار بوویەوە و هاوەڵانی بەلای چەپدا برد، دەیویست بڵاوە بەهاوەڵانی بکات بەڵام حوڕ دەهات و دووبارە ئەوانی کۆدەکردەوە. حسەینیش ئەوی دوور دەکردەوە و کاتێك حوڕ دەیویست ئەوان بەرەو لای کوفە ببات، بەرگری دەکرد. بەمشێوەیە درێژەیان بەرێگەدا تا گەیشتنە نەینەوا، ئەو شوێنەی حسەین وەك مەنزڵ هەڵیبژارد.

دەڵێت: لەم کاتەدا سوارێك لەسەر ئەسپێکی ڕەسەن دەرکەوت. شمشێری بەدەستەوە بوو، کەوانێکی بەشانەوە بوو و لەلای کوفەوە دەهات. هەمووان وەستان و چاوەڕوانی ئەو بوون، کاتێك نزیك بوویەوە، سڵاوی لەحوڕ و هاوەڵانی کرد بەڵام سەیری حسەین و هاوەڵانی نەکرد. دواتر نامەکەی کوڕی زیادی تەسلیم بەحوڕ کرد. نووسرابوو:

کاتێك نامەکەم بەدەستت گەیشت و نێردراوەکەم هات، حسەین لەزەوییەکی ئاوەڵا و بێ دیوار و بێ ئاو گەمارۆ بدە. فەرمانم بەنێردراوەکەم داوە لەگەڵ تۆ بێت و لێت جیا نەبێتەوە تا ئەو کاتەی دڵنیا دەبێت فەرمانەکانی منت جێبەجێ کردووە.

دەڵێت: حوڕ نامەکەی خوێندەوە و پێی وتن: ئەمە نامەی فەرمانڕەوا عوبەیدالڵە کوڕی زیادە کەفەرمانی پێداوم لەم شوێنەدا ڕێگەی ڕۆشتن و جموجۆڵتان لێبگرم. ئەمە نێردراوەکەی ئەوە و فەرمانی پێدراوە لێم جیا نەبێتەوە تا ئەو کاتەی فەرمانەکەی جێبەجێ دەکەم.

دەڵێت: باوکی سەعشا، یەزید کوڕی زیادی موهاجیری کێندی، سەیرێکی نێردراوەکەی عوبەیدالڵە کوڕی زیادی کرد و وتی: مالك کوڕی نەسیری بودیت؟

وتی: بەڵێ.

دەڵێت: ئەویش یەکێك لەخەڵکانی کێندە بوو.

دەڵێت: یەزید کوڕی زیاد پێی وت: دایکت لەپرسەتا دانیشێت، بۆ چ کارێک هاتوویت.

وتی: بۆ کارێک تا فەرمانی پێشەواکەم جێبەجێ کردبێت و ڕێزم لەبەڵێن و بەیعەتەکەی خۆم گرتبێت.

باوکی سەعشا وتی: نافەرمان پەروەردگارت کرد و گوێڕایەڵی پێشەواکەت بوویت، توێشووی جەهەننەمەت کۆکردۆتەوە چوونکە خواوەند دەفەرمێت:

(( و جعلنا منهم ائمه یدعون الی النار و یوم القیامه لا ینصرون

واتاکەی: ئەوانمان کردە پێشەوای ئێوە تا بەرەو جەهەننەم هانتان بدەن و لەڕۆژی پسلاَن هاوکاری نەبینن. پێشەواکەی تۆ بەو شێوەیە)).

دەڵێت: حوڕ ناچاری کردن لەوێ دابەزن، بەدوور لەئاو و ئاوەدانی.

وتیان: ڕێگە بدە لەم گوندە دابەزین. مەبەستیان نەینەوا بوو.

وتی: نا، سوێند بەخوا دەسەلاَتی ئەو کارەم نییە. ئەم پیاوەیان بۆ چاودێری کردنی من ناردووە.

دەڵێت: زوهەیر کوڕی قین وتی: ئەی کوڕی پێغەمبەری خوا! جەنگ دژی ئەمان ئاسانترە لەجەنگ دژی ئەو کەسانەی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئێمە دێن. سوێند بەگیانی خۆم دەبینی دوای ئەمانە کەسانێک بۆ جەنگی ئێمە دێن کەتوانای بەرگری و خۆڕاگریمان نابێت.

حسەین وتی: هیچکات جەنگ دەست پێناکەم.

وتی: کەواتە با بەرەو ئەو گوندە بڕۆین و لەوێ دابەزین چوونکە بەهێزە و لەسەر لێواری فوڕاتە. ئەگەر ڕێگەیان نەداین، دەجەنگین چوونکە جەنگ دژی ئەمان ئاسانترە لەو سوپایەی دوای ئەمان دێت.

حسەین وتی: ئەمە چ گوندێکە؟

وتی: عەقەر.

حسەین وتی: خواوەندا لەعەقەر[4] پەنا بۆ تۆ دەبەم. دواتر لەڕۆژی پێنجشەممە، دووی موحەڕەمی ساڵی شەست و یەکی کۆچی لەم ناوچەیە دابەزی.

---

[4] عەقەر بەمانای نەزۆکیی و نەزۆک کردن و خەساندنی ئاژەڵ دێت. (وەرگێڕ)

دەڵێت: بۆ بەیانی، عومەر کوڕی سەعد کوڕی ئەبی وەقاس لەگەڵ چوار هەزار کەس لەخەڵکانی کوفە، گەیشت.

دەڵێت: هۆکاری هاتنی کوڕی سەعد بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی حسەین ئەمە بوو: عوبەیداللە ئەوی کردە سەرکردەی چوار هەزار کەس لەخەڵکانی کوفە تا بەرەو دەستبی ڕەوانەی بکات چوونکە دەیلەمییەکان دەستیان بەسەر ئەو ناوچەیەدا گرتبوو. کوڕی زیاد فەرمانی فەرمانڕەوایەتی ڕەی بۆ نووسیبوو و فەرمانی ڕۆشتنی پێدابوو. ئەو لەگەڵ سوپاکەی لەحەمام ئەعیەن ئوردووی لێدا. کاتێك حسەین بەرەو کوفە بەڕێکەوت، کوڕی زیاد، عومەر کوڕی سەعدی بانگکرد و وتی: بۆ جەنگی حسەین بڕۆ و کاتێك لەکێشەی حسەین ڕزگارمان بوو، ڕێگەی ویلایەتەکەی خۆت بگرەبەر.

دەڵێت: عومەر کوڕی سەعد پێی وت: خوا بتبەخشێت، حەزم دەکەم من لەم کارە ببەخشیت.

عوبەیداللە وتی: بەو مەرجەی بیر لەفەرمانڕەوایەتی ئەو ویلایەتە نەکەیتەوە.

دەڵێت: کاتێك ئەمەی پێوت، عومەر کوڕی سەعد وتی: ئەمڕۆ مۆڵەتم پێبدە تا تێفکرم.

دەڵێت: ڕۆشت و لەگەڵ چاکەخوازانی خۆی ڕاوێژی کرد و هەمووان لەو کارە دووریان خستەوە.

دەڵێت: حەمزە کوڕی موغەیرە کوڕی شەعبەی خوشکەزای هات و وتی: خاڵۆ، سوێندت دەدەم بەخوا بۆ جەنگی حسەین نەڕۆیت چوونکە نافەرمانی خواوەند دەکەیت و ڕێز لەپەیوەندی خزمایەتی ناگریت. سوێند بەخوا ئەگەر لەجیهان و سامانی دنیا چاو بپۆشیت و فەرمانڕەوایەتی هەموو جیهان پشتگوێ بخەیت، باشترە لەوەی بەکوشتنی حسەین، بۆ پێشگای خواوەند بگەڕێیتەوە.

دەڵێت: عومەر کوڕی سەعد وتی: بەخواستی خوا ئەو کارە ناکەم.

عەبدوڵڵە کوڕی یەساری جوهەنی دەڵێت: کاتێك فەرمان بەعومەر کوڕی سەعد درا بۆ جەنگی حسەین بڕوات، ڕۆشتمە لای، پێی وتم: فەرمانڕەوا فەرمانی پێکردووم بۆ جەنگی حسەین بڕۆم و من ڕازی نەبووم.

وتم: خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە، بمێنەرەوە و ئەو کارە مەکە.

دەڵێت: عومەر کوڕی سەعدم بەجێهێشت، کەسێك هات و وتی: هەنووکە عومەر کوڕی سەعد، خەڵکان بۆ جەنگی حسەین کۆ دەکاتەوە.

دەڵێت: ڕۆشتمە لای، بینیم دانیشتووە. کاتێك منی بینی، پشتی تێکردم و زانیم مەبەستی ڕۆشتن بۆ جەنگی حسەین کوڕی عەلی هەیە. هیچم نەوت و گەڕامەوە.

دەڵێت: عومەر کوڕی سەعد ڕۆشتە لای عوبەیدالله کوڕی زیاد و وتی: خوا بتبەخشێت، ئەم کارەت خستە ئەستۆی من و خەڵکان ئاگادار بوونەتەوە. ئەگەر بۆچوونی تۆ ئەوەیە ئەم کارە جێبەجێ بکرێت، ئەو کارە بکە و لەگەڵ ئەم سوپایە، یەکێك لەگەورەکانی کوفە کە لەمن شیاوتر و بەئەزموونتر بێت، بۆ جەنگی حسەین ڕەوانە بکە.

دەڵێت: ناوی چەندین کەسی بۆ عوبەیدالله برد بەڵام وتی: نامەوێت گەورەکانی کوفە بەمن بناسێنیت، سەبارەت بەو کەسەی دەمەوێت ڕەوانەی بکەم، داوای بۆچوونی تۆم نەکردووە، ئەگەر دەخوازیت فەرمانڕەوایەتی ویلایەتێك بێت، لەگەڵ سوپادا بەڕێکەوە.

دەڵێت: کاتێك پێداگری کوڕی زیادی بینی، ڕەزامەندی خۆی نیشاندا.

دەڵێت: لەگەڵ چوار هەزار کەس بەڕێکەوت و بەیانی ئەو ڕۆژەی حسەین لەنەینەوا دابەزی، گەیشتە ئەوێ.

دەڵێت: عومەر کوڕی سەعد ویستی عوزرە کوڕی قەیسی ئەحمەسی بۆلای حسەین بنێرێت، پێی وت: بڕۆ لای و لێی بپرسە بۆچی هاتووە و چی دەوێت؟

دەڵێت: عوزرە یەکێك بوو لەو کەسانەی نامەی بۆ حسەین نووسیبوو، لەبەر ئەوە شەرمی کرد بڕواتە لای.

دەڵێت: ئەم کارەی بەو سەرکردانە پێشنیار کرد کەنامەیان بۆ حسەین نووسیبوو بەڵام هیچیان ڕازی نەبوون.

دەڵێت: کەسیر کوڕی عەبدوڵڵەی شەعبی کەسوارکارێکی بەئەزموون و بەتوانا بوو، هاتە پێش و وتی: من دەڕۆمە لای و ئەگەر دەخوازیت، سوێند بەخوا

بەشێوەیەکی لەناکاو دەیکوژم.

عومەر کوڕی سەعد وتی: نامەوێت بەشێوەیەکی لەناکاو بکوژرێت. بڕۆ و لێی بپرسە بۆچی هاتووە و چی دەوێت؟

دەڵێت: کەسیر هات و کاتێك باوکی سەمامەی ساعدی ئەوی بینی، بەحسەین کوڕی عەلی وت: ئەی باوکی عەبدوڵڵە! خراپترین کەسی سەرزەوی کە بەخوێنڕشتن و کوشتنی لەناکاو بەناوبانگە، بۆ بینینی تۆ هاتووە.

دەڵێت: باوکی سەمامە لێی نزیك بوویەوە و وتی: شمشێرەکەت دانێ.

وتی: نە، منێ نێردراوم، ئەگەر گوێ دەگرن، پەیامەکەم دەگەیێنم و ئەگەر ڕازی نابن، دەگەڕێمەوە.

وتی: من دەست بەدەسکی شمشێرەکەتەوە دەگرم، ئەوسا پەیامەکەی خۆت بڵێ.

وتی: سوێند بەخوا نابێت دەستی لێبدەیت.

وتی: پەیامەکەت بڵێ و من حسەین کوڕی عەلی لێ ئاگادار دەکەمەوە. ڕێگە نادەم لێی نزیك ببیتەوە چوونکە کەسێکی خراپەکاریت.

دەڵێت: جوێنیان بەیەکدا و کەسیر ڕۆشتە لای عومەر کوڕی سەعد و لەم پێشهاتە ئاگاداری کردەوە.

دەڵێت: عومەر کوڕی سەعد، قوررە کوڕی قەیسی حەنزەلی بانگکرد و وتی: ئەی قوررە، بڕۆ لای حسەین کوڕی عەلی و لێی بپرسە بۆ چی هاتووە و چی دەوێت؟

دەڵێت: قوررە بەڕێکەوت. کاتێك حسەین ئەوی بینی، وتی: ئەمە دەناسن؟

حەبیب کوڕی موزاهیر وتی: بەڵێ، کەسێکە لەتایەفەی حەنزەلە لەهۆزی تەمیم. خوشکەزای ئێمە و من بەکەسێکی باوەڕدارم دەزانی و گومانم نەدەکرد لێرە بیبینم.

دەڵێت: قوررە هات، سڵاوی کرد و پەیامەکەی سەعدی گەیاند.

حسەین پێی وت: خەڵکی شارەکەتان نامەیان بۆ نووسیوم و بانگێشتی ئێرەیان کردووم، ئەگەر منتان ناوێت دەگەڕێمەوە.

دەڵێت: دوای ئەوە حەبیب کوڕی موزاهیر پێی وت: ئەی قورڕە کوڕی قەیس، هاوار لەتۆ، بۆ بۆ لای ئەو ستەمکارانە دەگەڕێیتەوە؟ هاوکاری ئەم پیاوە بکە کەخواوەند بەهۆی باوکانییەوە ڕێزی بەئێمە بەخشیوە.

قورڕە وتی: وەڵامەکە بۆ سەعد دەبمەوە، ئەوسا لەم دۆخە ڕادەمێنم.

دەڵێت: بۆ لای عومەر کوڕی سەعد گەڕایەوە و لەوەڵامی حسەین ئاگاداری کردەوە. عومەر کوڕی سەعد پێی وت: هیوادارم خواوەند لەجەنگ دژی حسەین دوورم بخاتەوە.

حەسان کوڕی فایدی عەبەسی دەڵێت: شایەتی دەدەم کاتێك نامەی عومەر کوڕی سەعد بەدەستی زیاد گەیشت، من لەوێ بووم. نووسرا بوو:

((بەناوی خواوەندی بەخشندەی میهرەبان

بەڵام دواتر، کاتێك لەبەرابەر حسەین ڕیزم بەست، کەسم نارد و پرسیم بۆچی هاتووە و چی دەوێت؟

وتی: خەڵکی ئەم ویلایەتە نامەیان بۆ نووسیم و نێردراوەکانیان هاتوونەتە لای من و داوایان کردووە بێم، ئەگەر منیان ناوێت و داخوازی و داواکارییەکانیان شتێکی دیکە و کەسێکی دیکەیە، دەگەڕێمەوە)).

دەڵێت: کاتێك نامەکەیان بۆ عوبەیدالله کوڕی زیاد خوێندەوە، هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( هەنووکە کەپەنجەمان لەو گیر بووە

هیوای ڕزگار بوونی هەیە

بەڵام چیتر ڕێگەی هەڵاتنی نییە)).

دەڵێت: نامەی بۆ عومەر کوڕی سەعد نووسی:

(( بەناوی خواوەندی بەخشندەی میهرەبان

بەڵام دواتر: نامەکەت بەدەستم گەیشت. لەمەبەستەکەت تێگەیشتم. بەحسەین بڵێ خۆی و هاوەڵانی بەیعەت لەگەڵ یەزید کوڕی معاویە بکەن و ئەگەر ئەو کارەیان کرد، لەبۆچوونی خۆم ئاگادارت دەکەمەوە. بەخواستی خوا)).

دەڵێت: کاتێك نامەکە بەدەستی عومەر کوڕی سەعد گەیشت، وتی: گومانم

دەکرد کوڕی زیاد بەئاشتی ڕازی نەبێت.

حەمید کوڕی موسلیمی ئەزدی دەڵێت: نامەیەک لە عوبەیدالله کوڕی زیاد بەدەستی عومەر کوڕی سەعد گەیشت بەم ناوەڕۆکە:

(( بەڵام دواتر، ڕێگە مەدە ئاو بەحسەین و هاوەڵانی بگات و ڕێگە مەدە یەک دڵۆپ ئاو بخۆنەوە، بەهەمانشێوەی کەڕێگەیان نەدا، سەروەری باوەڕداران، عوسمان کوڕی عەففان ئاو بخواتەوە)).

دەڵێت: عومەر کوڕی سەعد، عەمرۆ کوڕی حەجاجی لەگەڵ پێنسەد سوار ڕەوانە کرد و دەستیان بەسەر ئاوەکەدا گرت و ڕێگەیان نەدا حسەین و هاوەڵانی یەک دڵۆپ ئاو بخۆنەوە. ئەم پێشهاتە سێ ڕۆژ پێش کوژرانی حسەین کوڕی عەلی ڕوویدا.

دەڵێت: عوبەیدالله کوڕی باوکی حەسینی ئەزدی (نەژادی بۆ بوجەیلە دەگەڕایەوە) هاواریکرد و وتی: ئەی حسەین، ئەو ئاوە دەبینی کە لەڕەنگی ئاسمانە، سوێند بەخوا یەک دڵۆپی لێناخۆیتەوە تا لەتینووانداا بمریت.

دەڵێت: حسەین وتی: خواوەندا ئەو بەتینوویەتی بکوژە و هەرگیز مەیبەخشە.

حەمید کوڕی موسلیم دەڵێت: سوێند بەخوا کاتێک نەخۆش بوو، سەردانم کرد، سوێند بەو خوایەی جگە لەو خوایەک نییە، بینیم ئاو دەخواتەوە تا سکی ئاوسا بەڵام تێراو نەدەبوو. بەمشێوەبوو تا گیانیدا. دەڵێت: کاتێک تینوویەتی تەنگی بەحسەین و هاوەڵانی هەڵچنی، عەباس کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیبی برای بانگ کرد و لەگەڵ سی سوار و بیست پیادە و بیست مەشکی ئاو ڕەوانەی کرد. شەوانە ڕۆشتن و لەئاو نزیک بوونەوە. نافیع کوڕی هیلالی جەمەلی ئالا بەدەست لەپێشیانەوە دەڕۆشت. عەمرۆ کوڕی حەجاجی زوبەیدی وتی: کێیت و بۆچی هاتوویت؟

وتی: هاتووم لەم ئاوەی لێیان درێغ کردووین، بخۆمەوە.

وتی: بخۆ، نۆشی گیانت.

وتی: نا، تا حسەین و هاوەڵانی تینووبن، یەک دڵۆپی لێناخۆمەوە.

دەڵێت: دوای ئەوە، کەسانی دیکە دەرکەوتن. عەمرۆ وتی: سوێند بەخوا

ڕێگەمان نییە ئاویان پێبدەین، ئێمەیان لێرە داناوە تا نەهێڵین ئێوە دەستتان بەئاو بگات.

دەڵێت: کاتێك هاوەڵان لەنافیع نزیك بوونەوە، بەپیادەکانی وت: مەشکەکان پڕ بکەن. پیادەکان شاڵاویان برد و مەشکەکانیان پڕ کرد. عەمرۆ کوڕی حەجاج و هاوەڵانی ویستیان ڕێگەیان لێبگرن. عەباس کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و نافیع کوڕی هیلال هێرشیانکردنەسەر و پاشەکشێیان پێکردن. دواتر وتیان: دەڕۆین، بەڵام ڕێگەیان لێگرتن. عەمرۆ کوڕی حەجاج دووبارە پەلاماریدان و جەنگێکی کەم ڕوویدا. یەکێك لەهاوەڵانی عەمرۆ کوڕی حەجاج لەتایەفەی سەدا، بەدەستی نافیع کوڕی هیلال برینداربوو. سەرەتا گومانی دەکرد برینەکەی سووکە، بەڵام دواتر بەهۆی ئەو برینەوە مرد.

دەڵێت: هاوەڵانی حسەین بەمەشکی پڕ ئاو گەڕانەوە و بردیانە لای حسەین.

هانی کوڕی سەبیتی حەزرەمی کە لەکاتی کوژرانی حسەین ئامادە بوو، دەڵێت: حسەین کوڕی عەلی، عەمرۆ کوڕی قورەزەی ئەنساری بۆ لای عومەر کوڕی سەعد نارد و داوای لێکرد شەو لەنێوان هەردوو ئوردووگاکە یەکتر ببینن.

دەڵێت: عومەر کوڕی سەعد لەگەڵ بیست سوار هات. حسەینیش لەگەڵ بیست سوار هات و کاتێك بەیەك گەیشتن، حسەین بەهاوەڵانی خۆی وت دوور بکەونەوە. عومەر کوڕی سەعدیش فەرمانێکی هاوشێوەی بەکەسەکانی خۆیدا.

دەڵێت: لێیان دوورکەوتینەوە تا ئەو جێگەی چیتر دەنگیان بەگوێمان نەدەگەیشت. قسەیان کرد و درێژەیان پێدا تا ئەوەی بەشێکی شەو تێپەڕی. دوای ئەوە هەرکام لەگەڵ هاوەڵانی خۆیان بۆ ئوردووگاکەیان گەڕانەوە. خەڵك بەگومانەوە سەبارەت بەگفتوگۆکەی ئەوان دەدووان. بەگومانەوە دەڵێن کەحسەین بەعومەر کوڕی سەعدی وتبوو: لەگەڵ من بۆ لای یەزید کوڕی معاویە وەرە و سوپاکەمان لێرە بەجێدێڵین.

عومەر وتبووی: ئەگەر ئەو کارە بکەم، ماڵەکەم وێران دەکەن.

حسەین وتبووی: من بۆت دروست دەکەمەوە.

وتبووی: دەست بەسەر مڵك و سامانەکەمدا دەگرن.

وتبووی: لەملك و سامانی خۆم لەحیجاز پێت دەبەخشم.

دەڵێت: عومەر بەمە ڕازی نەبووبوو.

دەڵێت: خەڵکان بێ ئەوەی شتێکیان زانیبێت یا بیستبێت، ئەم وتانەیان دووبارە دەکردەوە.

باوکی موخەنەف دەڵێت: بەلام ئەوەی موجالید کوڕی سەعید و سەعقەب کوڕی زوهەیر و کەسانی دیکە وتوویانە و هەمووان پشتی پێدەبەستن ئەمەیە کەوتی: بەیەکێك لەم سێ کارە ڕازی ببن: یا دەگەڕێمەوە بۆ ئەو شوێنەی کەهاتووم، یا دەست دەخەمە ناو دەستی یەزید کوڕی معاویە تا بۆچوون و فەرمانی خۆی دەربکات، یا من بۆ یەکێك لەسنووری موسوڵمانان ڕەوانە بکەن تا یەکێك بم لەوان و ئەرکی هاوشێوەی ئەوانم لەسەر شان بێت.

عوقەبە کوڕی سەمعان دەڵێت: هاوڕێ لەگەڵ حسەین لەمەدینەوە ڕۆشتم بۆ مەککە و لەمەککەوە بۆ عێراق. تا ئەو کاتەی کوژرا لێی جیانەبوومەوە. لەگفتوگۆکانی ئەو لەمەککە و لەڕێگە و لەعێراق، ئاگادارم، سوێند بەخوا ئەوەی خەڵك دەیڵێن و گومان دەکەن ڕاست نییە و هەرگیز نەیوتووە دەستی بخەنە ناو دەستی یەزید یا بۆ یەکێك لەسنوورەکان دووری بخەنەوە، بەڵکو وتی: ڕێگە بدە لەزەوییەکی پان و بەریندا بم تا بزانم چارەنووسی خەڵکان بەکوێ دەگات.

باوکی موخەنەف لەموجالید کوڕی سەعیدی هەمەدانی و سەعقەب کوڕی زوهەیر کەسێ یا چوار جار حسەین و عومەر کوڕی سەعدیان بینیبوو، دەڵێت: عومەر کوڕی سەعد نامەی بۆ عوبەیدالڵە کوڕی زیاد نووسی: ((بەلام دواتر: خواوەند ئاگری جەنگی خامۆش کردووە و ئاشتی خستۆتە سەر ڕێگەمان، ئێستا حسەین دەڵێت بۆ ئەو شوێنە دەگەڕێتەوە کەلێی هاتووە، دەتوانین بۆ هەرکام لەسنوورەکانی موسوڵمانان ڕەوانەی بکەین و یەکێك دەبێت لەموسوڵمانان و ئەرك و ماف هاوشێوەی ئەوانی دەبێت، یا بۆ لای سەروەری باوەڕداران، یەزید کوڕی معاویەی ڕەوانە بکەین تا بۆچوون و فەرمانی خۆی لەمبارەوە بڵێت و ئەمە هۆکاری ڕەزامەندی ئێوە و ئۆمەتی موسوڵمانانە.

دەڵێت: کاتێك عوبەیدالڵە نامەکەی خوێندەوە، وتی: ئەمە نامەی پیاوێکە

کەمۆجیاری فەرمانڕەواکەی خۆی دەکات و بەزەیی بەخەڵکەکەیدا دێتەوە. ڕازی دەبم.

دەڵێت: شیمر کوڕی زی ئەلجەوشەن هەستا و وتی: ئێستا کە لەسنوورەکەی تۆ دابەزیوە و لەتەنیشت تۆیە، ڕازی دەبیت؟ سوێند بەخوا ئەگەر لەم ویلایەتە بڕوات و دەستی نەخستبێتە دەستی تۆ، بەهێزی و شکۆمەندی بۆ ئەو دەگەڕێتەوە و لاوازی و ناتەوانی بۆتۆ. بەم پێشنیارە ڕازی مەبە چوونکە نیشانەی بێهێزییە. دەبێت خۆی و هاوەڵانی تەسلیمی فەرمانی تۆ ببن و ئەگەر سزا دەدەیت، سزادانیان لەدەستی تۆ دابێت و ئەگەر دەیانبەخشی، ئەو دەسەڵاتە لەدەستی تۆدا بێت. سوێند بەخوا بیستوومە حسەین و عومەر کوڕی سەعد، شەوان لەنێوان دوو ئوردووەکە دادەنیشن و کاتەکانیان بەگفتوگۆ کردن بەسەر دەبەن.

کوڕی زیاد وتی: ڕاست دەکەیت.

حەمید کوڕی موسلیم دەڵێت: عوبەیدالله کوڕی زیاد، شیمر کوڕی زی ئەلجەوشەنی بانگکرد و وتی: ئەم نامە بۆ لای سەعد کوڕی عومەر ببە تا بەحسەین و هاوەڵانی بڵێت لەسەر فەرمانی من تەسلیم ببن. ئەگەر ڕازی بوون، بەئاشتی ئەوان ڕەوانەی دەرباری من بکات و ئەگەر ڕازی نەبوون، ئاگری جەنگ هەڵگیرسێنێت. ئەگەر عومەر جەنگی هەڵگیرساند، ملکەچی فەرمانەکانی ئەو بە و ئەگەر ئەو کارەی نەکرد، تۆ سەرکردەی سوپاکەیت و سەری عومەر کوڕی سەعد ببڕە و ڕەوانەی دەرباری منی بکە.

باوکی جونابی کەلبی دەڵێت: عوبەیدالله کوڕی زیاد نامەیەکی بۆ عومەر کوڕی سەعد نووسی بەم ناوەڕۆکە:

((بەڵام دواتر: تۆ بۆ لای حسەین نەناردووە دەستی لێ هەڵبگریت یا کاتی لەگەڵدا بەسەر ببەیت یا هیوای مانەوە و ژیانی پێببەخشیت و ئەمانی پێبدەیت و لەنێوان من وئەودا نێوەنجیگەری بکەیت، ئەگەر حسەین و هاوەڵانی ملکەچ بوون و خۆیان بەدەستەوەدا، بەئاشتی ڕەوانەی دەرباری منیان بکە، ئەگەر ڕازی نەبوون، هێرشیان بکەسەر و خوێنیان بڕێژە و ئەندامەکانی جەستەیان ببڕە

چوونکە شیاوی ئەو کارەن. ئەگەر حسەین کوژرا، لەت و پەتی بکە چوونکە کەسێکی ناسپاسە و نەیارە و سپڵە و ستەمکار. مەبەستم لەوە نییە دوای مەرگی ئەم کارە زیانی لێدەدات بەلاّم بەڵێنمداوە ئەگەر کوشتم، ئەندامەکانی جەستەی بڕم. ئەگەر گوێڕایەڵی فەرمانەکانی من بوویت، پاداشتی گوێڕایەڵیت وەردەگریت و ئەگەر رازی نەبوویت، خۆت لەئێمە و سوپاکەمان بەدوور بگرە و کاروبارەکان بەشمیر کوڕی زی ئەلجەوشەن بسپێرە چوونکە فەرمانی پێویستمان پێداوە. والسلام)).

عوبەیداللە کوڕی شەریکی عامری دەڵێت: کاتێك شیمر کوڕی زی ئەلجەوشەن نامەکەی وەرگرت، ئەو و عەبدوللە کوڕی باوکی موحەل کەپووری دایکی ئەلبەنین کچی حەزام ژنی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و عەباس و عەبدوڵلە و جەعفەر و عوسمانی بۆ هێنابووە دنیا، هەستان. عەبدوڵلە کوڕی باوکی موحەل وتی: خواوەند ئەمیر ببەخشێت، مناڵەکانی خوشکەکەمان هاورێی حسەینن. ئەگەر دەخوازیت ئەماننامەیان بۆ بنووسیت، بینووسە.

وتی: بەڵێ، لەبەر ئێوە. فەرمانی بەدەبیرەکەیدا ئەمانیان بۆ بنووسێت کە عەبدوڵلە بەکۆیلەکەی خۆی بەناوی کزمان رەوانەی کرد. کزمان کاتێك گەیشتە لایان، بانگیکردن و وتی: خاڵتان ئەم ئەماننامەی بۆ ناردوون.

وتیان: سلاّوی ئێمە بەخاڵمان بگەیێنە و پێی بڵێ پێویستمان بەئەماننامەی ئێوە نییە، ئەمانی خواوەند لەئەمانی کوڕی سومەییە باشترە.

دەڵێت: شیمر کوڕی زی ئەلجەوشەن لەگەڵ نامەکەی عوبەیداللە کوڕی زیاد هاتە لای عومەر کوڕی سەعد و کاتێك نامەکەی پێدا و خوێندییەوە، عومەر پێی وت: چیت کرد؟ هاوار لەتۆ. خواوەند ماڵەکەت نزیك نەکاتەوە و پاداشتی ئەو کارە قێزەونەی تۆ بداتەوە. سوێند بەخوا دەزانم تۆ رێگەت نەداوە عوبەیداللە بەنامەکەی من رازی ببێت و ئاشتی لەم ناوەدا سەقامگیر بکرێت. سوێند بەخوا حسەین تەسلیمی عوبەیداللە نابێت.

شیمر پێی وت: پێم بڵێ چی دەکەیت؟ فەرمانی فەرمانڕەوا جێبەجێ دەکەیت و دوژمنەکەی دەکوژیت؟ ئەگەر نا، سوپا و ئوردوو تەسلیمی من بکە.

وتی: نا، خۆم ئەو کارە دەگرمە ئەستۆ.

وتی: تۆ سالار و سەرکردەیت.

دەڵێت: ئێواریی ڕۆژی پێنجشەممە، دوای تێپەڕینی نۆ ڕۆژ لەموحەرەم، هێرشی کردە سەر سوپاکەی حسەین.

دەڵێت: شیمر لەسوپاکەی حسەین نزیک بوویەوە و وتی: کوڕەکانی خوشکەکەی ئێمە بێن.

دەڵێت: عەباس و جەعفەر و عوسمان کوڕەکانی عەلی نزیک بوونەوە و وتیان: چیت دەوێت وچ کارێکت هەیە؟

وتی: ئێوە لەئەماندان.

دەڵێت، پێیان وت: خوا خۆت و ئەمانەکەت نفرین بکات. ئەگەر خاڵی ئێمە دەبوویت، ئەمانت بەئێمە نەدەبەخشی لەکاتێکدا کوڕی پێغەمبەر (د.خ) ئەمانی نییە.

دەڵێت: عومەر کوڕی سەعد جاڕیدا: ئەی سوپای خواوەند ئامادە بن. لەگەڵ سوپاکەی سەرکەوت و دوای نوێژی ئێواریێ هێرشی کردە سەریان. حسەین لەبەردەم خێوەتەکەی دانیشتبوو، پاڵی بەشمشێرەکەیەوەدا بوو و زۆری نەمابوو خەوی لێبکەوێت. زێنەبی خوشکەی دەنگەدەنگی بیست و لەبراکەی نزیک بوویەوە و وتی: ئەو دەنگە دەنگە نابیستیت؟

دەڵێت: حسەین وتی: پێغەمبەرم لەخەدوا بینی و پێی وتم ئەمشەو بۆ لای ئێمە دێت.

دەڵێت: زێنەب لەخۆیدا و وتی: هاوار لەمن.

وتی: خوشکەکەم ئارام بگرە، خواوەند بتبەخشێت.

دەڵێت: عەباس کوڕی عەلی وتی: برا، دوژمن هاتن.

حسەین وتی: عەباسی برام، سواربە و بڕۆ لایان و بپرسە: چیتان دەوێت و مەبەستتان لەم کارە چییە؟ و بزانە بۆچی هاتوون؟

دەڵێت: عەباس لەگەڵ بیست سوار و کەسانی وەک زوهەیر کوڕی قین و حەبیب کوڕی موزاهیر ڕۆشتە لایان و وتی: چیتان دەوێت و مەبەستتان لەم کارە چییە؟

وتیان: فەرمانڕەوا فەرمانی پێداوین پێتان بڵێین لەسەر فەرمانی ئەو تەسلیم ببن یا دژی ئێوە بجەنگین.

وتی: پەلە مەکەن تا بۆ لای باوکی عەبدوڵڵە بگەڕێمەوە و لەوتەکانتان ئاگاداری بکەمەوە.

دەڵێت: دەستیان ڕاگرت و وتیان: بڕۆ لای و پەیامەکەی ئێمە بگەیێنە و وەڵامەکەمان بۆ بێنەوە.

دەڵێت: عەباس بەپەلە بۆ لای حسەین گەڕایەوە تا ئاگاداری بکاتەوە. دوو سوپا قسەیان لەگەڵ یەك کرد و حەبیب کوڕی موزاهیر بەزوهەیر کوڕی قینی وت: ئەگەر دەتەوێت لەگەڵ ئەم خەڵکە قسە بکە و ئەگەر دەخوازیت من ئەو کارە دەکەم.

زوهەیر وتی: تۆ ئەمەت دەستپێکرد، تۆ قسە بکە.

دەڵێت: حەبیب کوڕی موزاهیر پێی وتن: سوێند بەخوا خەڵکانێك بەیانی بڕۆنە پێشگای خواوەند و کوڕی پێغەمبەر و کەسانی بنەماڵەکەیان کوشتبێت، لای خواوەند خەڵکانێکی خراپ و پاداشتی خراپەیان پێدەبڕێت.

عوزرە کوڕی قەیس وتی: تۆ تا ئەو جێگەی بتوانی خۆت بەپاك و بێ تاوان نیشان دەدەیت.

زوهەیر وتی: ئەی عوزرە، خواوەند ئەوی بەپاکی ئافراندووە و ڕێگەی نیشانداوە. ئەی عوزرە لەخواوەند بترسە، من چاکەخوازی تۆم، سوێندت دەدەم بەخوا لەڕیزی ئەو کەسانەدا مەبە کەبۆ کوشتنی کەسانی باوەڕدار و پاك، هاوکاری گومڕاکان دەکەن.

وتی: ئەی زوهەیر، تۆی لای ئێمە لەشیعەکانی ئەم بنەماڵە نەبوویت، تۆ لەلایەنگرانی عوسمان کوڕی عەففان بوویت.

وتی: بوونم لێرە هۆکارێك نییە بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەمان بم! سوێند بەخوا هەرگیز نامەم بۆ نەنووسیوە و هەرگیز کەسم بۆ لای ئەو ڕەوانە نەکردووە و هەرگیز بەڵێنی هاوکاریم پێنەداوە، بەڵام ڕێگە، ئێمەی بەیەك گەیاند و کاتێك ئەوم بینی، پێغەمبەر (د.خ) و خزمایەتی ئەوم لەگەڵ پێغەمبەر (د.خ) کەوتەوە بیر و زانیم بۆ

جەنگی دوژمنەکەی خۆی و دوژمنی ئێوە بەرێکەوتووە و بڕیارمدا هاوکاری بکەم و لەڕیزی سوپاکەی ئەودا بم و بۆ پاراستنی ڕاستی و ماف و بەرگری کردن لەفەرموودەکانی خواوەند و پێغەمبەر (د.خ)، بەگریکاری ئەو بم.

دەڵێت عەباس کوڕی عەلی گەڕایەوە و وتی: ئەی ئامادەبووان، باوکی عەبدوڵڵە دەڵێت ئەمشەو بگەڕێنەوە تا لێکۆڵینەوە و تێفکرین لەم پێشنیارە بکەین چوونکە پێشتر لەنێوان ئێمە و ئێوە لەمبارەوە قسە نەکراوە و بەخواستی خواوەند، بەیانی یەك دەبینین. یا ڕەزامەندی خۆمان بۆ ئەم کارە نیشان دەدەین و یا ناڕەزامەندی خۆمان.

دەڵێت: حسەین دەیویست ئەو شەوە پاشەکشێیان پێبکات تا وەسیەت و فەرمانەکانی خۆی بەکەسەکانی بڵێت. کاتێك عەباس کوڕی عەلی ئەم پەیامەی هێنا، عومەر کوڕی سەعد وتی: ئەی شیمر بۆچوونی تۆ چییە؟

وتی: بۆچوونی تۆ چییە؟ تۆ سەرکردەیت و فەرمان فەرمانی تۆیە.

وتی: دەمەوێت نەبم.

دواتر ڕوویکردە خەڵکان و تی: بۆچوونی ئێوە چییە؟

عەمرۆ کوڕی حەجاجی زوبەیدی وتی: سبحات الله، سوێند بەخوا ئەگەر لەدەستەی دەیلەمییەکان دەبوو، دەبوا بەداواکەیان ڕازی ببیت.

قەیس کوڕی ئەشعەس وتی: بەداواکەیان ڕازی ببە. بەڵام سوێند دەخۆم بەیانی دژی تۆ دەجەنگن.

وتی: سوێند بەخوا ئەگەر دەمزانی ئەو کارە دەکەن، ئەمشەو مۆڵەتم پێنەدەدان.

دەڵێت: کاتێك عەباس کوڕی عەلی، پێشنیارەکەی عومەر کوڕی سەعدی بۆ لای حسەین هێنا، پێی وت: بۆ لای ئەوان بگەڕێرەوە و ئەگەر توانیت تا بەرەبەیان مۆڵەتیان لێوەربگرە و ئەمشەو دووریان بخەرەوە. تا بتوانین ئەمشەو نوێژ بخوێنین و داوای بەخشین لەپەروەدگار بکەین. خواوەند دەزانێت من شەونوێژ و قورئان خوێندنەوەی شەوانەم خۆش دەوێت.

عەلی کوڕی حسەین دەڵێت: نێردراوێك لەلایەن عومەر کوڕی سەعد هاتە لای

ئێمە و لەو شوێنەی کەوەستابوو، بەدەنگی بەرز وتی: تا بەیانی مۆڵەتمان پێدان، ئەگەر تەسلیم بوون، ئێوە بۆ لای عوبەیدالڵە کوڕی زیاد ڕەوانە دەکەین، ئەگەر ڕازی نەبووین، ئاگری جەنگ هەڵدەگیرسێنین.

عەلی کوڕی حسەین دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی سەعد گەڕایەوە، دەمەو ئێواریٚ بوو، حسەین هاوەڵانی کۆکردەوە.

دەڵێت: نزیك بوومەوە تا ببیستم چوونکە نەخۆش بووم. بیستم باوکم بەهاوەڵانی خۆی دەوت:

(( سپاسی خواوەنی تاقانە دەکەم، خواوەندا سپاسی تۆ دەکەم کە بەپێغەمبەری(د.خ) پێگەی ئێمەت بەرز کردەوە و قورئانت فێر کردین و شارەزایی لەکاروباری دینت پێبەخشین، گوێچکە و چاو و دڵت پێبەخشین و لەناباوەڕان دوورت خستینەوە. بەڵام دواتر، هاوەڵانێکی شیاوتر و بەتواناتر وئەمەکدارتر لەئێوە ناناسم و بنەماڵەیەك لەبنەماڵەکەی خۆم بەگەورەتر و چاکتر نازانم.

خواوەند پاداشتی چاکەتان بداتەوە. دڵنیابن دەزانم بەیانی لەنێوان ئێمە و دوژمنەکەمان چی ڕوودەدات. من مۆڵەتی ڕۆشتنتان پێدەدەم، بەڕەزامەندی من هەمووتان بڕۆن چوونکە هیچ مافێکم بەسەر ئێوەوە نییە. لەتاریکی شەو کەڵك وەربگرن و بڕۆن)).

زوحاك کوڕی عەبدوڵڵەی مەشرقی هەمەدانی دەڵێت: من و مالیك کوڕی نەزری ئەرحەبی ڕۆشتین لای حسەین کوڕی عەلی، سلاۆمان لێکرد، لای ئەو دانیشتین و وەلاٚمی سلاٚوەکەی داینەوە و بەخێرهێناین و لەهۆکاری هاتنەکەی پرسین.

وتمان: هاتووین سلاٚوت لیٚ بکەین و لەخواوەند تەندروستی و ڕزگاری تۆ داوا بکەین و لەمەبەستی دوژمنەکەت ئاگادارت بکەینەوە. ئەوان بۆ جەنگی تۆ ڕێکەوتوون. بیر لەبارودۆخی خۆت بکەرەوە.

حسەین وتی: خواوەندم بەسە چوونکە باشترین پەناگەیە.

دەڵێت: دواتر ڕێزمان گرت و هیوای ڕزگاری و بەختەوەریمان بۆ خواست.

وتی: بۆ هاوکاری من ناکەن.

مالیك کوڕی نەزر وتی: قەرزم هەیە و نانخۆرەکانم فراوانن.

منیش وتم: منیش بەهەمانشێوە. بەڵام ئەگەر مۆڵەت بدەیت کاتێك بینیم جەنگاوەرێك نەماوە، بڕۆم بەشێوەیەك لەبەرژەوەندی تۆدا بێت و ببێتە هۆی بەرگریکردن لەتۆ، دەجەنگم.

وتی: مۆڵەتت هەیە.

دەڵێت: لەگەڵ ئەودا مامەوە و کاتێك شەو داهات، وتی: لەتاریکی شەو کەڵك وەربگرن و بڕۆن. هەرکام لەئێوە دەستی یەکێك لەبنەماڵەکەی من بگرێت و لەگوند و شارەکانی دەوروبەردا بڵاو ببنەوە تا ئەو کاتەی خواوەند ڕێگەچارەیەکمان نیشان دەدات چوونکە دوژمن کاتێك دەستیان بەمن بگات چیتر، شوێنپێی کەسانی دیکە هەڵناگرن.

دەڵێت: براکان و کوڕەکان و برازاکان و دوو کوڕەکەی عەبدوڵڵە کوڕی جەعفەر وتیان: بۆ ئەو کارە بکەین؟ بۆ ئەوەی دوای تۆ درێژە بەژیان بدەین؟ خواوەند هەرگیز ئەو ڕۆژە نەهێنێتەدی.

دەڵێت: سەرەتا عەباس ئەم قسەی کرد و دواتر ئەوان هاوشێوەی عەباس دووان.

حسەین وتی: ئەی کوڕەکانی عەقیل، کوژرانی موسلیم بۆ بنەماڵەکەی ئێوە بەسە. بڕۆن و مۆڵەتی ڕۆشتنتان هەیە.

وتیان: خەڵك چی دەڵێن؟ دەڵێن: گەورە و سەروەر و منداڵی مامەکانمان بەجێهێشت و تیرێکمان بۆ بەرگریکردن لەوان نەهاویشت و شمشێرێکمان نەوەشاند و نەمانزانی چییان کرد، سوێند بەخوا ناڕۆین و گیان و ماڵ و سامانمان لەمرێگەدا دەبەخشین و شان بەشانی تۆ دەجەنگین تا یەك چارەنووسمان هەبێت. ژیانی دوای تۆمان ناوێت.

زوحاك کوڕی عەبدوڵڵەی مەشرقی دەڵێت: دواتر موسلیم کوڕی عەوسەجەی ئەسەدی هەستا و وتی: تۆ بەجێبێڵین لەکاتێکدا خواوەند دەزانێت بۆ بەرگریکردن لەتۆ هیچمان نەکردووە؟ نە، سوێند بەخوا دەبێت ڕمەکەم لەسینگیان بچەقێنم و بەشمشێرەکەم هێرشیان بکەمەسەر، لەتۆ جیا نابمەوە، تەنانەت ئەگەر سیلاحی جەنگیشم پێنەبێت، بەبەرد بەرگری لەتۆ دەکەم.

دەڵێت: سەعد کوڕی عەبدوڵڵەی حەنەفی وتی: سوێند بەخوا بەجێت ناهێڵین تا خواوەند بزانێت بەئامادەبوونی تۆ، ڕێزمان لە پێغەمبەر (د.خ) گرتووە، سوێند بەخوا ئەگەر دڵنیابم کەدەکوژرێم و زیندوو دەبمەوە، دەسووتێم و خۆڵەمێشەکەم دەدەنە بەردەم با و حەفتا جار ئەو کارەم لەگەڵ بکەن، لەتۆ جیا نابمەوە تا لەبەردەم تۆدا دەمرم. کەواتە بۆ ئەو کارە بکەم کەتەنیا مەرگێکە و ڕێزێکی بێ کۆتایی بەدوادا دێت.

دەڵێت: زوهەیر کوڕی قین وتی: سوێند بەخوا حەز دەکەم بکوژرێم و زیندوو ببمەوە و دووبارە بکوژرێم و زیندوو ببمەوە و هەزار جار بکوژرێم بەو هیوای خواوەند بەڵای مەرگ لەتۆ و بنەماڵەکەت دوور بکاتەوە.

دەڵێت: هەموو هاوەڵانی بەمشێوەیە دووان و دەیانوت: سوێند بەخوا لێت جیانابینەوە، گیانمان پێشکەش بەتۆ دەکەین، تۆ دەپارێزین و کاتێك کوژراین، ئەرکی سەرشانی خۆمان جێبەجێ کردووە.

عەلی کوڕی حسەین دەڵێت: ئەو شەوەی بەیانییەکەی باوکم کوژرا، دانیشتبووم. زێنەبی پوورم لامبوو و پەرەستاری دەکردم. باوکم لەخێوەتەکەی خۆی گوێی لەهاوەڵانی دەگرت. حوی، کۆیلەی ئەبوزەری غەفاری، لای ئەو دانیشتبوو. سەرقاڵی تیژکردنی شمشێرەکەی بوو. باوکم هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

(( ئەی ڕۆژگاری خراپەکار، هاوڕێیەکی خراپیت

و بەرەبەیانان و ئێواران

هاوەڵان و خوازیارانی دنیا دەکوژێت

ڕۆژگار ناگۆڕێت

هەموو شتێك لەدەست خواوەندی تاقانەیە

و هەر زیندوویێك بەڕێگەی مەرگدا دەڕوات)).

دەڵێت: دوو یا سێ جار ئەم هۆنراوەی خوێندەوە تا ئەوەی تێگەیشتم و لەمەبەستەکەی حاڵی بووم، فرمێسك لەچاومدا قەتیس بوو، بێدەنگ بووم و زانیم بەڵا داباریوە، پووریشم بیستی، ژن بوو و ژنیش بەزەیی هەیە و هەمیشە ئامادەیە

بۆ گریان. نەیتوانی خۆی بگرێت و هەستا و شین و ڕۆڕۆی دەستپێکرد، سەری ڕووت بوو، ڕۆشتە لای و وتی: ئەی پشت و پەنای من، خۆزگە ئەو ڕۆژەی دایکم فاتیمە، یا باوکم عەلی، یا حەسەنی برام مرد، منیش دەمردم.

دەڵێت: حسەین سەیری کرد و وتی: خوشکەکەم، شەیتان توانای خۆڕاگریت لێ نەستێنێت.

وتی: ئەی باوکی عەبدوللە! دایک و باوکم بەقوربانت بن، چاوەڕوانی کوشتنیت؟... قسەکەی بۆ تەواو نەکرا.

دەڵێت: چاوەکانی فرمێسکی تێزا، وتی: ئەگەر واز لەوشترمر بێنن، شەو دەخەوێت.

وتی: هاوار لەمن، زۆرت لێدەکەن؟ ئەمە زیاتر دەمرەنجێنێت و بۆ من دژوارتر و ناخۆشترە. لەڕوخساری خۆیدا و یەخەی خۆی دڕی و بێهۆش کەوتە سەرزەوی.

دەڵێت: حسەین ڕۆشتە سەر سەری و ئاوی کرد بەدەم و چاویدا و دەیوت: خوشکەکەم! لەخوا بترسە و داوا بکە ئارامیت پێببەخشێت و بزانە خەڵکانی زەوی دەمرن و ئەوانەی ئاسمان هەمیشەیی نین. هەموو شتێك لەناو دەچێت جگە لەخواوەندی تاقانە کەزەوی بەدەستی خۆی ئافراندووە و خەڵکان زیندوو دەکاتەوە. باوکم باشتر بوو لەمن، براکەم لەمن باشتر بوو، پێشەوای من و ئەوانیش پێغەمبەری خواوەندە.

دەڵێت: بەم وتانە ئارامی کردوە و وتی: خوشکەکەم، سوێندت دەدەم و هیوادارم ڕێز لەسوێندەکەم بگریت کە بۆمن یەخەی خۆت نەدڕیت و ڕوخساری خۆت نەڕووشێنیت و شین و ڕۆڕۆ و ئارەزووی مردنی خۆت نەکەیت.

دواتر ئەوی هێنایەوە بۆ لای من و خۆی گەڕایەوە بۆ لای هاوەڵانی و فەرمانی پێدان خێوەتەکان لەیەك نزیك بکەنەوە و تەنافەکان لەیەك بئاڵێنن.

زوحاك کوڕی عەبدوللەی مەشرقی دەڵێت: ئەو شەوە حسەین و هاوەڵانی تا بەیانی بەئاگا بوون و نوێژیان دەخوێند و لەخوا دەپاڕانەوە.

دەڵێت: سوارەکانی ئەوان لای ئێمە تێدەپڕین و چاودێرییان دەکردین و حسەین ئەم ئایەی دەخوێندەوە:

(( و لا يحسبن الذين كفروا انما نملي لهم خير الانفسهم انما نملي لهم ليزداد وا اثما و لهم عذاب مهين، ما كان الله ليذر المؤمنين على ما انتم عليه حتى يميز الخبيث من الطيب

واتاکەی: ئەو کەسانەی کافر بوون گومان دەکەن ئەو مۆڵەتەی پێیان دەدەین، خێری ئەوانی تێدایە، تەنیا مۆڵەتیان پێدەدەین تا گوناحەکانیان زیاتر بێت و ئازابێکی ڕیسواکەر چاوەڕێیانە. خواوەند باوەڕداران لەم حاڵەی ئێوەدا ناهێڵێتەوە تا خراپەکار لەپاك جیا بکاتەوە)).

یەکێك لەو سوارانەی چاودێری ئێمەی دەکرد، ئەمەی بیست و وتی: سوێند بەپەروەردگاری کەعبە، ئێمە پاکین و لەئێوە جیا بووینەتەوە.

دەڵێت: ئەوم ناسییەوە و بەبورەیر کوڕی حەسینم وت: دەزانی ئەوە کێیە؟

وتی: نە.

وتم: ئەوە باوکی حەرب، عەبدوڵڵە کوڕی شەهرە، پیاوێکی قسەخۆش، ڕێزدار بوێر و لەناکاو دەکوژێت، چەندینجار سەعید کوڕی قەیس ئەوی بەهۆی تاوانەوە زیندانی کردووە.؟

دەڵێت: بورەیر کوڕی حەزیر پێی وت: ئەی خراپەکار! خواوەند تۆ دەخاتە ڕیزی پاکان و باوەڕداران.؟

وتی: تۆ کێیت؟

وتی: بورەیر کوڕی حەزیر.

وتیك انا لله، بەداخەوەم بۆت بورەیر، سوێند بەخوا دەکوژرێیت، سوێند بەخوا کوژراویت.

وتی: ئەی باوکی حەرب، دەتەوێت بۆ تۆبە کردن لەگوناحە گەورەکانی خۆت پەنا بۆ دەرگای خواوەند ببەیت چوونکە سوێند بەخوا ئێمە پاك و باوەڕدارین و ئێوە ناپاك و خراپەکار.

وتی: منیش شایەتی بۆ ئەو قسە دەدەم.

پێموت: هاوار لەتۆ، دەزانیت و لەڕیزی ئەواندایت.

وتی: بەقوربانت بم، ئەی کێ ببێتە هاونشینی عوزرەی عەنەزی؟

وتی: ئێستا یەزید لەگەڵ ئێمەیە.

وتی: هیوادارم خواوەند لەناوت ببات چوونکە کەسێکی قێزەونیت.

دەڵێت: ئەو ڕۆشت و ئەوەی شەوانە لەگەڵ سوارەکان چاودێری ئێمەی دەکرد، عوزرە کوڕی قەیسی ئەحمەسی، سەرکردەی سوارەکان بوو.

دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی سەعد، بەرەبەیانی ڕۆژی شەممە نوێژی کرد – بەوتەیەك ڕۆژی هەینی بوو– وئەمە لەڕۆژی عاشووورادا بوو، لەگەڵ کەسەکانی خۆی هات.

دەڵێت: حسەین هاوەڵانی خۆی ئامادە کرد و نوێژی بەیانییان خوێند، سی و دوو سوار و چل پیادەی لەگەڵ بوو. زوهەیر کوڕی قەیسی وەك سەرکردەی باڵی ڕاستی خۆی دانا و حەبیب کوڕی موزاهیری وەك سەرکردەی باڵی چەپ. ئالآکەی بەعەباس کوڕی عەلی برایدا. خێوەتەکانی لەپشت سەری خۆی بەجێهێشت و فەرمانیدا ئەو چیلکە و دارەی لەپشت خێوەتەکان کۆیان کردبوویەوە، بسووتێنن چوونکە دەترسا لەوەی دوژمن لەپشتەوە هێرشیان بکاتەسەر.

دەڵێت: بڕێك چیلکە و چەوێڵیان لەشوێنێکی چاڵ بۆ حسەین کۆکردبوویەوە. چاڵەکە لەپشت سەریان و هاوشێوەی جۆگەیەك بوو کەشەوانە هەڵیانکەندبوو. چیلکە و چەوێڵەکەیان کردە ناو چاڵەکە و وتیان: کاتێك بەیانی هێرشیان کردەسەرمان، گڕی تێبەردەدەین تا لەپشتەوە نەتوانن هێرشمان بکەنەسەر و تەنیا لەیەك بەرەوە دژی ئەوان بجەنگین. ئەو کارەیان کرد.

عەمرۆ کوڕی حەزرەمی دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی سەعد لەگەڵ سوپاکەی بەڕێکەوت، سەرکردەی سوارەکانی کوفە، عەبدوڵڵە کوڕی زوهەیری ئەسەدی بوو، سەرکردەی مەزحەج و ئەسەدییەکانی کوفە، عەبدولڕەحمان کوڕی باوکی سەبرە، سەرکردەی ڕەبیعە و کێندە قەیس کوڕی ئەشعەس و سەرکردەی خەڵکی تەمیم و هەمەدان، حوڕ کوڕی یەزیدی ڕیاحی بوو. ئەمانە هەموویان لەکوژرانی حسەین بەشدار بوون جگە لەحوڕ کوڕی یەزید کەپەیوەستی سوپاکەی حسەین بوو و کوژرا.

دەڵێت: عومەر فەرماندەیی باڵی ڕاستی سوپاکەی بەعەمرۆ کوڕی حەجاجی

زوبەیدی و باڵی چەپی بەشمیر کوڕی زی ئەلجەوشەن کوڕی شورەحبیل سپارد. سەرکردەی سوارەکان، عوزرە کوڕی قەیسی ئەحمەسی و سەرکردەی پیادەکان، شیبس کوڕی ریبعی یەربوعی بوو. ئالآی عومەر کوڕی سەعد بەدەستی کۆیلەکەی، زوەیدەوە بوو.

کۆیلەی عەبدولڕەحمان کوڕی عەبدەر بەئەنساری دەڵێت: لەگەڵ خودانەکەم بووم –کاتێک سوپا خۆی بۆ هێرشکردنە سەر حسەین ئامادە کرد– حسەین فەرمانیدا و خێوەتێکیان هەڵدا و بڕێک (موسک)یان هێنا و کردیانە دەفرێکی گەورەوە.

دەڵێت: حسەین ڕۆشتە ناو خێوەتەکە.

دەڵێت: خودانەکەی من عەبدولڕەحمان کوڕی عەبدەر لەگەڵ بورەیر کوڕی حەزیری هەمەدانی لە بەردەم خێوەتەکە دەمەقاڵێیان دەکرد لەسەر ئەوەی کامیان دوای حسەین بڕواتە ناو خێوەتەکە. بورەیر گاڵتەی لەگەڵ عەبدولڕەحمان دەکرد. عەبدولڕەحمان پێی وت: واز بێنە، ئێستا کاتی ئەوە نییە.

دەڵێت: بورەیر پێی وت: سوێند بەخوا خەڵکەکەم دەزانن نە لەگەنجی و لە پیری حەزم لەقسەی گاڵتە و گەپ نەبووە، بەڵام سوێند بەخوا ئەوەی زیاتر لەهەر شتێک دڵخۆشم دەکات ئەوەی لەنیوان من و حۆرییەکانی بەهەشت مەودایەك نییە جگە لەوەی ئەم سوپایە بەشمشێرەکانیان هێرش بکەنەسەرمان.

دەڵێت: دوای ئەوەی حسەین لەخێوەتەکەی هاتەدەر، ئەوانیش ڕۆشتنە ناو خێوەتەکە.

دەڵێت: حسەین سوار چوارپێکەی بوو، داوای قورئانێکی کرد و لەبەردەم خۆی داینا.

دەڵێت: هاوەڵانی جەنگێکی بوێرانەیان کرد و کاتێک بینیم ئەو دەستەیە لەپێکەوتوون، بەپەلە ڕۆشتم و ڕزگارم کردن.

باوکی خالیدی کاهیلی دەڵێت: کاتێک بەیانی بوویەوە، حسەین دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و وتی: خواوەندا، لەکاتی هەر بەلا و کارەساتێك، تۆ پشتیوانی منیت و لەهەر دژوارییەك، چرای هیوا، زۆر لەخەمەکان دەبوونە هۆی

پەرێشانی و دڵڕاوکێ و پشتگوێ خستنی دۆست و سەرکۆنە کردنی دوژمن، بەڵام ڕوومکردە پێشگای تۆ و سکاڵام بۆ لای تۆ بەرز کردەوە چوونکە زیاتر لەهەمووان خوازیاری ئەو کارەم، هەموو چاکییەکان هی تۆیە و هەموو باشییەکان تایبەتە بەتۆ.

زوحاکی مەشرقی دەڵێت: کاتێك هێرشیان کردە سەرمان و ئاگرەکەیان بینی، یەکێك لەسوارە تەیارەکان سوار لەسەر ئەسپ هات و قسەی نەکرد تا لەخێوەتەکان تێپەڕی و دواتر گەڕایەوە و بەدەنگی بەرز هاواری کرد: ئەی حسەین، لەم دنیا زووتر لەڕۆژی پسلاّن ئاگرت دەویست؟

حسەین وتی: ئەوە کێیە؟ دەڵێی شیمر کوڕی زی ئەلجەوشەنە؟

وتیان: بەڵێ، خۆیەتی.

وتی: ئەی کوڕی ژنی بزن لەوەڕێن، تۆ شیاوی لەئاگردا بسووتێیت.

موسلیم کوڕی عەوسەجە وتی: ئەی کوڕی پێغەمبەر (د.خ)، ڕێگەم بدە بەتیر بیکوژم، تیرەکانی من بەهەڵە ناڕوات، ئەمە یەکێکە لەستەمکارە گەورەکان.

حسەین وتی: ئەو کارە مەکە، ناخوازم من ئاگری جەنگ هەڵبگیرسێنم.

دەڵێت: حسەین ئەسپێکی بوو بەناوی لاحیق کەعەلی کوڕی حسەینی لەسەر بوو.

دەڵێت: کاتێك نزیکبوونەوە، داوای چوارپێکەی کرد و سواری بوو، بەدەنگی بەرز و بەشێوەیەك هەمووان بیستیان، وتی: ئەی خەڵکینە گوێ لەوتەکانم بگرن و لەکوشتنی من پەلە مەکەن، تا سەبارەت بەمافەکانم بدوێم و پێتان بڵێم بۆچی هاتووم، ئەگەر بەوتەکانم ڕازیبوون و باوەڕتان کرد، کەسانێکی دادپەروەرن و بەختەوەری دێتە ڕێگەتان چوونکە هیچ پاساوێکتان دژی من نییە و ئەگەر ڕازی نەبوون، خۆتان و خوای خۆتان و هەر بڕیارێك سەبارەت بەمن دەیدەن، بیدەن. پشتیوانی من خواوەندێکە ئەم کتێبەی ناردووە و ئەویش خۆشەویستی باوەڕدارانە.

دەڵێت: کاتێك خوشکەکانی ئەمەیان بیست، دەنگیان بەرز کردەوە و گریان، کچەکانیش بەهەمانشێوە و دەنگیان بەرز بوویەوە. حسەین، عەباسی برای و

عەلی کوڕی نارد و وتی: بێدەنگیان بکەن چوونکە ئاوا بڕوات، زۆر دەگرین.

دەڵێت: کاتێك ڕۆشتن ئەوان بێدەنگ بن، وتی: کوڕی عەباس راستی دەکرد. کوڕی عەباس وتبووی ئەوان لەگەڵ خۆی نەبات. کاتێك بێدەنگ بوون، سپاسی خواوەندی کرد و ناوی ئەوی هێنایە سەرزمان. بەئەندازەی پێویست سڵاو و دروودی بۆ پێغەمبەر (د.خ) و فریشتەکان نارد.

دەڵێت: سوێند بەخوا هەرگیز پێشتر و دوای ئەو نەمبینیوە کەسێك بەزمان پاراوی ئەو بدوێت.

وتی: ((بەڵام دواتر، من بیربێننەوە و بزانن کێم، دواتر بیر لەخۆتان بکەنەوە و سەرکۆنەی خۆتان بکەن و تێڕامێنن ئایا ڕەوایە بکوژن و ڕێزی من بشکێنن؟ مەگەر من کوڕی کچی پێغەمبەر (د.خ) و کوڕی جێگرەکەی ئەو و ئامۆزاکەی نیم کەپێش هەمووان باوەڕی بەخواوەند هێنا و وتەکانی پێغەمبەر (د.خ) پشتڕاست کردەوە؟ مەگەر حەمزە، سەروەری شەهیدان، مامی باوکم نەبوو؟ مەگەر ئەو وتە باوەتان نەبیستووە کە پێغەمبەر (د.خ) سەبارەت بەمن و براکەم فەرمووی: ئەم دووانە سەرکردەی گەنجەکانی بەهەشتن؟ ئەگەر باوەڕ بەوتەکانم دێنن، سوێند بەخوا لەو کاتەوەی زانیومە خواوەند درۆزنەکانی خۆش ناوێت و درۆکەر زیان دەبینێت، درۆم نەکردووە، ئەگەر باوەڕ بەوتەکانم ناکەن، هێشتا لەناو خەڵکان کەسانێك هەن وتەکانی من پشتڕاست بکەنەوە. لەجابر کوڕی عەبدوڵڵەی ئەنساری یا ئەبوسەعیدی خدری یا سەهل کوڕی سەعد یا زەید کوڕی ئەرقەم یا ئەنسی کوڕی مالیك بپرسن تا پێتان بڵێن ئایا ئەو فەرموودەی پێغەمبەریان سەبارەت بەمن و براکەم بیستووە یا نە. ئایا ئەمە نابێتە هۆی ئەوەی دەست لەکوشتنی من هەڵبگرن؟

شیمر کوڕی زی ئەلجەوشەن وتی: هەرکەس تێبگات تۆ چی دەڵێیت، خواوەند بۆ یەك وشە دەپەرستێت.

حەبیب کوڕی موزاهیر پێی وت: سوێند بەخوا تۆ خواوەند لەسەر حەفتا وشە دەپەرستیت. شایەتی دەدەم کەڕاست دەکەیت و تێناگەیت حسەین کوڕی عەلی چی دەڵێت، چوونکە خواوەند ڕێگەی ئەو کارەت پێنادات.

دەڵێت: ئەوسا حسەین پێی وتن:

(( ئەگەر گومانتان لەم وتە هەیە، ئایا گومانتان هەیە لەوەی من کچی پێغەمبەرەکەتانم؟ سوێند بەخوا لەڕۆژهەلآت تا ڕۆژئاوا لەنەتەوەی ئێوە یا نەتەوەیەکی دیکە، جگە لەمن کوڕی کچی پێغەمبەر (د.خ) بوونی نییە، تەنیا منم کەکوڕی پێغەمبەرەکەی ئێوەم. پێم بڵێن ئایا لەتۆڵەی کەسێك کەکوشتوومە، یا سامانێك کە بەفیڕۆمداوە، دەتانەوێت بمکوژن؟

دەڵێت: بێدەنگ بوون و وەڵامیان نەدایەوە.

دواتر هاواری کرد:

(ئەی شیبس کوڕی ربیعی، ئەی حەجار کوڕی ئەبجەر، ئەی قەیس کوڕی ئەشعەس، ئەی یەزید کوڕی حارس، مەگەر نامەتان بۆ نەنووسیم کەمیوەکان پێگەییون و باغەکان سەوز بوون و چاڵەکان پڕئاو بوون و بۆ لای سوپای ئامادەی خۆت دێیت؟

وتیان: ئێمە نەماننووسیوە.

وتی: سبحان الله، سوێند بەخوا ئێوە نووسیتان.

دەڵێت: ئەوسا وتی: ئەی خەڵکینە، ئەگەر منتان ناوێت، ڕێگە بدەم بۆ سەرزەمینەکەی خۆم بگەڕێمەوە.

دەڵێت: قەیس کوڕی ئەشعەس وتی: بۆ لەسەر فەرمانی ئامۆزاکانت تەسلیم نابیت؟ سوێند بەخوا بەشێوەیەکی ناشیرین هەڵسوکەوتت لەگەڵ ناکەن و خراپەت لەگەڵ ناکەن.

حسەین پێی وت: تۆ برای ئەو برایت، دەتەوێت منداڵەکانی هاشم زیاتر لەخوێنی موسلیم کوڕی عەقیل لەتۆ داوا بکەن؟ نا، سوێند بەخوا هاوشێوەی کەسانی پەست خۆم بەدەستەوە نادەم و هاوشێوەی کۆیلەکان ملکەچ نابم. ئەی بەندەکانی خوا، لەوەی بەردبارانم بکەن، پەنا بۆ پەروەردگار دەبەم. لەبەلآی ئەو ستەمکارانەی باوەڕیان بەڕۆژی کۆتایی نییە، پەنا بۆ پەروەردگاری خۆم و ئێوە دەبەم.

دەڵێت: چوارپێکەی خەواند و بەعوقەبە کوڕی سەمعانی وت بیبەستێتەوە. لەو

کاتەدا هێرشیان کرایەسەر.

کەسیر کوڕی عەبدوللەی شەعبی کە لەکاتی کوژرانی حسەین ئامادە بوو، دەڵێت: کاتێك هێرشمانکردە سەر حسەین، زوهەیر کوڕی قین، سوار لەسەر ئەسپەکەی خۆی و شمشێر بەدەست هات و وتی: ئەی خەڵکانی کوفە، لەئازابی خواوەند بترسن. مۆجیاریکردنی برای موسوڵمان ئەرکی موسوڵمانانە، ئێمە و ئێوە تا ئەو کاتەی شمشێرەکان بەرز نەکراونەتەوە، برای یەکین و لەسەر یەك دین، ئێوە شیاوە گوێ لەمۆجیارییەکانی ئێمە بگرن. کاتێك شمشێرەکان لەکالآن دەربێن، یەکێتی ئێمە لەناو دەچێت و ئێوە ئۆمەتێك دەبن و ئێمە ئۆمەتێك. خواوەند ئێمە و ئێوە بەبنەماڵەی پێغەمبەر (د.خ) ئەزموون دەکات تا بزانێت ئێمە چی دەکەین و ئێوە چی دەکەن. ئێمە بانگێشتان دەکەین هاوکارییان بکەن و دەست لەپشتیوانیکردنی عوبەیدالله کوڕی زیادی ستەمکار هەڵبگرن چوونکە لەرۆژگاری فەرمانڕەوایەتی ئەوان جگە لەخراپە هیچ نابینن. چاوەکانتان کوێر دەکەن، دەست و پێتان دەبڕنەوە، ئەندامەکانی جەستەتان لەت و کوت دەکەن و بەدار خورماکانەوە هەڵتاندەواسن، خۆپاریزان و قورئان خوێنەکانی ئێوە وەك حوجر کوڕی عودەی و هاوەڵانی و هانی کوڕی عوروە و کەسانی هاوشێوەی ئەوان دەکوژن.

دەڵێت: جوێنیان پێدا و سلاویان بۆ عوبەیدالله نارد و وتیان: سوێند بەخوا ناڕۆین تا ئەو کاتەی پێشەواکەی تۆ و هاوەڵانی دەکوژین یا ناچاریان دەکەین تەسلیم بەفەرمانی عوبەیدالله بن.

دەڵێت: پێی وتن: ئەی بەندەکانی خوا، منالەکانی فاتیمەی کچی پێغەمبەر (د.خ) زیاتر لەکوڕی سومەییە شیاوی هاوکاری و پشتیوانین، ئەگەر هاوکارییان ناکەن، خواوەندتان لەبیر بێت و مەیانکوژن. ئەم پیاوە تەسلیم بەکوڕە مامەکەی، یەزید کوڕی معاویە بکەن چوونکە بەمشێوەیە یەزید بێ کوشتنی حسەین لەئێوە رازی دەبێت.

دەڵێت: شیمر کوڕی زی ئەلجەوشەن تیرێکی بۆ هاویشت و وتی: بێدەنگبە، هیوادارم خوا بتکوژێت، بەم زۆربڵەییت ماندووت کردین.

زوهەیر وتی: ئەی کوڕی ئەو کەسەی میزی بەخۆیا دەکرد، لەگەڵ تۆ قسە ناکەم چوونکە ئاژەڵێك زیاتر نیت، سوێند بەخوا دڵنیام دوو ئایە لەقورئان نازانیت.

شیمر وتی: خواوەند هەر ئێستا خۆت و هاوەڵانت دەکوژێت.

وتی: لەمەرگ دەمترسێنیت! سوێند بەخوا حەز دەکەم بمرم نەك ئەوەی لەگەڵ تۆدا بژیم.

دەڵێت: ڕوویکردە خەڵکان و بەدەنگی بەرز وتی: ئەی بەندەکانی خوا، ئەم ستەمکارە و کەسانی هاوشێوە فریوتان نەدەن، سوێند بەخوا ئەو کەسانەی خوێنی بنەماڵەی محەممەد بڕێژن و پشتیوان و بەرگریکاریان نەبن، لەپاڕانەوە و شیفاعەتی پێغەمبەر (د.خ) بێبەش دەبن.

دەڵێت: یەك لەهاوەڵانی پێی وت: باوکی عەبدوڵڵە دەڵێت با بگەڕێتەوە، سوێند بەخوا، ئەگەر باوەڕداری بنەماڵەی فیرعەون، مۆجیاری خەڵکەکەی کرد و پەیامەکەی خواوەندی گەیاند، تۆیش ئەرکی خۆتت جێبەجێ کرد، ئەگەر ئەم مۆجیارییە ببێتە هۆی ڕزگاری ئەوان.

عودەی کوڕی حەرمەلە دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی سەعد هێرشی برد، حوڕ کوڕی یەزید پێی وت: خوا بتبەخشێت، دژی ئەو پیاوە دەجەنگیت؟

وتی: بەڵێ، جەنگێك کەمترین سەر بکەوێتە سەرزەوی و کەمترین دەست بپەڕێت؟

وتی: بەیەکێك لەسێ پێشنیارەکەی ڕازی نابن؟

عومەر وتی: سوێند بەخوا ئەگەر بەدەستی من دەبوو، ڕازی دەبووم بەڵام فەرمانڕەوا ڕازی نەبوو.

دەڵێت: حوڕ هاتە ناو سوپاکەی. یەکێك لەخەڵکەکەی بەناوی قوڕڕە کوڕی قەیس هاوڕێیەتی دەکرد. حوڕ پێی وت: ئەمڕۆ ئەسپەکەت ئاوداوە؟

وتی: نە.

وتی: ناتەوێت ئاوی بدەیت؟

قوڕڕە دەڵێت: سوێند بەخوا گومانم دەکرد دەیەوێت لەگۆڕەپانی جەنگ

دووربکەوێتەوە و بەشداری جەنگ نەکات و نایەوێت لەکاتی دوورکەوتنەوە، بیبینم و خەڵکان لەم کارەی ئەو ئاگادار بکەمەوە. وتم: ئاوم نەداوە و دەڕۆم ئاوی بدەم.

دەڵێت: لەشوێنەکەی حوڕ دوورکەوتمەوە.

دەڵێت: سوێند بەخوا ئەگەر لەمەبەستەکەی ئاگاداری دەکردمەوە، شانبەشانی ئەو پەیوەستی سوپاکەی حسەین دەبووم.

دەڵێت: هێدی هێدی لەحسەین نزیك بوویەوە. یەکێك لەخەڵکەکەی بەناوی موهاجیر کوڕی ئەوس پێی وت: ئەی کوڕی یەزید چیت دەوێت؟ دەتەوێت هێرش بکەیت؟

دەڵێت: ئەو بێدەنگ بوو و سەرتاپای دەلەرزی.

موهاجیر وتی: سوێند بەخوا کارەکانی تۆ جێی سەرسوڕمانە، هەرگیز لەکاتی جەنگ تۆم بەمشێوەیە نەبینیوە، ئەگەر لەمنیان دەپرسی: بوێرترین جەنگاوەری کوفە کێیە، ناوی تۆم دەهێنایە سەرزمان. بۆ وا پەرێشانیت؟

وتی: سوێند بەخوا لەنێوان بەهەشت و جەهەننەم دوودڵم. سوێند بەخوا ئەگەر لەت لەتم بکەن و بمسووتێنن، بەهەشت هەڵدەبژێرم.

دەڵێت: سوار لەسەر ئەسپەکەی پەیوەستی سوپاکەی حسەین بوو، وتی: خوا بتبەخشێت، من ئەو کەسەم ڕێگەی گەڕانەوەم پێنەدایت و هاوڕێی تۆ بووم و ناچارم کردیت لەم شوێنە خێوەت هەڵدەیت. سوێند بەوخوایەی جگە لەو خوایەك نییە، گومانم نەدەکرد ئەم خەڵکە بەوتەکانی تۆ ڕازی نەبن و بارودۆخ بگاتە ئێرە. بەخۆم وت، فەرمانەکانی ئەوان جێبەجێ دەکەم تا نەڵێن یاخی بووە و گوێڕایەڵی فەرمانەکان نابێت بەڵام ئەوان بەوتە و پێشنیارەکانی حسەین ڕازی دەبن. سوێند بەخوا ئەگەر دەمزانی ڕازی نابن، ئەو کارەم نەدەکرد. ئێستا هاتوومە لای تۆ و لەکردەوەکەی خۆم پەشیمانم. بەگیان و دڵ هاوکاریت دەکەم تا لەبەردەم تۆدا بکوژرێم. ئایا ئەمە بەتۆبەی من دەزانیت؟

وتی: بەڵێ، خواوەند لەتۆبەکەت ڕازی دەبێت و دەتبەخشێت. ناوت چییە؟

وتی: من حوڕ کوڕی یەزیدم.

وتی: بەهەمانشێوە کەدایکت ناوی نایت، حوڕی (ئازادی). بەخواستی خوا لەهەر دوو جیهان، حوڕ دەمێنیتەوە. دابەزە.

وتم: من بەسوار باشتر دەتوانم بجەنگم. لەسەر ئەسپ ماوەیەك دژی ئەوان دەجەنگم چوونکە دواتر ناچار دەبم لەئەسپ بێمەخوار.

وتی: خوا بتبەخشێت، چۆنت پێباشە ئەو کارە بکە.

دەڵێت: حوڕ بۆ لای هاوەڵانی گەڕایەوە و وتی: ئەی خەڵکینە، بۆ بەیەکێك لەپێشنیارەکانی حسەین کوڕی عەلی ڕازی نابن تا خواوەند لەجەنگ و کوشتنی ئەو دوورتان بخاتەوە.

وتیان: لەگەڵ عومەر کوڕی سەعد قسە بکە.

دەڵێت: ئەو وتانەی بۆ سەعد دووبارە کردەوە.

عومەر وتی: حەز دەکەم، ئەگەر ڕێگەچارەیەکم دەست دەکەوت، ئەنجامم دەدا.

حوڕ وتی: ئەی خەڵکی کوفە، دایکتان لەپرسەتانا دانیشێت. حسەین کوڕی عەلیتان بانگێشتکرد و کاتێك هات، تەسلیمتان کرد. دەتانەوت خۆتان بۆ پشتیوانیکردنی ئەو بەکوشت دەدەن. بەلاّم هێرشتان کردۆتەسەر بۆ ئەوەی خوێنی بڕێژن. چواردەورتان گرتووە، دەستتان خستۆتە قوڕگی و تەنگتان پێ هەڵچنیوە و ڕێگە نادەن لەم سەرزەمینە بەرینەی خواوەندا بگەڕێت و پەناگەیەکی دەست کەوێت. لەدەستی ئێوەدا وەك ئەسیرە بەشێوەیەك نەدەتوانێت بۆ ڕزگاری خۆی شتێك بکات و نەدەتوانێت زیانەکان لەخۆی دوور بخاتەوە. ئاوی ڕووباری فوراتتان لێ بەست لەکاتێکدا جوولەکە و مەسیحی و سەگ و ئاژەڵەکان لێی دەخۆنەوە و لەئێستادا تینویەتی بارودۆخی لێ دژوار کردوون. ئەمە چ کردەوەییێکە لەگەڵ پاشماوەی بنەماڵەی پێغەمبەر (د.خ) دەیکەن. ئەگەر ئێستا تۆبە نەکەن و لەکار و کردەوەکانی خۆتان پەشیمان نەبنەوە، لەو جیهان، خواوەند بەتینوویەتی ئازابتان دەدات.

دەڵێت: پیادەکانی سوپا هێرشیان کردەسەر و تیربارانیان کرد. حوڕ گەڕایەوە و لەبەردەم حسەین کوڕی عەلی وەستا.

حەمید کوڕی موسلیم دەڵێت: عومەر کوڕی سەعد هێرشیکردە سەریان و

هاواریکرد: ئەی زوەید، ئاڵاکەت بۆ پێشەوە ببە.

دەڵێت: زوەید ئاڵاکەی بۆ پێشەوە برد. عومەر تیرێکی خستە ناو کەوانەکەی و وتی: شایەت بن، یەکەم کەسم کەتیرم هاویشت.

باوکی جەنابی کەلبی دەڵێت: یەکێك لەئێمە بەناوی عەبدوڵڵە کوڕی عومەیر لەمناڵەکانی عەلیم هاتبووە کوفە و لەنزیك چاڵی جوعدە لەگەڕەکی هەمەدان نیشتەجێ بوو. ژنەکەی لەتیرەی نەمری کوڕی قاست بوو بەناوی داکی وەهەب کچی عەبد. عەبدوڵڵە، سوپاکەی بینیبوو کەسەرقاڵی ئامادەکردنی خۆیان بوون تا بۆ جەنگی حسەین بەڕێکەون.

دەڵێت: سەبارەت بەوان پرسیاریکرد، وتیان: بۆ جەنگی حسەین کوڕی فاتیمەی کچی پێغەمبەر (د.خ) ڕەوانەیان دەکەن.

وتی: سوێند بەخوا ئارەزوومەندی شەڕی ناباوەڕانم و هیوادارم پاداشتی جەنگ دژی ئەوان کە بۆ جەنگی کوڕی کچی پێغەمبەر (د.خ) دەڕۆن، لای خواوەند زیاتر لەپاداشتی شەڕ دژی ناباوەڕان بێت.

دەڵێت: بۆ لای ژنەکەی گەڕایەوە و لەو پێشهاتانە و مەبەستەکەی خۆی ئاگاداری کردەوە.

ژن وتی: کارێکی باش دەکەیت، خوا بۆ ڕێگەی ڕاست ڕێنوێنیت بکات، بڕۆ و منیش لەگەڵ خۆت ببە.

دەڵێت: شەوانە لەگەڵ ژنەکەی ملی ڕێگەی گرتەبەر تا پەیوەستی حسەین بوو. لەگەڵ حسەین مایەوە و کاتێك عومەر کوڕی سەعد یەکەم تیری هاویشت، خەڵکانیش دەستیان پێکرد. یەسار کۆیلەی ئازادکراوی زیاد کوڕی ئەبوسوفیان و سالیم کۆیلەی ئازادکراوی عوبەیداڵڵە کوڕی زیاد، هاتنە ناوەڕاستی گۆڕەپان و داوای جەنگاوەریان کرد.

دەڵێت: حەبیب کوڕی موزاهیر و بورەیر کوڕی حەزیر لەشوێنەکەیان هەستان.

حسەین پێی وتن: دانیشن. لەم کاتەدا عەبدوڵڵە کوڕی عومەیری کەلبی هەستا و وتی: ئەی باوکی عەبدوڵڵە، خوا بتبەخشێت، ڕێگە بدە من بۆ جەنگی ئەوان بڕۆم.

دەڵێت: حسەین پیاوێکی بینی ئەسمەر، بالأبەرز، چوارشانە و پشت پان و وتی: گومان دەکەم ئەمە بکوژی هەمووانە، ئەگەر دەخوازی برۆ.

دەڵێت: عەبدوڵلە بۆ جەنگی ئەوان ڕۆشت، لێیان پرسی: کێیت؟ کاتێك نەژادی خۆی باسکرد، وتیان: ئێمە تۆ ناناسین. زوهەیر کوڕی قین یا حەبیب کوڕی موزاهیر یا بورەیر کوڕی حەزیر بێت. یەسار لەبەردەم سالم وەستا بوو.

دەڵێت: پیاوی کەلبی وتی: ئەی کوڕی خراپەکار! بەجەنگ لەگەڵ من ڕازی نابیت تا کەسێکی دیکە بێت. دواتر هێرشیکردەسەر و بەشمشێرەکەی لێیدا بەشێوەیەك دەستبەجێ مرد. لەو کاتەدا سەرقاڵی کوشتنی ئەو بوو، سالم بەشمشێری هێرشیکردەسەر و هاواری کرد: دەتکوژم. عەبدوڵلە گرنگی پێنەدا تا نزیك بوویەوە. کاتێك نزیك بوویەوە، پێشدەستی کرد و شمشێرێکی وەشاند. پیاوی کەلبی دەستی خۆی خستە بەر شمشێرەکە و پەنجەکانی دەستی چەپی قرتان. دواتر پیاوی کەلبی شمشێری بەرز کردەوە و بەشێوەیەك لێیدا دەستبەجێ مرد. پیاوی کەلبی کەهەردووکیانی کوشتبوو، گەڕایەوە و هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((ئەگەر نامناسن من کوڕی کەلبم

نەژادم بۆ تیرەی عەلیم دەگەڕێتەوە.

پیاوێکی خۆپارێزم و باوەڕدار

لەکاتی کارەسات، ناتەوان نیم

دایکی وەهەب! بەڵێن دەدەم لەکاتی شمشێر وەشاندن

پێش ئەوان بکەوم

و گورزی شمشێرەکەم هاوشێوەی گورزی گەنجێکی باوەڕدار بێت)).

دەڵێت: دایکی وەهەب داردەستێکی هەڵگرت و بەرەو پیری مێردەکەی ڕۆشت، وتی: دایك و باوکم بەقوربانت، لەچاکەکاران، لەپاشماوەکانی بنەماڵەی پێغەمبەر (د.خ) بەرگریبکە.

دەڵێت: عەبدوڵلە هاتە لای و دەیویست بۆ لای ژنانی بگەڕێنێتەوە و ژن جلەکانی ئەوی گرتبوو و ڕایدەکێشا و دەیوت: دەبێت منیش لەگەڵ تۆ بمرم.

دەڵێت: حسەین بانگی ژنەکەی کرد و وتی: خواوەند پاداشتی چاکەی بنەماڵەکەتان بداتەوە، ئەی ژن، بۆ لای ژنان بگەڕێرەوە و لەگەڵ ئەوان دانیشە چوونکە جەنگ بۆ ژنان ڕەوا نییە. دایکی وەهەب بۆ لای ژنان گەڕایەوە.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی حەجاج فەرماندەی باڵی ڕاست هێرشی کردە سەر باڵی ڕاستی حسەین و کاتێك نزیك بوویەوە، هاوەڵانی حسەین کەوتنە سەر چۆك و ڕمەکانیان بەرز کردەوە. بەمشێوەیە ئەسپەکان نەیانتوانی پێشڕەوی بکەن و بەناچاری گەڕانەوە و ئەوانیان تیرباران کرد. چەند کەسێکیان کوشت و چەند کەسێکی دیکەیان بریندار کرد.

ئەبو جەعفەر، حسەین، دەڵێت: یەکێك لەمناڵەکانی تەمیم بەناوی عەبدوڵڵە کوڕی حوزە هات و ڕووبەڕووی حسەین وەستا و وتی: ئەی حسەین، ئەی حسەین.

وتی: چیت دەوێت؟

وتی: ئاگاداربە چوونکە بۆ جەهەننەم دەڕۆیت.

وتی: هەرگیز، بۆ لای پەروەردگاری خۆم دەگەڕێمەوە.

دواتر پرسی: ئەوە کێیە؟

هاوەڵانی وتیان: کوڕی حوزە.

وتی: پەروەردگارا، ئەو بۆ ناو ئاگری جەهەننەم ببە.

دەڵێت: ئەسپەکەی ئەوی بۆ لای جۆگەیەك برد و کەوتە ناوی، قاچی لەشوێنپێی ئەسپەکە گیری کرد و بەسەرەوەدا درا بەزەویدا. ئەسپەکە دەڕۆشت و ئەوی لەگەڵ خۆی دەبرد. سەری بەر بەرد و دارەکان دەکەوت و بەمشێوەیە مرد.

بەوتەی سوەید کوڕی حەییە، ئەسپی عەبدوڵڵە کوڕی حوزە کەوت و قاچی چەپی لەشوێنپێی زینەکە گیری کرد. ئەسپەکە غاریدا و سەری کوڕی حوزەی بەبەرد و دارەکاندا دەکێشا تا مرد.

مەسروق کوڕی وائیلی حەزرەمی دەڵێت: من لەڕیزی یەکەمین سوارەکان بووم کەهێرشمان کردە سەر حسەین. بەخۆم وت: لەپێش هەمووانەوە دەڕۆم ئەگەری هەیە سەری حسەین بەدەست بێنم و بەمشێوەیە خەڵات لەکوڕی زیاد وەربگرم.

دەڵێت: کاتێک لەحسەین نزیک بووینەوە، یەکێک لەئێمە بەناوی کوڕی حوزە پۆشتە پێش و وتی: حسەین لەناو ئێوەدایە.

دەڵێت: حسەین بێدەنگ بوو، کوڕی حوزە بۆ جاری دووەم پرسیارەکەی دووبارە کردەوە. حسەین بێدەنگ بوو و کاتێک بۆ جاری سێیەم پرسی، وتی: پێی بڵێن بەڵێ، ئەمە حسەینە، چیت دەوێت؟

وتی: ئەی حسەین، دەزانی بۆ جەهەننەم دەڕۆیت؟

وتی: هەرگیز، بۆ لای پەروەردگاری بەخشندە دەگەڕێمەوە. ئەوسا پرسی: تۆ کێیت؟

وتی: کوڕی حوزە.

دەڵێت: حسەین دوو دەستی بەرز کردەوە، بەشێوەیەک سپێتی ژێر باڵیم لەژێر جلەکانییەوە بینی، وتی: خواوەندا، ئەو بۆ قووڵایی ئاگری جەهەننەم ببە.

دەڵێت: کوڕی حوزە توڕە بوو، ویستی سوار لەسەر ئەسپ پەلاماری حسەین بدات. جۆگەیەک لەنێوان ئەو و حسەیندا بوو.

دەڵێت: قاچی لەشوێنپێی زینەکەدا بوو، ئەسپەکەی غاردا و کوڕی حوزە کەوت.

دەڵێت: قولاپە و ڕانی لێک جیابوونەوە.

بێژەر دەڵێت: مەسروق گەڕایەوە و سوپاکەی بەجێهێشت.

دەڵێت: پرسیم بۆ سوپات بەجێهێشت، وتی: شتێکم لەو بنەماڵەیە بینی کەهەرگیز دژی ئەوان ناجەنگم.

دەڵێت: جەنگ دەستپێکرد.

عەفیف کوڕی زوهەیر کە لەکاتی کوژرانی حسەین ئامادەبوو، دەڵێت: یەزید کوڕی مەعقەل لەمناڵەکانی عومەیر و موالی مناڵەکانی سەلیمە کوڕی عەبدولقەیس، هات و وتی: ئەی بورەیر کوڕی حەزیر، دەبینی خواوەند چ بەڵایەکی بەسەردا هێنایت؟

بورەیر وتی: سوێند بەخوا چاکەی لەگەڵ من کرد و خراپە لەگەڵ تۆ.

دەڵێت: درۆت کرد، پێشتر درۆزن نەبوویت، بیرتە لەگەڕەکی مناڵەکانی لوزان

هاوڕێی تۆ بووم و دەتوت کەعوسمان کوڕی عەففان خراپەی لەگەڵ خۆتی کرد و معاویە کوڕی ئەبی سوفیان گومڕا و گومڕاکەرە و پێشەوای ڕاستەقینە، عەلی کوڕی ئەبی تالیبە؟

بورەیر وتی: شایەتی دەدەم ئەوە وتار و کرداری منە.

یەزید کوڕی مەعقەل وتی: منیش شایەتی دەدەم تۆ لەگومڕاکانیت.

بورەیر کوڕی حەزیر پێی وت: دەتەوێت پێکەوە دۆعا بکەین و لەخوا بپاڕێینەوە درۆزن نفرین بکات و هەڵەکار بکوژێت، دواتر دەستەویەخە بجەنگین.

دەڵێت: هاتن و دەستی دۆعایان بەرز کردەوە و پاڕانەوە تا درۆزن نفرین بکات و ئەوەی ڕاستە، هەڵەکار بکوژێت. دواتر بۆ جەنگی یەک ڕۆشتن و هەرکام گورزێکی لەوەی دیکە وەشاند. یەزید کوڕی مەعقەل، گورزێکی سووکی لەبورەیر کوڕی حەزیردا بەڵام برینداری نەکرد، بورەیر گورزێکی لێدا کە زرێکەی سەری شکاند و بەمێشکی گەیشت و لەپێ کەوت. بەشێوەیەک دەتوت لەبەرزاییەوە کەوتۆتەخوار.

دەڵێت: شمشێرەکەی کوڕی حەزیر لەسەریدا بەجێمابوو، دەڵێی ئێستایش دەیبینم کەشمشێردکەی دەجووڵاند بۆ ئەوەی لەسەری بیهێنێتەدەر.

دەڵێت: ڕەزی کوڕی مەنقەزی عەبدی هێرشیکردەسەر بورەیر. پەلاماری یەکیاندا و سەرئەنجام بورەیر لەسەر سینەی دانیشت و ڕەزی وتی: پیاوانی جەنگ و بەرگری چییان لێهات؟

دەڵێت: کەعب کوڕی جابر کوڕی عەمرۆ ئەزدی ویستی پەلاماری بدات، پێمان وت: ئەوە بورەیر کوڕی حەزیری قورئان خوێنە کە لەمزگەوت قورئانی فێر دەکردین.

دەڵێت: بەڕم هێرشی کردە سەر بورەیر و ڕمەکەی لەپشتی چەقاند. کاتێک بورەیر هەستی بەکزانەوەی ڕمەکە کرد، هەستا و پەلاماریدا و لایەکی لووتی هەڵکەند. کەعب کوڕی جابر گورزێکی لێدا و لەپێی خست. سەری ڕمەکەی لەپشت چەقاندبوو، دواتر ڕۆشتە سەر سەری و ئەوەندەی شمشێر لێدا تا گیانی دەرچوو.

عەفیف دەڵێت: دەڵێی پیاوی عەبدی دەبینم کە لەشوێنەکەی هەستا، تەپوتۆزی لەخۆی دەتەکاند و دەیوت: ئەی برای ئەزدی، هیچکات ئەم کارەی تۆ لەبیر ناکەم.

بێژەر دەڵێت: پرسیم: ئەمەت بینی؟

وتی: بەڵێ، چاوم بینی و گوێچکەم بیستی.

دەڵێت: کاتێك کەعب کوڕی جابر گەڕایەوە، ژنەکەی و خوشکەکەی نەوار کچی جابر پێیان وت: هاوکاری دوژمنانی کوڕی فاتیمەت کرد و سەروەری قورئان خوێنەکانت کوشت، کارێکی خراپت کرد، سوێند بەخوا هەرگیز قسەت لەگەڵ ناکەم.

عەبدولڕەحمان کوڕی جوندەب دەڵێت: لەکاتی فەرمانڕەوایەتی مەسعەب بیستم کەکەعب کوڕی جابر دەیوت: پەروەردگارا، ئێمە ئەرکەکانی خۆمان ڕاپەڕاند، ئێمە لەڕیزی تاوانباران دامەنێ.

دەڵێت: باوکم وتی ڕاست دەکەیت، ئەرکی سەرشانت ڕاپەڕاند، بەڵام خراپەت کردە توێشووی خۆت.

وتی: هەرگیز، خراپەم نەکردۆتە توێشووی خۆم.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی قورەزەی ئەنساری هات لەبەردەم حسەین جەنگی، هۆنراوەی دەخوێندەوە تا ئەو کاتەی کوژرا.

سابت کوڕی هوبەیرە دەڵێت: کاتێك عەمرۆ کوڕی قورەزە کوڕی کەعب کوژرا، عەلی بانگی براکەی کرد کە لەگەڵ عومەر کوڕی سەعد بوو: ئەی حسەین، ئەی درۆزنی کوڕی درۆزن، براکەمت گومڕا کرد و فریوتدا و بەکوشتتدا.

حسەین وتی: خواوەند ڕێگەی ڕاستی نیشانی براکەتدا و تۆی گومڕا کرد.

وتی: خوا بمکوژێت، ئەگەر نەتکوژم یا لەم ڕێگەدا نەکوژرێم.

دەڵێت: هێرشی کردە سەر حسەین. نافیع کوڕی هیلالی موڕادی ڕێگەی لێگرت و گورزێکی لێدا و لەپێکەوت. هاوەڵانی پەلاماری نافعیاندا و ئەویان بەبرینداری ڕزگار کرد. دواتر چاك بوویەوە.

باوکی زوهەیری عەبەسی دەڵێت: کاتێك حوڕ کوڕی یەزید پەیوەستی حسەین بوو، یەکێك لەمناڵەکانی تەمیم بەناوی یەزید کوڕی سوفیان وتی: سوێند بەخوا

ئەو کاتەی حوڕ ڕۆشت ئەگەر دەمبینی، ڕم بەدەست شوێنی دەکەوتم.

دەڵێت: لەو کاتەی خەڵکان سەرقاڵی جەنگ بوون و ئەسپیان تاو دەدا و حوڕ هێرشی کردبووە سەر سوپاکەی عومەر کوڕی سەعد و گوێچکە و سەری ئەسپەکەی بریندار بووبوو و خوێنی لێدەچۆڕا، حەسین کوڕی تەمیم (سەرکردەی پاسەوانەکان بوو و عوبەیدالله ئەوی بۆ جەنگی حسەین نارد و هاوڕێی عومەر کوڕی سەعد بوو. عوبەیدالله جگە لەسەرکردایەتی پاسەوانەکان، فەرماندەیی ئەو سوارکارانەیشی پێسپاردبوو کەئەسپەکانیان خاوەن زرێ بوو) بەزەید کوڕی سوفیانی وت: ئەمە حوڕ کوڕی یەزید کەدەتویست جەنگی دەستەویەخەی لەگەڵ بکەیت.

وتی: زۆر باشە و بەرەو ڕووی حوڕ ڕۆشت و وتی: ئەی حوڕ، جەنگی دەستەویەخەم لەگەڵ دەکەیت؟

وتی: بەڵێ و جەنگیان دەستپێکرد.

دەڵێت: لەحەسین کوڕی تەمیمم بیست دەیوت: سوێند بەخوا دەستەویەخە لەگەڵ حوڕ جەنگی، وەك بڵێی گیانی لەبەری دەستیا بوو. کاتێك ڕووبەڕووی یەك وەستان، حوڕ دەرفەتی پێنەدا و خوێنی ڕشت.

یەحیا کوڕی هانی دەڵێت: نافیع کوڕی هیلال دەجەنگا و دەیوت: من جەمەلیم، من لەسەر دینی عەلیم.

دەڵێت: پیاوێك بەناوی موزاحیم کوڕی حورەیس لێی نزیکبوویەوە و وتی: من لەسەر دینی عوسمانم.

وتی: لەسەر دینی شەیتانی. پەلاماریدا و خوێنی ڕشت.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی حەجاج دەنگی بەرز کردەوە و وتی: ئەی نەزانینە، دەزانن لەگەڵ کێ دەجەنگن؟ لەگەڵ شاسوارەکان کە لەمەرگ ناترسن. کەس لەئێوە شەڕی دەستەویەخەیان لەگەڵ نەکات. ژمارەیان کەمە و ناتوانن بۆ ماوەیەکی زۆر خۆڕاگری بکەن. سوێند بەخوا ئەگەر بەردبارانیان بکەن لەناویان دەبەن.

عومەر کوڕی سەعد وتی: ڕاست دەکەیت، بۆچوونی گونجاو ئەوەیە. کەسی بۆ لای سوپاییەکان نارد و جەختیکردەوە لەوەی کەس شەڕی دەستەویەخە نەکات.

زوبەیدی دەڵێت: لەعەمرۆ کوڕی حەجاجم بیست کاتێك لەهاوەڵانی حسەین نزیك بووبوویەوە، دەیوت: ئەی خەڵکانی کوفە، گوێڕایەڵی سەروەری باوەڕداران و فەرمانڕەواکەی خۆتان بن و لەکوشتنی ئەو کەسانەی لەدین هەڵگەڕاونەتەوە و دژایەتی سەروەری باوەڕداران دەکەن، دوودڵ مەبن.

حسەین پێی وت: ئەی عەمرۆ کوڕی حەجاج، خەڵکان دژی من هان دەدەیت؟ ئێمە لەدین هەڵگەڕاوەین و ئێوە باوەڕدار! سوێند بەخوا ئەگەر گیانتان بگرن و لەسەر ئەم کردەوانە بن، دەزانن کێ لەدین هەڵگەڕاوەتەوە و کێ شیاوە بۆ ئەوەی لەئاگری جەهەننەمدا بسووتێت.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی حەجاج لەگەڵ باڵی ڕاستی سوپاکەی عومەر لەلای فوراتەوە هێرشیانکردە سەر سوپاکەی حسەین و ماوەیەك ئاگری جەنگیان خۆشکرد. موسلیم کوڕی عەوسەجە یەکەم کەس بوو لەهاوەڵانی حسەین کوژرا.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی حەجاج و سوپاکەی گەڕانەوە، تەپوتۆز دامرکایەوە و بینییان موسلیم کوڕی عەوسەجە لەسەر زەوی کەوتووە. حسەین ڕۆشتە لای، هێشتا گیانی بەبەردا مابوو، پێی وت: ئەی موسلیم کوڕی عەوسەجە، هیوادارم پەروەردگار بەبەهەشتت شاد بکات. دەستەیەك لەوان بەڵێنەکەی خۆیان بردەسەر و شەهید بوون و دەستەیەکی دیکە چاوەڕوانن و گۆڕانیان بەسەر نەهاتووە.[°]

حەبیب کوڕی موزاهیر لێی نزیکبوویەوە و وتی: ئەی موسلیم، مەرگی تۆ بۆ من دژوارە، مژدەی بەهەشتت لێبێت.

دەڵێت: موسلیم بەدەنگێکی کز پێی وت: خوا مژدەی خێرت پێبدات.

حەبیب کوڕی موزاهیر وتی: ئەگەر بەوشێوە نەدەبوو کەدەزانم دوای تۆ، پەیوەستی تۆ دەبم، حەزم دەکرد لای من وەسیەت بکەیت بۆ ئەوەی جێبەجێی بکەم هەم لەبەر دینداری و هەم لەبەر پەیوەندی خزمایەتی.

وتی: خوا بتبەخشێت، وەسیەتی من ئەمەیە (بەدەست ئاماژەی بۆ حسەین کوڕی عەلی کرد) لەبەر دەم ئەمدا بمریت.

وتی: سوێند بەپەروەردگاری کەعبە ئەو کارە دەکەم.

---

° فمنهم من قضى نحبه و منهم ينتظر و ما بدلوا تبديلا، ئەحزاب ئایەی ٢٣

دەڵێت: زۆری نەخایاند لەسەر دەستی ئەوان مرد. یەکێك لەکەنیزەکانی هاواری کرد: هاوار لەکوڕی عەوسەجە، هاوار بۆ سەروەرەکەم.

دەڵێت: سوپاکەی عەمرۆ کوڕی حەجاج بەدەنگی بەرز هاواریان دەکرد کەموسلیم کوڕی عەوسەجەمان کوشتووە. شیبس بەدەستەیەك لەهاوەڵانی نزیك خۆی وت: دایکتان لەپرسەتانا دانیشێت، کەسەکانی خۆتان بەدەستی خۆتان دەکوژن و خۆتان لەبەر کەسانی دیکە ڕیسوا دەکەن، لەوەی کەسێکی وەك موسلیم کوڕی عەوسەجەتان کوشتووە، شادومانن، سوێند بەو کەسەی باوەڕم بەدینەکەی هێناوە، ئەوم لەزۆر جێگەی بڕواپێکراو لەگەڵ موسوڵمانان بینیوە، ئەوم لەئازەربایەجان بینیوە پێش ئەوەی سوپای موسوڵمانان بگەن، شەش کەس لەناباوەڕانی کوشت، کەسێکی هاوشێوەی ئەو دەکوژرێت و ئێوە خۆشحاڵی خۆتان نیشان دەدەن!

دەڵێت: موسلیم کوڕی عەوسەجە بەدەستی موسلیم کوڕی عەبدوڵڵەی زەبابی و عەبدولڕەحمان کوڕی باوکی بوجلی کوژرا.

دەڵێت: شیمر کوڕی زی ئەلجەوشەن لەگەڵ باڵی چەپ، هێرشیکردە سەر باڵی چەپی حسەین. سوپاکەی حسەین خۆڕاگرییان کرد و ڕمەکانیان بەرز کردەوە. لەهەردوولاوە هێرشکرایە سەر حسەین و هاوەڵانی، کەلبیش کوژرا. ئەو دوای دوو کەسی یەکەم، دوو کەسی دیکەی کوشتبوو. هانی کوڕی سوبەیتی حەزرەمی و بوکەیر کوڕی حەی تەمیمی هێرشیانکردەسەر و خوێنیان ڕشت. ئەمە دووەم کوژراوی هاوەڵانی حسەین بوو.

دەڵێت: هاوەڵانی حسەین بوێرانە خۆڕاگرییان دەکرد، سوارەکانیان هێرشیانبرد. ژمارەیان سی و دوو سوار بوو. لەهەر شوێنێکەوە هێرشیاندەکردە سەر سوپاکەی عومەر کوڕی سەعد، پاشەکشێیان پێدەکردن.

کاتێك عوزرە کوڕی قەیس، سەرکردەی سوارەکانی کوفە بینی سوارەکانی لەبەرابەر سوارەکانی حسەین پاشەکشێ دەکەن، عەبدولڕەحمان کوڕی حەسینی بۆ لای عومەر کوڕی سەعد نارد و وتی: مەگەر نابینی سوارەکانی من لەسەرەتای ڕۆژ لەلایەن ئەم ژمارە کەمەوە، چییان بەسەر دێت، پیادە و تیرهاوێژەکان بۆ

جەنگی ئەوان ڕەوانە بکە.

دەڵێت: عومەر بە شیبس کوڕی ڕیبعی وت: بۆ جەنگی ئەوان ناڕۆیت؟

شیبس وتی: سبحان الله، دەتەوێت پیری موزێر و هەموو خەڵکانی شار و تیرهاوێژەکان ڕەوانە بکەیت؟ کەست جگە لەمن دەست نەکەوت ئەو کارەی پێبسپێریت؟

دەڵێت: هەمووان دڵنیابوون لەوەی شیبس نەیدەخواست دژی حسەین بجەنگێت.

دەڵێت: باوکی زوهەیری عەبەسی دەڵێت: لەڕۆژگاری فەرمانڕەوایەتی مەسعەب بیستم شیبس دەیوت: خواوەند هەرگیز چاکە لەگەڵ خەڵکی ئەم شارە ناکات و بۆ ڕێگەی ڕاست ڕێنوێنیان ناکات. سەرتان سوڕنەمێنێت چوونکە ئێمە هاوڕێ لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب و کوڕەکەی بۆ ماوەی پێنج ساڵ لەگەڵ بنەماڵەی ئەبو سوفیان جەنگاین دواتر هێرشمانکردە سەر کوڕەکەی کەباشترینی خەڵکانی سەرزەوی بوو و هاوڕێ لەگەڵ بنەماڵەی معاویە و کوڕی سومەییەی ڕووسپی دژی ئەو جەنگاین.

دەڵێت: عومەر کوڕی سەعد، حەسین کوڕی تەمیمی بانگکرد و ئەو سوارانەی ئەسپەکانیان زرێیان پێوە بوو، لەگەڵ پێنسەد کەسی دیکەیی لەگەڵدا ڕەوانە کرد. ئەم دەستەیە هاتن و کاتێك لەحسەین و هاوەڵانی نزیکبوونەوە، تیربارانیان کردن. زۆری نەخایاند ئەسپەکانیان کوشت و هەمووان پیادە بوون.

ئەییووب کوڕی موشریحی خەیوانی دەیوت: سوێند بەخوا من ئەسپەکەی حوڕم کوشت، تیرێکم لەورگی ئەسپەکەیدا، ئەسپەکە کەوتە لەرزین، لەخۆی دەئالا و کەوت. حوڕ لەئەسپەکەی دابەزی، هاوشێوەی شێرێکی شمشێر بەدەست بوو. سوێند بەخوا کەسم نەبینیوە باشتر بتوانێت لەو شمشێر بوەشێنێت.

دەڵێت: پیرەکانی هۆزەکەی پرسییان: تۆ ئەوت کوشت؟

وتی: نا، سوێند بەخوا من نەمکوشت، کەسێکی دیکە ئەوی کوشت، حەزم نەدەکرد بکوژی ئەو بم.

باوکی ئەلوەداك پرسی: بۆ؟

وتی: وەك دەڵێن باوەڕدارێکی خۆپارێز بووە، سوێند بەخوا ئەگەر ئەمە گوناح بێت، وەك کەسێکی گوناحکار (کەتەنیا برینداری کردبێت) بڕۆمە پێشگای خواوەند باشترە لەوەی گوناحی کوشتنی ئەوم لەئەستۆدا بێت.

باوکی ئەلوەداك پێی وت: وەك دەبینم بەگوناحی کوشتنی هاودینەکانت دەڕۆیتە پێشگای خواوەند، کاتێك تۆ تیرت لەمداوەو ئەسپی یەکیانت لەپێخستووە و کەسێکی دیکەت بەتیر کوشتووە و لەگۆڕەپانی جەنگ ئامادە بوویت، هێرشت کردۆتە سەریان و هاوەڵانی خۆت بۆ کوشتنی ئەوان هانداوە، هێرشیانکردۆتە سەرتۆ و هەڵنەهاتوویت، یەکی دیکە لەهاوەڵانی تۆیش ئەو کارەی کردووە و بەهەمانشێوە کەسانی دیکە و بەمشێوەیە هاوەڵانی حسەین کوژران. هەمووتان لەکوشتنی ئەوان تاوانبارن.

وتی: ئەی باوکی ئەلوەداك، تۆ لەبەزەیی و بەخششی خواوەند بێهیوامان دەکەیت، ئەگەر لەڕۆژی هەستانەوە لێپرسینەوەی ئێمە لەدەستی تۆدابوو، خوا نەتبەخشێت ئەگەر بمانبەخشی.

وتی: ڕاستیی ئەوەیە پێم وتی.

دەڵێت: تا نیوەڕۆ ئاگری قورسترین جەنگیان دژی ئەوان بەرپا کرد، تەنیا لەیەك بەرەوە دەیانتوانی هێرشبکەنە سەر سوپاکەی حسەین چوونکە خێوەتەکان کۆکرابووبوونەوە و ڕاست وچەپ پەیوەستی یەکتر کرابوو.

دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی سەعد ئەمەی بینی، کەسانێکی نارد تا خێوەتەکان لەناو ببەن و گەمارۆیان بخەنەسەر. هاوەڵانی حسەین سێ سێ یا چوار چوار دەڕۆشتنە ناو خێوەتەکان و هێرشیاندەکردە سەر ئەو کەسانەی سەرقاڵی تاڵانکردنی خێوەتەکان بوون و دەیانکوشتن، یا لەنزیکەوە تیربارانیان دەکردن. لەمکاتەدا بوو عومەر کوڕی سەعد فەرمانی سوتاندنی خێوەتەکانی دەرکرد.

دەڵێت: ئاگریان هێنا و خێوەتەکانیان سووتاند.

حسەین وتی: ڕێگەیان بدەن بیسووتێنن کاتێك ئاگر تەشەنە بسێنێت ناتوانن لەوێوە هێرشتان بکەنەسەر. سوپای عومەر تەنیا لەیەك قۆڵەوە دەیانتوانی لەگەڵ سوپاکەی حسەین بجەنگن.

دەڵێت: ژنی ئەو پیاوە کەلبییە هاتەدەر و بۆ لای هاوسەرەکەی ڕۆشت و لەسەر سەری دانیشت و تەپوتۆزی لێدەتەکاند و دەیوت: هیوادارم لەبەهەشتتدا بیت.

دەڵێت: شیمر کوڕی زی ئەلجەوشەن، فەرمانی بەڕۆستەمی کۆیلەیدا: بەدار لەسەری بدە. ڕۆستەم بەدار کێشای بەسەریدا و دەستبەجێ مرد.

دەڵێت: شیمر کوڕی زی ئەلجەوشەن هەڵمەتی برد و ڕمەکەی لەخێوەتی حسەین چەقاند و بەدەنگی بەرز هاواری کرد: ئاگر بێنن تا ئەم خێوەتە و کەسانی ناو خێوەتەکە بسووتێنم.

دەڵێت: ژنان بەقاوەقیژ لەخێوەتەکە هاتنەدەر.

دەڵێت: حسەین بەدەنگی بەرز پێی وت: ئەی کوڕی زی ئەلجەوشەن! داوای ئاگر دەکەیت تا ماڵەکەی من بەسەر بنەماڵەکەمدا بسووتێنێت، هیوادارم لەئاگری جەهەننەمدا بسووتێیت.

حەمید کوڕی موسلیم دەڵێت: بەشیمر کوڕی زی ئەلجەوشەنم وت: سبحان الله، ئەم کارە شیاوی تۆ نییە، دەتەوێت قورسایی دوو گوناحت لەسەر شان بێت، هاوشێوەی خواوەند ئازاب دەدەیت و ژن و منداڵەکان دەکوژیت، سوێند بەخوا تەنیا کوشتنی پیاوان فەرمانڕەواکەی تۆ ڕازی دەکات.

دەڵێت: پرسی: تۆ کێیت؟

وتم: سوێند بەخوا نەژادی خۆمت پێناڵێم.

دەڵێت: دەترسام لەوەی ئەگەر بمناسێت، لای فەرمانڕەوا خراپەی من بێنێتە سەرزمان.

دەڵێت: کەسێك کەشیمر زیاتر گوێرایەڵی قسەکانی دەکرد، یانی شیبس کوڕی ربیعی، هات و وتی: وتەیەکی قێزەونتر لەوتەکەی تۆم نەبیستووە و کردەیەکی ناشیرینتر لەکردەی تۆم نەبینیوە، ئێستا ژنان دەترسێنیت؟

دەڵێت: شایەتی دەدەم کەشەرمەزار بوو و دەیویست بگەڕێتەوە. لەمکاتەدا زوهەیر کوڕی قین و هاوەڵانی (ژمارەیان دە کەس دەبوو) هێرشیانکردە سەر شیمر و هاوەڵانی و لەخێوەتەکان دووریانکردنەوە. باوکی عەززەی زەبابییان (لەهاوەڵانی شیمر) کوشت و خوێنیان ڕشت.

دەڵێت: سوپاکەی عومەر کوڕی سەعد هێرشیانکردنەسەر و بەردەوام ژمارەیان زیاتر دەبوو. تا دەهات ژمارەی کوژراوان لەهاوەڵانی حسەین زیاتر دەبوو بەلاّم هەرچەند لەوان دەکوژرا، لەزۆری ئەوانی کەم نەدەکردەوە.

دەڵێت: کاتێك ئەبو سەمامە عەمرۆ کوڕی عەبدوڵڵەی سایدی ئەمەی بینی، بەحسەینی وت: ئەی باوکی عەبدوڵڵە، دەبینم ئەم سوپایە لەتۆ نزیکبوونەتەوە، سوێند بەخوا تۆ ناکوژرێت تا ئەو کاتەی من لەبەردەم تۆدا دەکوژرێم، بەلاّم حەز دەکەم پێش ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ لای پەروەردگار، نوێژەکەم بخوێنم.

دەڵێت: حسەین دەستی دۆعای بەرز کردەوە و وتی: بیری نوێژ کەوتیتەوە، هیوادارم هەمیشە لەڕیزی نوێژخوێناندا بیت، بەڵێ، ئێستا کاتی نوێژە.

وتی: داوایان لێبکە دەستمان لێهەڵگرن تا ئەو کاتەی نوێژەکەمان دەخوێن

حەسین کوڕی تەمیم وتی: نوێژەکەتان وەرناگیرێت.

حەبیب کوڕی موزاهیر وتی: وەرناگیرێت؟ دەڵێی نوێژی بنەماڵەی پێغەمبەر (د.خ) وەرناگیرێت؟ بەلاّم خواوەند بەنوێژی تۆ ڕازی دەبێت، نەزانی بێ مێشك!

دەڵێت: حەسین کوڕی تەمیم هێرشیکرد و حەبیب کوڕی موزاهیر بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ڕۆشت و بەشمشێر لەتەوێڵی ئەسپەکەیدا. ئەسپ لەسەر پێ بەرز بوویەوە و سوارەکەی کەوتەخوار. هاوەڵانی حسەین هاتن و ڕزگاریانکرد.

دەڵێت: حەبیب هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( ئەی ئەو کەسانەی بەڕەچەڵەك و نەژاد

لەهەموو خەڵکان خراپترن

سوێند دەخۆم ئەگەر لەژمارەدا وەك ئێوە دەبووین

یا نیوەی ئێوە

دەستە دەستە ڕێگەی هەلاّتنتان دەگرتەبەر))

دەڵێت: هەمانڕۆژ هۆنراوەیەکی دیکەی خوێند بەم ناوەرۆکە:

(( من حەبیبم و باوکم موزاهیرە

شاسواری گۆڕەپانەکانی جەنگ

ژمارەی ئێوە زیاترە

بەلأم ئێمە ئەمەكدارین و خۆڕاگر

بەڵگەكانی ئێمە ڕوون و ئاشكران

ئێمە خواپارێزین و باوەڕدارتر)).

بوێرانە جەنگی، دواتر یەكێك لەمناڵەكانی تەمیم هێرشیكردەسەر و بەشمشێر لەسەریدا و خوێنی ڕشت. ناوی تەمیمی، بەدیل كوڕی سورەیم لەمناڵەكانی عەقفان بوو. دواتر یەكێكی دیكە لەمناڵەكانی تەمیم ڕم بەدەست هێرشیكردەسەر و بەڕم لێیدا و كەوت. ویستی هەستێت، حەسین كوڕی تەمیم بەشمشێر لێیدا و كەوت. پیاوی تەمیمی لەئەسپەكەی هاتەخوار و سەری بڕی.

دەڵێت: حەسین پێی وت: من لەكوشتنی ئەودا هاوكاری تۆمكرد.

ئەوی دیكە وتی: سوێند بەخوا جگە لەمن كەس ئەوی نەكوشت.

حەسین وتی: سەری حەبیبم بدەرێ با بەگەردنی ئەسپەكەمەوە هەڵیواسم تا خەڵك بیبینن و بزانن لەكوشتنی ئەودا بەشدار بوون، دواتر سەرەكە ببە بۆ لای عوبەیدالڵە كوڕی زیاد چوونكە من پێویستم بەوەرگرتنی خەلأتەكەی نییە.

دەڵێت: بەلأم پیاوی تەمیمی ڕازی نەبوو. دواتر لەسەر ئەوە ڕێككەوتن كەسەری حەبیب كوڕی موزاهیر پێدا و بەگەردنی ئەسپەكەیەوە هەڵیواسی و بەناو سوپاكەدا گەڕا. دواتر سەری حەبیبی بۆ پیاوی تەمیمی گەڕاندەوە و كاتێك گەیشتنە كوفە، ئەوی دیكە سەری حەبیبی بەسنگی ئەسپەكەیەوە هەڵواسی و ڕۆشتە لای كوڕی زیاد.

دەڵێت: قاسم كوڕی حەبیب لەو كاتەدا لەتەمەنی باڵقبووندا بوو، ئەوی بینی و لەگەڵ سوارەكە ڕۆشت و لێی جیانەبوویەوە. كاتێك دەڕۆشتە ناو كۆشك، لەگەڵی دەڕۆشتە ژوور و كاتێك كۆشكی بەجێدەهێشت، لەگەڵی دەهاتەدەر. پیاوی تەمیمی گومانی لا دروست بوو، وتی: كوڕم، بۆ بەدوای منەوەیت؟

وتی: هیچ نییە.؟

وتی: كوڕم پێم بڵێ.

وتی: ئەو سەرەی بەتۆیە، سەری باوكی منە، ڕێگەم بدە بەخاكی بسپێرم.

وتی: كوڕم، فەرمانڕەوا ڕازی نابێت بەخاكی بسپێریت. من دەمەوێت خەلأتی

پێوەربگرم.

کوڕ وتی: بەلأم خوا بۆ ئەم کارەت پاداشتی زۆرت پێدەدات. سوێند بەخوا کەسێکت کوشتووە لەخۆت زۆر باشتر و چاکتر بووە. دەستی بەگریان کرد.

دەڵێت: کوڕ گەورە بوو، جگە لەدۆزینەوەی بکوژی باوکی بیری لەهیچی دیکە نەدەکردەوە. بەدوای دەرفەتێکدا دەگەڕا تا تۆڵەی باوکی لێبکاتەوە.

دەڵێت: لەڕۆژگاری مەسعەب کوڕی زوبەیر، کە لەباجمیرا دەجەنگی، کوڕ پەیوەستی سوپاکەی مەسعەب بوو و بکوژەکەی باوکی لەناو خێوەتەکەیدا بینی. چاوەڕوانی دەرفەتێکی گونجاوی دەکرد. لەکاتی نیوەڕۆ و لەگەرمەی خەودا، شمشێر بەدەست پەلاماری پیاوەکەیدا و کوشتی.

محەممەد کوڕی قەیس دەڵێت: کاتێك حەبیب کوڕی موزاهیر کوژرا، پەرێشانی حسەینی داگرت و وتی: خۆم و پارێزەری هاوەڵانم دەگەڕێینەوە بۆ لای خوا.

دەڵێت: حوڕ هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( سوێندم خواردووە نەکوژرێم

تا کەسانێکی زۆر دەکوژم

و کاتێك دەکوژرێم

بەرەو پێشەوە بڕۆم

بەشمشێری بڕەر لێیان بدەم

نە لێیان بێ ئاگا دەبم نەپاشەکشێ دەکەم))

هەروەها هۆنراوەیەکی دیکەی هەیە بەم ناوەرۆکە:

((بۆ بەرگریکردن لەباشترین کەسێك

کە لەمەنی و خیف جێگیر بووە

بەشمشێر هێرش دەکەمە سەر دوژمن)).

دەڵێت: حوڕ و زوهەیر کوڕی قین بوێرانە دەجەنگان، کاتێك یەکیان هەڵمەتی دەبرد و گرفتار دەبوو، ئەوی دیکەیان هەڵمەتی دەبرد و ڕزگاری دەکرد. ماوەیەك بەمشێوەیە جەنگان و سەرئەنجام، پیادەکان هێرشیانکردە سەر حوڕ و خوێنیان ڕشت.

دەڵێت: باوکی سەمامەی سایدی کوڕە مامەکەی خۆی کوشت (لەڕیزی سوپاکەی عومەر کوڕی سەعدا بوو)).

دەڵێت: دوای ئەوە نوێژی نیوەڕۆیان خوێند. حسەین نوێژی ترسی لەگەڵ کردن. دوای نیوەڕۆ جەنگان و جەنگ قورستر و لەحسەین نزیکبوویەوە. حەنەفی هاتەبەردەمی و لەلایەن دوژمنەوە لەچەپ و ڕاستەوە تیربارانکرا.

دەڵێت: زوهەیر کوڕی قین بوێرانە دەجەنگا و دەیوت:

(( منم زوهەیر کوڕی قین

شمشێر بەدەست دوژمن لەحسەین دووردەکەمەوە)).

هەروەها دەستی لەشانی حسەین دەدا و دەیوت:

(( بۆ پێشەوە بڕۆ چوونکە ڕێگەت نیشاندراوە و ڕێنیشاندەریت

ئەمڕۆ چاوت بە پێغەمبەر (د.خ) دەکەوێت

هەروەها چاوت بەحەسەن و عەلی و مورتەزا

و خاوەنی دوو باڵ، گەنجی بوێر

و شێری خواوەند، شەهیدی نەمر))

دەڵێت: کەسیر کوڕی عەبدوللەی شەعبی و موهاجیر کوڕی ئەوس هێرشیانکردەسەر و خوێنیان ڕشت.

دەڵێت: نافیع کوڕی هیلالی جەمەلی ناوی خۆی لەسەر تیرەکان نووسیبوو. تیری ژەهراوی دەهاویشت و دەیوت:

(( من جەمەلیم، لەسەر دینی عەلیم))

دەڵێت: دوانزە کەس لەسوپاکەی عومەر کوڕی سەعدی کوشت جگە لەوانەی بریندار کردن.

دەڵێت: ئەوەندە گورزی بەرکەوت کە هەردوو بازووی شکا و ئەسیر کرا.

دەڵێت: شیمر کوڕی زی ئەلجەوشەن ئەوی گرت و هاوەڵانی ئەویان بۆ لای عومەر کوڕی سەعد ڕادەکێشا کەپێی وت: هاوار لەتۆ، ئەی نافیع چی وای لێکردیت، ئەم بەڵایە بەسەر خۆتا بێنیت؟

وتی: پەروەردگار دەزانێت چیم دەوێت.

دەڵێت: خوێن لەڕیشی دەچۆڕا و دەیوت: سوێند بەخوا دوانزە کەس لەئێوەم کوشت جگە لەوانەی برینداری کردوون و خۆم بۆ ئەم کارە سەرکۆنە ناکەم. ئەگەر بازووەکانم نەدەشکان، نەتاندەتوانی ئەسیرم بکەن.

شیمر بەعومەری وت: خوا بتبەخشێت، بیکوژە.

وتی: تۆ هێناوتە، ئەگەر دەتەوێت بیکوژە.

دەڵێت: شیمر شمشێرەکەی دەرهێنا، نافیع پێی وت: سوێند بەخوا ئەگەر موسوڵمان دەبوویت، ئەوەندە چاو نەترس نەدەبوویت کە بەگوناحی کوشتنی ئێمە بۆ بارەگای خواوەند بڕۆیت. سپاس بۆ ئەو خوایەی مەرگی منی بەخراپترین کەسی سەرزەوی سپارد.

دەڵێت: شیمر ئەوی کوشت.

دەڵێت: دواتر شیمر هات و هێرشیبرد، هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

( بیکەنەوە، دوژمنانی خوا، ڕێگەی شیمر بکەنەوە
کەشمشێر دەوەشێنێت و هەڵنایەت)).

دەڵێت: کاتێک هاوەڵانی حسەین بینیان ژمارەی دوژمن زۆر بووە و ناتوانن بەرگری لەخۆیان و حسەین بکەن، بڕیاریاندا هەموویان لەبەردەم حسەیندا بکوژرێن.

عەبدوڵڵە و عەبدولڕەحمان کوڕی عوزرە، هەردووک غەفاری، هاتن و وتیان: ئەی باوکی عەبدوڵڵە، سلاوت لێ بێت، دوژمن گەمارۆی خستووینەتەسەر، دەمانەوێت لەبەردەم تۆدا بکوژرێین، بەرگریکاری تۆبین و بەرگری لەتۆ بکەین.

وتی: بەخێربێن، نزیک ببنەوە.

دەڵێت: لێی نزیکبوونەوە و لەتەنیش ئەو دەجەنگان و هۆنراوەیەکیان دەخوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

(( منداڵەکانی غەفار بزانن
هەروەها خەندەف و منداڵەکانی نزار
کەئێمە بەشمشێری تیژ

هێرشمانکردە سەر خراپەکاران

ئەی خەڵکینە! بەشمشێر و ڕم

لەمناڵی ئازاد پیاوەکان بەرگری بکەن)).

دەڵێت: دوو گەنجی جابری، سەیف کوڕی حارس کوڕی سورەیع و مالیك کوڕی عەبد کوڕی سورەیع (ئامۆزا بوون و کوڕی یەك دایك) بەدەم گریانەوە لەحسەین نزیکبوونەوە.

حسەین پێی وتن: برازاکانم بۆ دەگریین؟ هیوادارم بەزوویی دڵخۆش ببن.

وتیان: سوێند بەخوا بۆ خۆمان ناگریین، بۆ تۆ دەگریین چوونکە دەبینین گەمارۆیان داویت و ناتوانین بەرگریت لێبکەین.

وتی: هیوادارم خواوەند بۆ ئەم خەمەتان و ئەو پشتیوانییەی لەمنی دەکەن، باشترین پاداشتتان بداتەوە.

دەڵێت: حەنزەلە کوڕی ئەسعەدی شامی هات و لەبەردەم حسەین وەستا و بەدەنگی بەرز ئەم ئایانەی دەخوێندەوە:

(( یا قوم انی اخاف علیکم مثل یوم الاحزاب. مثل ادب قوم نوح و عاد و ثمود و الذین من بعد هم و ما الله یرید ظلما للعباد. و یا قوم انی اخاف علیکم یوم التناد. یوم تولون مدبرین ما لکم من الله من عاصم و من یضلل الله فما له من هاد.[٦]

واتاکەی: ئەی خەڵکینە، من بۆ ئێوە لەڕۆژگاری وەك دەستەکانی دیکە دەترسم، وەك بەسەرهاتی نەتەوەی نوح و عاد و سەموود و ئەو کەسانەی شوێنیان کەوتن و خوا ستەمی بۆ بەندەکانی ناوێت. ئەی خەڵکەکەی من، بۆ ئێوە لەڕۆژی جاڕدان دەترسم و ئەو ڕۆژەی دەتانگێڕنەوە و لەبارەگای خواوەند، پارێزەرێکتان نییە و هەرکەس خواوەند گومڕای بکات، ڕێبەری نییە)).

ئەوسا وتی: ئەی خەڵکینە، حسەین مەکوژن چوونکە خواوەند گرفتاری ئازابتان دەکات و هەرکەس درۆ هەڵبەستێت، بێ هیوا دەبێت)).[٧]

---

[٦] مؤمن- ئایەکانی ٣٠ تا ٣٣

[٧] - فیستحکم بعذاب و خاب من افتری. طه ئایەی ٦٥

حسەین پێی وت: ئەی کوڕی ئەسعەد، خوا بتبەخشێت، ئەوان کاتێک بانگەوازی ڕاستینەی تۆیان ڕەدکردەوە و هێرشیانکرد تا خوێنی تۆ و هاوەڵانت بڕێژن، شیاوی ئازابی خواوەند بوون چ بگات بەوەی ئێستا کەژمارەیەک لەهاوەڵە خۆپارێزەکانی تۆیان کوشتووە.

وتی: ڕاست دەکەیت، تۆ باشتر لەمن شارەزای کاروباری دینیت و زیاتر شیاویت. بەرەو ئەو جیهان دەڕۆین تا پەیوەستی هاوڕێکانمان ببین.

وتی: بەرەو جیهانی هەمیشەیی بەڕێکەوە چوونکە لەم جیهانە و هەموو سامانەکانی باشترە.

وتی: سلاو لەتۆ ئەی باوکی عەبدوڵڵە، هیوادارم لەو جیهان، خواوەند لەنزیک ئێوە نیشتەجێمان بکات.

وتی: ئامین، ئامین.

دەڵێت: ڕۆشتە پێش و جەنگا تا کوژرا.

دەڵێت: ئەو دوو گەنجە جابرییە هاتنە پێش و سەیری حسەینیان دەکرد و دەیانوت: ئەی کوڕی پێغەمبەری خوا، سلاو و ڕەحمەتی خواوەندت لێبێت.

وتی: سلاوی خوایش لەئێوە بێت.

دەڵێت: هەردووکیان جەنگان تا کوژران.

دەڵێت: عابس کوڕی باوکی شەبیبی شاکری هات، شەوزەبی کۆیلەی شاکریش هاوڕێیەتی دەکرد، پێی وت: شەوزەب دەتەوێت چی بکەیت؟

وتی: چی دەکەم؟ شانبەشانی تۆ بۆ بەرگریکردن لەکوڕی پێغەمبەر (د.خ) دەجەنگم تا دەکوژرێم.

وتی: چاوەڕوانی ئەوە لەتۆ دەکرێت، هەنووکە بڕۆ لای باوکی عەبدوڵڵە تا دۆعات بۆ بکات بەهەمانشێوە کەدۆعای بۆ هاوەڵانی دیکەی کرد. سوێند بەخوا ئەگەر ئێستا کەسێک لای من دەبوو کە زیاتر لەتۆ لەو نزیکتر دەبووم، حەزم دەکرد بێتە لای من دۆعای بۆ بکەم. ئەمە ڕۆژێکە دەبێتە بەهەر شێوەیەک بووە، بەدوای پاداشتدا بگەڕێین چوونکە دوای ئەمە کردەوە نابێت و کاتێک لێکۆڵینەوە لێپرسینەوەیە.

دەڵێت: ڕۆشت و سلاوی بۆ حسەین نارد، دواتر ڕوویکردە گۆڕەپانی جەنگ و شەڕیکرد تا کوژرا.

دەڵێت: عەباس کوڕی باوکی شەبیب وتی: سوێند بەخوا لەسەر زەوی کەس لەتۆ ئازیزتر و خۆشەویستتر نییە، ئەگەر دەمزانی بەشتێك زیاتر لەگیان و خوێنی خۆم، ئەم ستەمە لەتۆ دوور دەکەمەوە، ئەو کارەم دەکرد. ئەی باوکی عەبدوڵڵە، سلاو لەتۆ، شایەتی دەدەم تۆ و باوکت ڕێنیشاندەری منن.

دەڵێت: شمشێری دەرکێشا و ڕوویکردە دوژمنان لەکاتێکدا نێوچاوانی بریندار بوو.

ڕەبیع کوڕی تەمیمی هەمەدانی دەڵێت: کاتێك بینیم، ناسیمەوە چوونکە لەچەندین جەنگی دیکە بینیبووم ولەهەمووان بوێرتر بوو، وتم: ئەم پیاوە شێری شێرانە، ئەمە کوڕی باوکی شەبیبە، کەس بۆ جەنگی ئەو نەڕوات.

دەڵێت: ئەو بەدەنگی بەرز هاواری دەکرد، کەس نییە بۆ جەنگی من بێت.

دەڵێت: عومەر کوڕی سەعد فەرمانیدا بەردبارانی بکەن.

دەڵێت: بەردبارانیان کرد، کاتێك ئەمەی بینی، زرێ و قەڵغانەکەی فڕێدا و هێرشیکردە سەریان. سوێند بەخوا بینیم شوێن سوپاکەی عومەر کوڕی سەعد دەکەوت. دواتر لەهەر چوارلاوە هێرشیان کردەسەر و خوێنیان ڕشت.

دەڵێت: بینیم سەری بەدەستی چەند کەسێکەوە بوو. یەکیان دەیوت: من کوشتم. ئەوی دیکە دەیوت: من کوشتم. ڕۆشتنە لای عومەر کوڕی سەعد، پێی وتن: دەنگەدەنگ مەکەن، ئەمە بەدەستی کەسێك نەکوژراوە. بەمشێوەیە ئەوانی لێك جیاکردەوە.

زوحاك کوڕی عەبدوڵڵەی مەشرقی دەڵێت: کاتێك بینیم هاوەڵانی حسەین کوژران و تەنیا خۆی و بنەماڵەکەی ماونەتەوە و جگە لەسوەید کوڕی عەمرۆ خەسعەمی و بەشیر کوڕی عەمرۆ حەزرەمی کەس نەماوەتەوە، وتم: ئەی کوڕی پێغەمبەر (د.خ)، دەزانی بەڵێنی نێوان من و تۆ چ بوو، وتم تا ئەو کاتەی جەنگاوەرێك مابێت، بۆ پشتیوانیکردنی تۆ دەجەنگم و کاتێك کەس نەما، مۆڵەتی ڕۆشتنم دەوێت و وتت باش.

وتی: ڕاست دەکەیت. بەڵام چۆن دەتوانی بڕۆیت؟ ئەگەر دەتوانی، مۆڵەتت هەیە.

دەڵێت: بەرەو لای ئەسپەکەم ڕۆشتم، کاتێک بینیم سەرقاڵی کوشتنی ئەسپەکانی ئێمەن، ئەسپەکەی خۆم دوورخستەوە و لەناو خێوەتی یەکێک لەهاوەڵانم دامشارد. گەڕامەوە و وەك کەسێکی پیادە دەجەنگام و لەبەردەم حسەین کوڕی عەلی دوو کەسم کوشت و دەستی کەسێکی دیکەم پەڕاند. حسەین چەندینجار پێی وتم: دەستت خۆشبێت، خوا دەستت نەبڕێت، خوا لەلایەن بنەماڵەی پێغەمبەرەوە پاداشتت بداتەوە.

دەڵێت: کاتێك مۆڵەتیدا، ئەسپەکەم لەخێوەتەکەم هێنایەدەر و سواری بووم. دواتر بەغاردان ڕوومکردە ناو سوپاکەی عومەر کوڕی سەعد تا ڕێگەیان بۆ کردمەوە. پانزە کەس لەوان بەپیادە شوێنپێیان هەڵگرتن تا گەشتینە گوندێك لەنزیك کەنارەکانی فورات. کاتێك نزیکبوونەوە، هێرشمکردە سەریان. کەسیر کوڕی عەبدوڵڵەی شەعبی و ئەیووب کوڕی موشرحی حەیوانی و قەیس کوڕی عەبدوڵڵەی سادی منیان ناسییەوە و وتیان: ئەمە زوحاك کوڕی عەبدوڵڵەی مەشرقییە. ئەمە کوڕە مامی ئێمەیە، سوێندتان دەدەین دەستی لێهەڵگرن.

دەڵێت: سێ کەس لەمناڵەکانی تەمیم (لەگەڵ ئەواندا بوون) وتیان: بەڵێ، سوێند بەخوا ڕازی دەبین و دەست لەهاوکارییان هەڵدەگرین.

کاتێك تەمیمییەکان وەك هاوڕێکانم پشتیوانییان لێکردم، کەسانی دیکەیش دەستیان هەڵگرت و بەمشێوەیە ڕزگارم بوو.

فوزەیل کوڕی خودەیجی کێندی دەڵێت: باوکی شەعشای کێندی لەتیرەی مناڵەکانی بەهدەلە، لەبەردەم حسەین کەوتە سەرچۆك و سەد تیری هاویشت. تەنیا پێنج تیریان کەوتە سەرزەوی، تیرهاوێژێکی بەتوانا و کارامە بوو. کاتێك تیرێکی دەهاویشت، دەیوت: من کوڕی بەهدەلە، شاسواری عەرجەلە.

دەڵێت: حسەین دەیوت: هیوادارم تیرەکانت بەهەڵە نەڕوات و جێگەت بەهەشت بێت.

دەڵێت: کاتێك سەد تیری هاویشت، هەستا و وتی: تەنیا پێنج تیر کەوتە

سەرزەوی و بۆم دەرکەوت کەپێنج کەسم کوشتووە.

دەڵێت: ئەو لەیەکەم هاوەڵانی حسەین بوو کوژرا.

دەڵێت: ئەو ڕۆژە هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

(( منم یەزید کەباوکم موهاجیر بوو

بوێرتر لەشێری دارستان

خواوەندا، من هاوەڵانی حسەینم

و لەکوڕی سەعد خۆم بەدوور گرتووە)).

دەڵێت: باوکی شەعسا لەو کەسانە بوو لەگەڵ عومەر کوڕی سەعد بۆ جەنگی حسەین هاتبوو و کاتێک بەمەرجەکانی حسەین ڕازی نەبوون، چووە ڕیزی سوپاکەی و جەنگا تا ئەو کاتەی کوژرا.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی خالیدی سەیداوی و جابر کوڕی حارسی سەلمانی و سەعد کۆیلەی عومەر کوڕی خالید و مەجمەع کوڕی عەبدوللەی عایزی لەسەرەتای جەنگ، ئاگری جەنگیان خۆشکرد و شمشێر بەدەست هێرشیان بردە سەر سوپاکەی عومەر کوڕی سەعد. کاتێک دەوریان گرتن لەهاوەڵانیان جیابوونەوە. عەباس کوڕی عەلی هێرشیبرد و ئەوانی لەگێژاوە ڕزگار کرد. بریندار گەڕانەوە و جارێکی دیکە دوژمن لێیان نزیک بوویەوە وئەوان، شمشێر بەدەست بەرگرییان کرد. لەهەمان سەرەتای جەنگ، بەڕادەیەک بڵێسەی ئاگری جەنگیان خۆشکرد کەهەمووان پێکەوە کوژران.

زوهەیر کوڕی عەبدولڕەحمانی خەسعەمی دەڵێت: دوایین کەس لەهاوەڵانی حسەین، سوەید کوڕی عەمرۆ خەسعەمی بوو.

دەڵێت: یەکەم کەس لەمناڵەکانی ئەبوتالیب کە لەو ڕۆژەدا کوژرا، عەلی ئەکبەر کوڕی حسەین بوو کەدایکی لەیلی کچی ئەبوو مورە کوڕی عورەوەی سەقەفی بوو. ئەو هێرشی دەستپێکرد و هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

(( من عەلیم کوڕی حسەین کوڕی عەلی

سوێند بەپەروەدگاری کەعبە ئێمە لە پێغەمبەر (د.خ) نزیکترین

سوێند بەخوا کوڕی بێ باوک فەرمانڕەوایەتی ئێمە ناکات)).

دەڵێت: چەندجارێك ئەم کارەی دووبارە کردەوە. مورە کوڕی مەنقەزی عەبدی بینی و وتی: گەورەترین گوناحەکانی عەرەب لەئەستۆی مندا بێت، ئەگەر لای من تێپەڕێت و ئەو کارە بکات و باوکی پرسەگێڕ نەکەم.؟

دەڵێت: عەلی ئەکبەر جارێکی دیکە گەڕایەوە و شمشێر بەدەست هێرشی دەکردە سەر سوپاکەی عومەر کوڕی سەعد. مورە ڕێگەی لێگرت و گورزێکی لێدا و کەوت. سوپاکەی عومەر کوڕی سەعد، دەوریان گرت و بەشمشێر لەت لەتیان کرد.

حەمید کوڕی موسلیمی ئەزدی دەڵێت: خۆم بیستم حسەین دەیوت: کوڕم، خواوەند ئەو کەسانە بکوژێت کەتۆیان کوشت، لەبەرابەر خودا و شکاندنی ڕێزی پێغەمبەر (د.خ) چەند بوێر بوون، دوای تۆ جیهان مانای نییە.

دەڵێت: دەڵێی هێشتا دەبینم ژنێك بەپەلە هاتەدەر، دەتوت خۆری درەوشاوەیە و دەیقیژاند: ئەی براکەم، هاوار برازاکەم.

دەڵێت: پرسیارم کرد، وتیان: ئەمە زێنەب کچی فاتیمە کچی پێغەمبەرە.

دەڵێت: هات و باوەشی کرد بەجەنازەکەیدا. حسەین هات و دەستی گرت وبۆ خێوەتەکەی گەڕاندەوە. دواتر حسەین بۆ لای منداڵەکەی ڕۆشت. کۆیلەکانیش هاتن، وتی: براکەتان هەڵگرن. ئەویان لەشوێنی کوژرانەکەی هەڵگرت و ڕووبەڕووی ئەو خێوەتەی لەبەردەمیا دەجەنگی، دایاننا.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی سوبەیحی سەدایی تیرێکی بۆ عەبدوڵڵە کوڕی موسلیم کوڕی عەقیل هاویشت و ئەو دەستی خۆی بۆ ناوچاوی برد و نەیتوانی دەستی لا ببات. دواتر تیرێکی دیکەی لێدا و دڵی کونکرد.

دەڵێت: دواتر لەهەر چوارلاوە، گەمارۆیاندان: عەبدوڵڵە کوڕی قوتبەی تایی نەیهانی، هێرشیکردە سەر عەون کوڕی عەبدوڵڵەی تالبی و کوشتی. عامر کوڕی نەهشەلی تیمی هێرشیکردە سەر محەممەد کوڕی عەبدوڵڵەی تالبی و کوشتی.

دەڵێت: عوسمان کوڕی خالید کوڕی ئەسیری جوهەنی و بیشر کوڕی سوتی هەمەدانی قابشی، هێرشیانکردە سەر عەبدوڵڵە کوڕی عەقیل کوڕی ئەبی تالیب و کوشتیان. عەبدوڵڵە کوڕی عوزرەی خەسعەمیش تیرێکی بۆ جەعفەر کوڕی عەقیل

کوڕی ئەبی تالیب هاویشت و کوشتی.

حەمید کوڕی موسلیم دەڵێت: کوڕێك هاتەلای ئێمە، ڕوخساری لەمانگ دەچوو، شمشێرێکی بەدەستەوە بوو، جووتێك پێپۆشی لەپێدابوو کە قەیتانی یەکیان پچڕا بوو. هەرشتێکم لەبیر بچێت ئەمەم لەبیر ناچێت کەقەیتانی پێی چەپی بوو.

دەڵێت: عومەر کوڕی سەعد کوڕی نوفەیلی ئەزدی پێی وتم: سوێند بەخوا هێرشیدەکەمە سەر.

وتم: سبحان الله، لەمکارەدا بەدوای چی دەگەڕێیت؟ کوژرانی کەسەکانی بەسە.

وتی: سوێند بەخوا هێرشیدەکەمە سەر. هێرشیکرد و نەگەڕایەوە تا بەشمشێر لێیدا. کوڕەکە کەوتە سەرزەوی و و وتی: مامەگیان.

دەڵێت: حسەین وەك هەڵۆ هەستا و هاوشێوەی شێرێکی تووڕە بەشمشێر هێرشی کردە سەر عومەر. عومەر دەستی خۆی کردە لەمپەری شمشێرەکە و دەستی قرتا و بەپەلە گەڕایەوە.

دەڵێت: چەند کەسێك لەسوارەکانی کوفە هێرشیان برد و عومەریان لەدەست حسەین ڕزگار کرد. ئەسپەکان ڕوویانکردە عومەر و غاریاندا و بەسەر جەستەی عومەردا ڕۆشتن وپێشێلیان کرد. کاتێك تەپوتۆز نیشتەوە، بینیم حسەین لەسەر سەری کوڕەکە دانیشتووە و کوڕەکە بەقاچی زەوی هەڵدەکۆڵی و حسەین وتی: نفرین لەو خەڵکەی تۆیان کوشت! لەڕۆژی پسلاّن پێغەمبەر (د.خ) دوژمنی ئەوان دەبێت.

وتی: سوێند بەخوا بۆ مامت دژوارە بانگی بکەیت و نەتوانێت وەڵامت بداتەوە یا وەڵامت بداتەوە بەڵام سوودی نەبێت. سوێند بەخوا دوژمنەکانی زۆرن و هاوەڵانی کەم.

دەڵێت: هەڵیگرت، دەمبینی دوو قاچی کوڕەکە لەسەر زەوییە و حسەین کوڕەکەی لەئامێز گرتووە.

دەڵێت: بەخۆم وت: چی لێدەکات؟ ئەوی برد و لەگەڵ عەلی ئەکبەری کوڕی و کوژراوەکانی دیکە لەشوێنێکدا داینان.

دەڵێت: سەبارەت بەکوڕەکە پرسیارم کرد، وتیان: ئەو قاسم کوڕی حەسەن

کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیبە.

دەڵێت: حەسین تا درەنگانێکی ڕۆژ هێشتا زیندوو بوو، هەرکەس بۆ کوشتنی دەڕۆشت، نەیدەویست گوناحی ئەو تاوانە گەورەی لەئەستۆدا بێت و دەگەڕایەوە.

دەڵێت: سەرئەنجام یەکێك لەخەڵکانی کێندە بەناوی مالك کوڕی نەسیر لەخەڵکانی مناڵەکانی بەدا هات و بەشمشێر لەسەریدا. حسەین کڵاوێکی درێژی لەسەردابوو. شمشێر، کڵاوەکەی دڕاند و سەری بریندار کرد. کڵاوەکە لەخوێن پڕ بوو.

حسەین وتی: لەبەر ئەم خوێنە نەدەخۆیتەوە و نەدەخۆیت و خواوەند لەگەڵ ستەمکاران حەشرت دەکات.

دەڵێت: دواتر داوای کڵاوێکی کرد و دەستارەکەی بەست. شەکەت و ماندوو بووبوو.

دەڵێت: پیاوی کێندی هات و کڵاوە دڕاوەکەی هەڵگرت. دواتر کاتێك بردەییە لای ژنەکەی خۆی، دایکی عەبدوڵڵە، کەکچی حوڕ و خوشکی حسەین کوڕی حوڕی بودی بوو، دەیویست کڵاوەکە لەخوێن بشواتەوە، بەڵام ژنەکەی وتی: تالانیی کوڕی کچی پێغەمبەرت هێناوەتە ماڵەکەی من، لەم ماڵە بیبەدەر.

دەڵێن: هاوەڵانی پیاوی ئەزدی دەڵێن، بەردەوام بەهەژاری ژیا تا ژیانی کۆتایی هات.

دەڵێت: کاتێك حسەین دانیشت، عەبدوڵڵە کوڕی حسەینیان هێنا و لەئامێزی گرت.

عوتەبە کوڕی بەشیری ئەسەدی دەڵێت: ئەبو جەعفەر محەممەد کوڕی عەلی کوڕی حسەین پێی وتم: ئەی مناڵەکانی ئەسەد، خوێنێکی ئێمە لای ئێوەیە.

دەڵێت: وتم: ئەی ئەبو جەعفەر، خوات بتبەخشێت، گوناحی من لەم ناوەدا چییە؟ چۆن بوو؟

دەڵێت: مناڵەکەی حسەینیان بردە لای و لەئامێزی گرت و یەکێك لەئێوە، ئەی مناڵەکانی ئەسەد، تیرێکی لێدا و قوڕگی هەڵدڕی، حسەین خوێنەکەی هەڵگرتەوە و کاتێك بەرە دەستی پڕ بوو، ڕشتییە سەرزەوی و وتی: پەروەدگارا، ئەگەر

سەرکەوتنی ئاسمانت لەئێمە وەرگرتۆتەوە، هیوادارم خێری بەدواوە بێت و تۆڵەی ئێمە لەم ستەمکارانە بستێنیتەوە.

دەڵێت: عەبدوللە کوڕی عوقبەی غەنەوی تیرێکی بۆ ئەبوبەکر کوڕی حسەین هاویشت و کوشتی.

کوڕی باوکی عەقەبی شاعیر سەبارەت بەم ڕووداوە هۆنراوەیەکی هەیە بەم ناوەرۆکە:

((دڵۆپێك لەخوێنی ئێمە لای تایەفەی غەنییە

دڵۆپێکیش لای مناڵەکانی ئەسەد)).

دەڵێت: دەڵێن عەباس بەبراکانی خۆی، عەبدوڵڵە و جەعفەر و عوسمانی (لەیەك دایك بوون) وت: ئەی مناڵەکانی دایکم، بڕۆنە پێش، ئێوە مناڵتان نییە. ڕۆشتنە پێش و کوژران. هانی کوڕی سوبەیتی حەزرەمی هێرشی کردە سەر عەبدوڵڵە کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و کوشتی. دواتر هێرشیکردە سەر جەعفەر کوڕی عەلی و ئەویشی کوشت و سەری بڕاوی ئەوی هێنایەوە. خەولی کوڕی یەزیدی ئەسبەحی، تیرێکی بۆ عوسمان کوڕی عەلی هاویشت، دواتر یەکێك لەمناڵەکانی ئەیاد کوڕی دارم هێرشی کردە سەر و خوێنی ڕشت و سەری بڕاوی ئەوی هێنا. یەکێکی دیکە لەمناڵەکانی ئەیاد کوڕی دارم، هێرشی کردە سەر محەممەد کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و کوشتی و سەری بڕاوی ئەوی هێنا.

باوکی هوزەیلی سەکونی دەڵێت: لەڕۆژگاری خالید کوڕی عەبدوڵڵە، هانی کوڕی سوبەیتی حەزرەمیم بینی کە لەناو کۆڕی حەزرەمییەکان دانیشتبوو، پیرەپیاوێکی پەککەوتە بوو، بیستم کەدەیوت: یەکێك بووم لەو کەسانەی لەکاتی کوژرانی حسەین ئامادە بوون.

دەیوت: سوێند بەخوا وەستابووم و یەکێك لەو دە کەسە بووم کەسوار لەسەر ئەسپ بووین. سوارەکان غاریان دەدا و دەڕۆشتنە دوواوە. لەم کاتەدا کوڕێك لەبنەماڵەی حسەین لەخێوەتەکان هاتەدەر و دارێکی بەدەستەوە بوو. بیجامە و کراسێکی لەبەردا بوو، تۆقابوو و سەیری چەپ و ڕاستی دەکرد. دەتوت دوو مرواری بەدوو گوێچکەیەوە دەبینم و لەکاتی ئاوڕدانەوەی بۆ لایەکی دیکە،

دەجوولآنەوە. لەناکاو کەسێك بەغاردان هات و کاتێك نزیکبوویەوە، لەئەسپەکەی دابەزی و کوڕەکەی دانیشاند و ئەوی بەشمشێر هەڵدری.

سەکونی دەڵێت: بکوژی کوڕەکە هەمان هانی کوڕی سوبەیت بوو و لەبەر ئەوەی سەرکۆنەیان کردبوو، بەتانەوە سەبارەت بەخۆی قسەی دەکرد.

جابری جوعەفی دەڵێت: حسەین تینوو بوو، کاتێك تینوویەتی تەنگی پێهەڵچنی، نزیکبوویەوە تا ئاو بخوات. حەسین کوڕی تەمیم تیرێکی بۆ هاویشت و بەردەمی کەوت. خوێن لەدەمی دەچۆڕا. دواتر ناوی خواوەندی هێنایە سەرزمان و سپاسی کرد. دوو دەستی خۆی بەرز کردەوە و وتی: خواوەندا ژمارەیان کەم بکە و گیانیان بستێنە و یەك کەسیان لەسەر زەوی مەهێڵە.

قاسم کوڕی ئەسبەغ کوڕی نەباتە لەزمانی یەکێك لەو کەسانەی لەکاتی کوژرانی حسەین ئامادەبووە، دەڵێت: کاتێك ئوردووگاکەی حسەین دەستی بەسەردا گیرا، دەیویست بەرەو فورات بڕوات.

دەڵێت: یەکێك لەمناڵەکانی ئەبان کوڕی دارم وتی: هاوار لەئێوە، لەنێوان ئەو و ئاوەکە ببنە لەمپەر تا شیعەکان پێی نەگەنەوە.

دەڵێت: ئەسپەکەی غاردا و کەسانی دیکە شوێنیکەوتن تا ئەوەی لەنێوان حسەین و فورات جێگیر بوون. حسەین وتی: خواوەندا، با هەمیشە تینوو بن.

دەڵێت: پیاوی ئەبانی، تیرێکی هاویشت و لەچەنەی حسەین چەقی.

دەڵێت: حسەین تیرەکەی دەرهێنا و دوو دەستی کردەوە و پڕ بوو لەخوێن، ئەوسا وتی: خواوەندا، لەو بەڵایەی بەسەر کوڕی پێغەمبەرەکەت دەیهێنن، پەنا بۆ تۆ دەبەم.

دەڵێت: سوێند بەخوا زۆری نەخایاند، ئەو پیاوە لەتاو تینوویەتی تەنگی پێهەڵچنرا بەشێوەیەك هەرگیز تێراو نەدەبوو.

قاسم کوڕی ئەسبەغ دەڵێت: یەکێك بووم لەوکەسانەی بۆ دڵنەوایی کردنی ئەو هەوڵم دەدا. ئاویان بۆ فێنك دەکردەوە و شەکری تیا بوو. کاسە گەورەکان پڕ شیر و گۆزەکان پڕ ئاو، دەیوت: هاوار لەئێوە، ئاوم پێبدەن، خەریکە لەتینووواندا دەمرم. گۆزە یا کاسەیەکیان پێدەدا کە بۆ تێراو کردنی هەموو ئەندامانی

خێزانەکە بەس بوو، ئاوەکەی دەخواردەوە، کاتێک کاسەکەی لەدەمی دوور دەکردەوە، زۆری نەدەخایاند، ڕادەکشا و دەیوت: هاوار لەئێوە، ئاوم بۆ بێنن.

دەڵێت: زۆری نەخایاند سکی وەك سکی وشتر ئاوسا.

باوکی موخەنەف دەڵێت: شیمر کوڕی زی ئەلجەوشەن لەگەڵ دە کەس لەپیادەکانی سوپای کوفە، بەرەو مەنزڵگەی حسەین ڕۆشت کەکەرەستەکان و ماڵ و منداڵەکەی لەوێ بوو. حسەین بەرەو لای مەنزڵەکەی ڕۆشت بەڵام ڕێگەیان لێگرت.

دەڵێت: حسەین وتی: ئەگەر دینتان نییە و لەڕۆژی کۆتایی ناترسن، هاوشێوەی جوامێرەکان بن، ماڵ و منداڵی من لەدەستی نەزان و تاڵانچییەکان بپارێزن.

شیمر کوڕی زی ئەلجەوشەن وتی: ئەی کوڕی فاتیمە، ئەوە لەئەستۆی تۆدایە.

دەڵێت: شیمر لەگەڵ پیادەکان کەباوکی ئەلجنوب عەبدولڕەحمان و قەسعەم کوڕی عەمرۆ کوڕی یەزید (هەردووکیان جوعەفی) و سالح کوڕی وەهب یەزنی وسەنان کوڕی ئەنسی نەخەعی و خەولی کوڕی یەزیدی ئەسبەحی لەناویاندا دەبینران، ڕوویکردە حسەین و هانی سوپاکەی دەدا. لای باوکی جنوب تێپەڕی و پێی وت: بڕۆ بیکوژە.

وتی: بۆ خۆت ئەو کارە ناکەیت.

شیمر وتی: بەمشێوەیە وەڵامم دەدەیتەوە؟

وتی: بەوشێوەیە قسەم لەگەڵ دەکەیت؟

دەڵێت: یەکتریان جوێنباران کرد. باوکی جنوب کەپیاوێکی بوێر و ئازا بوو، پێی وت: سوێند بەخوا دەمەوێت ڕمەکەم لەچاوی تۆ بچەقێنم.

دەڵێت: شیمر ڕۆشت و وتی: سوێند بەخوا ئەگەر بتوانم، زیانت لێدەدەم.

دەڵێت: شیمر لەگەڵ پیادەکانی سوپا لەحسەین نزیك بوویەوە. حسەین هێرشیکردە سەریان و پاشەکشێی پێکردن. سەرئەنجام گەمارۆیان خستەسەر. کوڕێك لەبنەماڵەی حسەین هاتەلای. زێنەبی خوشکی هاتەپێش بۆ ئەوەی دووری بخاتەوە. حسەین وتی: دووریبخەرەوە. بەڵام کوڕەکە ڕازی نەبوو و بەڕاکردن هات

بۆ لای حسەین و لەتەنیشتی وەستا.

دەڵێت: بەحر کوڕی کەعب لەمناڵەکانی تیم الله، شمشێرەکەی بۆ حسەین بەرز کردەوە، کوڕ وتی: ئەی کوڕی ژنی خراپەکار، مامی من دەکوژیت؟ بەحر بەشمشێر لێیدا. کوڕ دەستی خستە بەر شمشێرەکە و دەستی قرتا و تەنیا پێستەکەی مایەوە.

دەڵێت: کوڕەکە هاواریکرد: ئەی ئۆمەتەکەی من. حسەین ئەوی لەئامێز گرت و وتی: برازاکەم، بۆ ئەم کارەساتە خۆڕاگر بە چوونکە بەهۆیەوە خوا دەتباتەوە بۆ لای پێغەمبەر (د.خ) و عەلی کوڕی ئەبی تالیب و حەمزە و جەعفەر.

حەمید کوڕی موسلیم دەڵێت: ئەو ڕۆژە بیستم حسەین دەیوت: خواوەندا، دڵۆپەکانی ئاسمان لەوان دریغ بکە و لەبەرەکەتەکانی زەوی بێبەشیان بکە. ئەگەر تا ماوەیەك بەهرەمەندیان دەکەیت، دواتر دووبەرەکی و چەند بەرەکی لەناویاندا دروست بکە بەجۆرێك هەرگیز فەرمانڕەواکانیان دڵشاد نەبن چوونکە بانگێشتی ئێمەیان کرد تا هاوکاریمان بکەن بەڵام هێرشیان کردینەسەر و خوێنیان ڕشتین.

دەڵێت: هێرشیکردە سەر پیادەکان و پاشەکشێی پێکردن.

دەڵێت: کاتێك حسەین لەگەڵ سێ چوار کەس مایەوە. داوای جلێکی زبریکرد، جلەکەی دڕاند بۆ ئەوەی دوای کوشتن لەبەری دانەکەنن. یەکێك لەهاوەڵانی وتی: باشترە جلێکی کورتی زبر لەژێرەوە بپۆشیت. وتی: ئەوە جلوبەرگی ڕیسواییە و پۆشینی ئەوە شیاوی من نییە.

دەڵێت: کاتێك کوژرا، بەحر کوڕی کەعب هات و جلەکانی لەبەر داکەند و بەڕووتی بەجێیهێشت.

محەممەد کوڕی عەبدولڕەحمان دەڵێت: لەزستاندا دەستی بەحر کوڕی کەعب ئاوی[8] لێدەچۆڕا و لەهاویندا وەك تەختە وشك دەبوو.

حەجاج کوڕی عەبدوڵڵە کوڕی عەمار دەڵێت: چوونکە لەکاتی کوژرانی حسەین ئامادەبوو، سەرکۆنەی عەبدوڵڵە کوڕی عەماریان دەکرد. وتی: منەتێکی گەورەم لەسەر مناڵەکانی هاشم هەیە.

---

[8] لەوانەیە مەبەستی لەئاو عارەق بێت. هەرچەند ئەمە زیاتر لەئەفسانە دەچێت تاکوو ڕاستی. (وەرگێڕ)

وتیان: چییە؟

وتی: ڕم بەدەست هێرشمکردە سەر حسەین و لێی نزیك بوویمەوە. سوێند بەخوا ئەگەر دەمویست ڕمەکە لەجەستەی دەچەقاند بەلاَم گەڕامەوە. بەخۆم وت بۆ من بیکوژم، کەسێکی دیکە دەیکوژێت.

دەڵێت: پیادەکان لەڕاست و چەپەوە هێرشیانکردە سەر. حسەین هێرشیکردە سەر لای ڕاستا و بلاَوەی پێکردن. دواتر هێرشیکردە سەر لای چەپ و بلاَوەی بەوانیشکرد. دەستارێکی بەسەرەوە بوو.

دەڵێت: سوێند بەخوا هەرگیز کەسێکی تێکشکاوم نەبینیوە کەمناڵ و بنەماڵە و هاورێکانی کوژرابێتن و هاوشێوەی ئەو ئارام و بەهێز و بوێر بێت. سوێند بەخوا هەرگیز کەسی وەك ئەوم نەبینیوە. کاتێك هێرشی دەبرد، پیادەکان وەك مەڕ لەترسی گورگ، هەڵدەهاتن.

دەڵێت: لەم حاڵەدا بوو کەزێنەبی کچی فاتیمە هاتە لای، دەڵێی هێشتا گوارەکانی دەبینم کەدەلەرانەوە، دەیوت: خۆزگە ئاسمان بەر زەوی دەکەوت.

لەم کاتەدا عومەر کوڕی سەعد لەحسەین نزیکبوویەوە.

زێنەب پێی وت: ئەی عومەر کوڕی سەعد! باوکی عەبدوڵڵە دەکوژن و تۆ سەیریان دەکەیت؟

دەڵێت: بینیم فرمێسك لەچاوی عومەر کوڕی سەعد دەهاتەخوار.

دەڵێت: پشتیکردە زێنەب.

دەڵێت: پێش ئەوەی بکوژرێت، بیستم کەدەیوت – لەو کاتەدا پیادە دەجەنگی هاوشێوەی سوارێکی بوێر، لەتیر خۆی دەپاراست، بەشوێن هێرشبەراندا دەگەڕا، پەلاماری سوارەکانی دەدا–: سوێند بەخوا دوای کوشتنی من کەس لەبەندەکانی خواوەند ناکوژن کە بەئەندازەی من ببێتە هۆی توڕەبوونی خواوەند. سوێند بەخوا ئەگەر من بکوژن، خوا دوژمنایەتی لەناو ئێوەدا دەنێتەوە و خوێنی یەکدی دەڕێژن و لەو دنیا، گرفتاری ئازابێکی هەمیشەییتان دەکات.

دەڵێت: ماوەیەکی درێژ لەڕۆژ زیندوو بوو، ئەگەر دەیانویست بیکوژن، زۆر بەئاسانی ئەو کاردیان دەکرد بەلاَم هەرکەس کاری کوشتنی حسەینی بەکەسێکی

دیکە دەسپارد و هەر دەستەیەك دەیویست، دەستەکەی دیکە، گوناحی کوشتنی ئەو بگرێتە ئەستۆ.

دەڵێت: شیمر هاواری کرد، ئەی هاوار، چاوەڕوانی چین، دایکتان لەپرسەتانا دانیشێت، بیکوژن.

دەڵێت: لەهەموو لایێکەوە هێرشیانکردە سەر. گورزێکیان لەبەری دەستی چەپیدا. زەرعە کوڕی شەریکی تەمیمی ئەو کارەی کرد. گورزێکیان لەشانیدا. دواتر بەجێیان هێشت. حسەین لەپێکەوتبوو.

دەڵێت: لەم کاتەدا سەنان کوڕی ئەنسی نەخەعی هێرشیکردەسەر و ڕمەکەی لەجەستەی چەقاند و بەخەولی کوڕی یەزیدی ئەسبەحی وت: سەری بڕە. دەیویست ئەو کارە بکات، بەڵام نەیتوانی و لەرز دایگرت، سەنان کوڕی ئەنس پێی وت: خوا بازووەکانت بشکێنێت و دەستەکانت ببڕێت. دابەزی و سەری بڕی و تەسلیم بەخەولی کوڕی یەزیدی کرد. پێشتر چەندین شمشێری بەرکەوتبوو.

جەعفەر کوڕی محەممەد دەڵێت: کاتێك حسەین کوڕی عەلی کوژرا، سی و سێ ڕم و سی و چوار لێدانی شمشێر بەر جەستەی کەوتبوو.

دەڵێت: لەو کاتەدا هەرکەس لەحسەین نزیکدەبوویەوە، سەنان کوڕی ئەنس هێرشیدەکردە سەر چوونکە دەترسا لەوەی سەری حسەینی لەدەست بچێت. تا ئەو کاتەی سەری بڕی و تەسلیم بەخەولی کوڕی یەزیدی کرد. دەڵێت: جلەکانی حسەینیان داکەند. بەحر کوڕی کەعب جلەکانی ژێرەوەی هەڵگرت. قەیس کوڕی ئەشعەس عاباکەی هەڵگرت. یەکێك لەمناڵەکانی ئەود بەناوی ئەسوەد، پێپۆشەکانی هەڵگرتەوە. یەکێك لەمناڵەکانی نەهشەل شمشێرەکەی هەڵگرتەوە و دواتر بەدەستی کەسەکانی حەبیب کوڕی بودەیل گەیشت.

دەڵێت: پیادە و سوار پەلاماری باروبنەی حسەینیاندا و تالانیان کرد.

دەڵێت:سوپاییەکان پەلاماری کەرەستە و ژنەکانی بنەماڵەی حسەینیاندا و ژنان لەسەر جلوبەرگەکانیان ڕووبەڕووی پیاوان دەبوونەوە.

زوهەیر کوڕی عەبدولڕەحمانی خەسعەمی دەڵێت: سوەید کوڕی عەمرۆ کوڕی ئەبی ئەلموتاع لەپێکەوتبوو و بێ هێز و ناتەوان لەناو کوژراوەکاندا کەوتبوو.

کاتێك بیستی کەدەیانوت: حسەین کوژرا، گیانیگرت، کێردێکی بەدەستەوە بوو، پێشتر شمشێرەکەیان لێسەندبوو. کێرد بەدەست ماوەیەك لەگەڵ ئەوان جەنگا و دواتر کوژرا. عوروە کوڕی بەتاری تەغلەبی و زەید کوڕی ڕەقادی تەجیبی ئەویان کوشت. ئەو دوواهەمین کوژراوی سوپاکەی حسەین بوو.

حەمید کوڕی موسلم دەڵێت: گەشتمە لای عەلی ئەسغەر کوڕی حسەین کوڕی عەلی کە لەبەر نەخۆشی لەسەر جێگە کەوتبوو. شیمر کوڕی زی ئەلجەوشەن و پیادەکانم بینی کەدەیانوت: بۆ ئەمە نەکوژین؟

دەڵێت: وتم: سبحان الله، منالەکانیش بکوژین؟ ئەمە منالە.

دەڵێت: هەرکەس بەمەبەستی کوشتنی ئەو دەهات، دوورم دەخستەوە تا عومەر کوڕی سەعد هات و وتی: کەس نەڕواتە ناو خێوەتی ژنان و کەس دەست بۆ ئەو کوڕە نەخۆشە نەبات. هەرکەس شتێکی لەوان وەرگرتووە، بیگەڕێنێتەوە.

دەڵێت: سوێند بەخوا کەس هیچی نەگەڕاندەوە.

دەڵێت: عەلی کوڕی حسەین وتی: خواوەند پاداشتی چاکەت بداتەوە، بەهۆی وتەکانی تۆ، خواوەند بەلای لەمن دوورخستەوە.

دەڵێت: خەڵکان بەسەنان کوڕی ئەنسیان وت: حسەین کوڕی عەلی و کوڕی فاتیمەی کچی پێغەمبەرت کوشت، باشترین پیاوی عەرەبت کوشت، کەهاتبوو دەسەلاّت لەبنەماڵەی ئومەییە وەربگرێتەوە، بڕۆ لای فەرمانڕەواکانی خۆت و داوای خەلاّت و پاداشتی خۆت بکە چوونکە ئەگەر لەبری کوشتنی حسەین، تەواوی سامانی بەیت ئەلماڵت پێبدەن، کەمە.

دەڵێت: ئەو سوار لەسەر ئەسپەکەی خۆی هات، پیاوێکی بوێر و شاعیر بوو. لەبەردەم خێوەتەکەی عومەر کوڕی سەعد وەستا و بەدەنگی بەرز هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( زینەکەم لەزێڕ و زیو قورس بکە
چوونکە شای پەردەدارم کوشت
کەسێکم کوشت کەباوك و دایکی
لەهەمووان باشترە

و کاتێك کەسان نەژادی خۆیان بڵێن

نەژادی ئەو لەهەمووان باڵاترە))

عومەر کوڕی سەعد وتی: شایەتی دەدەم کەشێتیت و هیچکات تەندروست نەبوویت. بیهێننە لای من. کاتێك بردیانە لای عومەر، بەدار لێیدا و وتی: ئەی دێوانە! بۆ بەمشێوەیە قسە دەکەیت؟ سوێند بەخوا ئەگەر کوڕی زیاد بیبیستێت دەتکوژێت.

دەڵێت: عومەر کوڕی سەعد، عوقبە کوڕی سەمعانی گرت کەکۆیلەی ڕەباب، کچی ئەمرۆ ئەلقەیسی کەلبی، دایکی سەکینە کچی حسەین بوو، پێی وت: کێیت؟

وتی: بەندەیەکی خوا.

دەڵێت: ئەوی ئازاد کرد و کەس جگە لەو، ڕزگاری نەبوو مەگەر مورقەع کوڕی سەمامەی ئەسەدی کەتیرەکانی هاویشتبوو و کەوتبووە سەر چۆك و دەجەنگی. کەسانێك لەخەڵکەکەی هاتن و وتیان: ئەمانت هەیە، لەگەڵمان وەرە. لەگەڵ ئەوان ڕۆشت و کاتێك عومەر کوڕی سەعد ئەوانی بردە لای کوڕی زیاد و بەسەرهاتی ئەوی گێڕایەوە، کوڕی زیاد ئەوی بۆ کوڕی زارە دوورخستەوە.

دەڵێت: عومەر کوڕی سەعد لەناو هاوەڵانی خۆی جاڕیدا: کێ دەخوازێت سوار لەسەر ئەسپ هێرش بکاتە سەر جەنازەی حسەین؟ دە کەس ئامادەیی خۆیان نیشاندا. ئیسحاق کوڕی حەیوەی حەزرەمی – ئەو کەسەی ڕوپۆشەکەی حسەینی فڕاند و دواتر گرفتاری نەخۆشی گولی بوو– و ئەخنەس کوڕی مەرسەد هاتن و بەئەسپەکانی خۆیان، جەنازەی حسەینیان پێشێلکرد و هەموو ئێسکی پشت و سکیان شکاند.

دەڵێت: بیستم کەماوەیەك دوای ئەوە، ئەخنەس کوڕی مەرسەد لەجەنگدا، تیرێکی وێڵی بەرکەوت و گیانیدا.

دەڵێت: حەفتا و دووکەس لەهاوەڵانی حسەین کوژرا. خەڵکانی غازرییە، لەهۆزی منالەکانی ئەسەد، ڕۆژێك دواتر جەنازەی حسەین و هاوەڵانی ئەویان بەخاك سپارد.

لەهاوەڵانی عومەر کوڕی سەعد، هەشتا و هەشت کەس کوژرابوون جگە

لەوانەی بریندار بووبوون. عومەر کوڕی سەعد لەسەر جەنازەی کوژراوەکان نوێژی خوێند و دواتر ئەوانیان بەخاك سپارد.

دەڵێت: کاتێك حسەین کوژرا، هەمانڕۆژ سەری ئەویان بەخەولی کوڕی یەزید و حەمید کوڕی موسلیمی ئەزدی بۆ لای کوڕی زیاد ڕەوانە کرد. خەولی لەگەڵ سەری حسەین هات و ویستی بڕواتە ناو کۆشك بەلاّم دەرگای کۆشك داخرابوو. گەڕایەوە بۆ ماڵ و سەری حسەینی خستە ناو تەشتێك. ئەو دوو ژنی بوو، یەکیان لەمناڵەکانی ئەسەد و ئەوی دیکەیان لەحەزرەمییەکان بەناوی نەوار کچی مالیك کوڕی عەقرەب. ئەو شەوە، شەوی ژنی حەزرەمی بوو.

هوشام دەڵێت: باوکم لەنەوار کچی مالیك دەگێڕێتەوە: خەولی سەری حسەینی هێنایەوە و خستییە ناو تەشتێك. دواتر هاتەژوور و ڕۆشتە سەر جێگەکەی، پرسیم: دەنگ و باس چییە؟ چیت هێناوە؟

وتی: بێ نیازی ڕۆژگارانم بۆ هێناویت، سەری حسەین کوڕی عەلی لەماڵەکەی تۆدایە.

دەڵێت: پێم وت: هاوار لەتۆ، سوێند بەخوا هەرگیز لەگەڵ تۆدا لەیەك ژووردا نابم.

دەڵێت: لەجێگەکەم هەستام و بۆ ماڵەوە گەڕامەوە. خەولی ژنە ئەسەدییەکەی بانگکرد و ڕۆشتەلای. من دانیشتبووم و سەیرم دەکرد.

دەڵێت: سوێند بەخوا ڕووناکییەکم بینی کەهاوشێوەی ستوون لەئاسمانەوە دەهات بۆ ناو ماڵەکە درێژ بووبوویەوە و باڵندە سپییەکانم بینی بەدەوریدا هەڵدەفرین.

حەمید کوڕی موسلیم دەڵێت: بۆ بەیانی، سەری حسەینی بۆ لای کوڕی زیاد برد.

دەڵێت: عومەر کوڕی سەعد ئەو ڕۆژە و بەیانی مایەوە، دواتر فەرمانی بەحەمید کوڕی بوکەیری ئەحمەریدا تا جاڕی ڕۆشتن لەناو خەڵکانی کوفە بدات. ئەو، کچەکان و خوشکەکانی حسەین و مناڵەکانی حسەین و عەلی کوڕی حسەینی لەگەڵ خۆیبرد.

قورە کوڕی قەیسی تەمیمی دەڵێت: بینیم ژنەکان کاتێك لای جەنازەی حسەین کوڕی عەلی تێپەڕین، دەگریان و لەڕوخساری خۆیان دەدا.

دەڵێت: سوار لەسەر ئەسپ، لەڕێگەی ئەوانەوە گوزەرم کرد، سوێند بەخوا هەرگیز ژنانی جوان ڕوخسارتر لەوانم نەبینیبوو.

دەڵێت: هەرچی لەبیر بکەم، وتەکانی زێنەب کچی فاتیمە لەبیر ناکەم کاتێك لای برا کوژراوەکەی خۆی تێپەڕی، وتی:

(( ئەی محەممەدم، ئە محەممەدم، فریشتەکانی ئاسمان سڵاوت بۆ دەنێرن، ئەمە حسەینە لەم دەشتەدا کەوتووە، لەخوێنی خۆیدا گەوزاوە و ئەندامەکانیان بڕیوە!

ئەی محەممەدم، کچەکانت ئەسیرن، پاشماوەی بنەماڵەکەت کوژراون و لەو دەشتەدا کەوتوون)).

دەڵێت: سوێند بەخوا دۆست و دوژمنی گریاند.

دەڵێت: سەری کوژراوەکانی دیکەیشیان بڕی و حەفتا و دوو سەریان لەگەڵ شیمر کوڕی زی ئەلجەوشەن و قەیس کوڕی ئەشعەس و عەمرۆ کوڕی حەجاج وعوزرە کوڕی قەیس بۆ لای عوبەیدالله کوڕی زیاد نارد.

حەمید کوڕی موسلیم دەڵێت: عومەر کوڕی سەعد منی بانگ کرد و بۆ لای کەسەکانی خۆی نارد تا مژدەی ئەم سەرکەوتنەیان پێبدەم.

دەڵێت: ڕۆشتم تا گەیشتمە لای کەسەکانی و لەم هەواڵە ئاگادارم کردنەوە. دواتر ڕۆشتم و بینیم کوڕی زیاد لەناو خەڵکان دانیشتووە. نێردراوەکان هاتبوون. مۆڵەتی چوونەژوورەوەیان پێدان، هەروەها مۆڵەتی چوونەژوورەوەیان بەخەڵکدا. منیش لەگەڵ خەڵکان ڕۆشتمە ژوور. بینیم سەری حسەین لەبەردەم ئەو دانراوە و بەداردەستەکەی لەددانەکانی پێشەوەی دەدات. کاتێك زەید کوڕی ئەرقەم بینی، دەست لەم کارەی هەڵناگرێت، وتی: ئەو دارە لەناو ددانەکانی هەڵبگرە، سوێند بەو خوایەی جگە لەو خوایەك نییە، دوو لێوی پێغەمبەرم (د.خ) بینیوە کەماچی ئەو دوو لێوەی دەکرد.

دەڵێت: ئەو پیرەپیاوە دەستی بەگریان کرد.

کوڕی زیاد وتی: خوا چاو بەفرمێسکت بکات، سوێند بەخوا ئەگەر پیرێکی خڵەفاو نەدەبوویت، دەمکوشتی.

دەڵێت: زەید هەستا و ڕۆشتەدەر. منیش ڕۆشتمەدەر. بیستم خەڵك دەیانوت: سوێند بەخوا زەید وتەیەکی هێنایە سەرزمان ئەگەر کوڕی زیاد دەیبیست، دەیکوشت.

وتم: چی وت؟

وتیان: لای ئێمە تێپەڕی و دەیوت: کۆیلەیەك، کۆیلەیەکی بەپاشایەتی گەیاند، ئەی عەرەبەکان چیتر ئێوە کۆیلەن. کوڕی فاتیمەتان کوشت و فەرمانڕەواییتان بەکوڕی مەرجانە بەخشی تا چاکەکانتان بکوژێت و خراپەکانتان بکاتە کۆیلە. بەڕیسوایی ڕازی بوون. نفرین لەو کەسەی بەم ڕیسواییە ڕازی دەبێت.

دەڵێت: کاتێك سەری حسەین و منداڵ و خوشك و ژنەکانی ئەویان بردە لای عوبەیداللە کوڕی زیاد، زێنەب، خراپترین جلوبەرگی خۆی لەبەر کردبوو، کەس نەیدەناسییەوە. کەنیزەکانی لەدەوریبوون و کاتێك هات، دانیشت.

دەڵێت: عوبەیداللە کوڕی زیاد وتی: ئەو ژنەی دانیشتووە، کێیە؟

بەڵام ئەو هیچی نەوت و عوبەیداللە ، سێ جار پرسیارەکەی دووبارە کردەوە و زێنەب بێدەنگ بوو. سەرئەنجام یەکێك لەکەنیزەکانی وتی: ئەمە زێنەب کچی فاتیمەیە.

دەڵێت: عوبەیداللە پێی وت: سپاس بۆ خواوەند کەڕیسوایی کردن و بەکوشتنیدان و داستانەکەی ئێوەی بەدرۆ خستەوە.

زێنەب وتی: سپاس بۆ خواوەند کە بەپێچەوانەی وتەکانی تۆ، بە پێغەمبەر (د.خ) ڕێز و پێگەی بەئێمە بەخشی و پاکی کردینەوە، خراپەکارە ڕیسوا دەبێت و ستەمکارە وتەکانی بەدرۆ دەخەنەوە.

وتی: بینیت خواوەند چ بەڵایەکی بەسەر خۆت و بنەماڵەکەت هێنا.

وتی: پێشتر کوشتنیان بۆ دیاریکرابوو و بۆ ئارامگای خۆیان گەڕانەوە. خواوەند تۆ و ئەوان کۆ دەکاتەوە تا لەپێشگای خواوەند پاساو بۆ کارەکانتان بێننەوە.

دەڵێت: کوڕی زیاد تورە بوو.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی حورەیس پێی وت: خواوەند ئەمیر ببەخشێت، ژنە، مەگەر دەکرێت ژنان بۆ قسەکانیان سەرکۆنە بکەن. لەبەر قسە، ژنان سەرکۆنە ناکەن و بۆ هەڵەکارییەکانیان، تانەیان لێنادەن.

کوڕی زیاد وتی: خواوەند بەکوشتنی ئەوان دڵی منی لەسەرئەنجامی یاخیبوون و یاخییەکان فێنك کردەوە.

دەڵێت: زێنەب گریا و وتی: سوێند بەدینەکەم، پیری بنەماڵەکەی منت کوشت و کەسەکانت لەناو بردم، لقەکەت بڕیمەوە و لەڕەگ و ڕیشە دەرت هێنام، ئەگەر ئەمە دڵی تۆ فێنك دەکاتەوە، هەمیشە بەو شێوەیە بێت.

عوبەیدالڵە وتی: بوێری یانی ئەمە، سوێند بەدینەکەم، باوکت زمان پاراو و بوێر بوو.

وتی: ژن و بوێری؟ من بوێر نیم، دەمەوێت بەو شێوەیە لەقورسایی خەمەکانم کەم بکەمەوە.

موجالید کوڕی سەعید دەڵێت: کاتێك عوبەیدالڵە کوڕی زیاد، سەیری عەلی کوڕی حسەینی کرد، بەپاسەوانێکی وت: بزانە ئەمە، بەوە گەشتووە کەپیاوان پێی دەگەن.

دەڵێت: جلەکانی ئەوی هەڵدایەوە و وتی: بەڵێ.

وتی: بیبەن و بیکوژن.

عەلی کوڕی حسەین پێی وت: ئەگەر لەنێوان تۆ و ئەم ژنانە پەیوەندی خزمایەتی هەیە، کەسێك لەگەڵ ئەواندا بنێرە تا پارێزەریان بێت.

کوڕی زیاد وتی: خۆت و ئەوی لەگەڵ ئەواندا نارد.

گێڕانەوەیەکی دیکە لەحەمید کوڕی موسلیم هەیە کەدەڵێت: لای کوڕی زیاد وەستابووم کەعەلی کوڕی حسەنیان بەبەرچاوی ئەودا برد و پێی وت: ناوت چییە؟

وتی: عەلی کوڕی حسەین.

وتی: مەگەر خواوەند عەلی کوڕی حسەینی نەکوشت.

دەڵێت: بێدەنگ بوو.

کوڕی زیاد وتی: بۆ قسە ناکەیت؟

وتی: برایەکەم بوو بەناوی عەلی و سوپاکەی تۆ ئەویان کوشت.

وتی: خواوەند ئەوی کوشت.

دەڵێت: عەلی بێدەنگ بوو و کوڕی زیاد پێی وت: بۆ قسە ناکەیت.

وتی: خواوەند گیانی کەسەکان لەکاتی مردنیان دەگرێت. کەس بەبێ فەرمانی خواوەند نامرێت.

وتی: تۆ لەو کەسانەیت. سەیری بکەن بزانن باڵق بووە؟ سوێند بەخوا گومان دەکەم ئەو پیاو بێت.

دەڵێت: موری کوڕی مەعاز، جلەکانی هەڵدایەوە و وتی: بەڵێ، باڵق بووە.

وتی: بیکوژە.

عەلی کوڕی حسەین وتی: دوای من ئەم ژنانە بەکێ دەسپێریت؟ زێنەبی پووری باوەشی پیاکرد و وتی: ئەی کوڕی زیاد! دەست لەئێمە هەڵبگرە، مەگەر لەخوێنی ئێمە تێر نەبوویت، مەگەر کەست لەئێمە هێشتۆتەوە.

دەڵێت: باوەشی پیا کرد و وتی: سوێندت دەدەم بەخوا ئەگەر باوەڕت هەیە، ئەگەر ئەو دەکوژیت، منیشی لەگەڵدا بکوژە.

دەڵێت: عەلی وتی ئەی کوڕی زیاد ئەگەر لەنێوان تۆ و ئەم ژنانە پەیوەندی خزمایەتی هەیە، پیاوێکی خۆپارێز لەگەڵ ئەواندا بنێرە تا موسوڵمان ئاسا هاوڕێیەتیان بکات.

دەڵێت: کوڕی زیاد سەیریکرد، دواتر ئاوڕی بۆ کەسانی دەوروبەر دایەوە و وتی: سەرمسوڕماوە لەپەیوەندی خزمایەتی، سوێند بەخوا دەزانم ئەو ژنە حەز دەکات ئەگەر کوڕەکە بکوژم، ئەویشی لەگەڵدا بکوژم، ئازادی بکەن با هاوڕێی ژنانی بنەماڵەکەی بێت.

حەمید کوڕی موسلیم دەڵێت: کاتێك عوبەیدالله هاتە ناو کۆشك و کەسەکان لەدەوری کۆبوونەوە، بانگی نوێژیاندا و خەڵکان لەمزگەوتی گەورە کۆبوونەوە. کوڕی زیاد ڕۆشتە سەر مینبەر و وتی: سپاس بۆ ئەو خوایەی سەرکەوتنی

بەڕاستی و شوێنکەوتەکانی ڕاستی بەخشی و سەروەری باوەڕداران، یەزید کوڕی معاویە و لایەنگرانی ئەوی دڵخۆشکرد و درۆزنی کوڕی درۆزن، حسەین کوڕی عەلی و شیعەکانی ئەوی کوشت.

دەڵێت: هێشتا کوڕی زیاد کۆتایی بەوتەکانی نەهێنابوو کە عەبدوڵڵە کوڕی عەفیفی ئەزدی غامیدی والبی لەشوێنەکەی هەستا. ئەو لەشیعەکانی عەلی بوو. لەجەنگی جەمەل شان بەشانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب جەنگابوو و چاوی چەپی خۆی لەدەستدا بوو، لەجەنگی سەفین شمشێرێك بەر سەری کەوت و چاوەکەی دیکەیشی لەدەستدا. بەردەوام لەمزگەوتی گەورە بوو، تا درەنگانی شەو نوێژی دەخوێند و دواتر بۆ ماڵەکەی دەگەڕایەوە.

دەڵێت: کاتێك عەفیف وتەکانی کوڕی زیادی بیست، وتی: ئەی کوڕی مەرجانە، درۆزنی کوڕی درۆزن تۆیت و باوکت و ئەو کەسەی تۆیکردە فەرمانڕەوا و باوکی. ئەی کوڕی مەرجانە، منداڵی پێغەمبەر (د.خ) دەکوژن و هاوشێوەی ڕاستکرداران دەدوێن؟

کوڕی زیاد وتی: ئەو بێننە لای من.

دەڵێت: پاسەوانەکان هەستان و گرتیان.

دەڵێت: کوڕی عەفیف هاواریکرد و وتی: ئەی مەبرور. (ئەمە دروشمی ئەزدییەکان بوو)

دەڵێت: عەبدولڕەحمان کوڕی میخنەف ئەزدی، دانیشتبوو، وتی: هاوار لەدوژمنت! خۆت بەکوشتندا و خەڵکەکەیشت.

دەڵێت: لەو کاتەدا حەوتسەد جەنگاوەری ئەزدی لەکوفە بوون.

دەڵێت: دەستەیەك لەگەنجانی ئەزد هەستان و گرتیان و گەڕاندییانەوە بۆ لای کەسەکانی. بەڵام عوبەیدالڵە نێردراوانی نارد و ئەویان هێنا و کوشتی و فەرمانیدا لەسوێرەلاّندا هەڵیواسن.

باوکی میخنەف دەڵێت: عوبەیدالڵە کوڕی زیاد سەری حسەینی لەکوفە هەڵواسی و دواتر لەناو بازاڕەکانی کوفە دەیانگەڕاند. دواتر زەحر کوڕی قەیسی بانگکرد و سەری حسەین و هاوەڵانی بۆ یەزید کوڕی معاویە نارد. باوکی بوردە

**کوڕی عەوف و تارق کوڕی باوکی زەبییان، هەردووك ئەزدی، هاوڕێیەتی زەحریان دەکرد و پێکەوە لەشام گەیشتنە لای یەزید.**

**غاز کوڕی رەبیعەی جورەشی دەڵێت: سوێند بەخوا لەدیمەشق لای یەزید کوڕی معاویە بووم کەزەحر کوڕی قەیس هات و ڕۆشتە لای یەزید. یەزید پێی وت: هاوار لەتۆ، دەنگ و باس چی بوو؟ تۆ چ هەواڵێکت هێناوە؟**

**وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، مژدەی سەرکەوتن. حسەین کوڕی عەلی و هەژدە کەس لەبنەماڵەکەی و شەست کەس لەشیعەکانی بۆ جەنگی ئێمەهاتن، ڕووبەڕوویان بووینەوە و داوامان کرد تەسلیم ببن و ملکەچی فەرمانەکانی عوبەیداڵڵە کوڕی زیاد ببن یا بۆ جەنگ خۆیان ئامادە بکەن. ئەوان جەنگیان هەڵبژارد، لەگەڵ هەڵاتنی خۆر هێرشمان کردە سەریان و لەچوارلاوە، دەورمان گرتن. کاتێك شمشێرەکانمان کەوتنەکار، ڕێگەی هەڵاتنیان گرتەبەر و لەدەستی ئێمە، ڕێگەی تەپۆڵکە و چاڵەکانیان گرتەبەر، وەك چۆن کۆتر لەبازی شکاری هەڵدێت، سوێند بەخوا ئەی سەروەری باوەڕداران، زیاتر لەکوشتنی وشترێك درێژەی نەکێشا کەهەموویان کوژران، ئێستا جەستەی ڕووتی ئەوان و جلوبەرگە خوێناویی و ڕوخساریان لەسەر خاکە وتیشکی خۆر لێیان دەدات وبا بەسەریاندا هەڵدەکات، داڵەکان سەردانیان دەکەن.**

**دەڵێت: فرمێسك لەچاوی یەزیددا قەتیس بوو، وتی: بێ کوشتنی حسەین، لەملکەچی ئێوە ڕازی دەبووم، نفرینی خواوەند لەکوڕی سومەییە بێت. سوێند بەخوا ئەگەر خۆم دەبووم، دەمبەخشی، خوا حسەین کوڕی عەلی ببەخشێت.**

**دەڵێت: هیچی بەزەحر نەدا.**

**دەڵێت: عوبەیداڵڵە فەرمانیدا ژنان و منداڵەکانی حسەین ئامادە بکەین و وتی تەوقێکی ئاسنی لەملی عەلی کوڕی حسەین بکەن. ئەوانی لەگەڵ مەحفەز کوڕی سەعلەبەی عایزی و شیمر کوڕی زی ئەلجەوشەن ڕەوانەی بارەگای یەزید کرد.**

**دەڵێت: عەلی کوڕی حسەین لەڕێگەدا قسەی لەگەڵ کەس نەکرد و کاتێك گەیشتنە بارەگای یەزید، مەحفەز کوڕی سەعلەبە هاواری کرد: مەحفەز کوڕی سەعلەبە خراپەکاران و ڕیسواکانی بۆ بارەگای سەروەری باوەڕداران هێناوە.**

دەڵێت: یەزید وەڵامی دایەوە: مەولود دایکی مەحفەز لەهەموان خراپەکارتر و ڕیسواترە.

قاسم کوڕی عەبدولڕەحمان، کۆیلەی یەزید کوڕی معاویە دەڵێت: کاتێک سەرەکانیان – سەری حسەین و ئەندامانی بنەماڵەکەی و هاوەڵانی– لەبەردەم یەزید دانا، هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( ئەو سەرانەیان لەجەستە کردەوە کەلای ئێمە ئازیز بوو

و خۆیان ناسپاستر بوون و ستەمکارتر)).

وتی: سوێند بەخوا حسەین ئەگەر ژیانی تۆ لەدەستی مندا دەبوو، نەمدەکوشتیت.

باوکی عەمارەی عەبەسی دەڵێت: یەحیا کوڕی حەکەم برای مەروان کوڕی حەکەم هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( خزمی کوژراوی دەشتی تەف

لەکوڕی خراپەکاری سومەییە نزیکتر بوو

وەچەی سومەییە لەئەندازەی ڕیخی ڕیخەڵان زیادیکرد

بەڵام وەچەی پێغەمبەر (د.خ) نەمایەوە)).

دەڵێت: یەزید کێشای بەسینەی یەحیا کوڕی حەکەم و وتی: بێدەنگ بە.

دەڵێت: کاتێک یەزید کوڕی معاویە دانیشت، گەورەکانی شامی کۆکردەوە و ئەوانی لەدەوری خۆی دانیشاند، دواتر فەرمانیدا عەلی کوڕی حسەین و بنەماڵەکەی بێنن کە چاو بەگریان هاتنە ژوور.

دەڵێت: یەزید بەعەلی وت: ئەی عەلی، سوێند بەخوا باوکت ڕێزی لەپەیوەندی خزمایەتی من نەگرت، لەسەر دەسەلات ڕووبەڕووی من بوویەوە و خواوەند ئەو بەلای بەسەردا هێنا کەبینیت.

عەلی ئەم ئایەی خوێندەوە:

(( ما اصاب من مصیبة فی الارض و لا فی انفسکم الا فی کتاب من قبل ان نبرأها

واتاکەی: هیچ بەڵایەك بەزەوی یا دانیشتووانی ئێوە ناگات مەگەر پێش ئەوەی

**بیئافرێنین لەنامەیەکدا))**

**یەزید بەخالیدی کوڕی وت: وەڵامی بدەرەوە.**

**دەڵێت: بەڵام خالید نەیزانی چ وەڵامێکی بداتەوە و یەزید ئەم ئایەی خوێندەوە:**

**(( قل ما اصابکم من مصیبة فیما کسبت ایدیکم و یعفوا عن کثیر**

**واتاکەی: هەر بەڵایەك بەسەر ئێوەدا بێت، بۆ ئەو کارانەیە کەدەستەکانتان ئەنجامیانداوە و ژمارەیەکی زۆریش دەبەخشێت))**

**دواتر بێدەنگ بوو.**

**دەڵێت: دواتر فەرمانیدا و ژن و منداڵەکانیان لەبەردەم ئەو دانیشاند و کاتێك بارودۆخی پەرێشانی ئەوانی بینی، وتی: خوا کوڕی مەرجانە ڕووڕەش بکات، ئەگەر لەنێوان ئێوە و ئەودا پەیوەندی خزمایەتی نزیك دەبوو، ئەو بەڵایەی بەسەردا نەدەهێنان و بەم بارودۆخە ئێوەی ڕەوانەی بارەگای ئێمە نەدەکرد.**

**فاتیمە کچی عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەڵێت: کاتێك گەشتینە لای یەزید، بەزەیی بەئێمەدا هاتەوە و فەرمانیدا بەشێوەیەکی جوان مامڵەمان لەگەڵ بکەن.**

**دەڵێت: یەکێك لەپیاوانی شام (سوورکەڵەیەك) هەستا و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەم کچە بەمن بدە. مەبەستی لەمن بوو (کچێکی پاکیزە بووم) ترسام و گومانم کرد ئەم کارە بۆ ئەوان ڕەوایە و جلەکانی زێنەبی خوشکم گرت.**

**دەڵێت: زێنەب لەمن گەورەتر و بیرمەندتر بوو، دەیزانی ئەوە ڕوونادات. وتی: درۆت کرد و ناماقوڵیت کرد، چوونکە نەمافی تۆیە و نە مافی ئەو.**

**دەڵێت: یەزید توڕە بوو، وتی: درۆ دەکەیت، سوێند بەخوا ئەوە مافی منە و ئەگەر بمەوێت، ئەو کارە دەکەم.**

**زێنەب وتی: هەرگیز، خواوەند ئەو مافەی بەتۆ نەداوە و ناتوانیت مەگەر ئەوەی لەڕیزی ئەم ئۆمەتە بڕۆیتەدەر و باوەڕ بەدینێك جیاواز لەدینەکەی ئێمە بێنیت.**

**دەڵێت: یەزید توڕە بوو و وتی: بەمشێوەیە لەگەڵ من دەدوێیت! ئەوەی لەدین هەڵگەڕایەوە، باوك و براکانی تۆ بوون.**

**زێنەب وتی: تۆ و باوکت و باوەگەورێت بەدینی خوا و دینی باوکم و دینی**

براکە و باوەگەورێی من ڕزگارتان بوو.

وتی: ئەی دوژمنی خواوەند درۆ دەکەیت؟

وتی: تۆ ئەمیرێکی خاوەن دەسەلاتیت، بەناڕەوا جوێن دەدەیت و بەپشت بەستن بەدەسەلاتی خۆت، زۆرداری دەکەیت.

دەڵێت: سوێند بەخوا وەك بڵێی شەرمەزار بوو، بێدەنگی هەڵبژارد، دوای ئەوە، پیاوی شامی داواکەی دووبارە کردەوە و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەم کچە بەمن ببەخشە.

یەزید وتی: بڕۆدەر، خوا بتکوژێت.

دەڵێت: یەزید وتی: ئەی نەعمان کوڕی بەشیر، کەرەستەی پێویستی ئەوان ئامادە بکە و یەکێك لەبڕواپێکراوانی شامیان لەگەڵ بنێرە. سوار و پیادەکان لەگەڵ ئەودا ڕەوانە بکە تا دەگەنە مەدینە.

بێژەر دەڵێت: دواتر فەرمانیدا و ژنانیان لەماڵێکی جیادا جێکردەوە و کەرەستەی پێویستیان خستە بەردەستیان. عەلی کوڕی حسەین لەگەڵ ئەوان لەو ماڵەدا بوو.

حارس کوڕی کەعب دەڵێت: دواتر ڕۆشتنە ماڵی یەزید و لەژنانی بنەماڵەی معاویە کەس نەمایەوە کەبەدەم گریانەوە پێشوازییان لێنەکات. سێ ڕۆژ پرسەیان بۆ حسەین دانا و یەزید لەسەر سفرە ئامادە نەدەبوو مەگەر ئەوەی عەلی کوڕی حسەین لەسەر سفرە بێت.

دەڵێت: ڕۆژێك ئەوی بانگ کرد، عەمرۆ کوڕی حەسەن کوڕی عەلیشی بانگ کرد کەکوڕێکی کەم تەمەن بوو و بەعەمرۆ کوڕی حەسەنی وت: لەگەڵ ئەم گەنجە دەجەنگیت؟ مەبەستی خالیدی کوڕی بوو.

وتی: بەمشێوەیە نە، کێردێك بەمن بدە و کێردێك بەو تا دژی ئەو بجەنگم.

دەڵێت: یەزید ئەوی لەئامێز گرت و وتی: ئەم شێوەیە لەئەخزەم دەناسم.[٩] مەگەر مار جگە لەمار هیچی دەبێت؟

دەڵێت: کاتێك ویستیان بەڕێکەون، یەزید، عەلی کوڕی حسەینی بانگکرد و

---

[٩] - پەندێکی عەرەبییە، یانی هەرکەس خوو و عادەتی باوکی دەگرێت. وەرگێر

وتی: نفرینی خواوەند لەکوڕی مەرجانە بێت، سوێند بەخوا ئەگەر خۆم دەبووم، بەهەموو مەرجەکانی باوکت ڕازی دەبووم و بەهەر شێوەیەك بوایە، تەنانەت بەمەرگی یەکێك لەکوڕەکانم، مەرگم لەو دوور دەکردەوە. بەلاّم خواوەند ئەوەی کردبووە چارەنووس. نامەم بۆ بنووسە و چیت پێویستە پێم بڵێ.

دەڵێت: جلوبەرگی لەبەر کردن و پێشنیاری پێویستی سەبارەت بەوان کرد.

دەڵێت: نێردراو ئەوانی برد و شەوانە هاوڕێیەتی ئەوانی دەکرد و یەك سات لێیان بێ ئاگا نەبوو. کاتێك دادبەزین، لێیان دووردەکەوتەوە و خۆی و سوارەکان بەدەوروبەردا بلاّو دەبوونەوە بۆ ئەوەی ئەگەر کەسێکیان مەبەستی دەستنوێژ یا سەرئاوی بێت، بێزار نەبێت.

دەڵێت: لەڕێگە لێیان نزیك دەبوویەوە و لەنیازەکانیانی دەپرسی و میهرەبانی لەگەڵ کردن تا گەیشتنە مەدینە.

بەپێی گێڕانەوەی حارس کوڕی کەعب، فاتیمە کچی عەلی دەڵێت: بەزێنەبی خوشکم وت: خوشکم! ئەم پیاوە (شامی) چاکەی زۆری لەگەڵ کردین، دەتەوێت شتێکی پێببەخشین؟

وتی: سوێند بەخوا هیچمان نییە پێی ببەخشین مەگەر زێڕ و خشڵەکانمان.

بێژەر دەڵێت: فاتیمە وتی: زێڕەکانمانی پێدەدەین.

فاتیمە دەڵێت: پاوانە و دەستەوانەکەم هەڵگرت، خوشکەکەیشم بەهەمانشێوە و بۆمان نارد و داوای لێبوردنمان کرد و وتمان: ئەمە پاداشتی چاکەکاری تۆیە لەگەڵ ئێمە.

دەڵێت: بەلاّم ئەو وتی: ئەگەر ئەوەی کردم، بۆ کۆکردنەوەی ماڵی دنیا دەبوو، زێڕەکانی ئێوە و کەمترە لەوەیش منی شادومان دەکرد بەلاّم ئەم کارەم تەنیا لەبەر خوا و بۆ نزیکبوونەوە لەبنەماڵەی پێغەمبەر (د.خ) ئەنجامدا.

بەلاّم بەپێی گێڕانەوەیەکی دیکە لەعەوانە کوڕی حەکەمی کەلبی هاتووە کەکاتێك حسەین کوژرا و کەرەستەکان و ئەسیرەکانیان لەکوفە بردە لای عوبەیدالله کوڕی زیاد، لەو کاتەی ئەسیرەکانیان زیندانی کردبوو، بەردێك کەوتە ناو زیندانەکە کەنووسراوێکی پێوە بوو بەم ناوەرۆکە: ((نێردراوێك سەبارەت

بەئێوە لەفلانە و فلان ڕۆژ بۆ لای یەزید کوڕی معاویە بەڕێکەوت، فلانە ڕۆژ دەڕوات و فلانە ڕۆژ دەگەڕێتەوە، ئەگەر تەکبیرتان بیست، دڵنیابن فەرمانی کوشتنتان دراوە و ئەگەر نەتانبیست، بەخواستی خواوەند لەئەماندان)).

دەڵێت: دوو ڕۆژ یا سێ ڕۆژ پێش گەڕانەوەی نێردراوەکە، بەردێك کەوتە ناو زیندانەکە کەنووسراوێکی پێوە بەستراوە بوو: وەسیەت بکەن و داواکارییەکانی خۆتان بڵێن چوونکە فلانە ڕۆژ چاوەڕوانی گەڕانەوەی نێردراون.

دەڵێت: نێردراو گەڕایەوە و دەنگی تەکبیریان نەبیست. نامەی یەزید سەبارەت بەڕەوانە کردنی ئەسیرەکان هاتبوو.

دەڵێت: عوبەیداللە کوڕی زیاد، مەحفەز کوڕی سەعلەبە و شیمر کوڕی زی ئەلجەوشەنی بانگکرد و وتی: لەگەڵ کەرەستە و ئەسیرەکان بۆ لای سەروەری باوەڕداران بڕۆن.

دەڵێت: بەڕێکەوتن تا گەیشتنە لای یەزید و مەحفەز کوڕی سەعلەبە وەستا و بەدەنگی بەرز وتی: سەری نەزانترین و خراپەکارترینی کەسانمان هێناوە.

یەزید وتی: مەولودی دایکی مەحفەز خراپەکارترە و نەزانتر، ستەمکارترە و ناسپاستر.

دەڵێت: کاتێك یەزید سەری حسەینی بینی، هۆنراوەی (سەریان بڕی) خوێندەوە.

دواتر وتی: دەزانن بۆ ئەو بەڵایەی بەسەردا هات؟ دەیوت: باوکم عەلی لەباوکی ئەو باشترە و دایکم فاتیمە، لەدایکی ئەو باشترە و باوەگەورێم (پێغەمبەر (د.خ)) لەباوەگەورێی ئەو باشترە و خۆم لەو باشترم و بۆ خەلافەت شیاوتر. بەڵام ئەوەی دەیوت: باوکی لەباوکی من باشترە، باوکم و باوکی داوەرییان هەڵبژارد و هەمووان دەزانن داوەری لەبەرژەوەندی کێ تەواو بوو، ئەوەی دەڵێت دایکم لەدایکی ئەو باشترە، سوێند بەخوا فاتیمە کچی پێغەمبەر (د.خ) لەدایکم باشترە، ئەوەی دەڵێت باوەگەورێم لەباوەگەورێی ئەو باشترە، ئەوەی باوەڕی هەبێت دەزانێت کەس لەدنیا لە پێغەمبەر (د.خ) باشتر نییە، بەڵام ئەوەی بینی بەهۆی زانستی ئەو بوو چوونکە ئەم ئایەی نەخوێندبوو:

(( قل اللهم مالك الملك توتی الملك من تشاء و تنزع الملك ممن تشاء و تعز من تشاء و تذل من تشاء بيدك الخير انك علی كل شيئی قدير

واتاكەی: بڵێ، ئەی خواوەندی خودان موڵك، بەهەركەس بخوازيت دەبەخشيت، و لەهەر كەس بخوازيت، وەردەگريتەوە، هەركەست بويت، ئازيزی دەكەيت و هەركەست بويت، ڕيسوای دەكەيت، هەموو چاكييەكان لەدەستی تۆدايە و بۆ هەموو شتێك بەتوانايت)).

دەڵێت: ژنەكانی حسەينيان بردە لای يەزيد و ژنانی بنەماڵەی يەزيد و معاويە، دەستيان بەگريان كرد و كاتێك گەيشتنە لای يەزيد، فاتيمە كچی حسەين كەگەورەتر لەسەكينە بوو، وتی: ئەی يەزيد، كچانی پێغەمبەر (د.خ)، ئەسيرن؟

دەڵێت: يەزيد وتی: برازاكەم، سوێند بەخوا بەمە ڕازی نەبووم.

فاتيمە وتی: سوێند بەخوا يەك ئاڵقەيان بۆ ئێمە نەهێشتەوە.

يەزيد وتی: برازا، ئەوەی بەتۆی دەدەم زياترە لەوەی لێيان سەندوويت.

دەڵێت: ئەوانيان بردە ماڵی يەزيد كوڕی معاويە و هەموو ژنەكانی بنەماڵەی يەزيد ڕۆشتنە لايان و پرسەيان گێڕا.

دەڵێت: يەزيد كەسی بۆ لای هەموو ژنەكان نارد تا بزانێت چييان لێسەندوون. بەئەندازەی دوو بەرابەر بەوانی بەخشييەوە.

دەڵێت: سەكينە دەيوت: كەسم نەبينيوە لەوانەی حاشا لەبوونی خوا دەكەن، لەيەزيد كوڕی معاويە باشتر بێت.

دەڵێت: ئەسيرەكانيان بردە لای يەزيد، عەلی كوڕی حسەين لەگەڵ ئەوان بوو.

يەزيد وتی: عەلی! بڵێ بزانم.

عەلی كوڕی حسەين ئەم ئايانەی خوێندەوە:

(( ما اصاب من مضيبة فی الارض و لا فی انفسكم الافی كتاب من قبل ان نبرأها، ان ذلك علی الله يسير. لكيلاتأسوا علی ما فاقكم و لا تفرحوا بما اتاكم و الله لا يحب كل مختال فخور

واتاكەی: هيچ بەڵايەك بەزەوی يا دانيشتووانی ئێوە ناگات مەگەر ئەوەی پێشتر بيئافرێنين لەناو نامەيەكدا بووە كە ئەمە بۆ خواوەند ئاسانە. تا بۆ ئەوەی

لەدەستی دەدەن خەم مەخۆن و لەوەی بەدەستتان دەگات، لەخۆبایی نەبن چوونکە خوا کەسانی خۆپەرەست و لەخۆبایی خۆش ناوێت)).

یەزیدیش ئەم ئایەی خوێندەوە:

((ما اصابکم من مصیبة فیما کسبت ایدیکم و یعفوا عن کثیر

واتاکەی: هەر بەلایەك بەسەر ئێوەدا بێت، بۆ ئەو کارانەیە کەدەستەکانتان ئەنجامیداوە و ژمارەیەکی زۆریش دەبەخشێت)).

دواتر کەرەستەی پێویست و سامانی پێدا و ڕەوانەی مەدینەی کرد.

قاسم کوڕی بوخەیت دەڵێت: کاتێك نێردراوانی خەڵکی کوفە سەری حسەین کوڕی عەلییان هێنا و ڕۆشتنە ناو مزگەوتی دیمەشق، مەروان کوڕی حەکەم پرسی: چیتان کرد؟

وتیان: هەژدە کەس لەوان ڕووبەڕوومان بوونەوە و سوێند بەخوا هەموویانمان کوشت و ئێستا سەری ئەوانمان هێناوە.

مەروان توڕە بوو و ڕۆشت.

دەڵێت: دوای ئەوە برای مەروان، یەحیا کوڕی حەکەم هات و وتی: چیتان کرد؟ هەمان وتەیان دووبارە کردەوە.

یەحیا وتی: لەڕۆژی پسلاّن لەمحەممەد دوور دەبن، هەرگیز لەگەڵ ئێوەدا کۆ دەبمەوە. دواتر هەستا و ڕۆشت.

دەڵێت: دواتر ڕۆشتنە لای یەزید و سەری حسەینیان لەبەردەم ئەو دانا و وتەکانیان دووبارە کردەوە.

دەڵێت: هیند کچی عەبدوڵڵە کوڕی عامر کوڕی کورەیز کەژنی یەزید کوڕی معاویە بوو، وتەکانی ئەوانی بیست و ڕوخساری داپۆشی و ڕۆشتەدەر و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، سەری حسەین کوڕی فاتیمەی کچی پێغەمبەرە؟

وتی: بەڵێ، بۆ کوڕی کچی پێغەمبەر (د.خ) و پیاوی بەتوانای قورەیش ڕەش بپۆشە و پرسەبگێڕە، کوڕی زیاد پەلەی کرد و ئەوی کوشت، خوا بیکوژێت.

دەڵێت: مۆڵەتی ڕۆشتنەژووری بەخەڵکاندا. سەری حسەین، لەبەردەم یەزیددا بوو، دارێکی بەدەستەوە و لەدەمی دەدا. دواتر وتی: بەسەرهاتی ئێمە و ئەو

بەوشێوەیە کەحەسین هومامی موڕی دەڵێت:

(( ئەو سەرانەیان بڕی.....))

دەڵێت: یەکێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر (د.خ) بەناوی باوکی بورزەی ئەسلەمی وتی: بۆ بەداردەستەکە لەدەمی حسەین دەدەیت، سوێند بەخوا دارەکەت بەرشوێنێك دەکەوێت کەچەندین جار بینیومە پێغەمبەر (د.خ) لێوی دەخستەسەر و ماچی دەکرد. ئەی یەزید، ڕۆژی پسلاّن دێت و کوری زیاد شیفاعەت بۆ تۆ دەکات و حسەین لەڕۆژی پسلاّن، پێغەمبەر (د.خ) شیفاعەتی بۆ دەکات.

دەڵێت: هەستا و کۆڕەکەی بەجێهێشت.

عەوانە کوڕی حەکەم دەڵێت: کاتێك عوبەیداللّە کوڕی زیاد، حسەین کوڕی عەلی کوشت و سەری حسەینیان بردە لای یەزید، عەبدولمەلیك کوڕی باوکی حارسی سولەمی بانگکرد و وتی: بەرەو مەدینە بەڕێکەوە و بڕۆ بۆ لای عەمرۆ کوڕی سەعید کوڕی عاس و مژدەی کوژرانی حسەینی پێبدە.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی عاس لەو کاتەدا کارگوزاری مەدینە بوو.

دەڵێت: عەبدولمەلیك دەیویست خۆی دوا بخات بەلاّم عوبەیداللّە سەرکۆنەی کرد، لەبەر ئەوەی کەسێکی بوێر و ئازا بوو، پێی وت: بەرەو مەدینە بەڕێکەوە با هەواڵەکە پێش تۆ نەگات. بڕێك دیناری پێدا و وتی: خۆت دوا مەخە، ئەگەر وشترەکەت لەپێکەوت، وشترێکی دیکە بکڕە.

عەبدولمەلیك دەڵێت: کاتێك گەیشتمە مەدینە، یەکێك لەقورەیشییەکان منی بینی و وتی: دەنگوباس چییە؟

وتم: فەرمانڕەوا هەواڵەکان دەزانێت.

وتی: انا لله و انا الیە راجعون. حسەین کوڕی عەلی کوژرا.

دەڵێت: ڕۆشتمە لای عەمرۆ کوڕی سەعید و پرسی: دەنگوباس چییە؟

وتم: هۆکاری شادومانی فەرمانڕەوا، حسەین کوڕی عەلی کوژرا.

وتی: خەڵکان لەکوشتنی ئەو ئاگادار بکەرەوە.

دەڵێت: خەڵکانم لەکوشتنی حسەین ئاگادار کردەوە. سوێند بەخوا هەرگیز قیژە و هاواری پرسەم هاوشێوەی ژنانی منالّەکانی هاشم بۆ پرسەی حسەین

نەبیستووە.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی سەعید پێکەنی و هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( ژنانی بنەماڵەی زیاد ڕۆژێك دوای جەنگی ئەرنەب

پرسەیەکیان گێڕا کەهاوشێوەی پرسەی ژنانی ئێمە بوو)).

( ئەرنەب جەنگێك بوو کەمناڵەکانی زوبەید تیایدا بەسەر مناڵەکانی زیاد سەرکەوتن. عەمرۆ کوڕی مەعدی کەرب ئەم هۆنراوەی وتووە).

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی سەعید وتی: ئەم گریان و پرسەیە، لەبری گریان و پرسەی عوسمان کوڕی عەففان.

دەڵێت: ڕۆشتە سەر مینبەر و خەڵکانی لەکوژرانی حسەین کوڕی عەلی ئاگادار کردەوە.

عەبدولڕەحمان کوڕی عوبەید، باوکی ئەلکەنود، دەڵێت: کاتێك عەبدوڵڵە کوڕی جەعفەر کوڕی ئەبی تالیب ئاگادار بوویەوە دوو کوڕەکەی لەگەڵ حسەین کوڕی عەلی کوژراون. یەکێك لەکۆیلەکانی ڕۆشتە لای، لەو کاتەدا خەڵکان سەرەخۆشییان لێدەکرد.

دەڵێت: وەك بزانم ئەم کۆیلەیە باوکی ئەلسلاس بوو، وتی: ئەم بەڵایە بەهۆی حسەین کوڕی عەلی بەسەر ئێمەدا هاتووە.

دەڵێت: عەبدوڵڵە کوڕی جەعفەر بەپێپۆشەکەی لێیدا و وتی: ئەی کوڕی ژنی گەنیو، سەبارەت بەحسەین بەمشێوەیە قسە دەکەیت؟ سوێند بەخوا ئەگەر لەوێ دەبووم، حەزم دەکرد لێی جیانەبمەوە تا لەگەڵ ئەودا دەکوژرێم، سوێند بەخوا ئەوەی ئارامیم پێدەبەخشێت ئەوەیە کەکوڕەکانم لەگەڵ براکەم و ئامۆزاکانم کوژراون و هاوکاری ئەویان کردووە و خۆڕاگرییان لەخۆیان نیشانداوە.

دەڵێت: دواتر ڕوویکردە ئامادەبووان و وتی: سپاس بۆ خوا، سوێند بەخوا کوژرانی حسەین بۆ من دژوار و گرانە، ئەگەر دەستەکانم هاوکارییان نەکرد، دوو کوڕەکەم بۆ بەرگریکردن لەو کوژران.

دەڵێت: کاتێك خەڵکی مەدینە لەکوژرانی حسەین ئاگاداربوونەوە، کچی عەقیل کوڕی ئەبی تالیب، هاوڕێ لەگەڵ ژنانی دیکە، بەسەری ڕووت هات و

لەجلوبەرگەکانی دەئالاّ، هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( چی دەڵێن؟ ئەگەر پێغەمبەر (د.خ) پێتان بڵێت:

ئێوە کەدوا ئۆمەت بوون لەدوای من

چ بەلاّیەکتان بەسەر بنەماڵەکەمدا هێنا؟

دەستەیەکیان ئەسیرکران و دەستەیەکیان لەخوێنی خۆیاندا گەوزان)).

عەوانە دەڵێت: عوبەیداللە کوڕی زیاد، دوای ئەوەی حسەینی کوشتبوو، بەعومەر کوڕی سەعدی وت: ئەی عومەر، ئەو نامەی تیایدا فەرمانی کوشتنی حسەینمدا بوو، لەکوێیە؟

وتی: فەرمانەکەی تۆم جێبەجێکرد و نامەکە ون بووە.

وتی: دەبێت ئەو نامە بێنیت؟

وتی: ون بووە.

وتی: سوێند بەخوا دەبێت بیهێنیت.

وتی: سوێند بەخوا نامەکە ماوە تا لەمەدینە بۆ پاساو هێنانەوە بۆ پیرێژنەکانی قورەیش بخوێنرێتەوە. سەبارەت بەحسەین ئەوەندە مۆجیاریم کردی ئەگەر بەباوکم، سەعد کوڕی ئەبی وەقاسم کردبوو، ماف باوکایەتی ئەوم دابوو.

عوسمان کوڕی زیاد برای عوبەیداللە وتبووی: سوێند بەخوا ڕاستی وت، حەزم دەکرد لەلووتی هەرکام لەمناڵەکانی زیاد تا ڕۆژی پسلاّن ئاڵقەیەکی دەستەمۆ کردن دەبینرا بەلاّم حسەین نەدەکوژرا.

دەڵێت: سوێند بەخوا عوبەیداللە بۆ ئەم وتەیە ڕەخنەی لێنەگرت.

عەمرۆ کوڕی عەکرەمە دەڵێت: بەرەبەیانی ڕۆژی کوژرانی حسەین لەمەدینە، یەکێك لەکۆیلەکانی ئێمە دەیوت: دوێشەو بیستم جارچییەك جاڕی دەدا و هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( ئەی ئەو کەسانەی لەڕووی نەزانییەوە حسەین کوڕی عەلیتان کوشت

ئاگادار بن لەسزا و ئازابەکانی

هەموو باوەڕداران بە پێغەمبەر (د.خ) و فریشتە و کەسانی دیکە

نفرینی ئێوە دەکەن

لەسەر زمانی کوڕی داوود و موسا و هەڵگری ئەنجیل
نفرین کراون)).
حەیزوومی کەلبی دەیوت: منیش ئەو دەنگەم بیستووە.

## ناوی ئەو کەسانەی لەبنەماڵەی هاشم لەگەڵ حسەین کوژران و ژمارەی کوژراوان

باوکی میخنەف دەڵێت: کاتێك حسەین کوڕی عەلی کوژرا، سەری ئەو کەسانەی لەبنەماڵە و هاورێکان و شیعەکانی لەگەڵ ئەو کوژران، لای عوبەیدالڵە کوڕی زیاد کۆبوویەوە.

خەڵکانی کێندە سیانزە سەری بڕاویان هێنا و سەرکردەکەیان قەیس کوڕی ئەشعەس بوو. خەڵکی هەوازین بیست سەری بڕاویان هێنا وسەرکردەکەیان شیمر کوڕی زی ئەلجەوشەن بوو. خەڵکی تەمیم حەفدە سەری بڕاویان هێنا. مناڵەکانی ئەسەد شەش سەری بڕاو و خەڵکانی مەزحەج حەوت سەری بڕاویان هێنا. پاشماوەی سوپا حەوت سەری بڕاویان بەدەستەوە بوو و کۆی گشتی کوژراوان حەفتا کەس بوو.

دەڵێت: حسەین کوژرا کەدایکی فاتیمە کچی پێغەمبەر (د.خ) بوو. سەنان کوڕی ئەنسی نەخەعی ئەوی کوشت و خەولی کوڕی یەزید سەری ئەوی هەڵگرت.

عەباس کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب کوژرا، دایکی، ئوم ئەلبەنین کچی حەزام کوڕی رەبیعە بوو. زەید کوڕی رەقادی جونەبی و حەکیم کوڕی توفەیلی سەنبوسی ئەویان کوشت.

عەبدوڵڵە کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب کوژرا، دایکی ئەویش، ئوم ئەلبەنین بوو، عوسمان کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیبیش کوژرا، دایکی ئەویش، ئوم ئەلبەنین بوو، خەولی کوڕی یەزید تیرێکی لێدا و کوشتی.

محەممەد کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب کوژرا، دایکی کەنیز بوو و یەکێك

لەمناڵەکانی ئەبان کوڕی دارەم ئەوی کوشت.

ئەبوبەکر کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب کوژرا، دایکی لەیلی کچی مەسعود کوڕی خالیدی دارمی بوو. بەلآم لەکوژرانی ئەودا گومان هەیە.

عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوژرا. دایکی لەیلی کچی ئەبو موڕە کوڕی عوروە کوڕی مەسعودی سەقەفی بوو و دایەگەورێی مەیمونە کچی ئەبوسوفیان کوڕی حەرب بوو. بکوژەکەی، مەنقەز کوڕی نوعمانی عەبدی بوو.

عەبدوڵڵە کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوژرا، دایکی، ئوم ڕەباب کچی ئەمری ئەلقەیس کوڕی عودەی کەلبی بوو. هانی کوڕی سوبەیتی حەزرەمی ئەوی کوشت.

عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی بچووك بوو و نەکوژرا.

ئەبوبەکر کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوژرا. دایکی کەنیز بوو. عەبدوڵڵە کوڕی عوقەبەی غەنەوی ئەوی کوشت.

عەبدوڵڵە کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوژرا، دایکی کەنیز بوو. حەرمەلە کوڕی کاهل، تیرێکی لێدا و کوشتی.

قاسم کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوژرا، دایکی کەنیز بوو. سەعد کوڕی عەمرۆ کوڕی نوفەیلی ئەزدی ئەوی کوشت.

عەون کوڕی عەبدوڵڵە کوڕی جەعفەر کوژرا. دایکی جەمانە کچی حەبیب کوڕی نوجەبەی فەزاری بوو و عەبدوڵڵە کوڕی قوتەبەی تایی نەبهانی ئەوی کوشت.

محەممەد کوڕی عەبدوڵڵە کوڕی جەعفەر کوژرا، دایکی خەوصا کچی خەسەفە کوڕی سەقیفی بەکری بوو و عامر کوڕی نەهشلەی تیمی ئەوی کوشت.

جەعفەر کوڕی عەقیل کوژرا، دایکی ئوم ئەلبەنین کچی شەقر کوڕی هەزاب بوو و بوشر کوڕی حوتی هەمەدانی ئەوی کوشت.

عەبدولڕەحمان کوڕی عەقیل کوژرا، دایکی کەنیز بوو، عوسمان کوڕی خالیدی جوهەنی ئەوی کوشت.

عەبدوڵڵە کوڕی عەقیل کوڕی ئەبی تالیب کوژرا. دایکی کەنیز بوو و عومەر کوڕی سوبەیحی سەیدانی تیرێکی لێدا و کوشتی.

موسلیم کوڕی عەقیل لەکوفە کوژرا، دایکی کەنیز بوو.

عەبدوڵڵە کوڕی موسلیم کوڕی عەقیل کوژرا. دایکی ڕوقییە کچی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و دایەگەورێی کەنیز بوو. عەمرۆ کوڕی سوبەیحی سەدایی و بەوتەیەك ئەسەد کوڕی مالکی حەزرەمی ئەوی کوشت.

محەممەد کوڕی باوکی سەعید کوڕی عەقیل کوژرا، دایکی کەنیز بوو. هوبك کوڕی یاسری جوهەنی ئەوی کوشت.

حەسەن کوڕی حەسەن کوڕی عەلی بچووك بوو. دایکی خەولە کچی مەستور کوڕی زەبانی فەزاری بوو.

عەمرۆ کوڕی حەسەن کوڕی عەلی بچووك بوو و نەکوژرا. دایکی کەنیز بوو.

لەکۆیلەکان، سلێمان، کۆیلەی حسەین کوژرا. سلێمان کوڕی عەوف حەزرەمی ئەوی کوشت.

مەنجەخی کۆیلەی حسەینیش کوژرا.

عەبدوڵڵە کوڕی بەقتەر، برای شیری حسەین کوژرا.

عەبدولڕەحمان کوڕی جوندەبی ئەزدی دەڵێت: دوای کوژرانی حسەین، عوبەیداللە کوڕی زیاد، گەورەکانی کوفەی خستە ژێر چاودێرییەوە و عوبەیداللە کوڕی حوڕی نەبینی.

عوبەیداللە کوڕی حوڕ دوای چەند ڕۆژێك هاتە لای. عوبەیداللە لێی پرسی: ئەی کوڕی حوڕ لەکوێ بوویت؟

وتی: نەخۆش بووم.

وتی: نەخۆشی ئاوز یا جەستە؟

وتی: ئاوزم کێشەی نەبوو، خواوەندیش تەندروستی بەجەستەم بەخشی.

کوڕی زیاد وتی: درۆ دەکەیت، لەگەڵ دوژمنەکەی ئێمەدا بوویت.

وتی: ئەگەر دوژمنی تۆ دەبووم، منیان دەبینی و سکاڵات لەدیارنەبوونی من نەدەکرد.

دەڵێت: کوڕی زیاد ساتێك لێی بێ ئاگا بوو، کوڕی حوڕ ڕۆشتەدەر و سوار ئەسپەکەی بوو.

کوڕی زیاد پرسی: کوڕی حوڕ لەکوێیە؟

وتیان: ئێستا ڕۆشتەدەر.

وتی: بیهێنن.

دەڵێت: پاسەوانەکان هاتن و پێیان وت: بگەڕێرەوە بۆ لای فەرمانڕەوا. بەڵام کوڕی حوڕ سوار لەسەر ئەسپەکەی خۆی غاریدا و وتی: پێی بڵێن هیچکات بەدڵخواز ناچمە لای. دواتر ڕۆشت و لەماڵی ئەحمەر کوڕی زیادی تایی پەنای گرت و هاوەڵانی لەو ماڵە لەدەوری کۆبوونەوە. دواتر ڕوویکردە کەربەلا و سەردانی شوێنی کوژرانی حسەین و هاوەڵانی کرد و بۆیان پاڕایەوە. دوای ئەوە، ڕێگەی مەداینی گرتەبەر و هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

(( فەرمانڕەوای خیانەتکار پێم دەڵێت

بۆ دژی شەهیدی کوڕی فاتیمە نەجەنگایت

بەداخەوە هاوکاری و پشتیوانی ئەوم نەکرد....))

هۆنراوەیەکی دووردرێژە.

لەم ساڵەدا باوکی بیلال مەرداس کوڕی عەمرۆ کوژرا.

## کوژرانی باوکی بیلال

ئەبوجەعفەری تەبەری دەڵێت: پێشتر لەم کتێبەدا ئاماژەمان بەهۆکاری شۆڕشەکەی ئەو کرد و ئەوەی عوبەیدالڵە کوڕی زیاد، ئەسلەم کوڕی زەرعەی کەلابی لەگەڵ دوو هەزار کەس بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد و سەرئەنجام، ئەسلەم و سوپاکەی لەسەر دەستی باوکی بیلال و هاوەڵانی، شکستیان خوارد.

کاتێک مەرداس، باوکی بیلال، شکستی بەئەسلەم کوڕی زەرعە هێنا و عوبەیدالڵە کوڕی زیاد لەم هەواڵە ئاگادار بوویەوە، بەهەمانشێوە کە لەگێڕانەوەی باوکی موخارقی ڕاسبیدا هاتووە، عیباد کوڕی ئەخزەری تەمیمی لەگەڵ سێ هەزار جەنگاوەر بۆ جەنگی ئەو ڕەوانە کرد. عیباد شوێنپێی باوکی بیلالی هەڵگرت و لەتوج پێی گەیشتەوە و لەبەرابەر سوپاکەی ڕیزی بەست. باوکی بیلال و هاوەڵانی هێرشیانکردە سەر بەڵام سوپاکەی عیباد خۆڕاگرییان کرد. لەبەر

ئـەوەی ژمـارەی هـاوەڵانی کـەمبوو، پێـی وتـن: هەرکـەس لـەئێوە بەمەبەسـتی کۆکردنەوەی سامانی دنیا پەیوەستمان بووە، بڕوات و هەرکەس لەئێوە مەبەستی جیهادە، بمێنێتەوە. دواتر ئەم ئایەی خوێند:

(( من كان يريد حرث الاخرة نزد له فى حرثه و من كان يريد حرث الدنيانوته منها و ماله فى الاخره من نصيب

واتاکەی: هەرکەس بەرهەمی ئەو دنیای دەوێت، بەرهەمەکەی زیاد دەکەین و هەرکـەس بەرهـەمی ئـەم دنیـایی دەوێـت، پێـی دەبەخـشین بـەڵام لـەو دنیـا هـیچ بەشێکی نابێت)).

دواتـر دابـەزی و هـاوەڵانی دابـەزین. کـەس لێـی جیانەبوویـەوە و تـا دوایـین کەسیان کوژران.

دەڵێت: عیباد کوڕی ئەخزەر و سوپاکەی بۆ بەسرە گەڕانەوە. عوبەیدە کوڕی هیلال لەگەڵ سێ کەس هات (خۆی چوارەم کەس بوو) و چاودێری عیباد کوڕی ئەخزەریان دەکرد. جارێکیان کەعیباد بەرەو کۆشکی فەرمانڕەوایی دەڕۆشت و مناڵە بچووکەکەی لەپشت سەری خۆیەوە سوار کردبوو، پێیان وت: ئەی بەندەی خوا، ڕاوەستە تا فتوایەك لەتۆ وەربگرین.

دەڵێـت: عیبـاد وەسـتا، پێیـان وت: ئێمـە چـوار بـراین کەبرایـەکمان کـوژراوە، بۆچوونی تۆ چییە؟

وتی: داوای هاوکاری لەفەرمانڕەوا بکەن.

وتی: داوامان کرد بەڵام هاوکاری نەکردین.

وتی: بیکوژن و هیوادارم خوا بیکوژێت.

دەڵێت: پەلاماریانـدا و وتیـان: داوەری کـردن تایبەتـە بەخواوەنـد و بەمـشێوەیە کوشتیان.

لـەم سـاڵەدا، یەزیـد کـوڕی معاویـە، سـەلم کـوڕی زیـادی وەك فـەرمانڕەوای سیستان و خوراسان دیاریکرد.

## هۆکاری ئەوەی یەزید، سەلەمی وەك فەرمانڕەوای سیستان و خوراسان دیاریکرد

موسلیمە کوڕی موحاریب کوڕی سەلەم دەڵێت: سەلەم ڕۆشتە لای یەزید کوڕی معاویە. لەم کاتەدا تەمەنی بیست و چوار ساڵ بوو. یەزید پێی وت: ئەی باوکی حەرب، کاروباری براکانت، عەبدولڕەحمان و عیباد بەتۆ دەسپێرین.

وتی: فەرمان، فەرمانی سەروەری باوەڕدارانە.

دەڵێت: ئەوەی وەك فەرمانڕەوای سیستان و خوراسان دیاریکرد. سەلەم، حارس کوڕی معاویەی حارسی، باوەگەوریێی عیسا کوڕی شەبیبی بۆ خوراسان نارد و خۆی ڕێگەی بەسرەی گرتەبەر و کەرەستەی پێویستی هەڵگرت و بەرەو خوراسان بەڕێکەوت و حارس کوڕی قەیس کوڕی هەیسەمی گرت و زیندانی کرد و لەشەبیبی کوڕیدا و بەبیجامەوە لەبەرچاوی خەڵکان ڕایگرت.

دەڵێت: سەلەم، یەزید کوڕی زیادی برای بەرەو سیستان نارد. عوبەیداللە کوڕی زیاد، نامەیەکی بۆ عیبادی برای نووسی و لەفەرمانڕەوایەتی سەلەم ئاگاداری کردەوە. عیباد سامانی بەیت ئەلماڵی لەناو کۆیلەکانی خۆی دابەش کرد. بڕێك لەسامانەکە مایەوە و جارچییەکەی جاڕیدا هەرکەس دەیەوێت مانگانەی خۆی لەپێشەوە وەربگرێت، بێت و ئەوەی هات، وەریگرت. عیباد سیستانی بەجێهێشت و کاتێك گەیشتە جیرۆفت، ئاگادار بوویەوە کەسەلەم لەوێیە. چیایەك لەنێوانیاندا بوو، ڕێگەکەی گۆڕی. لەو شەوەدا یەك هەزار کۆیلەی عیباد ڕۆشتن کەهەریەکیان لانیکەم دە هەزاری پێبوو.

دەڵێت: عیباد ڕێگەی فارسی گرتەبەر و دواتر هاتە لای یەزید کەپێی وت: سامانەکە لەکوێیە؟

وتی: من سنوردار بووم و ئەوەی بەدەستم هێنا، لەنێوان کەسەکانی خۆم دابەشم کرد.

دەڵێت: کاتێك سەلەم بەرەو خوراسان دەڕۆشت، عیمران کوڕی فوسەیلی بەرجەمی و عەبدوڵڵە کوڕی خازمی سولەمی و تەڵحە کوڕی عەبدوڵڵە جەڕاحی و

موهەلیب کوڕی ئەبی سوفرە و حەنزەلە کوڕی عەرادە و ئەبو حەزابە، وەلید کوڕی نەهیك و یەحیا کوڕی یەعمەری عەدەوانی و ژمارەیەکی زۆر لەشاسواران و گەورەکانی بەسرە لەگەڵی ڕۆشتن.

دەڵێت: سەلەم نامەی یەزید کوڕی معاویەی بردە لای عوبەیدالله کوڕی زیاد تا دوو هەزار کەس و بەوتەیەك شەش هەزار کەسی بۆ هەڵبژێرێت.

دەڵێت: سەلەم شاسوارەکان و سەرکردەکانی هەڵدەبژارد، کەسانێك خوازیاری جیهاد بوون داوایان کرد ئەوان لەگەڵ خۆی ببات و یەکەم کەس، حەنزەلە کوڕی عەرادە بوو کە عوبەیدالله پێی وت: ئەو بۆ من بەجێبێڵە.

سەلەم وتی: با خۆی یەکمان هەڵبژێرێت، ئەگەر تۆی ویست، لای تۆ بمێنێتەوە و ئەگەر منی ویست، لەگەڵ مندا بێت.

دەڵێت: حەنزەلە، سەلەمی هەڵبژارد.

دەڵێت: خەڵکان لەگەڵ سەلەم دەدوان و داویان دەکرد ئەو لەگەڵ خۆیان ببات.

دەڵێت: سەللە کوڕی ئەشیمی عەدەوی هاتە دیوان و نووسەر پێی وت: ئەی باوکی سەهبا، ناوت بنووسم، ئەم سەفەرە هەم جیهادە و هەم تالآنی.

سەللە وتی: لەخوا دەپاڕێمەوە و تێدەفکرم. بەردەوام خۆی دوا دەخست. هاوسەرەکەی مەعازە کچی عەبدوڵلە پێی وت: بۆ ناوی خۆت نانووسیت؟

وتی: با بزانم.

دواتر نوێژی خوێند و لەخواوەند پاڕایەوە.

دەڵێت: لەخەودا بینی کە: کەسێك هاتە لای و وتی: بەڕێکەوە چوونکە بەخواستی خواوەند سوودت دەست دەکەوێت و ڕزگار دەبیت.

دەڵێت: ڕۆشتە لای نووسەر و وتی: ناوم بنووسە.

وتی: کاری ناو نووسین تەواو بووە، بەلآم تۆ بەجێناهێڵین، ناوی خۆی و کوڕەکەی نووسی و کاتێك سەلەم بەڕێدەکەوت، ئەوی لەگەڵ یەزید کوڕی زیاد ڕەوانە کرد. سەللە ڕێگەی سیستانی گرتەبەر.

دەڵێت: سەلەم بەڕێکەوت، دایکی محەممەد کچی عەبدوڵلە کوڕی عوسمان کوڕی ئەبی ئەلعاسی سەقەفی لەگەڵ ئەودا بوو. ئەو یەکەم ژنی عەرەب بوو

لەڕووبار پەڕاندیانەوە.

عوسمان کوڕی حەفسی کرمانی دەڵێت: کارگوزارانی خوراسان دەڕۆشتنە جەنگ و کاتێك زستان دەستی پێدەکرد، دەستیان لەجەنگ هەڵدەگرت و بۆ مەروی شاهجان دەگەڕانەوە. کاتێك موسوڵمانان دەگەڕانەوە، پاشاکانی خوراسان لەیەکێك لەشارەکانی خوراسانی نزیك خارەزم کۆدەبوونەوە و پەیمانیان دەبەست بۆ جەنگی یەك ڕیز نەبەستن و کەس، هانی کەسی دیکە نەدات.

دەڵێت: بەمشێوەبوو کەموسوڵمانان داوایان لەفەرمانڕەواکانی خۆیان دەکرد بۆ جەنگی ئەو شارە بڕۆن بەڵام ڕازی نەدەبوون. کاتێك سەلەم هاتەخوراسان، جەنگی دەستپێکرد و یەکێك لەجەنگەکان لەزستان ڕوویدا.

دەڵێت: موهەلیب بەپێداگرییەوە داوای لەسەلەم کرد بەرەو ئەو شارە ڕەوانەی بکات. سەلەم، شەش هەزار کەس و بەوتەیەك چوار هەزار کەسی لەگەڵدا نارد. موهەلیب گەمارۆی خستەسەر شارەکە و داوای کرد ملکەچی و گوێڕایەڵی خۆیان نیشان بدەن بەڵام ئەوان خوازیاری ئاشتی بوون بەو مەرجەی تەنیا (فدیە) بدەن. موهەلیب ڕازی بوو و لەسەر بیست و چەند هەزار هەزار (دینار یا درەم!) پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەستن.

دەڵێت: لەکاتی وەرگرتنی مەرجەکانی پەیمانی ئاشتی، ئەو سەری بەنیوەی بەها و چوارپێی بەنیوەی بەها و پێستەی بەنیوەی بەها وەردەگرت و بەمشێوەیە بڕی پەنجا هەزار هەزاری لەوان وەرگرت. بەم کارەی پێگەی موهەلیب لای سەلەم بەرز بوویەوە. سەلەم لەناو تاڵانییەکان، ئەوەی بەدڵی بوو، هەڵیبژارد و بەسنورداری مەرو، بۆ یەزید کوڕی معاویەی نارد و هەروەها دەستەیەك لەگەورەکانی بۆ لای ئەو ڕەوانە کرد.

ئیسحاق کوڕی ئەییووب دەڵێت: سەلەم هاوڕێ لەگەڵ هاوسەرەکەی، دایکی محەممەد کچی عەبدوڵڵە بۆ جەنگی سەمەرقەند ڕۆشت و لەوێ کوڕێکی بۆ هاتەدنیا و ناویاننا، سەغدا.

حەسەن کوڕی ڕەشیدی دوزگانی، لەزمانی یەکێك لەخەڵکانی خوزاعە دەگێڕێتەوە: لەگەڵ سەلەم کوڕی زیاد بۆ جەنگی خارەزم ڕۆشتم و لەسەر بڕە

پارەیەکی زۆر پەیمانی ئاشتییان بەست، دواتر ڕێگەی سەمەرقەندی گرتەبەر و خەڵکەکەی ڕێگە چارەی ئاشتییان گرتەبەر. دایکی محەممەد، هاوڕێیەتی دەکرد و لەم جەنگەدا کوڕێکی بۆ هێنایە دنیا.

دەڵێت: دایکی محەممەد، کەسی بۆ لای ژنی فەرمانڕەوای سەغد نارد و بڕێك زێڕی بەقەرز وەرگرت و ئەو، تاجەکەی بۆ دایکی محەممەد نارد و کاتێك گەڕانەوە، تاجەکەی لەگەڵ خۆی هێنا.

لەم ساڵەدا یەزید، عەمرۆ کوڕی سەعید کوڕی عاسی لەفەرمانڕەوایەتی مەدینە لابرد و وەلید کوڕی عوتەبەی لەو شارە دانا.

باوکی مەعشەر دەڵێت: یەزید کوڕی معاویە، عەمرۆ کوڕی سەعیدی لەمانگی زیحەججە لابرد و وەلید کوڕی عوتەبەی وەك کارگوزاری مەدینە دەستنیشان کرد. ئەو دوو جار ڕێوڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. لەساڵی شەست و یەك و ساڵی شەست و دوو.

لەم ساڵەدا کارگوزاری یەزید کوڕی معاویە لەبەسرە و کوفە، عوبەیداللە کوڕی زیاد بوو.

کارگوزاری مەدینە، لەکۆتایی ساڵدا، وەلید کوڕی عوتەبە بوو.

کارگوزاری سیستان و خوراسان، سەلەم کوڕی زیاد بوو.

کاروباری دادی بەسرە لەئەستۆی هوشام کوڕی هوبەیرەدا بوو.

کاروباری دادی کوفە لەئەستۆی شورەیحدا بوو.

لەم ساڵەدا کوڕی زوبەیر دژایەتی لەگەڵ یەزید دەستپێکرد و خەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە.

## لابردنی عەمرۆ کوڕی سەعید و کارگوزاری وەلید کوڕی عوتەبە

هۆکاری لابردنی عەمرۆ کوڕی سەعید و ئاشکرابوونی بانگەوازەکەی کوڕی زوبەیر، وەك عەبدولمەلیك کوڕی نەوفل دەیگێڕێتەوە، ئەوە بوو کاتێك حسەین کوژرا، کوڕی زوبەیر لەگەڵ خەڵکانی مەککە قسەی کرد و کوژرانی ئەوی بەگرنگ لەقەڵەمدا و سەرکۆنەی خەڵکی کوفە و عێراقی کرد. دوای سپاسکردنی خواوەند و ناردنی درووود بۆ پێغەمبەر (د.خ)، وتی: خەڵکانی عێراق خیانەتکارانی

ستەمكارن جگە لەدەستەیەكیان و خەڵكانی كوفە خراپترینی خەڵكانی عێراقن، ئەوان بانگێشتی حسەین كوڕی عەلییان كرد بۆ ئەوەی پشتیوان و هاوكاری بن و وەك خەلیفە، دەستنیشانی بكەن، كاتێك ڕۆشتە لایان، هێرشیانكردەسەر و پێیان وت: یا تەسلیم بە، یا بەئاشتی تۆ بۆ بارەگای كوڕی زیاد دەبەین تا فەرمانی خۆی سەبارەت بەتۆ دەربكات یا بۆجەنگ ئامادە بە. حسەین دەیزانی كەژمارەی هاوەڵانی كەمە و خواوەند كەسی لەكوشتنی خۆی ئاگادار نەكردۆتەوە، بەڵام ئەو مەرگی شەرافەتمەندانەی بەژیانێكی كەم بەها هەڵبژارد. خواوەند حسەین ببەخشێت و بكوژەكەی ڕیسوا بكات. سوێند بەخواوەند، دژایەتی و نافەرمانی حسەین وانەیەكە بۆ هەمووان تا كەس پشت بەوان نەبەستێت، ئەوەی چارەنووس دیاریكردبێت، ڕوودەدات و كاتێك خواوەند مەبەستی ئەنجامدانی كارێك بكات، كەس ناتوانێت ڕێگری بكات. دوای حسەین، چۆن دەتوانین باوەڕ بەم خەڵكە بكەین و وتەكانیان بەڕاست بزانین و دڵ بەپەیمان و بەیعەتی ئەوان خۆش بكەین! نا، شیاوی ئەوە نین. سوێند بەخوا كەسێكیان كوشت كەشەوان، نوێژی زۆری دەخوێند و زۆربەی ڕۆژەكان بەڕۆژوو بوو و زیاتر لەو كەسانە شیاوی سەركەوتن و ژیان بوو چوونكە كەسێكی خۆپارێز و ڕاستكردار بوو. سوێند بەخوا هەمیشە گوێی لەقورئان دەگرت و گرنگی بەگۆرانی نەدەدا و لەترسی خواوەند، دەگریا و گۆرانی نەدەخوێند. هیچكات ماڵی حەرامی نەدەخوارد و مزگەوتی بۆ ڕاو و شكار بەجێنەدەهێشت (مەبەستی لەم وتەیە یەزید بوو كەزۆربەی كاتەكانی بەڕاو بەسەر دەبرد).

دەڵێت: هاوەڵانی خوێنیان گەرم بوو، وتیان: ئەی پیاو، بەیعەتی خۆت ئاشكرا بكە چوونكە دوای حسەین كەس نەماوە، دژایەتی تۆ بكات.

دەڵێت: كوڕی زوبەیر بەشێوەیەكی نهێنی بەیعەتی لەگەڵ خەڵكان دەكرد و وای نیشان دەدا كەپەنابەری ماڵی خوایە.

دەڵێت: كوڕی زوبەیر پێی وتن: پەلە مەكەن.

لەو كاتەدا، عەمرۆ كوڕی سەعید كوڕی عاس كارگوزاری مەككە بوو و بارودۆخی لەكوڕی زوبەیر و هاوەڵانی دژوار دەكرد بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا لەگەڵیان دەگونجا. كاتێك یەزید ئاگادار بوویەوە كەكوڕی زوبەیر چەندین دەستەی لەمەككە

کۆکردۆتەوە، سوێندی خوارد بەزنجیر بیبەستێتەوە.

دەڵێت: یەزید زنجیرێکی زیوینی نارد، نێردراو بەزنجیرەکەوە لای مەروان کوڕی حەکەم تێپەڕی و لەبەسەرهاتی زنجیرەکە ئاگاداری کردەوە. مەروان هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( بیپارێزە چوونکە پیاوی بەهێز ئەو کارە ناکات

و پیاوی ناتەوان سەبارەت بەمە دەدوێت)).

دەڵێت: نێردراو مەروانی بەجێهێشت و ڕۆشتە لای کوڕی زوبەیر. پێشتر کوڕی زوبەیریان لەگفتوگۆکەی نێوان نێردراو و مەروان ئاگادار کردبوویەوە و وتبووی: نا، هەرگیز، سوێند بەخوا من ئەو پیاوە ناتەوانە نابم. بەڕێزەوە نێردراوەکەی گەڕاندەوە.

دەڵێت: پێگە و دەسەڵاتی کوڕی زوبەیر لەمەککە بەرز بوویەوە و خەڵکانی مەدینە نامەیان بۆ نووسی و دەیانوت: هەنووکە کەحسەین کوڕی عەلی کوژراوە، بۆ وەرگرتنی خەلافەت کەس کێبڕکێی کوڕی زوبەیر ناکات.

عەبدولعەزیز کوڕی مەروان دەڵێت: کاتێک یەزید کوڕی معاویە، کوڕی عەزای ئەشعەری و مەسعەدە و هاوەڵانی بۆ لای عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر نارد تا تەوق لەگەردن بیبەنە شام بۆ ئەوەی سوێندەکەی یەزید نەکەوێت، زنجیرێکی زیوین و کڵاوێکی خەزی نارد. باوکم، من و براکەیشمی لەگەڵ ئەواندا نارد و وتی: کاتێک کوڕی زوبەیرتان لەپەیامی یەزید ئاگادار کردەوە، یەکتان هۆنراوەیەک بخوێنێتەوە بەم ناوەرۆکە:

(( بیپارێزە چوونکە پیاوی بەهێز ئەو کارە ناکات

و.... هتد))

دەڵێت: کاتێک نێردراوان پەیامی کوڕی یەزیدیان گەیاند، لێی نزیک بوومەوە، براکەم پێی وتم: تۆ بیخوێنەرەوە و عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر بیستی و وتی: کوڕەکانی مەروان، بیستم چیتان وت و دەزانم دەتانەوێت چی بڵێن. بەباوکتان بڵێن. من کەسێکم تەنیا لەبەرابەر ڕاستی تەسلیم دەبم.

دەڵێت: نازانم کاری کامیان سەرسوڕهێنەرتر بوو.

سەعید کوڕی عەمرۆ کوڕی سەعید دەڵێت: کاتێک عەمرۆ کوڕی سەعید بینی

خەڵکان خوازیاری بەستنی بەیعەت لەگەڵ کوڕی زوبەیرن و گومانیکرد پێگە و دەسەڵاتی فراوان دەبێت، عەبدوڵڵە کوڕی عەمرۆ کوڕی عاسی بانگکرد (( یەکێکە لەئەسحابەکان و لەگەڵ باوکی سەفەری میسری کردبوو و لەوێ کتێبی دانیالی خوێندبوویەوە و قوڕەیشییەکان ئەویان بەزانایەکی گەورە دەزانی)) و وتی: لەکاروباری ئەو پیاوە ئاگادارم بکەرەوە، بەبۆچوونی تۆ بەمەبەستەکەی دەگات؟ هەروەها پێم بڵێ سەرئەنجامی بەسەرهاتی یەزید و ئەو بەکوێ گەیشت؟

عەبدوڵڵە وتی: یەزید یەکێك لەو پاشایانەی هەمیشە بەمەبەستی خۆی دەگات و تا ئەو کاتەی دەمرن، پاشا دەبن.

دەڵێت: بەمشێوەیە عەمرۆ کوڕی سەعید گوشارەکانی بۆ سەر کوڕی زوبەیر و هاوەڵانی زیادکرد بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا هیچکات ڕێگەی توندوتیژی نەگرتەبەر.

دەڵێت: وەلید کوڕی عوقبە و کەسانێك لەمناڵەکانی ئومەییە بەیەزید کوڕی معاویەیان وت: ئەگەر عەمرۆ کوڕی سەعید دەیویست، کوڕی زوبەیری دەگرت و ڕەوانەی بارەگای تۆی دەکرد. یەزید، وەلید کوڕی عوتبەی بۆ فەرمانڕەوای حیجاز ڕەوانە کرد و عەمرۆ کوڕی سەعیدی لەو پێگەیە دوورخستەوە.

لابردنی عەمرۆ و فەرمانڕەوایەتی وەلید لەم ساڵە، یانی ساڵی شەست و یەکەم ڕوویدا.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: گێڕانەوەی محەممەد کوڕی عومەر بەمشێوەیە کەیەزید، عەمرۆ کوڕی عاسی لەیەکی زیحەججەی ساڵی شەست ویەك لابرد و وەلید کوڕی عوتبەی وەك کارگوزاری مەدینە دیاریکرد کە لەساڵی شەست و یەك ڕێوڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا و کاروباری دادی بەباوکی ڕەبیعەی عامری سپارد.

باوکی مەعشەر دەڵێت: لەساڵی شەست و یەکەم، وەلید کوڕی عوتبە ڕێوڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا و هەموو مێژوونووسان لەمبارەوە هاودەنگن.

لەم ساڵەدا کارگوزاری کوفە و بەسرە، عوبەیدالله کوڕی زیاد بوو. کاروباری دادی کوفە لەئەستۆی شورەیح و دادی بەسرە لەئەستۆی هوشام کوڕی هوبەیرە بوو. فەرمانڕەوای خوراسان، سەلەم کوڕی زیاد بوو.

## ڕووداوەکانی ساڵی شەست و دووەم

یەکێك لەپێشهاتەکانی ئەم ساڵە ئەوە بوو خەڵکی مەدینە ڕۆشتنە لای یەزید کوڕی معاویە.

## هۆکاری ڕۆشتنی خەڵکی مەدینە بۆ لای یەزید کوڕی معاویە

وەك لەگێڕانەوەی عەبدوڵڵە کوڕی عوروەدا هاتووە، هۆکارەکەی ئەوە بوو کاتێك یەزید، وەلید کوڕی عوتەبەی بۆ فەرمانڕەوایەتی حیجاز نارد و عەمرۆ کوڕی سەعیدی لابرد و وەلید هاتە مەدینە، ژمارەیەکی زۆر لەکۆیلە و کەسەکانی عەمرۆی گرت و زیندانی کردن. عەمرۆ سەبارەت بەوان قسەی لەگەڵ وەلید کرد بەڵام بەئازاد کردنیان ڕازی نەبوو و وتی: ئەی عەمرۆ، ئارام بگرە.

دەڵێت: برای عەمرۆ، ئەبان کوڕی سەعید وتی: عەمرۆ ئارام بگرێت؟ سوێند بەخوا ئەگەر ئاگر بەدەستەوە بگرێت و ئێوەیش ئاگر بەدەستەوە بگرن، دەستی لێبەرنادات تا دەست بەردەدەن.

دەڵێت: عەمرۆ ڕۆشت و لەدوو مەنزڵی مەدینە جێگیر بوو و نامەی بۆ کۆیلە و کەسانی خۆی نووسی کەبۆ هەرکام لەئێوە، وشترێك و کەرەستەی پێویست دەنێرم، وشترەکان لەبازاردا دەخەوێنن، کاتێك نێردراوەکەی من هاتە لاتان، دەرگای زیندان بشکێنن، هەرکام لەئێوە سوار وشترەکەی خۆی بێت و بێتە لای من.

دەڵێت: نێردراوی عەمرۆ هات و وشترەکانی کڕی و کەرەستەی پێویستی ئامادە کرد. وشترەکانی لەبازار خەواند و ڕۆشت و ئەوانی ئاگادار کردەوە. گیراوەکان دەرگای زیندانەکەیان شکاند و سوار وشترەکان، پەیوەستی عەمرۆ کوڕی سەعید بوون و کاتێك پێی گەیشتنەوە، عەمرۆ گەیشتبووە لای یەزید کوڕی معاویە.

دەڵێت: کاتێك عەمرۆ ڕۆشتە لای یەزید، یەزید بەخێرهاتنی کرد و لەنزیك خۆیەوە داینیشاند وسەرکۆنەی کرد بۆ لەئەنجامدانی فەرمانەکانی سەبارەت

بەکوڕی زوبەیر کەمتەرخەمی کردووە و تەنیا بەپێی بۆچوونی خۆی کاروبارەکانی ڕاپەڕاندووە؟

عەمرۆ وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئامادە ئەو شتانە دەبینێت کەغایب نایانبینێت، زۆربەی خەڵکانی مەدینە و مەککە پشتگیرییان لێدەکرد و بەخەلافەتی ئەو ڕازی بوون و بەنهێنی و ئاشکرا یەکیان بۆ بەستنی بەیعەت لەگەڵ کوڕی زوبەیر هان دەدا. سوپایەکم لەبەردەستا نەبوو پشتی پێببەستم، کەسێکی وشیار بوو و خۆی لەمن بەدوور دەگرت، ڕێگەی سازانم لەگەڵ ئەو گرتەبەر تا بتوانم فریوی بدەم و بەسەریدا زاڵ ببم، لەگەڵ ئەوەیشدا بارودۆخم لێدژوار کرد و ڕێگەی زۆر کارم لێگرت کەئەگەر دەیتوانی ئەنجامیان بدات، هاوکاری مەبەستەکەی دەکرد. لەمەککە و لەسەر ڕێگە و دۆڵەکان کەسانێکم وەك پاسەوان و چاودێر دانا بوو تا ڕێگە نەدەن کەس بێتە ناو شارەکە پێش ئەوەی من لەناوی خۆی و ناوی باوکی و ئەوەی لەکام دیارەوە هاتووە و بۆ چی هاتووە و چی دەوێت ئاگادار بکەنەوە. ئەگەر لەهاوەڵانی کوڕی زوبەیر دەبوو یا مەبەستی هاوکاری کردن و پەیوەست بوون بەکوڕی زوبەیری دەکرد، دەمگەڕاندەوە و جیاواز لەو شێوە، ڕێگەم پێدەدا. وەلیدت وەك کارگوزار ڕەوانە کرد، بەمزوانە لەکار و کردەوەکانی ئەو ئاگادار دەبیتەوە و ئەگەری هەیە دوای ئەوە، ڕێزی من و کارەکانم بزانیت بەخواستی خوا. ئەی سەروەری باوەڕداران، هیوادارم خواوەند کاروبارەکان بۆ تۆ ئاسان بکات و دوژمنەکەت تێکبشکێنێت.

یەزید پێی وت: تۆ لەو کەسەی ئەم شتانەی سەبارەت بەتۆ وت و منی دژی تۆ هەڵخراند، ڕاستگۆتری و یەکێکی لەکەسە بڕواپێکراوەکان کەپشتم بەهاوکاری تۆ بەستووە و بۆ چارەسەر کردنی کێشە و ئارێشەکان یا ڕووبەڕووبوونەوەی کارەساتە گەورەکان پێویستم پێتە.

عەمرۆ وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، کەس بۆ بەهێزی دەسەڵاتی تۆ و لاوازی دوژمنەکانت و سەختگیری لەگەڵ نەیارەکانت بەئەندازەی من تێناکۆشێت.

دەڵێت: وەلید کوڕی عوتبە لەگەڵ کوڕی زوبەیر بوو و بەردەوام چاودێری دەکرد بەڵام کوڕی زوبەیر خۆی بەدوور دەگرت و کاتێك حسەین کوژرا، نەجدە

کوڕی عامری حەنەفی لەیەمامە شۆڕشی کرد و لەو کاتەدا، کوڕی زوبەیریش ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە. وەلید لەعەرەفات دەگەڕایەوە بەڵام کوڕی زوبەیر لەگەڵ کەسەکانی دەمایەوە. نەجدەیش لەگەڵ کەسەکانی خۆی دەمایەوە و کەس لەوان ڕازی نەبوو شوێن دەستەکەی دیکە بکەوێت. نەجدە کوڕی زوبەیری دەبینی و بەڕادەیەك ڕێزی دەگرت کەخەڵك گومانیان دەکرد بەزووترین کات بەیعەتی لەگەڵ دەبەستێت.

دەڵێت: کوڕی زوبەیر، فێڵی لەوەلید کوڕی عوتبە کرد و نامەی بۆ یەزید کوڕی معاویە نووسی: پیاوێکی ڕووگرژت بۆ ئێمە ناردووە و گرنگی بەڕاستی و دروستی کاروبارەکان نادات وگوێ لەوتەی کەسانی بیرمەند و بیریار ناگرێت. ئەگەر پیاوێکی نەرم و نیان و چاکەکارت وەك فەرمانڕەوای ئێمە ڕەوانە دەکرد، هیواداربووین ئاڵۆزی و گرژییەکان نەمێنێت و ئەو دووبەرەکییەی دروست بووە، کۆتایی پێبێت. لێکۆڵینەوە لەمکارە بکە چوونکە بەرژەوەندی هەمووان لەوەدایە. والسلام.

دەڵێت: وەك لەگێڕانەوەی حەمید کوڕی حەمزە، یەکێك لەکۆیلەی منداڵەکانی ئومەییەدا هاتووە، یەزید کەسی نارد و وەلید کوڕی عوتبەی لەسەر کار لابرد و عوسمان کوڕی محەممەد کوڕی ئەبی سوفیانی وەك فەرمانڕەوا ڕەوانە کرد.

دەڵێت: عوسمان گەنجێکی لەخۆبایی و تازەکار و بێ ئەزموون بوو، ساردی و گەرمی ڕۆژگاری نەچێشتبوو و گرنگی بەکاروباری فەرمانڕەوایەتی نەدەدا.

دەڵێتك عوسمان دەستەیەك لەخەڵکانی مەدینە و لەناو ئەوان عەبدوڵڵە کوڕی حەنزەلەی غوسەیلی ئەنساری و عەبدوڵڵە کوڕی باوکی عەمرۆ مەخزومی و مونزەر کوڕی زوبەیر و کەسانێکی دیکە لەگەورەکانی شاری بۆ لای یەزید نارد. کاتێك گەیشتنە لای یەزید، ڕیزی گرتن و چاکەی لەگەڵ کردن و دیاری گرانبایی پێبەخشین. دواتر گەڕانەوە و هەموویان لەمەدینە کۆبوونەوە جگە لەمونزەر کوڕی زوبەیر کەڕۆشتە بەسرە بۆ لای عوبەیداللە کوڕی زیاد. یەزید، سەد هەزار درەمی وەك دیاری بەکوڕی زوبەیر بەخشیبوو.

دەڵێت: کاتێك ئەو دەستەیە هاتنە مەدینە، لەناو خۆیاندا گفتوگۆیان کرد

وجوێنیان بەیەزیدا و سەرکۆنەیان کرد و وتیان: لای کەسێکەوە دەگەڕێینەوە کەدینی نییە، شەراب دەخوات و تەپڵ دەژەنێت و کەنیزەکان لای ئەو سەرقاڵی خوێندن. گەمە لەگەڵ سەگ دەکات و بۆتە هاودەمی کۆیلەکان. شایەت بن ئێمە ئەومان لەسەر کار لابردووە و کەسانێکی دیکە شوێنیکەوتوون.

عەبدولمەلیك کوڕی نەوفل دەڵێت: خەڵکان لەدەوری عەبدوڵڵە کوڕی حەنزەلەی غوسەیل کۆبوونەوە و بەیعەتیان لەگەڵ بەست و ئەویان کردە سەرکردە و سالاری خۆیان.

محەممەد کوڕی عەبدولعەزیز دەڵێت: کاتێك مونزەر لای یەزید کوڕی معاویە گەڕایەوە و ڕۆشتە بەسرە بۆ لای کوڕی زیاد، عوبەیداڵڵە ڕێزی گرت چوونکە یەکێك لەهاوڕێ نزیکەکانی ئەو بوو. لەناکاو نامەیەك لەیەزید کوڕی معاویەی بەدەست گەیشت و فەرمانی پێدابوو مونزەر کوڕی یەزید بگرێت تا فەرمانی خۆی سەبارەت بەو ڕەوانە بکات.

دەڵێت: بەلام عوبەیداڵڵە کوڕی زیاد نەیدەویست مونزەر بگرێت چوونکە میوانی بوو. عوبەیداڵڵە، مونزەی بانگکرد و لەنامەکەی یەزید ئاگاداری کردەوە و وتی: تۆ هاوڕێی زیاد بوویت و هەنووکە میوانی منیت، چاکەم لەگەڵ کردوویت و ئێستا دەمەوێت دووبارە چاکەخوازی تۆ بم. کاتێك خەڵکان لەدەوری من کۆبوونەوە، هەستە و داوای مۆڵەتم لێبکە تا بۆ ویلایەتەکەی خۆت بگەڕێیتەوە، کاتێك وتم: نە، لای من بمێنەرەوە چوونکە ڕیزی زیاتر لێدەگیرێت، بڵێ، من لەوێ مڵکێکم هەیە و دەبێت پێی ڕابگەم و ناچارم بگەڕێمەوە، مۆڵەتم بدە. بەمشێوەیە من مۆڵەتت پێدەدەم و دەتوانی بۆ لای کەسەکانی خۆت بگەڕێیتەوە.

دەڵێت: کاتێك خەڵکان لای عوبەیداڵڵە کۆبوونەوە، مونزەر هەستا و داوای مۆڵەتی کرد. عوبەیداڵڵە وتی: نا، لای من بمێنەرەوە، ڕێزت دەگرم و هاوکاریت دەکەم.

مونزەر وتی: مڵکێکم هەیە و ناچارم بگەڕێمەوە. مۆڵەتم پێبدە.

عوبەیداڵڵە مۆڵەتی پێدا و ئەو بەرەو حیجاز گەڕایەوە. کاتێك گەیشتە لای خەڵکانی مەدینە، یەکێك بوو لەو کەسانەی خەڵکی دژی یەزید هاندەدا، لەوتەکانی ئەوە بوو: سوێند بەخوا یەزید سەد هەزار درەمی پێبەخشیم بەلام ئەمە ڕێگر نابێت لەوەی لەکردار و کردەوەکانی ئەو ئاگادارتان بکەمەوە. سوێند بەخوا

شـەراب دەخواتـەوە و ئەوەنـدە مەسـت دەبێـت، نوێـژەکانی بـیر دەچـێت. هـەموو ڕاستیی و کەموکوڕییەکانی یەزیدی باس کرد.

دەڵێت: سـەعید کـوڕی عـەمرۆ لەکوفـە دەیـوت کاتێـك یەزیـد وتـەکانی مـونزەری ...ەبارەت بەخۆی بیست، وتی: سوێند بەخوا ڕێـزم گـرت و پێگـەییم بـەرز کـردەوە، بەڵام ئەوەی کرد کەبینیتان و بیستان. ئەوی بەدرۆزن و ناسپاس ناوزەد کرد.

سـەعید کـوڕی زەیـد دەڵێـت: یەزیـد، نـەعمان کـوڕی بەشـیری ئەنـساری نـارد و وتی: بڕۆ لای کەسان و خەڵکەکەی خۆت و لەو کارانەی ئەنجامی دەدەن، دووریـان بخەرەوە چوونکە ئەگەر ئەوان شۆڕش نەکەن، خەڵکان بوێری دژایـەتی کردنـی مـن ناکەن. کەسانێك لەتایەفەی مـن لەمەدینـە ژیـان بەسـەر دەبـەن کەحـەز ناکـەم ئـەوان بەشداری ئەم شۆڕشە بن و لەناو بچن.

دەڵێت: نەعمان کوڕی بەشیر بۆ لای خەڵکەکـەی ەڕایـەوە و ئـەوانی کۆکردەوە و پێـشنیاری گوێڕایـەڵی و ملکەچـی پێـدان و لەمەترسـییەکانی ئـاژاوە و شـۆڕش ئەوانی ئاگـادار کـردەوە، وتـی: ئێـوە توانـای خـۆڕاگری لەبەرابـەر خـەڵکی شـامتان نییە.

دەڵێت: عەبدوڵڵە کوڕی مـوتیعی عـەدەوی پێـی وت: ئـەی نـەعمان، بـۆ دەتـەوێت خەڵکانی ئێمە بڵاوەی لێبکەن و ئاژاوە و دووبەرەکی لەناو ئێمەدا دەنێیتەوە؟

نـەعمان وتـی: سـوێند بـەخوا دەبیـنم کاتێـك خـەڵکان لـەدەورت کۆبوونـەوە و سواران بەشمـشێر لەسـەر و ناوچـاوی یـەك دەدەن، سـوار ئیـسترەکەت دەبیـت و ڕێگەی مەککە دەگریتەبەر و ئەم داماوانە –یـانی ئەنـسار– بەجێدێڵێـت تـا لـەکۆڵان و مزگەوتەکان و لەبەر دەرگای ماڵەکانیان بکوژرێن.

دەڵێت: خەڵکان گرنگییان بەوتەکانی نەدا بەڵام پێشبینییەکانی هاتەدی.

لـەم سـاڵەدا وەلیـد کـوڕی عوتـەبە ڕێـوڕەسمی حـەجی لەگـەڵ خـەڵکان ئەنجامـدا. کارگوزارانی عێراق و خوراسان هەمان کەسانی ساڵی پێشووبوون.

لـەم سـاڵەدا وەك ئامـاژەیـان پێـداوە، محـەمەـد کـوڕی عەبدوڵڵـە کـوڕی عـەباس چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

ساڵی شەست و سێ دەستی پێکرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی شەست و سێی کۆچی

لەڕووداوەکانی ئەم ساڵە ئەوە بوو خەڵکی مەدینە عوسمان کوڕی محەممەد کوڕی ئەبی سوفیان، کارگوزاری یەزید کوڕی معاویەیان لەمەدینە دەرکرد و خەلافەتیان لەیەزید سەندەوە و گەمارۆیان خستە سەر منداڵەکانی ئومەییە لەمەدینە.

حەبیب کوڕی کورە دەڵێت: کاتێك خەڵکی مەدینە لەگەڵ عەبدوڵڵە کوڕی حەنزەلەی غوسەیل، بۆ لابردنی یەزید کوڕی معاویە بەیعەتیان بەست، هێرشیان کردە سەر عوسمان کوڕی محەممەد و منداڵەکانی ئومەییە و کۆیلە و کەسوکارەکانیان و ئەو قوڕەیشییانەی لەگەڵ ئەواندا بوون. نزیکەی هەزار کەس دەبوون و هەموویان پێکەوە ڕوویانکردە ماڵی مەروان کوڕی حەکەم. خەڵك دەوری ماڵەکەیان گرت بەڵام گەمارۆکە زۆر دژوار نەبوو.

بێژەر دەڵێت: منداڵەکانی ئومەییە، حەبیب کوڕی کورەیان بانگکرد. مەروان کوڕی حەکەم و عەمرۆ کوڕی عوسمان کوڕی عەفان کەکاروباری ئەوانی ڕادەپەڕاند، کەسیان بەدوای حەبیبدا نارد. عوسمان کوڕی محەممەد، کارگوزاری مەدینە، کەم تەمەن و بێ ئەزموون بوو.

حەبیب کوڕی کورە دەڵێت: لەگەڵ مەروان بووم، ئەو و دەستەیەك لەمنداڵەکانی ئومەییە، بەمندا نامەیەکیان بۆ یەزید کوڕی معاویە نارد. عەبدولمەلیك کوڕی مەروان نامەکەی هەڵگرت و لەگەڵ مندا هاتە سەنیەت ئەلوەداع و لەوێ نامەکەی تەسلیم کرد، وتی: دوانزە ڕۆژ بۆ ڕۆشتنت دیاریدەکەم و دوانزە ڕۆژ بۆ گەڕانەوەت. بیست و چوار ڕۆژی دیکە لێرەبە و بەخواستی خواوەند دەبینی لێرە چاوەڕێت دەکەم.

ناوەرۆکی نامەکە:

(( بەناوی خواوەندی بەخشندەی میهرەبان

بەڵام دواتر، ئێمەیان لەماڵی مەروان کوڕی حەکەم گەمارۆداوە و ڕێگەی ئاویان لێگرتووین و بەردبارانمان دەکەن. هاوکاری... هاوکاری....))

دەڵێت: نامەکەم هەڵگرت و ملی ڕێگەم گرتەبەر تا گەیشتمە لای یەزید کە لەسەر چوارپایەیەك دانیشتبوو، بەهۆی ئازاری قاچی، قاچی خستبووە ناو تەشتێك ئاو. نامەکەی خوێندەوە، دواتر هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( سرشتی من خۆڕاگری بوو، بەڵام گۆڕییان

منیش لەجیاتی نەرم و نیانی

لەگەڵ خەڵکەکەی خۆم، ڕێگەی توندوتیژیم گرتەبەر)).

دواتر وتی: مەگەر منالەکانی ئومەییە و کەسوکاریان لەمەدینە هەزار کەس نین؟

دەڵێت: وتم: بۆنا، سوێند بەخوا زیاترن.

وتی: نەیاندەتوانی ماوەیەك لەڕۆژ بجەنگن؟

دەڵێت: وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، خەڵکان دژی ئەوان یەکیانگرتووە و توانای خۆڕاگرییان نییە.

دەڵێت: یەزید کەسی بۆ لای عەمرۆ کوڕی سەعید ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا لەگەڵ خەڵکان بەڕێکەوێت.

عەمرۆ وتی: ئەو ویلایەتەم بۆ تۆ پاراستبوو، کارەکانم ڕێکخستبوو، بەڵام ئێستا، خوێنی قوریشییەکانە دەڕژێت و حەز ناکەم ئەو کارە لەئەستۆ بگرم، کەسێك وەك سەرکردە دیاریبکە کەپەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ ئەواندا نەبێت.

دەڵێت: یەزید من و نامەکەی بۆ لای موسلیم کوڕی عوقبەی موڕی نارد کەپیرەپیاوێکی پەککەوتە و ناتەوان بوو، نامەکەم پێدا، خوێندییەوە و هەواڵەکانی لێ پرسیم. ئەویش هەمان وتەی یەزیدی دووبارە کردەوە، مەگەر منالەکانی ئومەییە و کەسوکاریان لەمەدینە هەزارکەس نابن؟

وتم: با، دەبن.

وتی: نەیاندەتوانی ماوەیەك لەڕۆژ بجەنگن؟ ئەوان شیاوی هاوکاری کردن نین تا ئەو کاتەی هەوڵی خۆیان بۆ بەرگریکردن لەخەلافەت و دژایەتی کردنی دوژمن، نیشان بدەن.

دەڵێت: هاتە لای یەزید و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، هاوکارییان نەکە چوونکە خەڵکانێکی ڕیسوا و ناتەوانن، مەگەر نەیاندەتوانی نیوەی ڕۆژ یا بەشێکی ڕۆژ بجەنگن. ئەی سەروەری باوەڕداران، ڕێگە بدە دژی دوژمنەکانیان هەوڵەکانیان بخەنەگەڕ و ئەمەکداری و وەفاداری خۆیان بۆ ئێوە بسەلمێنن. بەمشێوەیە دەردەکەوێت کامیان بۆ گوێڕایەڵی و خەلافەتی تۆ دەجەنگێت و کامیان تەسلیم دەبێت.

وتی: هاوار لەتۆ، دوای ئەوان ژیان مانای نامێنێت، هەستە و لەگەڵ خەڵکان

بەڕێکەوە.

دەڵێت: جارچییەکەی ڕۆشتەدەر و جاڕیدا: بەرەو حیجاز بەڕێکەون، مانگانەی خۆتان بەتەواوی وەربگرن، لەگەڵ سەد دینار هاوکاری کەدەست بەجێ پێتانی دەدەن. دوانزە هەزار کەس خۆیان ئامادە کرد.

موغەیرە دەڵێت: یەزید بۆ کوڕی مەرجانەی نووسی: بۆ جەنگی کوڕی زوبەیر بەڕێکەوە.

بەڵام ئەو وتی: دوو کار بۆ ئەم خراپەکارە ناکەم: کوشتنی کوڕی پێغەمبەر (د.خ) و جەنگی کەعبە.

دەڵێت: مەرجانە ژنێکی ڕاستکردار بوو، کاتێك حسەین کوڕی عەلی کوژرا، بە عوبەیدالڵەی وت: هاوار لەتۆ، چیت کرد و چ کەسێکت کوشت؟

حەبیب کوڕی کوڕە دەڵێت: گەڕامەوە و لەماوەی دیاریکراو و لەشوێنی دیاریکراو، عەبدولمەلیکم بینی.

دەڵێت: بینیم ڕوخساری داپۆشیوە و لەژێر دارێك دانیشتووە، لەدەنگوباسەکان ئاگادارم کردەوە. شادومان بوو و ڕێگەی ماڵی مەروانمان گرتەبەر. کاتێك لەهەواڵەکە ئاگادارم کردەوە، دەستیان بەرز کردەوە و سپاسی خواوەندیان کرد.

عەبدولمەلیك کوڕی نەوفل دەڵێت: حەبیب پێی وتم کە لەماوەی دە ڕۆژدا گەیشتە شوێنی مەبەست.

دەڵێت: لەوێ نەرۆشتم تا چاوم بەیەزید کوڕی معاویە کەوت چوونکە بۆ سەردانی سوپا، کۆشکی بەجێهێشتبوو. شمشێرێکی هەڵواسیبوو، کەوانێکی عەرەبی بەشانەوە بوو و هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

((کاتێك شەو بەکۆتا دێت

و خەڵك لەوادی ئەلقورەی دابەزین

ئەبوبەکر ئاگادار بکەنەوە

کەبیست هەزار کەس لەپیر و گەنجەکان دەتوانی ببینی

کەهەموویان مەستن

یا دەستەیەکیان بێدارن و خەویان زڕاوە

سەرسوڕماوە لەو کافرەی فێڵ لەکاروباری دین دەکات

و لەدەشتێکی کراوە، مەنزڵی هەیە! سەیرە!)).

عەبدولمەلیك کوڕی نەوفل دەڵێت: ئەم سوپایە بەسەرکردایەتی موسلیم کوڕی عوقەبە لەشامەوە بەڕێکەوت. یەزید پێی وت: ئەگەر پێشهاتێك بۆ تۆ ڕوویدا، حسەین کوڕی نەمیری سەکونی وەك سەرکردەی سوپاکە دەستنیشان بکە.

هەروەها پێی وت: سێ ڕۆژ بانگێشتی گەڕانەوەیان پێبکە، ئەگەر ڕازی بوون، باشتر، جیاواز لەوە ئاگری جەنگ هەڵبگیرسێنە و کاتێك سەرکەوتنت بەدەست هێنا، بۆ ماوەی سێ ڕۆژ مەدینە بەسوپاییەکان بسپێرە و ئەوەی سامان و کۆیلە و خواردن لەشارەکەدا بێت، هی سوپاییەکانە. دوای سێ ڕۆژەکە لەتالآنکردنی شارەکە دەست هەڵبگرە. سەردانی عەلی کوڕی حسەین بکە و چاکەکاری لەگەڵ بکە و لەخۆتی نزیك بکەرەوە چوونکە بەشداری ئەو شۆڕشەی نەکردووە و نامەی ئەوم بەدەست گەیشتووە.

دەڵێت: عەلی کوڕی حسەین لەپێشنیار و ڕاسپاردەکانی یەزید بۆ موسلیم کوڕی عوقەبە بێئاگا بوو.

دەڵێت: کاتێك منداڵەکانی ئومەییە، بەرەو شام ڕۆشتن، عەلی کوڕی حسەین، پەنایدا بوو بەمەروان کوڕی حەکەم و هاوسەرەکەی، عایشە کچی عوسمان کوڕی عەفان کەدایکی ئەبان کوڕی مەروان بوو.

محەممەد کوڕی عومەر دەڵێت: کاتێك خەڵکانی مەدینە، عوسمان کوڕی محەممەدیان لەشارەکە دەرکرد، مەروان کوڕی حەکەم لەگەڵ عەبدوڵڵە کوڕی عومەر قسەی کرد تا کەسەکانی خۆی لای ئەو بشارێتەوە بەڵام کوڕی عومەر بەم کارە ڕازی نەبوو. مەروان لەگەڵ عەلی کوڕی حسەین قسەی کرد و وتی: ئەی باوکی حەسەن، من ماف خزمایەتیم لەسەرشانە، حەرەمی من، لەگەڵ حەرەمی تۆ بێت.

وتی: ئەو کارە دەکەم. مەروان حەرەمی خۆی بۆ لای حسەین کوڕی عەلی نارد و ئەو، ماڵ و منداڵی خۆی و مەروانی برد و لەیەنبەع نیشتەجێی کردن. مەروان هەمیشە سپاسی عەلی کوڕی حسەینی دەکرد چوونکە پێشتر پەیوەندی هاوڕێیەتی لەنێوان ئەواندا دەبینرا.

عەبدولمەلیك کوڕی نەوفل دەڵێت: موسلیم کوڕی عوقەبە لەگەڵ سوپا بەڕێکەوت و کاتێك خەڵکی مەدینە لەهاتنی سوپا ئاگادار بوونەوە، هێرشیانکردە سەر منداڵەکانی

ئومەییە لەماڵی مەروان و گەمارۆیاندان، وتیان: دەستتان لێ هەڵناگرین تا ئەو کاتەی دەتانگرین و دەتانکوژین یا ئەوەی دەبێت پەیمان بدەن نابنە هۆی کارەسات بۆ ئێمە و خاڵە لاوازەکانی ئێمە بەدوژمن ناڵێن و دژی ئێمە، هاوکاری ئەوان ناکەن. بەمشێوەیە دەستتان لێهەڵدەگرین و ڕێگەتان دەدەین بڕۆن.

دەڵێت: منداڵەکانی ئومەییە پەیمانیاندا و سوێندیان خوارد زیانیان لێنەدەن و هاوکاری دوژمن نەکەن. ئەوانیان لەمەدینە دەرکرد. منداڵەکانی ئومەییە لەگەڵ باروبنە و کەرەستەکانی خۆیان ڕۆشتن تا لەوادی ئەلقورەی چاویان بەموسلیم کوڕی عوقەبە کەوت. عایشە کچی عوسمان بەرەو تایف بەڕێکەوت و لای عەلی کوڕی حسەین تێپەڕی کە لەنزیك مەدینە و لەناو مڵکەکەی خۆیدا بوو و خۆی لەکاری خەڵکانی مەدینە بەدوور گرتبوو، بەعایشەی وت: عەبدوڵڵەی کوڕم لەگەڵ خۆت بۆ تایف ببە. ئەو عەبدوڵڵەی بردە تایف تا ئەوەی شۆڕشەکەی مەدینە کۆتایی پێهات.

دەڵێت: کاتێك منداڵەکانی ئومەییە لەوادی ئەلقورەی چاویان بەموسلیم کوڕی عوقەبە کەوت، ئەو پێش هەمووان داوای عەمرۆ کوڕی عوسمان کوڕی عەفانی کرد و وتی: لەهەواڵەکانی شار ئاگادارم بکەرەوە و بۆچوونی خۆتم پێ بڵێ.

عەمرۆ وتی: ناتوانم هیچت پێبڵێم چوونکە پەیمانیان لێسەندووین کەهاوکاریتان نەکەین و لەخاڵە لاوازەکانی ئەوان و چۆنیەتی دزە کردنە ناو شارەکە ئاگادارتان نەکەینەوە.

دەڵێت: موسلیم سەرکۆنەی کرد و وتی: ئەگەر کوڕی عوسمان نەدەبوویت، دەمکوشتیت. سوێند بەخوا دوای تۆ، بەوەلامی لەم چەشنەی هیچ قورەیشییەك ڕازی نابم.

دەڵێت: عەمرۆ بۆ لای هاوەڵانی خۆی گەڕایەوە و ئاگاداری کردنەوە.

دەڵێت: مەروان کوڕی حەکەم بەعەبدولمەلیکی کوڕی وت: پێش من بڕۆ لای، ئەگەری هەیە تەنیا بەبینینی تۆ بەسەندە بکات.

دەڵێت: عەبدولمەلیك ڕۆشتە لای موسلیم کەپێی وت: لەهەموو هەواڵەکان ئاگادارم بکەرەوە و بۆچوونی خۆتم پێ بڵێ.

وتی: بەڵێ، بۆچوونی من ئەوەیە لەگەڵ هاوڕێکانی خۆت بڕۆیت و ڕێگەت بەرەو مەدینە بسووڕێنیت و کاتێك گەشتیتە نزیکترین مەنزڵی مەدینە، دابەزی تا کەسان

لەسێبەردا بحەسێنەوە و شیرەی خورما بخۆن و کاتێك شەو داهات، پاسەوانەکان بۆ ئوردووگا دیاریبکەیت و کاتی بەیانی، لەگەڵ سوپا نوێژ بخوێنیت، دواتر لەگەڵ سوپا ڕێگەی بەرەو چەپ بگۆڕیت و بەدەوری مەدینەدا بسووڕێیتەوە و لەکاتی هەڵاتنی خۆر، لەلای حوڕ و لەڕۆژهەڵاتەوە پێیان دەگەیت و ڕووبەڕوویان دەبیتەوە و ئەگەر لەکاتی هەڵاتنی هەتاودا بێت، هەتاو لەپشتی سوپاکەی تۆ دەدات و ئازاریان نادات و لەڕوخساری ئەوان دەدات و بێزاریان دەکات. مادام ئێوە لەڕۆژهەڵات بن، لەبریسکەی زریّ و قەڵغان و شمشێرەکانتان بەڕادەیەك بێزار دەبن کەئێوە لەزیانەکانی ئەوان نایبینن. دوای ئەوە ئاگری جەنگ هەڵگیرسێنە و داوای هاوکاری لەخواوەند بکە چوونکە دژایەتی پێشەوا و سەروەری باوەڕداران دەکەن و لەڕیزی موسوڵمانان جیابوونەتەوە.

موسلیم وتی: باوکت چ کوڕێکی باشی هەیە چوونکە جێگرەوەیەکی شیاویت. دواتر مەروان ڕۆشتە لای موسلیم کەپێی وت: بڵێ.

وتی: مەگەر عەبدولمەلیك نەهاتە لای تۆ؟

وتی: بۆنا، چ پیاوێکی گەورەیە عەبدولمەلیك، کەمتر کەسێکی قوڕەیشیم بینیوە وەك ئەو بێت.

مەروان پێی وت: کاتێك چاوت بەعەبدولمەلیك کەوتووە یانی، منت بینیوە.

وتی: بەڵێ.

دەڵێت: بەڕێکەوت و سوپایش بەڕێکەوت و لەو شوێنەی عەبدولمەلیك وتبووی، دابەزین و پێشنیارەکانی ئەوی بەکار برد. دواتر بەرەو حوڕە بەڕێکەوت و لەلای ڕۆژهەڵاتەوە، ڕێگەی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی خەڵکانی مەدینە، گۆڕی.

دەڵێت: موسلیم کوڕی عوقبە پێشنیاری گەڕانەوەی پێکردن و وتی: ئەی خەڵکی مەدینە، سەروەری باوەڕداران، یەزید کوڕی معاویە گومان دەکات کەئێوە ڕەگ و ڕیشەی ئیسلامن و من کوشتنی ئێوەم پێخۆش نییە. سێ ڕۆژ مۆڵەتتان پێدەدەم، هەرکەس بگەڕێتەوە و پەشیمان ببێتەوە، ڕازی دەبین و ئەم شارد بەجێدێڵین و بۆ شەڕی ئەو کافرە دەڕۆین کە لەمەککەیە. ئەگەر ڕازی نەبوون، دژی ئێوە دەجەنگم.

دەڵێت: ئەم پێشهاتە لەمانگی زیحەججەی ساڵی شەست و چوارەم ڕوویدا.

دەڵێت: بەڵام لەنووسراوەکەی خۆمدا ئەمەم دۆزییەوە، بەڵام ئەمە هەڵەیە چوونکە

یەزید لەمانگی ڕەبیعە الاوەلی ساڵی شەست و چوارەم مرد و ڕووداوەکەی حوڕە لەزیحەججەی ساڵی شەست و سێی کۆچ و لەڕۆژی چوارشەممە، دوو ڕۆژ بۆ کۆتایی ئەو مانگە ڕوویدا.

دەڵێت: کاتێك سێ ڕۆژەکە تەواو بوو، موسلیم وتی: ئەی خەڵکی مەدینە، ئایا تەسلیم دەبن یا دەجەنگن؟

وتیان: دەجەنگین.

وتی: ئەو کارە مەکەن، گوێڕایەڵ و ملکەچ بن تا ئێمەیش هێز و توانای خۆمان دژی ئەو کافرە بەکار ببەین چوونکە بێ بڕواکان و خراپەکاران لەدەوری کۆبوونەتەوە.

وتیان: ئەی دوژمنانی خواوەند! سوێند بەخوا ئەگەر بتانەوێت بۆ جەنگی ئەوان بڕۆن، ڕێگەتان پێنادەین و دژی ئێوە دەجەنگین، ڕێگەتان پێنادەین بەرەو ماڵی خواوەند بڕۆن و خەڵکەکەی بترسێنن و ناباوەڕی لەو شوێنە پیرۆزە بڵاو بکەنەوە. نا، سوێند بەخوا بەوە ڕازی نابین.

دەڵێت: خەڵکی مەدینە لەلایەکی شارەکە خەندەکێکیان لێدا بوو و ژمارەیەکی زۆر بەسەرکردایەتی عەبدولڕەحمان کوڕی زوهەیەر، ئامۆزای عەبدولڕەحمان کوڕی عەوف زوهری، لەوێ بوون. عەبدوڵڵە کوڕی موتیع لەناوچەیەکی دیکە و بەرەیەکی دیکە بوو، مەعقەل کوڕی سەنانی ئەشجەعی لەقۆڵێکی دیکە و سەرکردەی هەموویان عەبدوڵڵە کوڕی حەنزەلەی غوسەیلی ئەنساری بوو.

بەڵام بەوتەی عەوانە کوڕی حەکەمی کەلبی، عەبدوڵڵە کوڕی موتیع، سەرکردەی قوڕەیشییەکانی مەدینە و عەبدوڵڵە کوڕی حەنزەلە، سەرکردەی ئەنسار و مەعقەل کوڕی سەنان سەرکردەی موهاجیرەکان بوو.

عەبدولمەلیك کوڕی نەوفل دەڵێت: موسلیم کوڕی عوقبە لەگەڵ سوپاکەی هات و لەلای حوڕەوە پێشڕەوی کرد. خێوەتەکەی خۆی لەسەر ڕێگەی کوفە هەڵدا. دواتر سوپاکەی بۆ جەنگی عەبدوڵڵە کوڕی حەنزەلە ڕەوانە کرد. کوڕی حەنزەلە و سوپاکەی، هێرشیانکردە سەر سوپاکەی موسلیم و پاشەکشێیان پێکردن. موسلیم لەخێوەتەکەی هاتەدەر و دووبارە سوپای بۆ جەنگ هاندا و شەڕێکی قورس دەستپێکرد.

دەڵێت: فەزڵ کوڕی عەباسی موتەلبی لەگەڵ بیست سوار، ڕۆشتە لای عەبدوڵڵە کوڕی حەنزەلە و جەنگی دەستپێکرد، دواتر بە عەبدوڵڵەی وت: فەرمان بەسوارەکانت بدە بێن و لەگەڵ مندا ڕاوەستن، کاتێك هێرشم برد، هێرش بەرن، سوێند بەخوا تا ئەو کاتەی دەگەمە خێوەتەکەی موسلیم ناوەستم، یا دەیکوژم، یا دەکوژرێم.

دەڵێت: عەبدوڵڵە کوڕی حەنزلە بە عەبدوڵڵە کوڕی زوحاکی ئەشهەلی ئەنساری وت: سوارەکان بانگ بکە تا لەگەڵ فەزڵ کوڕی عەباس بن.

دەڵێت: زوحاك سوارەکانی لای فەزڵ کوڕی عەباس کۆکردەوە و کاتێك کۆبوونەوە، هێرشی کردە سەر خەڵکی شام. سوپای شام پاشەکشێی کرد. فەزڵ وتی: مەگەر نابینن ڕیسوایانە پاشەکشێ دەکەن، جارێکیدی هەڵمەت بەرن، سوێند بەخوا ئەگەر سەرکردەکەیان ببینم، دەیکوژم یا دەکوژریم. دوای خۆڕاگری شادومانییە و سەرکەوتن.

دەڵێت: هێرشی برد و ئەوانەی لەگەڵ ئەودا بوون، هێرشیانبرد. سوپای شام لەموسلیم کوڕی عوقبە جیابوونەوە کە لەگەڵ پێنسەد سوار مابوویەوە و کەوتبوونە سەر چۆك و ڕمەکانیان بەڕووی دوژمندا بەرزکردبوویەوە. فەزڵ ڕوویکردە ئاڵاکەی موسلیم و بەشمشێر لەسەری ئاڵادارەکەیدا، زرێی بەسەرەوە بوو، زرێکە قەڵشا و سەری شکا و بێگیان کەوت. وتی: بیگرە، من کوڕی عەبدولموتەلیبم. گومانیکرد موسلیمی کوشتووە و وتی: سوێند بەپەروەدگاری کەعبە، سەردەستەی ستەمکارانم کوشت.

بەلام موسلیم وتی: بەهەڵەدا چوویت، کوژراو، کۆیلەی موسلیم بوو. پیاوێکی ڕۆمی و بوێر. دواتر موسلیم ئاڵاکەی بەدەستەوە گرت و بەدەنگی بەرز، هاواری کرد: ئەی خەڵکی شام، ئەم شێوە شەڕکردنە، شێوازی ئەو کەسانەیە دەیانەوێت بەرگری لەئایینەکەیان بکەن و هێز بەپێشەواکەیان بدەن؟ خوا بۆ جەنگی ئەمڕۆتان، ڕووڕەشتان بکات چوونکە بوونە هۆی ئازاری گیان و ڕۆحی من. سوێند بەخوا شیاون لەمانگانە و تالانییەکان بێبەش بکرێن و بۆ سنوورە دوورەکان، دوور بخرێنەوە. لەگەڵ ئەم ئاڵایە هێرش ببەن، خوا بتانکوژێت ئەگەر پیاوانە نەجەنگن.

دەڵێت، موسلیم لەگەڵ ئاڵاکەی خۆی پێشڕەوی کرد و پیادەکانی سوپا، لەبەردەم

ئالآکە، ڕۆشتنە پێش. فەزڵ کوڕی عەباس لەپێکەوت و کوژرا لەکاتێکدا لەنێوان ئەو و تەنافی خێوەتەکەی موسلیم، دە زەراع دووری بوو. زەید کوڕی عەبدولڕەحمان کوڕی عەوف لەگەڵ ئەودا کوژرا، هەروەها ئیبراهیم کوڕی نەعیمی عەدەوی و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکانی مەدینە کوژران.

عەوانە دەڵێت: لەگێڕانەوەیەکی دیکەدا بیستوومە کە لەڕۆژی جەنگەکە، موسلیم کوڕی عوقەبە نەخۆش بوو، فەرمانیدا تەختێك و چوارپایەییێکان لەناو دوو ڕیزدا بۆ دانا، وتی: ئەی خەڵکی شام، بەرگری لەسەرکردەکەتان بکەن یا بڕۆن. خەڵکانی شام لەهەر چوارلاوە، هێرشیان کردە سەر سوپای مەدینە و شکستیاندان. سوپای مەدینە دوای شەڕێکی کەم، پاشەکشێیان دەکرد.

سەرئەنجام ڕوویکردە عەبدوڵڵە کوڕی حەنزەلە و جەنگێکی قورس دەستپێکرد. ئەو کەسانە لەخەڵکی مەدینە کەخوازیاری جەنگ بوون، لەدەوری عەبدوڵڵە کوڕی حەنزەلە کۆبوونەوە و بوێرانە بەرگرییان دەکرد. فەزڵ کوڕی عەباس کوڕی ڕەبیعەی موتەلبی لەگەڵ سوارکاران بەمەبەستی کوشتنی موسلیم کوڕی عوقەبە، هێرشیبرد کە لەسەر تەختەکەی خۆی کەوتبوو و دەیوت: بمبەنە ناو ڕیزەکە. ئەویان لەبەردەم خێوەتەکەی دانابوو، هەڵیانگرت و لەناو ڕیزەکەدا جێگەیان بۆ کردەوە. فەزڵ کوڕی عەباس و هاوەڵانی هێرشیان برد تا لەتەختەکە نزیك بوونەوە. فەزڵ سووربوو بوو، کاتێك شمشێرەکەی بەرز کردەوە بۆ ئەوەی بیکوژێت، موسلیم بەدەنگی بەرز بەهاوەڵانی وت: ئەم کۆیلە سووربوە دەمکوژێت، ئەی منالی ئازادەکان لەکوێن! بەڕم کون کونی بکەن. بەڕم هێرشیانکردە سەر فەزڵ و کون کونیان کرد.

باوکی میخنەف دەڵێت: دواتر سوارەکان و پیادەکانی سوپاکەی موسلیم، هێرشیانکردە سەر سوپاکەی عەبدوڵڵە کوڕی حەنزەلە و لێیان نزیکبوونەوە. موسلیم کوڕی عوقەبە، سوار لەسەر ئەسپەکەی، لەگەڵ خەڵکانی شام دەڕۆشت و هانی دەدان، دەیوت: ئەی خەڵکی شام، ئێوە لەبەر پێگە و نەژاد و ژمارە و فراوانی ویلایەتەکانتان نەبوونەتە سەروەری عەرەبەکان و خواوەند سەرکەوتن بەسەر دوژمنانی پێنەبەخشین بەڵکە بەهۆی ملکەچبوونتان بۆ سەروەری باوەڕداران، ئەم پێگەتان بەدەست هێناوە. ئەم خەڵکە و عەرەبەکانی دیکە، گۆڕان و خواوەند ئەوانی گۆڕی. گوێڕایەڵ و ملکەچ بن تا خواوەند سەرکەوتنتان پێببەخشێت.

دواتر ڕۆشت تا گەیشتە جێگەی خۆی. فەرمانی بەسوارەکاندا هێرش بکەنە سەر سوپاکەی کوڕی حەنزەلە. کاتێك سوارەکان هێرشیان دەکردە سەر پیادەکان، بەڕم و شمشێر دەڕۆشتنە بەردەمیان و بڵاوەیان پێدەکردن.

دەڵێت: موسلیم کوڕی عوقبە هاواریکرد: ئەی خەڵکی شام، خواوەند بەپیادە جەنگانی تایبەت نەکردووە بەوان، ئەی حەسین کوڕی نەمیر، لەگەڵ سوپاکەت، لەئەسپەکان دابەزن. حەسین و سوپای خەڵکانی حیمس دابەزین. موسلیم ڕۆشتە لایان و کاتێك بینی لەژێر ئاڵاکانیان بەرەوڕووی کوڕی حەنزەلە پێشڕەوی دەکەن، لەگەڵ هاوەڵانی خۆی وەستا و وتی: ئەی خەڵکینە، دوژمن، لەم جەنگەدا شێوازێکی گرتەبەر، کەدەبوا ئێوەیش ئەو کارە ئەنجام بدەن، دڵنیام زۆر ناخایەنێت ئەم جەنگە کۆتایی دێت چ لەبەرژەوەندی ئێمەدا بێت، چ لەزیانمان. سوێند بەخوا ئێوە سەرکەوتوون. دڵنیام خواوەند بەو ئەندازەی لەئێوە ڕازییە، لەخەڵکی هیچکام لەویلایەتەکانی دیکە ڕازی نییە و لەهیچکەس زیاتر لەو کەسانەی دژی ئێوە دەجەنگن، تووڕە نییە. هەرکام لەئێوە، ڕۆژێك دەبێت بمرن، سوێند بەخوا هیچ مەرگێك شیرینتر لەشەهادەت نییە کەخواوەند پێشکەشی کردوون، کەواتە ئەم هەلە بقۆزنەوە، سوێند بەخوا بەوشێوە نییە، ئارەزووی هەرچی بکەن، لەبەردەستانا بێت.

دەڵێت: لەگەڵ ئاڵاکەی خۆی کەمێك پێشڕەوی کرد و وەستا. کوڕی نەمیر لەگەڵ ئاڵاکەی خۆی لێی نزیك بوویەوە. موسلیم، فەرمانی بە عەبدوڵڵە کوڕی عەزای ئەشعەریدا لەگەڵ پێنسەد تیرهاوێژ تا نزیك سوپاکەی کوڕی حەنزەلە پێشڕەوی بکەن. ئەم پێنسەد کەسە تیرهاویشتنیان دەستپێکرد. کوڕی حەنزەلە وتی: بۆ خۆتان دەکەنە ئاماجی تیرەکانی ئەوان! هەرکەس دەیەوێت بەپەلە بەرەو بەهەشت بڕوات، لەژێر ئەم ئاڵایە کۆببێتەوە. هەمووان گیانبەخشانە لەدەوری کۆبوونەوە. پێی وتن: بەڵێن بەپەروەردگار بدەن و هیوادارم دوای کاتژمێرێك دڵخۆش و کامەران بن. هەردوو سوپا هێرشیانکردە سەریەك و بەشێکی ڕۆژ بەقورسترین شێوە جەنگان. عەبدوڵڵە، یەك یەك کوڕەکانی خۆی بۆ پێشەوە دەنارد و هەمووان لەبەردەم خۆیدا کوژران. خۆی شمشێری دەوەشاند و هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( بەنەحلەت بێت ئەو کەسەی ستەمکاری دەوێت و سەرکێشی دەکاتە پیشە

و لەڕاستی و ئایەتەکانی خواوەند خۆی بەدوور دەگرێت

ڕەحمان تەنیا کەسێك نفرین دەکات

کەنافەرمانی بکاتە پیشە)).

جەنگا تا کوژرا. زڕ براکەی لەدایکەوە، محەممەد کوڕی سابت کوڕی قەیس هاتە پێش و جەنگی تا کوژرا. دەیوت: حەزم نەدەکرد لەجیاتی ئەمان، دەیلەمییەکان بمکوژن.

محەممەد کوڕی عەمرۆ کوڕی حەزمی ئەنساریش کوژرا، مەروان کوڕی حەکەم لەسەر جەنازەکەی تێپەڕی و وتی: خوا بتبەخشێت، زۆر جار بینیومی لەپاڵ ستوونەکان نوێژت دەخوێند.

عەوانە دەڵێت: بیستم لەجەنگی حوڕە، ئەو کاتەی دوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبووبوونەوە، موسلیم کوڕی عوقبە لەسەر چوارپایەیەك دادەنیشت و خەڵکان ئەویان بەملاولادا دەبرد.

باوکی میخنەف دەڵێت: ئەو ڕۆژە محەممەد کوڕی سەعد کوڕی ئەبی وەقاس بۆ جەنگ هاتبوو و کاتێك سوپاکەی عەبدوڵڵە کوڕی حەنزەلە شکستی خوارد، شمشێر بەدەست هێرشیکردە سەر سوپاکەی موسلیم تا ئەو کاتەی شکستی خوارد و گەڕایەوە.

دەڵێت: موسلیم بۆ ماوەی سێ ڕۆژ تالآنکردنی مەدینەی بەسوپاکەی سپارد کەخەڵکیان دەکوشت و سامانەکانیان تالآن دەکرد. ئەو ئەسحابانەی لەوێ بوون، ترسان. باوکی سەعیدی خدری ڕۆشت و لەئەشکەوتێك خۆی شاردەوە. یەکێك لەخەڵکانی شام ئەو بینی و ڕۆشتە ناو ئەشکەوتەکە.

باوکی سەعیدی خدری دەڵێت: پیاوی شامی شمشێر بەدەست هاتە ناو ئەشکەوتەکە، منیش شمشێرم دەرهێنا و ڕووبەڕووی ڕۆشتم، ویستم بیترسێنم بۆ ئەوەی بڕوات. بەڵام ئەو پێداگرانە دەهاتەپێش و کاتێك هەستم بەسووربوونی کرد، شمشێرەکەم کردە کالآن و ئەم ئایەم خوێندەوە:

(( لئن بسطت یدك لتقتلنی ما انا بباسط یدی علیك لا قتلك انی اخاف الله رب العالمین

واتاکەی: ئەگەر دەستی خۆت بەمەبەستی کوشتنی من بکەیتەوە، من دەستی خۆم بۆ کوشتنی تۆ ناکەمەوە چوونکە تەنیا لەپەروەردگاری جیهانیان دەترسم)).

وتی: تۆ کێیت؟

وتم: باوکی سەعیدی خدری.

وتی: هاوڕێی پێغەمبەری خوایت؟

وتم: بەڵێ.

وتی: زۆر باشە و ڕۆشت.

عەوانە دەڵێت:موسلیم کوڕی عوقبە داوای لەخەڵکان و دووان لەقوڕەیشییەکان، یەزیج کوڕی عەبدوڵڵە کوڕی زەمعە و کوڕی باوکی ئەلجوهمی عەدەوی بەیعەت بکەن، هەروەها مەعقەل کوڕی سەنانی ئەشجەعی داوای ئەمانی کردبوو، ڕۆژێك دوای جەنگ ئەوانیان هێنا. موسلیم وتی: بەیعەت ببەستن.

دوو پیاوی قوڕەیشی وتیان: بەپێی کتێبی خواوەند و سوونەتی پێغەمبەر (د.خ)، بەیعەتت لەگەڵ دەبەستین.

وتی: نا، هەرگیز بەمە ڕازی نابم. ئەوانی کوشت (سەری بڕین).

مەروان پێی وت: سبحان الله، دوو پیاوی قوڕەیشیت کوشت کەهاتبوون ئەمان وەربگرن، بەلاّم تۆ ئەوانت سەر بڕی.

دەڵێت: موسلیم بەدار لەکەلەکەی مەروانیدا و وتی: سوێند بەخوا ئەگەر تۆیش هاوشێوەی ئەوان دەدوایت، بروسکەی ئاسمانت دەبینی.

باوکی میخنەف دەڵێت: مەعقەل کوڕی سەنانی ئەشجەعی هات و دانیشت، داوای شەربەتێکی کرد بیخواتەوە.

موسلیم پێی وت: حەزت لەچ شەربەتێکە؟

وتی: شەربەتی هەنگوین.

وتی: پێی بدەن.

دەڵێت: خواردییەوە تا تێر بوو، ئەوسا موسلیم وتی: لەشەربەتەکە تێر بوویت؟

وتی: بەڵێ.

وتی: دوای ئەو شەربەتە، جگە لەئاوی کولاّوی جەهەننەم، هیچی دیکە ناخۆیت. لەبیرتە، وتبووت: یەك مانگ ڕێگەم بڕی و یەك مانگ دەگەڕێمەوە و دەستم خاڵییە، خواوەندا گۆڕانێك دروست بکە. مەبەستت لەناوچوونی یەزید بوو؟ دواتر ئەوی هێنایە پێش و سەری بڕی.

بەڵام عەوانە کوڕی حەکەم دەڵێت: موسلیم کوڕی عوقبە، عەمرۆ کوڕی موحرزی ئەشجعی نارد و مەعقەل کوڕی سەنانی ئەشجەعی هێنایە لای، پێی وت: باوکی محەممەد، بەخێر بێیت، دەبینم کەتینوویت؟

وتی: بەڵێ.

وتی: هەنگوین و بەفری بۆ تێکەڵ بکەن. پێشتر هاورێی ئەو بوو.

هەنگوین و بەفریان بۆ تێکەڵ کرد و کاتێک مەعقەل خواردییەوە، پێی وت: هیوادارم خواوەند لەشەربەتی بەهەشتت پێ ببەخشێت.

موسلیم وتی: سوێند بەخوا دوای ئەمە هیچ شەربەتێك ناخۆیتەوە تا لەناوی کولاّوی جەهەننەم دەخۆیت.

وتی: سوێندت دەدەم بەپەیوەندی خزمایەتی نێوانمان.

موسلیم وتی: تۆ بوویت لەتەبەرییە، ئەو شەوەی لای یەزید گەڕابوویتەوە و چاوت بەمن کەوت،ـ وتت: مانگێك رێگەمان بڕی و دەستی بەتاڵ لای یەزید گەڕاینەوە و رێگەی مەدینە دەگرینەبەر و ئەم خراپەکارە لەسەر کار لادەبەین و لەگەڵ منالی یەکێك لەموهاجیرەکان بەیعەت دەبەستین. غەتەفان و ئەشجەع چۆن دەتوانن کەسێك لەخەلافەت لاببەن و کەسێکی دیکە دیاریبکەن؟ سوێندم خواردووە ئەگەر لەجەنگدا رووبەڕووی تۆببوومەوە، ئەگەر توانیم سەرت ببڕم. دواتر فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد.

عەوانە دەڵێت: یەزید کوڕی وەهەب کوڕی زەمعەیان بردە لای موسلیم کەپێی وت: بەیعەت ببەستە.

وتی: لەسەر سوونەتی عومەر کوڕی خەتاب بەیعەتت لەگەڵ دەبەستم.

وتی: بیکوژن.

وتی: بەیعەت دەبەستم.

وتی: نا، سوێند بەخوا لەهەڵەکەت خۆش نابم.

دەڵێت: مەروان بەهۆی پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ یەزید کوڕی وەهەب، قسەی لەگەڵ موسلیم کرد بەلاّم فەرمانیدا مەروانی بۆ بێدەنگ بکەن، وتی: دەبێت بەو شێوەیە بەیعەت ببەستن کەئێوە بەندەکان و کۆیلەکانی یەزید کوڕی معاویەن. دواتر فەرمانی کوشتنی یەزید کوڕی وەهەبی دەرکرد.

عەبدولمەلیك كوڕی نەوفل دەڵێت: مەروان، عەلی كوڕی حسەینی هێنا، كاتێك منداڵەكانی ئومەییەیان لەمەدینە دەركرد، عەلی كوڕی حسەین، ماڵ و سامان و ژنەكەی مەروانی پاراستبوو. دواتر ژنەكەی مەروان كەكچی عوسمان كوڕی عەفان بوو، ڕێگەی تایفی گرتەبەر و عەلی كوڕی حسەین، عەبدوللەی كوڕی لەگەڵ ئەودا نارد. مەروان بۆ ئەم كارەی ڕێزی دەگرت.

دەڵێت: عەلی كوڕی حسەین هات، لەنێوان مەروان و عەبدولمەلیك ڕێگەی دەبڕی و دەیویست بەهۆی ئەوانەوە، لای موسلیم ئەمانی دەست بكەوێت. كاتێك لەموسلیم نزیكبوویەوە، لەنێوان ئەواندا دانیشت. مەروان داوای شەربەتێكی كرد تا بەو هۆیەوە ئەمان لەموسلیم وەربگرێت و كاتێك شەربەتەكەیان هێنا، كەمێكی خواردەوە و دواتر دای بەعەلی كوڕی حسەین، كاتێك بەدەستی عەلی گەیشت، موسلیم وتی: لەشەربەتی ئێمە مەخۆرەوە. عەلی كوڕی حسەین، كەوتە لەرزین و گومانی كرد كەئەمانی نییە. جامەكەی بەدەستەوە بوو، نەلێی دەخوارد، نەدایدەنا.

موسلیم وتی: هاتیت و لەنێوان ئەواندا بەڕێگەدا دەڕۆیت تا ئەمانت پێببەخشم، سوێند بەخوا ئەگەر لەدەستی مندا دەبوو، دەمكوشتی بەڵام سەروەری باوەڕداران، پێشنیاری تۆی پێكردووم و وتوویەتی تۆ نامەت بۆ نووسیوە و ئەمە بووەی هۆی ئەوەی زیندوو بیت، ئەگەر دەتەوێت لەو شەربەتە بخۆرەوە، ئەگەر دەتەوێت داوای شەربەتێكی دیكەت بۆ دەكەین.

وتی: ئەم شەربەتە دەخۆمەوە.

وتی: بیخۆ.

دەڵێت: عەلی كوڕی حسەین شەربەتەكەی خواردەوە و موسلیم پێی وت: وەرە پێش. ئەوی لای خۆی دانیشاند.

عەوانە كوڕی حەكەم دەڵێت: كاتێك عەلی كوڕی حسەینیان بردە لای موسلیم، پرسی: ئەمە كێیە؟

وتیان: عەلی كوڕی حسەینە.

وتی: بەخێربێیت. دواتر ئەوی لەسەر تەختەكەی خۆی دانیشاند و وتی: سەروەری باوەڕداران، پێشنیاری تۆی پێكردووم، ئەم ناپاكانە منیان لەخزمەتكردن بەتۆ دوور خستۆتەوە. دواتر وتی: ئەگەری هەیە كەسەكانی تۆ ترسابێتن.

وتی: بەڵێ بەخوا.

دەڵێت: موسلیم فەرمانیدا چوارپێکەی زین بکەن و عەلی سوار کرد و سوار لەسەر چوارپێکەی خۆی، ئەوی گەڕاندەوە.

عەوانە دەڵێت: عەمرۆ کوڕی عوسمان لەو کەسانە نەبوو کەشارەکەیان چۆڵ کردبوو، ئەویان بردە لای موسلیم کوڕی عوقبە کەوتی: ئەی خەڵکی شام، ئەم پیاوە دەناسن؟

وتیان: نە.؟

وتی: ئەمە خراپەکاری کوڕی پاکە. ئەمە عەمرۆ کوڕی عوسمان سەروەری باوەڕدارانە، ئەی عەمرۆ! ئەگەر خەڵکانی مەدینە سەرکەوتن بەدەست بێنن، دەڵێی من یەکێکم لەئێوە و ئەگەر خەڵکی شام سەرکەوتن بەدەست بێنن، دەڵێی من کوڕی عوسمان کوڕی عەفانی سەروەری باوەڕدارانم.

دەڵێت: فەرمانیدا ڕیشی هەڵکەنن.

ئەبوجەعفەری تەبەری دەڵێت: لەمحەممەد کوڕی عومەر دەگێڕنەوە کەجەنگی حوڕە لەڕۆژی چوارشەممە، دوو ڕۆژ بۆ کۆتایی زیحەججەی ساڵی شەست و سێیەم ڕوویدا. دەستەیەکی دیکە دەڵێن: سێ ڕۆژ بۆ کۆتایی ئەو مانگە بوو.

لەم ساڵەدا عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر ڕێوڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا.

کوڕی عەوف دەڵێت: لەساڵی شەست و سێی کۆچی، کوڕی زوبەیر ڕێوڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵك ئەنجامدا. ئەو کاتە ئەویان بەپەنابەر ناو دەبرد و شۆرایەك کاروبارەکانی بەڕێوەدەبرد.

دەڵێت: لەنیوەی مانگی موحەڕەم لەماڵەکەی خۆماندا بووین کەسەعید، کۆیلەی مسوەر کوڕی مەخریمە هات و پێی ڕاگەیاندین کەموسلیم چ بەلایەکی بەسەر خەڵکی مەدینە هێناوە و چ کوشتارێکی خستۆتەگەڕ. هەواڵێکی مەترسیدار بوو. خەڵکان کەوتنە جموجۆڵ و خۆیان ئامادە کرد چوونکە دڵنیا بوون لەوەی موسلیم ڕوودەکاتە مەککە. سەبارەت بەجەنگی حوڕە، جگە لەوەی ئامارەمان پێدا، گێڕانەوەیەکی دیکەش باسی لێوەکراوە کەجوەیرییە کوڕی ئەسما دەڵێت: لەپیرەکانی مەدینەم بیست کەدەیانوت: کاتێك وادەی مەرگی معاویە نزیکبوویەوە، یەزیدی بانگکرد و وتی: بەناچاری ڕووبەڕووی خەڵکی مەدینە دەبیتەوە، ئەگەر ئەو کارەیان کرد،

موسلیم کوڕی عوقبە بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە بکە چوونکە کەسێکی چاکەخوازی بنەماڵەی ئێمەیە. کاتێك معاویە مرد، دەستەیەك لەخەڵکی مەدینە سەردانی یەزیدیان کرد، یەکێك لەو کەسانە عەبدوڵڵە کوڕی حەنزەلە کوڕی باوکی عامر بوو، کەسێکی خۆپارێز و چاکەکار و هەشت لەکوڕەکانی هاوڕێیەتییان دەکرد. یەزید، سەد هەزار درەمی پێبەخشی و هەرکام لەکوڕەکانی، جگە لەجلوبەرگ و چوارپێ، یەکی دەهەزاریان وەرگرت.

دەڵێت: کاتێك عەبدوڵڵە کوڕی حەنزەلە گەڕایەوە بۆ مەدینە، خەڵکان دەوریان گرت و وتیان: دەنگوباس چییە؟

وتی: لای کەسێکەوە دێم کەسوێند بەخوا ئەگەر یەك کوڕیشم هاوکاریم نەکات، دژی ئەو دەجەنگم.

وتیان: بیستوومانە خەلاتی بەتۆ بەخشیوە و ڕێزی گرتوویت.

وتی: ئەو کارەی کرد و منیش لێموەرگرت تا خۆمی پێبەهێز بکەم.

دەڵێت: خەڵکانی هاندا و بەیعەتیان لەگەڵ بەست. کاتێك یەزید ئاگادار بوویەوە، موسلیم کوڕی عوقبەی ڕەوانە کرد. خەڵکی مەدینە پێشتر کەسانێکیان ناردبوو و هەموو چاڵاوەکانی نێوان مەدینە و شامیان کوێر کردبوویەوە بەڵام خواوەند بارانی نارد و سوپای شام نیازمەندی یەك دڵۆپ ئاو نەبوون.

دەڵێت: خەڵکی مەدینە بەسوپایەکی گەورە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سوپای شام، شارەکەیان بەجێهێت و کاتێك سوپای شام، سوپای مەدینەی بینی، ترسان و دەیانویست خۆیان لەجەنگ بەدوور بگرن. موسلیم نەخۆش بوو. لەو کاتەی خەڵکی مەدینە سەرقاڵی جەنگ بوون، لەپشتەوە، لەناو شاری مەدینە دەنگی تەکبیریان بیست. منداڵەکانی حارسە کەچاودێری خەندەکەکە بوون، ڕێگەیان بۆ سوپای شام کردەوە. خەڵکی مەدینە شکستیان خوارد. ژمارەی ئەو کەسانەی کەوتنە ناو خەندەکەکە و کوژران، زیاتربوو لەوانەی لەناو گۆڕەپانی جەنگدا کوژران. خەڵکانی شام ڕۆشتنە ناو مەدینە و سوپای مەدینە شکستی خوارد. عەبدوڵڵە کوڕی حەنزەلە، پشتی بەیەکێك لەکوڕەکانی خۆیدابوو، خەوتبوو. کاتێك چاوی کردەوە و بارودۆخی خەڵکی مەدینەی بینی، کوڕەکەی کردە سەرکردە و خۆی ڕۆشتەپێش و جەنگا تا کوژرا.

موسلیم کوڕی عوقەبە ڕۆشتە ناو شارەکە و داوای لەخەڵك کرد بەیعەت ببەستن لەسەر بنەمای ئەوەی بەندەی یەزید کوڕی معاویە بن و بتوانێت سەبارەت بەخوێنی خۆیان و کەسەکانیان و سامانەکەیان حوکم بدات.

ساڵی شەست و چواری کۆچی دەستپێکرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی شەست و چواری کۆچی

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەڕووداوەکانی ئەم ساڵە ئەوە بوو سوپای شام بۆ جەنگی عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر و شوێنکەوتەکانی کەئامادە نەبوون بەیعەت لەگەڵ یەزید کوڕی معاویە ببەستن، ڕوویانکردە مەککە. کاتێك موسلیم کوڕی عوقەبە، لەجەنگی خەڵکانی مەدینە سەرکەوتنی بەدەستهێنا و بۆ ماوەی سێ ڕۆژ تالاّنیکردن، وەك لەگێڕانەوەی عەبدولمەلیك کوڕی نەوفلدا هاتووە، لەگەڵ سوپاکەی خۆی بەمەبەستی جەنگی کوڕی زوبەیر ڕێگەی مەککەی گرتەبەر و ڕوەح کوڕی زەنباعی جوزامی وەك جێگری خۆی لەمەدینە دەستنیشانکرد.

واقدی دەڵێت: عەمرۆ کوڕی موحریزی ئەشجەعی کردە جێگری خۆی.

## مەرگی موسلیم کوڕی عوقەبە و بەردبارانکردن و سووتاندنی کەعبە

باوکی میخنەف دەڵێت: کاتێك موسلیم کوڕی عوقەبە گەیشتە موشەلل و بەوتەیەك ئەوبەری موشەلل، وادەی مەرگی گەیشت. مەرگی ئەو لەکۆتایی موحەڕەمی ساڵی شەست و چواری کۆچی بوو. موسلیم پێش مەرگی، حەسین کوڕی نەمیری سەکونی بانگکرد و وتی: سوێند بەخوا ئەگەر لەدەستی مندا دەبوو، تۆم وەك سەرکردە هەڵنەدەبژارد، بەلاّم سەروەری باوەڕداران، دوای من، سەرکردایەتی بەتۆ سپاردووە و فەرمانی سەروەری باوەڕداران، دەبێت جێبەجێ بکرێت: چوار ڕاسپاردەی من لەگوێ بگرە: خێرا بڕۆ، بەخێرایی بجەنگە، هەواڵەکان کۆبکەرەوە و گوێ لەوتەی هیچ پیاوێکی قورەیشی مەگرە.

دەڵێت: موسلیم مرد و لەوبەر موشەلل، بەخاکیان سپارد.

عەوانە دەڵێت: موسلیم کوڕی عوقەبە بەمەبەستی جەنگی کوڕی زوبەیر

بەڕێکەوت و کاتێک گەیشتە تەپۆڵکەی هەرشا، وادەی مەرگی گەیشت و سەرکردەکانی سوپای کۆکردەوە و وتی: سەروەری باوەڕداران فەرمانی پێدوام دوای خۆم، حەسین کوڕی نەمیری سەکوونی وەك سەرکردە دەستنیشان بکەم، سوێند بەخوا ئەگەر بەمن دەبوو ئەو کارەم نەدەکرد بەلاّم حەز ناکەم لەسەرەمەرگدا نافەرمانی سەروەری باوەڕداران بکەم. دواتر حەسین کوڕی نەمیری بانگکرد و پێی وت: گوێ لەوتەکانم بگرە و ڕاسپاردەکانم جێبەجێ بکە: هەواڵەکان کۆبکەرەوە و گوێ لەوتەی هیچ پیاوێکی قورەیشی مەگرە، خەڵکی شام لەدوژمنەکانت دووربخەرەوە و زیاتر لەسێ ڕۆژ لنەهیچ ناوچەیەك مەوەستە و ئاگری جەنگ دژی کوڕی زوبەیر هەڵگیرسێنە. وتی: خواوەندا، دوای شایەتیدان بەوەی خوایەك جگە لەخواوەندی تاقانە نییە و محەممەد بەندە و نێردراوی ئەوە، هیچکارێکم نەکردووە کە لەکوشتنی خەڵکانی مەدینە زیاتر خۆشحاڵم بکات و لەو دنیایش چاوەڕوانی پاداشتی ئەو کارەم.

دواتر بەمناڵەکانی مورەی وت: کێڵگەکەم لەحوران تایبەتە بەئێوە و ئەو ماڵەی فلاّنەکەس تیایدا نیشتەجێیە، تایبەتە بەخۆی. دوای ئەوە مرد.

دەڵێت: کاتێك مرد، حەسین کوڕی نەمیری سەکوونی لەگەڵ سوپا بەڕێکەوت و لەمەککە ڕووبەڕووی کوڕی زوبەیر بوویەوە کەخەڵکانی مەککە و حیجاز بەیعەتیان لەگەڵ بەستبوو.

عەوانە دەڵێت: موسلیم پێش وەسیەت، وتبووی: کوڕەکەم گومان دەکات ئەم کەنیزە، ژەهرخواردی کردووم، بەلاّم درۆ دەکات. ئەمە ئازارێکە لەسکی بنەماڵەکەماندا دروست دەبێت.

دەڵێت: خەڵکانی مەدینە لای کوڕی زوبەیر بوون، نەجدە کوڕی عامری حەنەفی و دەستەیەك لەخەواریج بەمەبەستی بەرگری کردن لەکەعبە لەوێ بوون. کوڕی زوبەیر بەمونزەری برای وت: بۆ ئەم کارە و ڕێگرتن لەم سوپایە، کەس لەمن و تۆ شیاوتر نییە.

دەڵێت: مونزەری برای کوڕی زوبەیر لەو کەسانە بوو کە لەجەنگی حەڕە بەشدار و دواتر پەیوەستی براکەی بوو. عەبدوڵڵە، ئەوی لەگەڵ خەڵکانی مەدینە

بۆ جەنگی سوپای شام نارد و ماوەیەك جەنگان. دواتر یەكێك لەسوپای شام، پێشنیاری جەنگی دەستەویەخەی پێكرد.

دەڵێت: پیاوی شامی لەسەر ئێسترێك بوو. مونزەر ڕووبەڕووی بوویەوە و شمشێرەكان كەوتنەكار. هەردووك، بێ گیان كەوتن. عەبدوڵڵە كوڕی زوبەیر كەوتە سەر ئەژنۆ و وتی: خواوەندا، ڕەگ و ڕیشەی ئەم پیاوە لەناو ببە. بەمشێوەیە، نفرینی دوژمنی براكەی دەكرد.

دەڵێت: سوپای شام هێرشیانبرد و سوپای عەبدوڵڵە كوڕی زوبەیر شكستی خوارد. ئێسترەكەی عەبدوڵڵە كوڕی زوبەیر خلیسكا، وتی: بتۆپیت. دواتر دابەزی و بەهاوەڵانی وت لەدەوری كۆببنەوە. مسوەر كوڕی مەخریمە و مەسعەب كوڕی عەبدولڕەحمان، هەردووك زوهری، لەگەڵ ئەو ڕۆشتن و جەنگان تا كوژران. كوڕی زوبەیر لەبەرابەر دوژمنان خۆڕاگری كرد و تا شەو، لەجەنگ بەردەوام بوو. لەگەڵ دەستپێكردنی شەو، دوو سوپا لەیەك جیابوونەوە. ئەم جەنگە، لەگەمارۆی یەكەم ڕوویدا.

دواتر پاشماوەی مانگی موحەڕەم و مانگی سەفەریان بەجەنگ بەسەر برد و كاتێك سێ ڕۆژ لەڕەبیع الاوەلی ساڵی شەست و چواری كۆچی تێپەڕی، بەمەنجەنیق ماڵەكانیان كردە نیشانە و گڕیان تێبەردان. هۆنراوەیەكیان دەخوێندەوە بەم ناوەڕۆكە:

(( مەنجەنەیق وەك ورچێك، كەف هێناوەتە سەر لێو
بەمەنجەنیق دارەكانی ئەم مزگەوتە دەكەینە نیشانە)).

كوڕی عەوانە دەڵێت: عەمرۆ كوڕی حوتی سەدوسی، هۆنراوەیەكی دەخوێندەوە بەم ناوەڕۆكە:

(( بەسەرهاتی كوڕی فەروە چۆن دەبینی
كە لەنێوان سەفا و مەروا، لێیان دەدان؟))
مەبەستی لەكوڕی فەروە، مەنجەنیق بوو.

واقدی دەڵێت: كاتێك لەموشەلل موسلیم كوڕی عوقبەیان بەخاك سپارد، حەسێن كوڕی نەمیر، حەوت ڕۆژ بۆ كۆتایی موحەڕەم بەڕێكەوت و چوار ڕۆژ بۆ

کۆتایی موحەڕەم گەیشتە مەککە و بۆ ماوەی شەست و چوار ڕۆژ، کوڕی زوبەیر و سوپاکەی گەمارۆدا تا ئەوەی لەسەرەتای ڕەبیع الاخر، هەواڵی مەرگی یەزیدیان پێگەیشت.

لەم ساڵەدا کەعبە سوتێنرا.

## هۆکاری سووتانی کەعبە

محەممەد کوڕی عومەر دەڵێت: دوای تێپەڕینی سێ ڕۆژ لەمانگی ڕەبیع الاوەلی ساڵی شەست و چوارەمی کۆچی، بیست و نۆ ڕۆژ پێش ئەوەی هەواڵی مەرگی یەزید بگات، کەعبە سووتا. هەواڵی مەرگی یەزید، شەوی سێشەممە، یەکی رەبیع الاوەل گەیشت.

ڕیاح کوڕی موسلیم لەباوکی دەگێڕێتەوە: لەدەوروبەری کەعبە ئاگریان دەکردەوە. بەهۆی هەڵکردنی با، بڵێسەی ئاگر کەوتە ناو کەعبە و سووتا. دارەکانی سووتا و ئەم کارەساتە لەڕۆژی شەممە، سێ ڕۆژی یەکەمی مانگی ڕەبیع الاوەل ڕوویدا.

عوروە کوڕی ئۆزەینە دەڵێت: ئەو ڕۆژەی ئاگر بەکەعبە گەیشت، لەگەڵ دایکم ڕۆشتمە مەککە. بینیم کەعبە حەریری پێوە نەماوە و ڕوکنەکەی، لەسێ لاوە قەڵشاوە. وتم: چ بەلایەك بەسەر کەعبەدا هاتووە؟

دەڵێت: یەکێك لەهاوەڵانی کوڕی زوبەیریان نیشاندا و وتیان: بەهۆی ئەمەوە سووتا چوونکە بڵێسەی ئاگری بەسەری ڕمەکەی خۆیەوە گرتبوو، با هەڵیکرد و لەنێوان ڕوکنی یەمانی و ڕوکنی حەجەرە الاسوەد، پەردەکان گڕی گرت.

لەم ساڵەدا یەزید کوڕی معاویە مرد. مەرگی ئەو لەیەکێك لەگوندکانی حیمس ڕوویدا بەناوی حەوارین لەسەرزەمینی شام، دوای تێپەڕینی چواردە ڕۆژ لەمانگی ڕەبیع الاوەلی ساڵی شەست و چوارەمی کۆچی. بەوتەی هەندێکەس، یەزید لەکاتی مەرگی، سی و هەشت ساڵە بوو.

لەهوشام کوڕی وەلیدی مەخزومی دەگێڕنەوە کەزوهری تەمەنی خەلیفەکانی بۆ نووسی، نووسیبووی: کاتێك یەزید کوڕی معاویە مرد، سی و نۆساڵ تەمەنی بوو

و ماوەی خەلافەتی ئەو بەوتەی دەستەیەك، سێ ساڵ وشەش مانگ و بەوتەیەك سێ ساڵ و هەشت مانگ بوو.

باوکی مەعشەر دەڵێت: یەزید کوڕی معاویە لەڕۆژی سێشەممە، دوای تێپەڕینی چواردە ڕۆژ لەمانگی ڕەبیع الاوەل مرد. ماوەی خەلافەتی ئەو، سێ ساڵ و هەشت مانگ، هەشت ڕۆژ کەمتر بوو. معاویە کوڕی یەزید، نوێژی لەسەر خوێند.

بەلام هوشام کوڕی محەممەدی کەلبی سەبارەت بەتەمەنی یەزید، ئاماژە بەگێڕانەوەیەکی دیکە دەدات: باوکی خالید، یەزید کوڕی معاویە کوڕی ئەبوسوفیان، لەسەرەتای مانگی ڕەجەبی ساڵی شەستی کۆچی، کاروباری خەلافەتی گرتەدەست و دوو ساڵ و هەشت مانگ خەلافەتی کرد و دوای چواردە ڕۆژ لەمانگی ڕەبیع الاوەلی ساڵی شەست و سێی کۆچی، لەتەمەنی سی و پێنج ساڵیدا مرد. دایکی مەیسون، کچی بەجدەل کوڕی ئەنیفی کەلبی بوو.

## ژمارەی منداڵەکانی یەزید

یەکێك لەمناڵەکانی یەزید، معاویە بوو بەنازناوی ئەبو لەیلی. شاعیر سەبارەت بەو دەڵێت:

(( دەبینم فیتنەیەك دەستی پێکردووە
و دوای باوکی لەیلی، مڵکی کەسێکە (خەلافەت)
کەسەرکەوتن بەدەست دێنێت))

هەروەها خالید کوڕی یەزید بەنازناوی باوکی هاشم و دەیانوت، لەزانستی کیمیادا شارەزا بووە.

ئەبوسوفیان کوڕی یەزید کەدایکیان، دایکی هاشم کچی باوکی هاشم کوڕی عوتەبە کوڕی ڕەبیعە بوو و دوای یەزید، مەروان ئەوی کردە هاوسەری خۆی. شاعیر سەبارەت بەو دەڵێت:

(( دایکی خالید خۆشبە
کەزۆر کەس بۆ دانیشتوویێك تێدەکۆشێت))

هەروەها عەبدوڵڵە کوڕی یەزید کەدەڵێن لەڕۆژگاری خۆی باشترین تیرهاوێژی

عەرەب بوو، دایکی، دایکی کولسوم کچی عەبدوللە کوڕی عامر بوو. نازناوەکەی ئەسوار و شاعیر سەبارەت بەو دەڵێت:

(( کەسان گومانیان کردووە کاتێك قسە بکرێت

باشتر لەهەموو عەرەبەکان ئەسوار بێت)).

هەروەها عەبدوللە کوڕی ئەسفەر و عومەر و ئەبوبەکر و عوقبە و حەرب و عەبدولڕەحمان و ڕەبیع و محەممەد کە لەکەنیزە جۆراجۆرەکان بوون.

## خەلافەتی یەزید کوڕی معاویە

لەم ساڵەدا لەشام لەگەڵ یەزید کوڕی معاویە وەك خەلیفە بەیعەتیان بەست و لەحیجاز لەگەڵ عەبدوللە کوڕی زوبەیر.

کاتێك یەزید کوڕی معاویە مرد، وەك لەگێڕانەوەی عەوانەدا ئاماژەی پێدراوە، حسەین کوڕی نەمیر و سوپای شام بۆ ماوەی چل ڕۆژ لەگەڵ کوڕی زوبەیر و سوپاکەی لەمەککە جەنگان و گەمارۆیان خستبوونەسەر و بارودۆخیان لێ دژوار کردبوون. دوای ئەوە، هەواڵی مەرگی یەزید بەکوڕی زوبەیر و هاوەڵانی گەیشت، بەلام هێشتا حەسین کوڕی نەمیر و سوپاکەی لەم هەواڵە بێ ئاگا بوون.

عەبدولعەزیز کوڕی خالیدی سەنعانی دەڵێت: لەوکاتەی حەسین کوڕی نەمیر لەگەڵ کوڕی زوبەیر سەرقاڵی جەنگ بوو، هەواڵی مەرگی یەزید گەیشت. کوڕی زوبەیر دەنگی بەرز کردەوە و وتی: ئاگاداربن، سەرکردەی ستەمکاری ئێوە مردووە و هەرکەس لەئێوە دەخوازێت پەیوەستی ئێمە بێت، ببێت و هەرکەس دەخوازێت بۆ شام بگەڕێتەوە، ملی ڕێگە بگرێتەبەر.

دەڵێت: بەرەبەیان دووبارە بۆ جەنگ هاتنەوە و کوڕی زوبەیر بەحەسین کوڕی نەمیری وت: وەرەپێش تا گفتوگۆ بکەین.

کوڕی نەمیر نزیکبوویەوە و گفتوگۆیان کرد. ئەسپی یەکیان تەرسی کرد، کۆترەکانی حەرەم هاتن تا لێی هەڵبگرن. حەسین ئەسپەکەی خۆی لەوان دوورخستەوە.

کوڕی زوبەیر پێی وت: چی دەکەیت؟

وتی: دەترسم ئەسپەکەم، کۆترەکانی حەرەم بکوژێت.

کوڕی زوبەیر پێی وت: لەوە دەترسیت، بەڵام دەتەوێت موسوڵمانان بکوژیت؟

وتی: نا، چیتر دژی تۆ ناجەنگم، ڕێگەبدە تەواف ماڵی خوا بکەین و بگەڕێینەوە.

کوڕی زوبەیر مۆڵەتی ئەو کارەی پێدان و گەڕانەوە.

بەڵام بەوتەی عەوانە کوڕی حەکەم کاتێك هەواڵی مەرگی یەزید کوڕی معاویە بەکوڕی زوبەیر گەیشت، هێشتا خەڵکی شام بێ ئاگابوون و درێژەیان بەگەمارۆکەی سەر کوڕی زوبەیر دەدا و بارودۆخیان لێدژوار کردبوو. کوڕی زوبەیر بەسوپای شامی وت: بۆ لەسەر جەنگ پێداگری دەکەن، خەلیفەکەی ئێوە مردووە بەڵام شامییەکان وتەکانی ئەویان بەڕاست نەدەزانی تا ئەوەی سابت کوڕی قەیسی نەخەعی لەخەڵکانی کوفە، لەگەڵ سەرکردەکانی عێراق هات و لای حسەین کوڕی نەمیر تێپەڕی کەهاوڕێی بوو. پەیوەندی خزمایەتی لەنێوان ئەواندا بوو و پێشتر لای معاویە ئەوی بینیبوو. هەواڵەکانی لێپرسی و سابت، لەمەرگی یەزید ئاگاداری کردەوە.

دەڵێت: حەسین کوڕی نەمیر کەسی بۆ لای عەبدوللە کوڕی زوبەیر نارد و وتی: ئەمشەو لەئەبتەح کۆدەبینەوە. کاتێك ڕووبەڕووبوونەوە، حەسین پێی وت: ئەگەر ئەم پیاوە مردبێت، لەهەمووان بۆ خەلافەت شیاوتریت، با بەیعەت لەگەڵ تۆ ببەستین. دواتر لەگەڵ من بۆ شام وەرە چوونکە ئەم سوپایەی لەگەڵ مندایە، سەرکردەکان و شاسوارانی خەڵکی شامن و سوێند بەخوا دوو کەس دژایەتی تۆ ناکەن. ئەمان بەخەڵکان دەبەخشیت و ئەم خوێنانەی لەم ناوەدا ڕژاوە، قەرەبوو دەکەیتەوە.

بێژەر دەڵێت: هۆکاری ئەوەی کوڕی زوبەیر بەم بەیعەتە ڕازی نەبوو و ڕێگەی شامی نەگرتەبەر، دوودڵی و گومان بوو چوونکە لەمەککە لەسوپاکەی مەروان پارێزراو بوو بەڵام ئەگەر دەڕۆشتە شام، سوێند بەخوا دوو کەس دژایەتی کوڕی زوبەیریان نەدەکرد.

دەڵێت: دەستەیەك لەقورەیشییەکان گومانیانکردووە عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر

وتوویەتی: من ئەم خوێنانە لەبەرچاو نەگرم؟ سوێند بەخوا دەمەوێت لەبەرابەر هەرکەسێکیان دەکەس بکوژم. حەسین بەهێواشی قسەی لەگەڵ دەکرد بەڵام عەبدوڵڵە دەنگی بەرز دەکردەوە و دەیوت: سوێند بەخوا نایکەم.

دەڵێت: حەسین کوڕی نەمیر پێی وت: هەرکەس لەمەدوا تۆ بەبیریار و چارەسەرکەر بزانێت، خواوەند پووڕەشی بکات. گومانیان دەکرد بۆچوونەکانت ڕاستە. مەگەر نابینی من بەهێواشی لەگەڵ تۆ دەدوێم و تۆ دەنگ بەرز دەکەیتەوە؛ من پێشنیاری خەلافەتت پێدەکەم و تۆیش بەڵێنی کوشتن و قەرەبوو کردنەوە.

دواتر هەستا و ڕۆشت و سوپای کۆکردەوە و لەگەڵ ئەوان ڕێگەی مەدینەی گرتەبەر. کوڕی زوبەیر لەکارەکەی پەشیمانبوویەوە و کەسی بۆ لای حەسین نارد و وتی: نایێم بۆ شام چوونکە حەز ناکەم مەککە بەجێبێڵم. لێرە بەیعەت لەگەڵ من ببەستن و منیش ئەمانتان پێدەدەم و دادپەروەری دەکەمە پیشە.

حەسین وتی: ئەگەر خۆت لەشام نەبیت، ژمارەیەکی زۆر لەکەسانی ئەم بنەماڵە، داوای کورسی خەلافەت دەکەن و خەڵکان وەڵامیان دەدەنەوە، من دەتوانم چی بکەم؟

دەڵێت: حەسین لەگەڵ سوپاکەی ڕێگەی مەدینەی گرتەبەر و عەلی کوڕی حسەینی بینی کەئالیك و جۆی پێ بوو. سڵاوی لەحەسین کرد بەڵام هەستی پێنەکرد. حەسین سوار لەسەر ئەسپێکی ڕەسەن بوو، ئالیکی تەواو کردبوو، شیریان پێدابوو، جوێنی بەکۆیلەکەی دەدا و دەیوت: لێرە لەکوێ ئالیك بۆ ئەسپەکەم بەدەست بێنم.

عەلی کوڕی حسەین وتی: من ئالیکم پێیە، دەتوانی ئالیك بەئەسپەکەت بدەیت.

لەو کاتەدا حەسین ڕوویکردە عەلی کوڕی حسەین. عەلی وتی ئالیکەکەی بەحەسین بدەن.

دەڵێت: خەڵکی مەدینە و حیجاز لەبەرابەر سوپای شام بوێریان پەیا کرد چوونکە ڕیسوا بووبوون. هەرکام لەوان تەنیا دەمایەوە، جڵەوی ئەسپەکەیان دەگرت و دەیانهێنایە خوار. لەبەر ئەمە سوپاییەکانی سوپای شام، لەئوردووگاکەی خۆیان دوور نەدەکەوتنەوە. مناڵەکانی ئومەییە پێیان وتبوون

لەگەڵ خۆیان بیانبەن بۆ شام. ئەو کارەیان کرد و سوپا بەڕێکەوت تا گەیشتە شام. یەزید کوڕی معاویە وەسیەتی کردبوو لەگەڵ معاویەی کوڕی بەیعەت ببەستن بەڵام ئەو زیاتر لەسێ مانگ نەژیا و مرد.

عەوانە دەڵێت: یەزید کوڕی معاویە، کوڕەکەی خۆی معاویەی وەك خەلیفە دەستنیشانکرد بەڵام زیاتر لەچل ڕۆژ نەژیا و مرد.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: کاتێك معاویە کوڕی یەزید، کاروباری خەلافەتی گرتەدەست و کارگوزارانی باوکی کۆکردەوە و لەدیمەشق بەیعەتیان لەگەڵ بەست، بەڵام دوای چل ڕۆژ مرد. نازناوەکەی باوکی عەبدولڕەحمان بوو و باوکی لەیلی، دایکی، دایکی هاشم کچی باوکی هاشم کوڕی عوتەبەی ئومەوی بوو، کاتێك مرد، تەمەنی سی ساڵ و هەژدە ڕۆژ بوو.

لەمساڵەدا خەڵکی بەسرە لەگەڵ عوبەیداللە کوڕی زیاد بەیعەتیان بەست تا کاروبارەکانیان بەڕێوە ببات تا ئەو کاتەی خەڵك لەسەر پێشەوایەك هاودەنگ و هاوڕا دەبن. دواتر عوبەیداللە کەسی بۆ کوفە نارد و داوای لێکردن ئەوانیش هاوشێوەی خەڵکی بەسرە بن. بەڵام خەڵکانی کوفە ڕازی نەبوون و کارگوزارانی خۆیان بەردباران کرد. دواتر خەڵکی بەسرە، دژایەتی عوبەیداللەیان کرد و ئاژاوە لەبەسرە سەریهەڵدا و عوبەیداللە کوڕی زیاد ڕوویکردە شام.

## کاروباری عوبەیداللە کوڕی زیاد و خەڵکی بەسرە دوای مەرگی یەزید

حەسەن دەڵێت: کاتێك یەزید کوڕی معاویە مرد، زوحاك کوڕی قەیس، نامەی بۆ قەیس کوڕی هەیسەم نووسی: سڵاو لەتۆ، یەزید کوڕی معاویە مرد، ئێوە برای ئێمەن، پێش ئێمە هیچ کارێك مەکەن تا کەسێك وەك پێشەوای خۆمان هەڵبژێرین.

شەهرەك دەڵێت: کاتێك یەزید کوڕی معاویە مردبوو، ئامادەبوون کە عوبەیداللە کوڕی زیاد پەیڤی. ناوی خواوەندی هێنایە سەرزمان، سپاسی کرد و وتی: ئەی خەڵکی بەسرە، ڕەچەڵەکی من بڵێن، سوێند بەخوا دەبینن شوێنکۆچی دایك و باوکم و زادگام و ماڵەکەم لای ئێوەیە، کاتێك کاروباری ئەم ویلایەتەم گرتەدەست، دیوانی جەنگاوەرانی ئێوە زیاتر لەحەفتا هەزار جەنگاوەری نەبوو. بەڵام ئێستا

ژمارەکـەی هەشـتا هـەزارە. هەرکـەس ببێتـە هـۆی نیگـەرانی ئێـوە، هەنووکـە لەزینداندایـە، سـەروەری بـاوەڕداران یەزید کوڕی معاویـە مردووە و خـەڵکی شـام ناکۆکن. ژمـارەی ئێـوە لەهـەموو ویلایەتـەکانی دیکـە زیـاترە و سـەرزەمینەکەتان بـەربلاوترە و پێویـستان بەکـەس نییـە. کەسێك وەك پێـشەوای خۆتـان هەڵبـژێرن کەجێی ڕەزامەندی هەمووتان بێت. من یەکەم کەس دەبم بەیعەت لەگەڵ ئەو کەسـە دەبەستم کەهەڵیدەبژێرن. ئەگەر خەڵکی شام کەسێکیان هەڵبژارد کەئێوەیش پێی ڕازی بـوون، پەیوەسـتی موسـوڵمانان بـبن و ئەگـەر بەهەڵبژاردەکـەی ئـەوان ڕازی نـەبوون، بمێننـەوە تـا چـارەیەك لەلایـەن خواوەنـدەوە دێـت چـوونکە پێویـستان بەهیچکام لەویلایەتەکانی دیکە نییە.

دەڵێت: وتاردەرانی بەسرە هەستان و وتیـان: ئەی فەرمانڕەوا! وتـەکانی تۆمـان بیـست. سـوێند بـەخوا دەزانـین کـەس لـەتۆ بـۆ ئـەم کـارە بـەتواناتر نییـە. بەیعـەت لەگەڵ تۆ دەبەستین.

وتی: پێویستم بەو کارە نییە، کەسێك بۆ خۆتان هەڵبژێرن، بـەلام ڕازی نـەبوون. عوبەیداڵڵەیش ڕازی نەبوو تا ئەوەی سێ جار داواکەیان دووبارە کردەوە و کاتێك ڕازی نـەبوون، عوبەیداڵڵـە دەسـتی بـردە پـێش و بەیعـەتیان لەگـەڵ بەسـت. دوای بەسـتنی بەیعـەت، ڕۆشـتن و دەیـانوت: کـوڕی مەرجانـە گومـان دەکـات لـەکاتی سـەرهەڵدانی ئـاژاوە و دووبـەرەکی، شـوێنکەوتەی ئـەو دەبـین، سـوێند بـەخوا بەهەڵەدا چووە. دواتر دژی عوبەیداڵڵە وەستانەوە.

خالید کوڕی سومەیر دەڵێت: شـەقیق کوڕی سـەور و مالیك کوڕی موسـەمەع و حەسـین کـوڕی مـونزەر، شـەوانە ڕۆشـتنە لای عوبەیداڵڵـە کـوڕی زیـاد لەکۆشـکی فەرمانڕەوایەتی. یەکێك لەمناڵەکانی سەدوس لەمکارە ئاگادار بوویەوە.

سەدوسی دەڵێت: ڕۆشتم و لەبەردەم دەرگای کۆشکی فەرمانڕەوایەتی وەستام، ئـەو دوو کەسـە لەگـەڵ عوبەیداڵڵـە بـوون تـا شـەو تێپـەڕی. دواتـر هاتنـەدەر و ئێسترێکیان پێبوو کەبارێکی قورسی لەسەر بوو.

دەڵێت: ڕۆشتمە لای حەسین و وتم: بڵێ شتێك لەم سامانە بەمن بدەن.

وتی: بڕۆ لای ئامۆزاکانت.

دەڵێت: ڕۆشتمە لای شەقیق و وتم: فەرمان بدە لەم سامانە بەشی من بدەن.

دەڵێت: سامانەکە لەدەستی کۆیلەکەی بەناوی ئەییووب بوو، وتی: ئەییووب، سەد درەمی پێبدە.

وتم: سوێند بەخوا ئەوە وەرناگرم.

دەڵێت: شەقیق ماوەیەك بێدەنگ بوو، کەمێك ڕۆشت، ڕۆشتمە پێش و وتم: فەرمان بدە لەم سامانە بەشی من بدەن.

وتی: ئەییووب! دووسەد درەمی پێبدە.

وتم: سوێند بەخوا بەوە ڕازی نابم.

وتی: سێسەد درەمی پێبدەن و دوای ئەوە وتی: چوارسەد درەمی پێبدەن و کاتێك گەشتینە تەفاوە، وتم: فەرمان بدە لەم سامانە بەشم بدەن.

وتی: ئەگەر ئەو کارە نەکەم، چی دەکەیت؟

وتم: سوێند بەخوا دەڕۆم و کاتێك گەیشتمە ناوماڵەکانی هۆزەکەمان، گوێچکەم دەگرم و بەدەنگی بەرز هاوار دەکەم ئەی منداڵەکانی بەکر کوڕی وائیل، شەقیق کوڕی سەور و حەسین کوڕی موتزەر و مالیك کوڕی موسەمەع، ڕۆشتوونە لای کوڕی زیاد و سەبارەت بەخوێنی ئێوە پەیمانیان بەستووە.

وتی: چی دەڵێت! خوا بیکوژێت، هاوار لەتۆ. پێنسەد درەمی پێبدەن.

دەڵێت: پێنسەد درەمەکەم وەرگرت و ڕۆشتمە لای مالیك.

بێژەر دەڵێت: بیرم نییە مالیك چەندەی پێدا.

دەڵێت: دواتر حەسینم بینی و ڕۆشتمە لای. وتی: کوڕی مامەکەت چی کرد؟ ئاگادارم کردەوە و وتم: لەو سامانە بەشم بدە.

وتی: سوێند بەخوا ئەم سامانەمان وەرگرت و گەیاندمانە شوێنی مەبەست و لەخەڵك ناترسین. بەمشێوەیە هیچی پێنەدام.

یونس کوڕی حەبیبی جێرەمی دەڵێت: کاتێك عوبەیداڵڵە کوڕی زیاد، حسەین کوڕی عەلی و کوڕەکانی عەلی کوڕی ئەبی تالیبی کوشت، سەری بڕاوی ئەوانی بۆ لای یەزید کوڕی معاویە نارد و بووە هۆی شادومانی یەزید و پێگەی عوبەیداڵڵە بەرز بوویەوە، بەڵام دوای ماوەیەك لەکوشتنی حسەین پەشیمان بوویەوە و

دەیوت: چی دەبوو ئەگەر لەبەر ڕێزی پێغەمبەر (د.خ) و بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتی، ئەو ئەرکەم دەخستە سەرشان و لەماڵەکەی خۆم دامدەبەزاند و سەبارەت بەوەی دەیویست، سەرپشکم دەکرد هەرچەند دەبووە هۆی زیانی من. خواوەند کوڕی مەرجانە بەنەحلەت بکات کەگرفتاری ئەو کارەساتەی کرد، داوای لێکردبوو ڕێگای بۆبکاتەوە تا بگەڕێتەوە بەلام ڕێگەی نەدا، یا دەستی بخاتە ناو دەستی من یا ڕێگەی بدات بۆ یەکێك لەسنوورەکانی موسوڵمانان بڕوات تا ئەوکاتەی دەمرێت، بەلام بەهیچکام لەداواکانی ڕازی نەبوو و ئەوی کوشت و بەکوشتنی ئەو، منی لای موسوڵمانان قێزەون و بێزراو کرد و دوژمنی منی لەدڵی ئەواندا چاند و ئێستا چاکەکار و خراپەکار بەدوژمنم دەزانن چوونکە کوشتنی حسەین بەکارەساتێکی گەورە ناوزەد دەکەن. بۆ من پشتم بەکوڕی مەرجانە بەست، خوا نفرینی بکات. لێی توڕە بوو.

دەڵێت: عوبەیداڵڵە کوڕی زیاد یەکێك لەکۆیلەکانی خۆی بەناوی ئەییووب کوڕی حیمرانی بۆ شام ناردبوو تا فەرمانەکانی یەزید ئاگاداری بکاتەوە. ڕۆژێك عوبەیداڵڵە سوار بوو و کاتێك گەیشتە گۆڕەپانی قەسابەکان، ئەییووب کوڕی حیمران هات و بەهێواشی لەمەرگی یەزید کوڕی معاویە ئاگاداری کردەوە. عوبەیداڵڵە گەڕایەوە بۆ ماڵ و بەعەبدوڵڵە کوڕی حوسن، یەکێك لەمناڵەکانی سەعلەبە فەرمانیدا جاڕی نوێژ بدات.

بەلام عومەیر کوڕی مەعنی نووسەر دەڵێت: ئەو کەسەی عوبەیداڵڵە ناردبووی، حیمرانی کۆیلەی بوو. عوبەیداڵڵە ڕۆشتبووە سەردانی عەبدوڵڵە کوڕی نافیعی زبریا و لەدەرگای بچووکی ماڵەکەی نافیع، پیادە بەرەو مزگەوت هاتبوو، کاتێك گەیشتە ناو حەوشی مزگەوت، لەکاتی تاریکبوونی هەوا، حیمرانی کۆیلەی بینی. حیمران لەڕۆژگاری خەلافەتی معاویە، پەیکی عوبەیداڵڵە بۆ لای معاویە و هەروەها پەیکی ئەو بۆ لای یەزید بوو. کاتێك حیمرانی بینی، وتی: دەنگوباس؟

وتی: سلامەتیت، نزیك ببمەوە؟

وتی: بەڵێ.

حیمران نزیکبوویەوە و لەهەواڵی مەرگی یەزید و دووبەرەکی خەڵکی شام

ئاگاداری کردەوە. ڕۆژی پێنجشەممە، نیوەی مانگی ڕەبیع الاوەلی ساڵی شەست و چوارەمی کۆچی مردبوو. عوبەیدالڵە بێدرەنگ هات و فەرمانی بەبانگبێژدا، بانگی نوێژ بدات. کاتێک خەڵکان کۆبوونەوە، ڕۆشتەسەر مینبەر و لەهەواڵی مەرگی یەزید ئاگاداریکردنەوە و خراپەی ئەوی هێنایە سەرزمان چوونکە یەزید پێش مەرگ، مەبەستی لەناوبردنی عوبەیداڵڵەی کردبوو.

درێژەی گێڕانەوەکە هاوشێوەی گێڕانەوەی شەمرە، تا ئەو جێگەی دەڵێت: بەڕەزامەندی و بەڕاوێژکردن، بەیعەتیان لەگەڵ بەست.

دەڵێت: کاتێک ڕۆشتن، دەستی خۆیان لەدەرگا و دیواری ماڵەکان دەسوو و دەیانوت: کوڕی مەرجانە گومان دەکات لەکاتی ئاژاوە و دووبەرەکی پشتیوانی لێدەکەین.

دەڵێت: عوبەیداڵڵە ماوەیەکی زۆر لەکۆشکی فەرمانڕەوایەتی نەمایەوە و هێز و دەسەڵاتی لاواز بوو. فەرمانەکانی جێبەجێ نەدەکران، بۆچوونەکانی ڕەد دەکرانەوە، فەرمانی دەدا تاوانبار زیندانی بکەن بەڵام لەنێوان تاوانبار و هاوەڵانی کوڕی زیاد دەبوونە لەمپەر.

عەبدولڕەحمان کوڕی حەوشەب دەڵێت: بەدوای جەنازەیێکەوە بووم، کاتێک گەیشتە بازاری وشتر، پیاوێکم لەسەر ئەسپێکی سپی بینی، سیلاحی و ئالآیەکی بەدەستەوە بوو و دەیوت: ئەی خەڵکینە کۆببنەوە، تا پێشنیارێکتان پێبکەم کەپێشتر کەس نەیکردووە، پیشنیارتان پێدەکەم لەگەڵ پەنابەری حەرەم، عەبدوللە کوڕی زوبەیر، بەیعەت ببەستن.

دەڵێت: خەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە و دەستیان دەخستە ناو دەستی. ئێمە ڕۆشتین و نوێژی مردوومان لەسەر جەنازەکە خوێند و کاتێک گەڕاینەوە، بینیمان ژمارەیەکی زۆرتر لەدەوری کۆبوونەتەوە. دواتر لەنێوان ماڵی قەیس کوڕی هەیسەم و ماڵی حارسییەکان کەبەرەو منالەکانی تەمیم دەڕۆشت، جێگەی گرت و وتی: هەرکەس دەیەوێت بمناسێت، من سەلمەم، کوڕی زوەیب.

دەڵێت: لەکاتی گەڕانەوە عەبدولڕەحمان کوڕی بەکرم بینی و لەبەسەرهاتی سەلمە ئاگادارم کردەوە. عەبدولڕەحمان ڕۆشتە لای عوبەیداڵڵە و ئاگاداری

کردەوە. عوبەیدالله کەسی بۆ لای من نارد، ڕۆشتمە لای و وتی: ئەم هەواڵەی باوکی بەحر لەتۆی دەگێڕێتەوە، چییە؟

دەڵێت: بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە تا گەیشتمە کۆتایی. فەرمانیدا هەمانکات، بانگی نوێژ بدەن. خەڵکان کۆبوونەوە و عوبەیدالله لەسەرەتای کاروباری خۆی تا کۆتایی لەگەڵ ئەوان باسکرد و هەروەها ئەوەی پێی وتبوون کەسێك بەڕەزامەندی خۆیان هەڵبژێرن، وتی: جگە لەمن بەکەس ڕازی نەبوون، بەڵام ئاگادار بوومەوە کەدەستی خۆتان بەدەرگا و دیواری ماڵەکان پاککردۆتەوە و شتی جیاوازتان وتووە. هەنووکە من فەرمان دەدەم و جێبەجێ ناکرێت، بۆچوونەکانی من پشتگوێ دەخرێت و خەڵکان دەبنە ڕێگە لەبەردەم هاوەڵانی من. ئێستا سەلمە کوڕی زوەیب بۆ دژایەتی کردنی من هانتان دەدات و دەیەوێت دووبەرەکی لەناو ئێوەدا بنێتەوە و شمشێر بۆ یەك لەکالان دەربێنن.

دەڵێت: ئەحنەف کوڕی قەیس و کەسانی دیکە وتیان: سەلمە دەهێنینە لای تۆ. ڕۆشتنە لای سەلمە، بەڵام ژمارەی ئەو کەسانەی پەیوەستی سەلمە بووبوون، زیادیکردبوو، دووبەرەکی سەریهەڵدابوو. سەلمە لەبەرابەر ئەوان خۆڕاگریکرد. ئەوانیش کاتێك بارودۆخیان بەمشێوەیە بینی، چیتر نەگەڕانەوە بۆ لای عوبەیدالله.

جارودی هەزلی دەڵێت: عوبەیدالله لەناو قسەکانیدا وتی: ئەی خەڵکی بەسرە، سوێند بەخوا، ئێمە خەز و یەمەنی و جلوبەرگی نەرمی زۆرمان پۆشیوە و عادەتمان پێوەی گرتووە و پێستمان بەو جلوبەرگانە ڕاهاتووە، پێویست ناکات دوای ئەوە ئاسن بپۆشین. سوێند بەخوا ئەگەر کۆببنەوە بۆ ئەوەی کلکی وشترێك بشکێنن، ناتوانن ئەو کارە بکەن.

جارود دەڵێت: سوێند بەخوا کاتێك یەکەم تیریان بۆ هاویشت، هەڵات و لای مەسعود خۆی شاردەوە. کاتێك مەسعود کوژرا، ڕێگەی شامی گرتەبەر.

یونس دەڵێت: کاتێك عوبەیدالله پێش شۆڕشەکەی سەلمە، قسەی بۆ خەڵك کرد، هەشت هەزار یا کەمتر لەبەیت ئەلمالدا بوو. بەوتەی عەلی کوڕی محەممەد نۆزدە هەزار بوو. بەخەڵکی وت: ئەمە تالانی ئێوەیە، مانگانەی خۆتان و

ڕۆژانەی منداڵەکانتان هەڵبگرن. بەکاتبەکانی وت پێرستی کەسەکان ئامادە بکەن. بەپەلە کاتبەکانی ناچار کرد و کەسانێکی ڕاسپارد تا شەوانە ئەوان لەدیواندا بهێڵنەوە و مۆمەکانیان بۆ بگرن.

دەڵێت: کاتێک ئەو کارەیان کرد و پشتیان کردە عوبەیداڵڵە و شۆڕشەکەی سەلمە دەستیپێکرد، لەم کارەی پەشیمانبوویەوە و لەکاتی هەڵاتن، هەموو سامانەکەی برد و تا ئێستا ئەو سامانە لەدەستی بنەماڵەی زیاددایە و کاتێک زەماوەند یا پرسە دەگێڕن، لەناو قوڕەیشییەکان کەس وەک ئەوان جوانپۆش و بۆنخۆش نییە.

دەڵێت: عوبەیداڵڵە سەرکردەی جەنگاوەرانی حکومەتی کۆکردەوە و داوای لێکردن شانبەشانی ئەو بجەنگن، وتیان: ئەگەر پێشڕەوەکانمان بجەنگن، ئێمەیش دەجەنگین. براکانی عوبەیداڵڵە پێیان وت: سوێند بەخوا خەلیفەیەک نییە بۆ پشتیوانیکردن لەو بجەنگیت و ئەگەر شکستت خوارد، پەنای بۆ ببەیت تا هاوکاریت بکات. دەزانی جەنگ، هەم سەرکەوتنی هەیە هەم شکست، ئەگەری هەیە ئەمجارە لەزیانی تۆ بێت، سامانێکی زۆرمان لای ئەم خەڵکەیە، ئەگەر سەرکەوتن بەدەست بێنن، دەمانکوژن و سامانەکەمان بەفیڕۆ دەڕوات و هیچ لەتۆ بەجێنامێنێت.

دەڵێت: عەبدوڵڵەی برای (لەیەک دایک و باوک، دایکی ئەویش مەرجانە بوو)وتی: سوێند بەخوا ئەگەر لەگەڵ ئەم خەڵکە بجەنگیت، سک دەخەمە سەر نووکی شمشێر تا لەپشتمەوە بێتەدەر.

دەڵێت: عوبەیداڵڵە کاتێک ئەم بارودۆخەی بینی، حارس کوڕی قەیسی حارسی بانگکرد و وتی: حارس، باوکم وەسیەتی کردووە ئەگەر ڕۆژێک مەبەستی هەڵاتنم کرد، ئێوە هەڵبژێرم و تەنیا بەتۆ ڕازی دەبم.

حارس وتی: وەک دەزانی خەڵکەکەم خزمەتی باوکی تۆیان کردووە بەڵام لای ئەو و لای تۆ، پاداشتیان دەستنەکەوتووە، بەڵام کاتێک ئێمەت هەڵبژارد، بێهیوات ناکەین. بەڵام نازانم چی بکەم، ئەگەر بەڕۆژدا تۆ ببەم، دەترسم پێش ئەوەی بگەیتە لای خەڵکەکەی خۆت، دەکوژرێیت و منیش دەکوژرێم، بەڵام لەگەڵ تۆ

دەمێنمەوە، لەکاتی بومەڵێڵدا کەهاتوچۆ کەمترە، لەپشت سەری من سوار دەبیت بۆ ئەوەی کەس نەتناسێتەوە، دواتر لەگەڕەکی خاڵەکانی خۆم، مناڵەکانی ناجییە، تۆ دەبەم.

عوبەیدالڵە وتی: بۆچوونێکی تەواوە.

دەڵێت: مایەوە تا ئەو کاتەی تاریکی داهات و مرۆڤ لەگورگ جیا نەدەکرایەوە، عوبەیدالڵە لەپشت سەری خۆی سوار کرد، هەموو سامانەکەیان گەیاندبووە شوێنی مەبەست. حارس ئەوی برد و لەناو ئەو کەسانەی لەترسی حەرورییەکان کێشکیان دەگرت، پەڕاندییەوە. عوبەیدالڵە دەیپرسی: لەکوێین؟ وەڵامی دەدایەوە. کاتێك لەگەڕەکی مناڵەکانی سەلیم گوزەریانکرد، عوبەیدالڵە پرسی: لەکوێین؟

وتی: لەگەڕەکی مناڵەکانی سەلیم.

وتی: بەخواستی خوا، بەسلامەت ڕزگارمان بوو.

کاتێك گەیشتە گەڕەکی مناڵەکانی ناجییە، پرسی: لەکوێین؟

وتی: لەگەڕەکی مناڵەکانی ناجییە.

وتی: بەخواستی خوا، ڕزگارمان دەبێت.

مناڵەکانی ناجییە پرسییان: کێیت؟

وتی: حارس کوڕی قەیس.

وتیان: برازای ئێوەیە. بەلام یەکێك لەوان عوبەیدالڵەی ناسییەوە و وتی: کوڕی مەرجانە، تیرێکی بۆ هاویشت و بەردەستارەکەی کەوت.

دەڵێت: حارس ئەوی برد تا گەیاندییەماڵەکەی خۆی لەگەڕەکی جەهازم بەلام ڕۆشتە لای مەسعود کوڕی عەمرۆ ئەزدی. کاتێك مەسعود ئەوی بینی، وتی: ئەی حارس، لەشوومی شەو هاتووان، پەنایان بۆ خوا دەبرد، لەبەلای ئەو شتەی هێناوتە، پەنا بۆ خواوەند دەبەین.

حارس وتی: جگە لەچاکە هیچم نەهێناوە. دەزانی خەڵکەکەی تۆ زیادیان ڕزگار کرد و کەسانێکی ئەمەکدار بوون و ئەمە بووە هۆی ئەوە پێگەیان لای عەرەبەکان بەرز ببێتەوە و شانازی بەخۆیانەوە بکەن. ئێوە بەڕەزامەندی و ڕاوێژ بەیعەتتان لەگەڵ عوبەیدالڵە بەست، پێشتر بەیعەتی گشتیتان لەئەستۆدا بووە.

مەسعود وتی: ئەی حارس، بەبۆچوونی تۆ لەسەر عوبەیدالڵە دوژمنایەتی خەڵکی شارەکەمان بکەین لەکاتێکدا لەسەردەمی باوکی، ڕووبەڕووی ئەو هەموو دژوارییە بووینەوە بێ ئەوەی پاداشمان دەستکەوێت. گومانم نەدەکرد ئەمە بۆچوونی تۆ بێت.

حارس وتی: هیچکەس دوژمنایەتی تۆ ناکات تا ئەو کاتەی دەیگەیێنیتە شوێنی مەبەست.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەڵام لەگێڕانەوەی باوکی لوبەیدی جەهزەمی بەمشێوەیە هاتووە کەحارس کوڕی قەیس دەڵێت: عوبەیدالڵە کوڕی زیاد داوای هاوکاری لێکردم و وتی: سوێند بەخوا دەزانم خەڵکەکەی تۆ بۆچوونێکی باشیان نەبووە.

دەڵێت: بەشێوەیەکی نەرم و نیان هەڵسوکەوتم لەگەڵ کرد، ئەوم لەپشت سەری خۆم سوار ئێسترەکەم کرد. شەو بوو، لەگەڕەکی مناڵەکانی سەلیم گوزەرمان کرد و وتی: ئەمانە کێن؟

وتم: مناڵەکانی سەلیم.

وتی: بەخواستی خوا ڕزگارمان دەبێت.

دەڵێت: لەگەڕەکی مناڵەکانی ناجییە گوزەرمانکرد، دانیشتبوون و سیلاحیان بەدەستەوە بوو. لەو کاتەدا خەڵکان لەگەڕەکەکانی خۆیان کێشکیان دەگرت.

وتیان: کێیت؟

وتم: حارس کوڕی قەیس.

وتیان: برۆ، هیوادارین ڕێگەی ڕاست بدۆزیتەوە.

دەڵێت: کاتێك گوزەرمانکرد، یەك لەوان وتی: سوێند بەخوا ئەو کوڕی مەرجانەیە لەپشت سەری حارس سوار بووە. تیرێکی هاویشت و لەدەستارەکەی عوبەیدالڵە چەقی.

عوبەیدالڵە وتی: ئەی باوکی محەممەد ئەمانە کێن؟

وتم: ئەو کەسانەن گومانت دەکرد لەقوڕەیشن، ئەمانە مناڵەکانی ناجییەن.

وتی: بەخواستی خواوەند ڕزگارمان دەبێت.

دواتر وتی: ئەی حارس، چاکەت کرد و چاکەخواز بوویت، ئایا ئەگەر شتێك

بڵێم، ئەنجامی دەدەیت؟ پێگەی مەسعود کوڕی عەمرۆ لەناو خەڵکەکەی دەزانی، دەزانی کەسێکی بڕواپێکراوە و پیر و خەڵکان گوێرایەڵی بۆچوونەکانی ئەون. بمبە بۆ ماڵەکەی ئەو تا لەناو خەڵکانی ئەزد بم چوونکە ئەگەر ئەو کارە نەکەیت، دوژمنایەتی لەنێوان تۆ و خەڵکەکەت دروست دەبێت.

وتم: بەڵێ.

دەڵێت: ئەوم برد. مەسعود نەیدەزانی تا گەشتینە لای. دانیشتبوو، تاکێکی پێپۆشەکانی دەرهێنابوو، ئەوی دیکەیانی لەپێدابوو و دەستی لێدەدا. کاتێک سەیری کردین، ناسینیەوە و وتی: لەمیوانە شوومەکان پەنایان بۆ خواوەند دەبرد.

پێم وت: کەواتە ئەو کەسە دەردەکەیت کەڕووی لەماڵەکەی تۆ کردووە؟

دەڵێت: وتی ئەو بۆ ماڵی عەبدولغافر کوڕی مەسعود ببەن. لەو کاتەدا هاوسەری عەبدولغافر، خەیرە کچی خەفاف کوڕی عەمرۆ بوو.

بێژەر دەڵێت: هەمانشەو مەسعود سوار بوو. حارس و دەستەیەک لەخەڵکەکەی هاوڕێیەتییان دەکرد، لای کۆبوونەوەی ئەزدییەکان تێپەڕین و وتیان: کوڕی زیاد لەکوێیە، چوونکە دیار نییە و دەترسین لای ئێوە بێت.

دەڵێت: ئەو شەوە شمشێریان دانەنا و خەڵک کوڕی زیادیان نەدۆزییەوە و وتیان: دەبێت ڕوویکردبێتە کام ناوچە؟

دەیانوت: لەناو خەڵکانی ئەزد خۆی حەشارداوە.

پیرێژنێك لەمناڵەکانی عەقیل وتی: بۆ کوێ ڕۆشتووە؟ سوێند بەخوا لەدارستانەکانی باوکی خۆی حەشارداوە.

دەڵێت: مردنی زیاد لەکاتیکدا بوو کوڕی زیاد هاتبووە بەسرە و لەوکاتەدا خەزێنەی بەسرە، شانزە هەزار هەزاری تیا بوو. عوبەیدالله بەشێکیدا بەبراکانی و ئەوی دیکەی هەڵگرت. داوای لەبوخارییە کردبوو شانبەشانی بجەنگێت و هەروەها داوای لەکوڕەکانی زیاد کرد بەڵام ڕازی نەبوون.

عەبدوڵلە کوڕی جەریری مازنی دەڵێت: شەقیق کوڕی سەور بانگیکردم و وتی: بیستوومە کەکوڕی باوکی مەنجوف و کوڕی موسەممەع، شەوانە دەڕۆنە ماڵی

کوڕی مەسعود تا کوڕی زیاد بگەڕێننەوە تا ئەو دوو کەسە لەخۆڕازییە پەیوەستی یەك بکەن و خوێنی ئێوە بڕێژن و خۆیان بەهێز بکەن. دەمەوێت بیگرم و لای خۆمان دەربیبکەین. بڕۆ لای کوڕی مەسعود و سڵاوی منی پێبگەیێنە و بڵێ: کوڕی مەنجوف و کوڕی موسەممەع فلاْنە و فیسارە کار دەکەن، ئەوان لەخۆت دوور بکەرەوە.

دەڵێت: ڕۆشتمە لای کوڕی مەسعود، دوو کوڕەکەی زیاد لای ئەو بوون. یەکیان لای ڕاست و ئەوی دیکەیان لای چەپ دانیشتبوو. وتم: باوکی قەبیس، سڵاو لەتۆ.

وتی: سلاْو لەتۆیش.

وتم: شەقیق کوڕی سەور منی ناردووە، سڵاوت لێدەکات و دەڵێت بیستوومە..... پەیامەکەم گەیاند تا ئەو شوێنەی وتبووی: ئەوان لەخۆت دوور بکەرەوە.

مەسعود وتی: سوێند بەخوا ئەوەم وت.

دەڵێت: عوبەیدالله وتی: باوکی سەور، چۆن؟

دەڵێت: نازناوی ئەوی لەبیرکردبوو، نازناوی ئەو باوکی فەزڵ بوو.

دەڵێت: عەبدوڵڵەی برای وتی: سوێند بەخوا ئێمە لای ئێوە ناڕۆین، پەناتان پێداوین. ناڕۆین تا ئەوەی لەناو ئێوەدا دەکوژرێین و بەمشێوەیە ئەم کارە، تا ڕۆژی هەستانەوە وەك پەڵەیەکی نەنگین بەڕوخساری ئێوەوە دەبێت.

باوکی لوبەید دەڵێت: خەڵکی بەسرە کۆبوونەوە و کاروباری خۆیان بەنەعمان کوڕی سەهبانی ڕاسبی و یەکێك لەخەڵکانی موزێر سپارد تا کەسێك وەك فەرمانڕەوای بەسرە هەڵبژێرن و وتیان: هەرکەس ئێوە پەسەندی بکەن، پەسەندی دەکەین.

بێژەرێکی دیکە دەڵێت: پیاوی موزێری، قەیس کوڕی هەیسەمی سولەمی بوو.

باوکی لوبەید دەڵێت: پیاوی موزێری دەیویست کەسێك لەمناڵەکانی ئومەییە هەڵبژێرێت و نەعمان، خوازیاری کەسێك لەمناڵەکانی هاشم بوو. نەعمان وتی: هیچکەس بۆ ئەم کارە بەشیاوتر لە فلاْنەکەس - یەکێك لەمناڵەکانی ئومەییە-

نازانم.

موزێری وتی: بۆچوونی تۆ ئەمەیە؟

وتی: بەڵێ.

وتی: ئەم کارە بەتۆ دەسپێرم و هەرکەس پەسەند بکەیت، پەسەندی دەکەم. دواتر ڕۆشتنە لای خەڵکان. موزێری وتی: من بەبۆچوونی نەعمان ڕازیم، هەرکەسی ناوبرد، ڕەزامەندی منیشی لەسەرە.

لەنەعمانیان پرسی: چی دەڵێیت؟

وتی: جگە لە عەبدوڵڵە کوڕی حارس ناسراو بە بەبە، کەس بەشیاو نازانم.

پیاوی موزێری وتی: بەڵام شتێکی دیکەت بەمن وت.

وتی: سوێند بەگیانی خۆم هەر ئەمە بوو.

دەڵێت: خەڵك بە عەبدوڵڵە ڕازی بوون و بەیعەتیان لەگەڵ بەست.

هاوەڵانی ئێمە دەڵێن: خەڵکانی موزێر خوازیاری فەرمانڕەوایەتی عەباس کوڕی ئەسوەدی زوهری بوون کەبرازای عەبدولڕەحمان کوڕی عەوفە بەڵام یەمەنییەکان خوازیاری فەرمانڕەوایەتی عەبدوڵڵە کوڕی حارس بوون و ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی قەیس کوڕی هەیسەم و نەعمان کوڕی سەهبانی ڕاسبی بۆ ئەوکارە هەڵبژێرن تا لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو دوو پیاوە بکەن و ئەو دووانە ڕازی بوون کەپیاوی موزێری، کەسێك لەمناڵەکانی هاشم وەك فەرمانڕەوا دیاریبکات تا ئەو کاتەی خەڵکان پێشەوا و خەلیفەیەك هەڵدەبژێرن و شاعیر لەمبارەوە وتی:

(( ئێمە ڕۆشتین و مناڵەکانی بەکر کوڕی وائیل

هێلکەگونی خۆیان ڕادەکێشا

بۆ ئەوەی بزانن پەیمان لەگەڵ کێ ببەستن)).

کاتێك بەبەیان وەك فەرمانڕەوای بەسرە دەستنیشانکرد، هەمیان کوڕی عودەی وەك سەرکردەی پاسەوانەکان دانا.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: گێڕانەوەیەکی دیکە لەباوکی سەعدان سەبارەت بەبەسەرهاتی مەسعود و عوبەیدالڵە کوڕی زیاد ئاماژەی پێدراوە و دەڵێت: لەموسلیمە نەوەی سەلەم کوڕی زیاد و کەسانیتر لەبنەماڵەی زیاد کە لەکاتی

کارەساتەکەدا بوون و هەروەها لەکۆیلەکانم بیست کەحارس کوڕی قەیس قسەی لەگەڵ مەسعود نەکرد بەڵکو ئەمانی بە عوبەیدالله بەخشی و یەکسەد هەزاری هەڵگرت و بردییە لای دایکی بەستام هاوسەری مەسعود کەکچە پووری بوو. عوبەیدالله و عەبدوڵڵە، کوڕەکانی زیاد لەگەڵیدا بوون. داوای مۆڵەتی کرد و دایکی بەستام مۆڵەتیدا. حارس پێی وت: شتێکم هێناوە کەبەهۆیەوە دەبیتە پێشەوای ژنانی عەرەب و پێگەی خەڵکەکەت بەرز دەکەیتەوە و دەبێتە کەسێکی دەوڵەمەند، ئەم سەد هەزار درەمە بگرە بەڵام عوبەیدالله لای خۆت بپارێزە.

وتی: دەترسم مەسعود بەمە ڕازی نەبێت.

حارس وتی: یەکێك لەجلەکانی خۆتی لەبەر بکە و بیبە ژوورەکەی خۆت و ئێمە لەگەڵ مەسعود بەجێبێڵە.

دەڵێت: دایکی بەستام پارەکەی وەرگرت و عوبەیداللەی بردە ژوورەکەی خۆی و کاتێك مەسعود هات ئاگاداری کردەوە. عوبەیدالله و حارس هاتنە لای مەسعود.

عوبەیدالله وتی: کچە پوورەکەت پەنای بەمندا، هەنووکە جلەکانی تۆ لەبەر مندایە و خواردنی تۆ لەسکی مندایە و لەماڵەکەی تۆدام. حارسیش لەمبارەوە شایەتیدا و نەرمییان نواند تا ئەوەی مەسعود ڕازی بوو.

باوکی عوبەیدە دەڵێت: عوبەیدالله نزیکەی پەنجا هەزار درەمی بەحارسدا و لەماڵی مەسعود مایەوە تا ئەو کاتەی مەسعود کوژرا.

سوار کوڕی عەبدوڵڵەی جرەمی دەڵێت: کاتێك عوبەیدالله هەڵات، خەڵکی بەسرە بێ فەرمانڕەوا مانەوە و سەبارەت بەهەڵبژاردنی فەرمانڕەوا بۆچوونەکانیان جیاواز بوو. دواتر لەسەر دوو کەس ڕێکەوتن تا ئەو دوو کەسە یەکێك هەڵبژێرن و کاتێك ئەوان هەڵیانبژارد، خەڵکانیش ڕەزامەندی خۆیان نیشان بدەن. قەیس کوڕی هەیسەمی سەلەمی و نەعمان کوڕی سەهبانی ڕاسبییان هەڵبژارد تا ئەو دووانە بەڕەزامەندی یەکتر، کەسێك هەڵبژێرن. ناوی عەبدوڵڵە کوڕی حارسی موتەلیبییان هێنا کەدایکی هیند کچی ئەبوسوفیان کوڕی حەرب و نازناوەکەی بەبە بوو هەروەها عەبدوڵڵە کوڕی ئەسوەدی زوهری و کاتێك لەسەر ئەم دوو کەسە ڕێکەوتن، مەربودیان کردە شوێنی کۆبوونەوە و بەڵێنیان بەخەڵکاندا لەم

دووکەسە یەکیان هەڵبژێرن.

دەڵێن: خەڵکان ئامادە بوون، منیش لەگەڵ ئەواندا بووم، لەبەشی سەرەوەی مەربود، قەیس کوڕی هەیسەم هات، دواتر نەعمان. قەیس و نەعمان سەرقاڵی گفتوگۆکردن و بیروڕا گۆڕینەوە بوون و قەیس وای نیشاندەدا کەخوازیاری هەڵبژاردنی کوڕی ئەسوەدە.

دواتر وتی: ئێمە ناتوانین هەردووکمان قسە بکەین. داوای لەقەیس کردن قسەکردن لەگەڵ خەڵکان بەو بسپێرێت و قەیس ڕازی بوو. نەعمان پەیمانی لەخەڵك وەرگرت بەو کەسە ڕازی بن کەئەوان هەڵیدەبژێرن.

دەڵێت: نەعمان ڕۆشتە لای عەبدوڵڵە کوڕی ئەسوەد و دەستی گرت و چەندین مەرجی بۆ دانا بەشێوەیەك خەڵك گومانیانکرد ئەو هەڵدەبژێرێت، دواتر دەستی عەبدوڵڵە کوڕی حارسی گرت و چەندین مەرجیشی بۆ ئەو دانا؛ ئەوسا سپاسی خواوەندی کرد و ئاماژەی بەناوی پێغەمبەر (د.خ) و ماڤ بنەماڵەکەیدا. وتی: ئەی خەڵکینە، بۆ یەکێك لەئامۆزاکانی پێغەمبەر (د.خ) کەدایکی هیند کچی ئەبوسوفیانە، چ ڕەخنەیەکتان هەیە، ئەگەر کاروبارەکان لەدەستی ئەودا بێت، خوشکەزای ئێوەیە.

دەڵێت: دەستی خستە ناو دەستی ئەو، وتی: من ئەوم وەك فەرمانڕەوای ئێوە هەڵبژارد.

خەڵکان دەنگیان بەرز کردەوە: ئێمەیش ڕازین.

دەڵێت: عەبدوڵڵە کوڕی حارسیان بردە کۆشکی فەرمانڕەوایەتی و لەوێ جێگیر بوو. ئەم پێشهاتە لەیەکی جومادی الاخری ساڵی شەست و چوارەم ڕوویدا. ئەو، هەمیان کوڕی عودەی سەدوسی وەك سەرکردەی پاسەوانەکانی خۆی دیاریکرد و لەناو خەڵکان جاڕیدا بۆ بەیعەت ئامادە بن. خەڵکان هاتن و بەیعەتیان لەگەڵ بەست. فەرزدق کاتێك بەیعەتی لەگەڵ بەست، هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

(( لەگەڵ کەسانێك بەیعەتم کرد و بۆ پەیمانەکەم ئەمەکدار بووم

لەگەڵ بەبەیش بەیعەتم بەست بێ ئەوەی پەشیمان بم)).

عەمرۆ کوڕی عیسا دەڵێت:ماڵی مالیك کوڕی موسەممەغی جەحدەری لەباتینە نزیك ماڵی عەبدوڵڵەی ئیسفەهانی لەگەڕەکی مناڵەکانی جەحدەر لای مزگەوتی گەورە بوو. مالیك لەمزگەوت ئامادە دەبوو. ڕۆژێك دوای هەڵبژاردنی بەبە، لەمزگەوت دانیشتبوو، یەکێك لەمناڵەکانی عەبدوڵڵە کوڕی عامر کوڕی کورەیزی قورەشی، هات کەنامەیەکی لە عەبدوڵڵە کوڕی خازم لەهەراتەوە هێنابوو. گفتوگۆیان کرد. قورەیشی بەشێوەیەکی زبر لەگەڵ مالیك دووا و یەکێك لەخەڵکانی بەکر کوڕی وائیل، شەقەزللەیەکی لەپیاوی قورەیشیدا و کەسانێك لەخەڵکی موزێر و ڕەبیعە کەلەوێ بوون، تورە بوون. زۆربەی ئامادەبووان لەخەڵکانی ڕەبیعە بوون. یەکێك هاواریکرد: ئەی بنەماڵەی تەمیم، دەستەیەك لەخەڵکی زەببە کوڕی ئەد کەلای قازی بوون، ئەم دەنگەیان بیست، ڕم و قەڵغانی پاسەوانەکانی مزگەوتیان وەرگرت و هێرشیان کردە سەر خەڵکانی ڕەبیعە و شکستیان پێهێنان.

دەڵێت: شەقیق کوڕی سەوری سەدوسی ئاگادار بوویەوە و لەو کاتەدا سەرکردەی بەکر کوڕی وائیل بوو، هاتە مزگەوت و وتی: هەرکەس لەخەڵکانی موزێرتان گرت، بیکوژن.

مالیك کوڕی موسەممەع ئەمەی بیست و نێوەنجیگەری کرد تا ئەوەی خەڵکان ئارام بوونەوە و دەستیان هەڵگرت.

دەڵێت: مانگێك یا کەمتر تێپەڕی، یەکێك لەمناڵەکانی یەشکور لەگەڵ یەکێك لەمناڵەکانی زەببە لەمزگەوت دانیشتبوو، باسی ئەو شەقەزللەیان دەکرد کەپیاوی بەکری لەپیاوی قورەیشیدابوو. یەشکوری شانازیکرد و وتی: هیچ نەبوو. زەببی تورەبوو و لەگەردنیدا. ئەو کەسانەی بۆ نوێژی هەینی هاتبوون، پەلاماریاندا و پیاوی یەشکورییان نیوەگیان بۆ لای کەسەکانی گەڕاندەوە. بەکرییەکان کەسەرکردەکەیان ئەشیم کوڕی شەقیق بوو، تورە بوون و وتیان: بڕۆین.

وتی: کەسێك دەنێرم ئەگەر قەرەبوویان نەکردینەوە، ئەوسا دەڕۆین.

بەڵام بەکرییەکان بەمە ڕازی نەبوون و ڕۆشتنە لای مالیك کوڕی موسەممەعت کەپێش ئەشیم، سەرکردەی خەڵکان بوو. ئەشیم لەو کاتەوەی باوکی ڕۆشتبووەی

لای یەزید کوڕی معاویە، سەرکردایەتی خەڵکانی بەدەستهێنابوو چوونکە یەزید بۆ عوبەیداڵڵەی نووسی: ئەشیم بکەنە سەرکردە بەڵام خەڵکی نەهازم یانی منالەکانی قەیس کوڕی سەعلەبە و هاوپەیمانەکانیان و کەسانی دیکە و هەروەها شەیع اللات و هاوپەیمانەکانیان عیجل، دژایەتی ئەم فەرمانەیان کرد و ئەم تایەفانە لەبەرابەر بنەماڵەی زوهەل کوڕی شەیبان و هاوپەیمانەکانیان یەشکور، و هەروەها زوهەل کوڕی سەعلەبە و هاوپەیمانەکانیان زەبیعە کوڕی ڕەبیعە، بوونە چوار تایەفە لەبەرابەر چوار تایەفە. پێشتریش لەڕۆژگاری جاهلییەت لەم پەیمانانە دەبینرا وەك پەیمانی تایەفەکانی بەکر، حەنیفە. لەڕۆژگاری جاهلییەت نۆ تایەفە پەیوەستی ئەم پەیمانە بووبوون و دواتر لەگەڵ عیجل، پەیوەستی ئیسلام بوون و نازناوی لەهزمەیان وەرگرت یانی تێکەڵاو.

سەبارەت بەسەرکردایەتی ئەشیم، بەفەرمانی عیمران کوڕی عسامی عەنزەی لەمنالەکانی هەمیم ڕەزامەندییان نیشاندا و سەرکردایەتی بەئەشیم سپارد. کاتێك ئەم ئاژاوەیە ڕوویدا، مالیك کوڕی موسەممەعیان ئیدانە کرد. ئەویش هەوڵیدا و دەستەیەکی لەدەوری خۆی کۆکردەوە و داوای لەهۆزی ئەزد کرد ئەو پەیمانەی ساڵی پێشتر دژی یەزید بەستبوویان، تازەی بکەنەوە.

دەڵێت: عوبەیداڵڵە لەماڵی مەسعود بوو، لەدووبەرەکی و ئاژاوەی نێوان بەکر و تەمیم ئاگادار بوویەوە و بەمەسعودی وت: سەردانی مالیك بکە و پەیمانی یەکەم تازە بکەرەوە.

مەسعود سەردانی مالیکی کرد بەڵام بەداواکەی ڕازی نەبوو و چەند کەس لەوان نارەزامەندی خۆیان بۆ تازەکردنەوەی پەیمانی یەکەم نیشاندا. عوبەیداڵڵە، عەبدوڵڵەی برای لەگەڵ مەسعود نارد و پارەیەکی زۆری پێدا و زیاتر لەدووسەد هەزار درهەمیان خەرج کرد تا بەیعەتی لەگەڵ بەستن. عوبەیداڵڵە بەبراکەی خۆی وت: لەم خەڵکە بۆ یەمەنییەکان پەیمان وەربگرە، پەیمانەکەیان تازە کردەوە، جگە لەو دوو نووسراوەی پێشووتر، پەیمانێکی تازەیان نووسی و پەیمانێکیان لای مەسعود کوڕی عەمرۆ دانا.

باوکی عوبەیدە دەڵێت: یەکێك لەکوڕەکانی مەسعود پێی وتم یەکەم ناوی ئەم

پەیمانە نووسراوە، سەڵت کوڕی حورەیسی حەنەفی بوو. پەیماننامەیەکیان لای سەڵت کوڕی حورەیس دانا کەیەکەم ناوی ناو پەیماننامەکە، ڕەجائی عەوەزی بوو.

باوکی عوبەیدە دەڵێت: محەممەد کوڕی حەفس و کەسانی دیکە گومانیانکردووە ژمارەی خەڵکانی موزێر لەبەسرە زیاتر لەڕەبیعە بوو و ئەزدییەکان دووایین دەستەبوون دوای ئەوەی بەسرە بوو بەشار، لەو شارەدا نیشتەجێ بوون. عومەر کوڕی خەتاب دەستەیەك لەموسوڵمانانی بۆ ئەو شارە گواستەوە، ئەزدییەکان لەشوێنی خۆیاندا بوون و لەکۆتایی خەلافەتی معاویە و سەرەتای خەلافەتی یەزید کوڕی معاویە، هاتنە بەسرە، کاتێك هاتنە ناو شارەکە، منداڵەکانی تەمیم بەئەحنەفیان وت: (( پێش ئەوەی خەڵکانی ڕەبیعە پێشدەستی بکەن، سەرقاڵی ئەوان بە)).

ئەحنەف وتی: ئەگەر هاتنە لای ئێوە، پێشوازییان لێبکەن و وەریانبگرن، جیاواز لەوە، ئێوە نەڕۆنە لایان چوونکە دەبنە ژێردەستە و شوێنکەوتەی ئەوان.

مالیك کوڕی موسەممەع هاتە لایان. لەو کاتەدا سەرکردەی ئەزدییەکان مەسعود کوڕی عەمرۆ کوڕی مەعنی بوو. مالیك وتی: ئەو پەیمانەی لەڕۆژگاری جاهلی لەنێوان ئێمە کێندە و هەروەها لەنێوان ئێمە و منداڵەکانی زوهەلی تەی بووە، تازە بکەنەوە.

ئەحنەف وتی: ئێستا کەڕۆشتنە لای ئەوان، بەردەوام شوێنکەوتە و ژێردەستەی ئەوان دەبن.

باوکی عوبەیدە دەڵێت: کاتێك خەڵکانی بەکر خوازیاری هاوکاری کردنی موزێرییەکان بوون و پەیمانە کۆنەکەیان تازەکردەوە و ویستیان بەڕێکەون، ئەزدییەکان وتیان: لەگەڵ ئێوەدا بەڕێناکەوین، مەگەر ئەوەی سەرکردایەتی هەمووان لەدەستی ئێمەدا بێت. بەمشێوەیە مەسعودیان وەك سەرکردە دەستنیشانکرد.

موسلیمە کوڕی موحارب دەڵێت: مەسعود بە عوبەیدالڵەی وت: وەرە با جارێکی دیکە تۆ بۆ کۆشکی فەرمانڕەوایەتی بگەڕێیننەوە.

عوبەیدالله وتی: توانای ئەو کارەم نییە، تۆ برۆ. فەرمانیدا کەرەستەی پێویست ئامادە بکەن، جلوبەرگی سەفەری لەبەر کرد، چوارپایەییەکان لەبەردەم ماڵی مەسعود دانا و لەسەری دانیشت. مەسعود ڕۆشت. عوبەیدالله چەند کەس لەکۆیلەکانی خۆی لەگەڵ ئەسپەکەی مەسعود نارد و پێی وتن: نازانم چی ڕوودەدات، کاتێك پێشهاتێك ڕوویدا، کەسێکتان هەواڵم بۆ بێنێت، بەمشێوەیە هەر پێشهاتێکی خۆش یا ناخۆش ڕوویدا، کەسێکتان بگەڕێتەوە و هەواڵەکانم بۆ بێنێت.

بەمشێوەیە مەسعود دەگەیشتە هەر کۆڵانێك و لای هەر هۆزێك تێدەپەڕیٚ، یەکێك لەکۆیلەکان دەگەڕایەوە و عوبەیدالله‌ی ئاگادار دەکردەوە.

دەڵێت: مەسعود ڕۆشتە لای هۆزی ڕەبیعە و تەواوی کۆڵانەکانی مەربودیان گرت. مەسعود هات و ڕۆشتە ناو مزگەوت و چووە سەر مینبەر. عەبدوڵڵە کوڕی حارس لەکۆشکی فەرمانڕەوایەتی بوو، پێیان وت: مەسعود و یەمەنییەکان و خەڵکی ڕەبیعە بەرێکەوتوون و شەڕ و ئاژاوە لەنێوان خەڵکان ڕوودەدات، چی دەبێت ئاشتی لەنێوان ئەواندا سەقامگیر بکەیت و لەگەڵ منداڵەکانی تەمیم بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەوان بڕۆیت.

وتی: خواوەند نفرینیان بکات، سوێند بەخوا بۆ سەقامگیرکردنی ئاشتی لەنێوان ئەوان، پێگەی خۆم لەناو نابەم. ژمارەیەك لەهاوەڵانی مەسعود هۆنراوەیەکیان خوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

(( ژنێك بۆ بەبە دێنم

کچێك لەناو سەراپەردەیەك

کەیارییەکان ڕێکبخات)).

ئەمە بەوتەیەك، وتەی خەڵکانی ئەزد و ڕەبیعەیە بەڵام موزێرییەکان دەڵێن دایکی بەبە، هیند کچی ئەبوسوفیانی هەڵدەپەڕاند و ئەم هۆنراودی دەخوێندەوە.

دەڵێت: کەس ڕێگری لەوە نەگرت مەسعود بڕواتە سەر مینبەر، مالیك کوڕی موسەممەع لەگەڵ دەستەیەك، لەکۆڵانی مەربود، ڕوویکردە گۆڕەپانەکە، دواتر لای ماڵی منداڵەکانی تەمیم گوزەریکرد تا لەلای گۆڕەپانەکەوە گەیشتە کۆڵانی

منداڵـەکانی ئەلعەدەوییـە و ماڵـەکانیان سـووتاند بـەهۆی ئـەو کینـەی لـەکوژرانی پیاوێکی یەشـکوری بەدەسـتی پیـاوێکی زەبـبی لەدڵیانـدا بـوو و هـەروەها بـەهۆی ئەوەی کوڕی خازم لەهەرات دەستدرێژی کردبووە سەر خەڵکانی ڕەبیعە.

دەڵێـت: سـەرقاڵی ئـەم بابەتـە بـوون کـەهاتن و وتیـان: مەسـعودیان کوشـت. هـەروەها وتیـان: منداڵـەکانی تـەمیم بەڕێکـەوتوون. مالیـك هـات و لـەکۆڵانی مـەربود گەیشتە مزگەوتی منداڵـەکانی قـەیس، کاتێـك هـەواڵی کوژرانی مەسعودی بیست، وەستا.

مالیك کوڕی دینار دەڵێت: لەگـەڵ ئـەو گەنجانـەدا بـووم بـۆ سـەیرکردن لـەدەوری ئەحنەف کۆببووبووینەوە. ڕۆشتمە لای. منداڵەکانی تـەمیم هـاتن و وتیـان: مەسعود ڕۆشتە ناو کۆشکی فەرمانڕەوایی و تۆ سەروەری ئێمەیت.

وتی: من سەروەری ئێوە نیم، سەروەری ئێوە شەیتانە.

ئیـسحاق کـوڕی سـوەیدی عـەدەوی دەڵێـت: لەگـەڵ خـەڵکان ڕوومـان لـەماڵی ئەحنەف کرد، ڕۆشتنە لای ئەحنەف و وتیان: ئەی باوکی بەحر، ڕەبیعە هاتوونەتە ناو گۆڕەپانەکە.

وتی: ئێوە زیاتر لەوان لەکۆشکی فەرمانڕەوایەتی مافتان نییە.

دەڵێـت: سـەلمە کـوڕی زوەیـب تـوڕە بـوو، وتـی: ئـەی گەنجـەکان لـەدەوری مـن کۆببنەوە، ئەمە ترسەنۆکە و هیچ سوودێك بەئێوە ناگەیەنێت.

دەڵێت: گورگەکانی منداڵەکانی تەمیم هەوڵەکانیان دەستپێکرد و پێنسەد کـەس لـەوان خۆبەخـشانە ئامـادە بـوون لەگـەڵ مـاه ئەفرەیـدون بەڕێکـەون. سـەلمە کـوڕی زوەیب پێی وتن: مەبەستی کوێتان هەیە؟

وتیان: بەرەو لای ئێوە دەهاتین.

وتی: پێشڕەوی بکەن.

ناشیب کوڕی حەسحاس و حەمید کوڕی هیلال دەڵێن: ڕۆشتینە ماڵی ئەحنـەف کە لەنزیك مزگەوتەکە بوو، لەڕیزی سەیرکەراندا بووین. ژنێـك ئاگردانێکی هێنایـە پێش و وتی: تۆ کەی شیاوی بۆ سەروەری کردنی خـەڵکان، بـڕۆ هاوشـێوەی ژنـان بخور بسووتێنە.

ئەحنەف وتی: بنەوەی ژن زیاتر شیاوی ئاگردانە.

دەڵێت: دواتر هاتنەلای و وتیان: پاوانەکانی عولیە کچی ناجییەی ڕیاحی و خوشکی مەتریان، لەپێی دەرهێناوە. دەستەیەک ناوی عەزە کچی حوڕی ڕیاحییان هێنا، ماڵی ئەو لەگۆڕەپانی منداڵەکانی تەمیم لای شوێنی نوێژگەکە بوو، هەروەها وتیان: ڕەنگرێژێك کە لەسەر ڕێگەکەی تۆ بوو، کوشتیان. هەروەها پیرەپیاوێکیان لەمزگەوتدا کوشت. هەروەها وتیان: مالیك کوڕی موسەممەع ڕۆشتە ناو کۆڵانی منداڵەکانی ئەلعەدەرییە و چەند ماڵێکی سووتاند.

ئەحنەف وتی: کەسانێك بێنن ئەم ڕووداوانە پشتڕاست بکاتەوە چوونکە بۆ کەمتر لەمانەیش، جەنگ دژی ئەوان ڕەوایە.

دەڵێت: چەند کەسێك شایەتییاندا.

ئەحنەف وتی: عیباد هات؟ مەبەستی عیباد کوڕی حەسینی تەمیمی بوو.

وتیان: نە.؟

دەڵێت: چەند ساتێك چاوەڕوان بوو، دووبارە وتی: عیباد هات؟

وتیان: نە.

وتی: عەبەس کوڕی تەڵەق لێرەیە؟

وتیان: بەڵێ.

ئەوی بانگکرد و پارچەیەك کە لەخۆی ئالأندبوو، لێکردەوە و کەوتە سەر ئەژنۆ، پارچەکەی بەڕمێکەوە بەست و تەسلیم بەوی کرد و وتی: بڕۆ.

دەڵێت: کاتێك عەبەس بەڕێکەوت، وتی: خواوەندا ڕیسوای مەکە بەهەمانشێوە کەپێشتر ڕیسوا نەبووە.

دواتر خەڵکان دەنگیان بەرز کردەوە کە(زیرا) کەوتە جووڵە. زیرا کەنیزی ئەحنەف بوو و مەبەستیان لەزیرا، خودی ئەحنەف بوو.

دەڵێت: کاتێك عەبەس ڕۆشت، عیباد لەگەڵ شەست سوار هات و دەنگوباسی پرسی.

وتیان: ڕۆشتن.

وتی: کێ سەرکردەیان بوو.

وتیان: عەبەس کوڕی تەڵەقی سورەیمی.

وتی: من لەژێر ئاڵای عەبەسدا بڕۆم. لەگەڵ سوارەکانی بۆ لای خەڵکەکەی گەڕایەوە.

باوکی ڕێحانەی عورەینی دەڵێت: ڕۆژی کوژرانی مەسعود، لەژێر سکی ئەسپی زەرد کوڕی عەبدوڵڵەی سەعدی بووم و ڕامکرد تا گەیشتمە چاڵاوە کۆنەکە.

ئیسحاق کوڕی سوەید دەڵێت: کاتێک گەیشتنە سەرەتای کۆڵانەکان، ما ئەفرەیدون بەزمانی پارسی پێی وتن: ئەی گەنجەکان (یا کۆیلەکان) چی ڕوویداوە؟

وتیان: ڕم بەدەست هاتنە بەردەم ئێمە.

بەپارسی پێی وتن: بەپێنجدانە شەڕیان لەگەڵ بکەن. یانی لەیەک کاتدا پێنج تیر بهاوێژن. سوارەکان چوارسەد کەس بوون و بەیەکجار دوو هەزار تیریان لێدان. لەکۆڵانەکان ڕۆشتن و لەبەردەم دەرگای مزگەوت وەستان و ما ئەفرەیدون وتی: چی ڕوویدا؟

وتیان: سەری ڕمەکانی خۆیان بەڕووی ئێمەدا بەرز کردۆتەوە.

وتی: دووبارە تیربارانیان بکەن.

دەڵێت: دوو هەزار تیریان بۆ هاویشتن و لەدەرگاکان دووریان خستنەوە و ڕۆشتنە ناو مزگەوت. مەسعود لەسەر مینبەر قسەی دەکرد و خەڵکانی هاندەدا، غەتەفان کوڕی ئەنیف کەباوەگەورێی لەڕۆژگاری جاهلیەت یەکێك لەشاسوارانی عەرەب بوو، جەنگی دەستپێکرد و خەڵکەکەی هاندەدا و دەیوت: ڕێگە مەدەن مەسعود هەڵبێت.

ئیسحاق کوڕی یەزید دەڵێت: ڕوویانکردە مەسعود کە لەسەر مینبەرەکە بوو و خەڵکانی هاندەدا. ئەویان هێنایەخوار و کوشتیان. ئەم ڕووداوە لەیەکی شەوالی ساڵی شەست و چوارەمی کۆچی ڕوویدا. مەسعود، کەسانێکی زۆری لەگەڵدا نەبوو، ئەوانیش شکستیان خوارد. ئەشیم کوڕی شەقیق دەیویست لەدەرگای نوێژگەکەوە هەڵبێت، کەسێك ڕمی بۆ هاویشت بەلام هەلات.

باوکی خێنسا، کەسیبی عەنبەری دەڵێت: حەسەن کوڕی باوکی حەسەن

لەکۆڕەکەی خۆی لەمزگەوتی ئەمیر بوو، بیستم دەیوت: مەسعود لێرەوە هات (بەدەست ئامارەی بەماڵەکانی ئەزد دەکرد)، هاوشێوەی باڵندەیەك کەعابایەکی زەردی لەبەردا بوو، کەنارەکانی عاباکەی ڕەش بوو، پێشنیاری سوونەتی بەخەڵکان دەکرد و لەئاژاوە دووری دەخستنەوە، بەڵام دەستیان بەرز دەکردەوە: مانگ، مانگ، سوێند بەخوا زۆری نەخایاند مانگەکەیان ئاوابوو، لەسەر مینبەر هێنایانە خوار و کوشتیان.

سەلمە کوڕی موحاریب دەڵێت: ڕۆشتنە لای عوبەیدالڵە و وتیان: مەسعود ڕۆشتە سەر مینبەر، لەبەردەم کۆشکی فەرمانڕەوایەتی یەك تیر نەهاوێژرا. لەو کاتەی خۆی ئامادە دەکرد بۆ ئەوەی بەرەو کۆشکی فەرمانڕەوایەتی بڕوات، هاتن و وتیان: مەسعود کوژرا. ئەو سوار چوارپێکەی بوو و ڕێگەی شامی گرتەبەر. ئەم پێشهاتە لەمانگی شەوالی ساڵی شەست و چوارەمی کۆچی ڕوویدا.

ڕەوادی کەعبی دەڵێت: کەسانێك لەخەڵکی موزێر ڕۆشتنە لای مالیك کوڕی موسەممەع و لەماڵەکەی خۆیدا گەمارۆیان خستەسەر و ماڵەکەیان سووتاند.

دەڵێت: کاتێك عوبەیدالڵە هەڵات، شوێنی کەوتن، بەڵام ئەوانەی شوێنیکەوتبوون، مانەوە و سەرقاڵی تاڵانکردنی ئەوشتانەبوون کە لە عوبەیدالڵە بەجێمابوو.

ئەبوجەعفەر، محەممەد کوڕی جەریر دەڵێت: سەبارەت بەڕۆشتنی عوبەیدالڵە بۆ شام گێڕانەوەیەکی دیکە لەزوبەیر کوڕی حورەیس هەیە کەدەڵێت: مەسعود سەد کەس لەخەڵکانی ئەزدی بەسەرکردایەتی قورە کوڕی عەمرۆ کوڕی قەیس لەگەڵ کوڕی زیاد نارد و ئەویان گەیاندە شام.

یەساف کوڕی شورەیحی یەشکوری دەڵێت: کوڕی زیاد لەبەسرەوە بەڕێکەوت، دواتر وتی: حەز بەسواری وشتر ناکەم، سوار چوارپێیەکی سمدارم بکەن.

دەڵێت: کۆپانێکمان خستە سەر کەرێك و سواری بوو، زۆری نەمابوو قاچەکانی لەزەوی بخشێت.

یەشکوری دەڵێت: بەهەمانشێوە کە لەبەردەم مندا دەڕۆشت، بێدەنگ بوو، بێدەنگییەکەی درێژەی کێشا، بەخۆم وت: ئەمە عوبەیدالڵەیە کەتا دوێنی

فەرمانڕەوای عێراق بوو، هەنووکە سوار کەرێك بووە و ئەگەر بکەوێت ئازاری دەگات. وتم: سوێند بەخوا ئەگەر خەوتبێت، بەئاگای دێنمەوە، لێی نزیکبوومەوە و وتم: خەوتوویت؟

وتی: نە.

وتم: بۆ بێدەنگیت؟

وتی: لەگەڵ خۆمدا قسەم دەکرد.

وتم: دەتەوێت پێت بڵێم چیت لەگەڵ خۆت دەوت.

وتی: بڵێ، سوێند بەخوا چاکە ناهێنیتە سەرزمان.

وتم: دەتوت: خۆزگە حسەینم نەدەکوشت.

وتی: چیتر؟

وتم: دەتوت: خۆزگە ئەو کەسانەم نەدەکوشت کەکوشتوومن.

وتی: چیتر؟

وتم: دەتوت: خۆزگە بناغەی بەیزام دانەدەنا.

وتی: چیتر؟

وتم: دەتوت: خۆزگە کارم لەوەرزێرەکان نەدەکێشایەوە.

وتی: چیتر؟

وتم: دەتوت: خۆزگە لەوەی هەم بەخشندەتر دەبووم.

وتی: سوێند بەخوا چاکەت نەوت و هەڵەکانت هێنایە سەرزمان. بەڵام سەبارەت بەحسەین، ئەو بەمەبەستی کوشتنی من ڕوویکردە عێراق و بەباشم زانی من بیکوژم تا ئەو من بکوژێت. سەبارەت بەبەیزا، من بەیزام لە عەبدوڵڵە کوڕی عوسمانی سەقەفی کڕی و یەزید هەزار هەزاری نارد و خەرجی ئەوێم کرد، ئەگەر زیندوو بمێنم، تایبەتە بەکەسەکانی من و ئەگەر بکوژرێم، لەو توندوتیژییانەی تیایدا نەمکردووە، بەداخ نیم، بەڵام کارکێشانەوە لەوەرزێرەکان بەوشێوەبوو کە عەبدولڕەحمان کوڕی ئەبی بەکرە و زازان و فەڕووخ لای معاویە سکاڵایان دژی من بەرز کردەوە تا ئەو جێگەی باسی توێکڵی برنجیشیان کردبوو و خەراجی عێراقیان بۆ یەکسەد هەزار بەرز کردبوویەوە، معاویە منی سەرپشك کرد

لەوەی بەڵێنی پێدانی ئەو بڕە پارە بدەم یا دەست لەکار بکێشمەوە. حەزم نەدەکرد لەکاری فەرمانڕەوایەتی دووربخرێمەوە. بەمپێیە کاتێك کارم بەیەکێك لەعەرەبەکان دەکرد و کەمی دەهێنا، ئەگەر حسێب و کتێبم لەگەڵ بکردایە یا قەرەبووم لەخەڵکەکەی و هۆزەکەی وەربگرتایە، دەبوومە هۆی زیانی ئەوان و ئەگەر پشتگوێم بخستایە، ماڵ و سامانی خواوەندم پشتگوێ دەخست. جووتیاران لەکاری کۆکردنەوەی خەراج شارەزاتر بوون و لەئەمانەت نزیکتر و وەرگرتنی پارە لەوان ئاسانتر. لەگەڵ ئەوەیشدا ئێوەم وەك چاودێری ئەوان دانا تا ستەم لەکەس نەکەن.

بەڵام سەبارەت بەبەخشین، سوێند بەخوا سامانێکی ئەوتۆم نەبوو لێی ببەخشم، ئەگەر دەمویست شتێکم لەسامانی ئێوە وەردەگرت و دەمبەخشی بەدەستەیەکی تایبەت کەدەیانوت: کەسێکی بەخشندەیە، بەڵام لەگەڵ هەمووان یەکسان و دادپەروەر بووم و ئەمە لەبەرژەوەندی ئێوەدا بوو.

بەڵام ئەوەی وتت: خۆزگە ئەو کەسانەم نەدەکوشت کەکوشتوومن، جگە لەڕەزامەندی خواوەند هیچکارێکم نەکردووە چوونکە بەبڕوای من کوشتنی خەواریج، هۆکاری نزیکبوونەوەیە لەخواوەند. هەنووکە پێت دەڵێم بیرم لەچی دەکردەوە و چیم بەخۆم دەوت: دەموت: خۆزگە لەگەڵ خەڵکانی بەسرە دەجەنگام کە بەڕەزامەندی خۆیان بەیعەتیان لەگەڵ من بەست. سوێند بەخوا دەمویست ئەو کارە بکەم بەڵام کوڕەکانی زیاد هاتن و وتیان: ئەگەر لەگەڵ ئەوان بجەنگیت و سەرکەوتن بەدەست بێنن، یەك کەس لەئێمە بەزیندوویی ناهێڵن و ئەگەر پشتگوێیان بخەیت، هەرکام لەئێمە لای ماڵە خاڵەکانمان خۆمان حەشار دەدەین. بەزەییم بەکوڕەکانی زیاددا هاتەوە و جەنگم نەکرد.

هەروەها دەموت: خۆزگە زیندانییەکانم دەکوشت، ئێستا کەئەو دوو کارەم نەکردووە، خۆزگە تا ئەو کاتەی دەگەمە شام، کەسیان وەك خەلیفە هەڵنەبژاردبێت.

دەستەیەك وتوویانە: کاتێك گەیشتە شام، کەسیان بۆ خەلافەت هەڵنەبژاردبوو، دەتوت لەبەرابەر ئەو منداڵێکی بێ دەسەڵاتن.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە: کاتێك گەیشتە شام، لەسەر کەسێك ڕێککەوتبوون بەڵام گۆڕانیان بەسەردا هێنا و بەپێی بۆچوونی ئەو جووڵانەوە.

لەم ساڵەدا خەڵکی کوفە، عەمرۆ کوڕی حورەیسیان دەرپەڕاند و لەکارەکەی دووریانخستەوە و عامر کوڕی مەسعودیان وەك فەرمانڕەوای خۆیان هەڵبژارد.

## لابردنی عەمرۆ کوڕی حورەیس بەدەستی خەڵکانی کوفە و دانانی عامر

ئەبوجەعفەر دەڵێت: گێڕانەوەی کوڕی عەیاش بەمشێوەیە، دەڵێت: زیاد و کوڕەکەی یەکەم کەس بوون فەرمانڕەوایی دوو شاری کوفە و بەسرەی لەیەك کاتدا دەکرد و سیانزە هەزار کەس لەخەوارجیان کوشت و عوبەیداللـە، چوار هەزار کەسی زیندانی کرد. کاتێك یەزید مرد، عوبەیداللە، قسەی بۆ خەڵکانکرد و وتی: ئەو کەسەی بەجێبەجێکردنی فەرمانەکانی ئەو دەجەنگاین، مردووە، ئەگەر وەك فەرمانڕەوای خۆتان دەستنیشانم بکەن، خەراجتان بۆ کۆدەکەمەوە و لەگەڵ دوژمنان دەجەنگم. عوبەیداللـە، بۆ ئەم مەبەستە موقاتیل کوڕی موسەممەع و سەعید کوڕی قورەجای (یەکێك لەمناڵەکانی مازن) بۆ کوفە نارد. جێگری ئەو لەکوفە، عەمرۆ کوڕی حورەیس بوو. ئەو دووکەسە پەیامەکەی عوبەیداللـەیان گەیاند. یەزید کوڕی حارس کوڕی ڕویەمی شەیبانی قسەی کرد و وتی: سپاس بۆ خواوەند کەئێمەی لەدەست کوڕی سومەییە ڕزگارکرد.

دەڵێت: عەمرۆ فەرمانیدا زیندانی بکەن. بەڵام خەڵکانی بەکر کوڕی وائیل لەنێوان عەمرۆ و یەزید بوونە لەمپەر. یەزید ترسا و بۆ لای کەسەکانی خۆی گەڕایەوە. محەممەد کوڕی ئەشعەس کەسی نارد و ئاگاداری کردەوە تا لەسەر بۆچوون و بڕیارەکەی پێداگری بکات. نێردراوان بەردەوام لەهاتوچۆدا بوون. دواتر عەمرۆ ڕۆشتەسەر مینبەر بەڵام بەردبارانیانکرد و بەناچاری بۆ ماڵەکەی گەڕایەوە. ئەوسا خەڵکان لەمزگەوت کۆبوونەوە و وتیان: کەسێك وەك فەرمانڕەوای خۆمان هەڵدەبژێرین تا ئەو کاتەی خەڵکان، خەلیفەیەك هەڵدەبژێرن. بڕیاریاندا عەمرۆ کوڕی سەعید وەك فەرمانڕەوا دەستنیشان بکەن بەڵام ژنانی هەمەدان چاو بەگریان (بۆ حسەین دەگریان) هاتن و پیاوەکانیان بەشمشێر

دەوری مینبەریان گرت. محەممەد کوڕی ئەشعەس وتی: پێشهاتێك ڕوویدا کەئێمە خوازیاری نەبووین. خەڵکانی کێندە پشتیوانییان لەعەمرۆ کوڕی سەعید دەکرد چوونکە خوشکەزایان بوو. دواتر هەمووان لەسەر فەرمانڕەوایەتی عامر کوڕی مەسعود کۆك بوون. کوڕی زوبەیریان لەمکارە ئاگادار کردەوە و ئەویش بڕیارەکەی ئەوانی پەسەند کرد.

بەڵام گێڕانەوەی عەوانە کوڕی حەکەم بەمشێوەیە: کاتێك خەڵکانی بەسرە لەگەڵ عوبەیداڵڵە کوڕی زیاد بەیعەتیان بەست، عەمرۆ کوڕی موسەممەع و سەعید کوڕی قورحای تەمیمی وەك نوێنەری خۆی بۆ کوفە نارد تا لەبڕیارەکەی خەڵکی بەسرە ئاگاداریان بکاتەوە و داوایان لێبکات بەیعەت لەگەڵ عوبەیداڵڵە کوڕی زیاد ببەستن تا ئەو کاتەی خەڵك پێشەوایەك هەڵدەبژێرن.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی حورەیس خەڵکانی کۆکردەوە، سپاسی خواوەندی کرد و وتی: ئەم دووکەسە لەلایەن فەرمانڕەواوە هاتوون و پێشنیاری کارێکتان پێدەکەین کەهیوادارم خواوەند بەهۆیەوە یەکدەنگی و یەکگرتووی لەناو ئێمەدا بێنێتە ئاراوە و ئاشتی سەقامگیر بکات، وتەکانیان ببیستن و گوێڕایەڵیان بن چوونکە مژدەی دڵخۆشکەریان پێیە.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی موسەممەع هەستا، سپاسی خواوەندی کرد و ئاماژەی بەخەڵکانی بەسرەدا کە عوبەیداڵڵە کوڕی زیادیان وەك فەرمانڕەوا هەڵبژاردووە تا ئەو کاتەی خەڵکان کەسێك وە خەلیفە هەڵدەبژێرن، وتی: ئێمە هاتووین بۆ ئەوەی فەرمانڕەوای ئێمە و ئێوە، یەك کەس بێت چوونکە کوفە لەبەسرەیە و بەسرە لەکوفە.

دواتر کوڕی قورحا هەستا و هاوشێوەی هاورێکەی قسەی کرد.

دەڵێت: یەزید کوڕی حارسی شەیبانی هەستایە سەرپێ و پێش هەمووان بەردبارانی کردن. دواتر خەلکیش بەهەمانشێوە دەستیان پێکرد. یەزید وتی: ئێمە لەگەڵ کوڕی مەرجانە بەیعەت ببەستین؟ ئەم کارە پێگەی یەزیدی لەشارەکە بەرز کردەوە.

نێردراوان بۆ بەسرە گەڕانەوە و خەڵکی بەسرەیان ئاگادار کردەوە، وتیان:

خەڵكی كوفە لەكاروبارەكان دووری دەخەنە و ئێوە دەیكەنە فەرمانڕەوا و بەیعەتی لەگەڵ دەبەستن؟ خەڵكیان دژی عوبەیدالله هەڵخڕاند.

دەڵێت: كاتێك خەڵك دژایەتی كردنی عوبەیداڵڵەیان دەستپێكرد، پەنای بۆ مەسعود كوڕی عەمرۆ ئەزدی برد كەپەنای پێبەخشی و پاراستی. عوبەیداڵڵە تا نەوەد ڕۆژ دوای مەرگی یەزید لای مەسعود مایەوە و دواتر ڕێگەی شامی گرتەبەر. خەڵكانی ئەزد و بەكر، كەسانێكی خۆیان لەگەڵ نارد و ئەویان گەیاندە شام.

دەڵێت: كاتێك عوبەیداڵڵە بەرەو شام دەڕۆشت، مەسعود كوڕی عەمرۆی وەك جێگری خۆی لەبەسرە دانا. منداڵەكانی تەمیم و قەیس وتیان: ئێمە بەوە ڕازی نابین و هەركەس خەڵكەكەی ئێمە هەڵیبژێرت، پەسەندی دەكەین.

مەسعود وتی: منی وەك جێگری خۆی دەستنیشانكردووە و هیچكات دەست لەو پۆستە هەڵناگرم. لەگەڵ خەڵكەكەی هات و ڕۆشتە ناو كۆشكی فەرمانڕەوایەتی. خەڵكانی تەمیم لای ئەحنەف كۆبوونەوە و وتیان: ئەزدییەكان ڕۆشتنە ناو مزگەوت. وتی: ڕۆشتنە ناو مزگەوت كەچی؟ مزگەوت هی ئێوەیە و هی ئەوانیش. ئێوەیش دەڕۆنە ناو مزگەوت.

وتیان: ڕۆشتۆتە ناو كۆشك و چووەتە سەر مینبەر.

دەڵێت: كاتێك عوبەیداڵڵە كوڕی زیاد بەرەو شام بەڕێكەوتبوو، دەستەیەك لەخەواریج لەتەنیشت ڕووباری ئەساوەرە جێگیر بووبوون. خەڵك گومانیانكردووە ئەحنەف كەسی بۆ لای ئەوان ناردووە و پێی وتوون: ئەم پیاوەی ڕۆشتۆتە ناو كۆشك، دوژمنی هاوبەشی ئێمەیە، چ شتێك دەبێتە ڕێگر لەوەی سەرەتا دژی ئەو بجەنگن.

دەڵێت: دەستەیەك لەوان هاتن و ڕۆشتنە ناو مزگەوت، مەسعود كوڕی عەمرۆ لەسەر مینبەر بوو، بەیعەتی لەگەڵ خەڵكان دەبەست. یەكێك لەخەڵكانی فارس بەناوی موسلیم كەهاتبووە بەسرە و باوەڕی بەئیسلام هێنابوو و دواتر پەیوەستی خەواریج بوو، تیرێكی بۆ هاویشت كە لەدڵی چەقی و كوشتی. خەڵك شمشێریان دەركێشا و وتیان: مەسعود كوڕی عەمرۆ كوژرا، خەواریج ئەویان كوشت.

ئەزدییەکان بۆ جەنگی خەواریج کۆبوونەوە و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و بریندار کردن و لەبەسرە دووریانخستنەوە. دواتر مەسعودیان بەخاك سپارد.

دەڵێت: دواتر خەڵکان لای ئەزدییەکان کۆبوونەوە و وتیان: مەگەر نازانن منداڵەکانی تەمیم گومان دەکەن ئەوان مەسعود کوڕی عەمرۆیان کوشتووە. ئەزدییەکان کەسیان نارد و لەمبارەوە پرسیاریان کرد. دەرکەوت کەسانێك لەمناڵەکانی تەمیم بەو شێوەیە دەڵێن. ئەزدییەکان کۆبوونەوە و زیاد کوڕی عەمرۆ عەتکییان وەك سەرکردە هەڵبژارد و بۆ جەنگی مناڵەکانی تەمیم بەڕێکەوتن. قەیسییەکان لەگەڵ مناڵەکانی تەمیم بوون. مالیك کوڕی موسەممەع و تایەفەی بەکر کوڕی وائیل پەیوەستی ئەزدییەکان بوون و بەرەو ماڵی مناڵەکانی تەمیم بەڕێکەوتن. مناڵەکانی تەمیم ڕۆشتنە لای ئەحنەف و وتیان: ئەم خەڵکە هاتوون، وەرەدەر. بەڵام ئەحنەف لەشوێنی خۆی نەجوولا تا ئەوەی یەکێك لەژنان ئاگردانێکی هێنا و وتی: ئەی ئەحنەف لای ئەم ئاگردانە دانیشە چوونکە تۆ ژنیت.

ئەحنەف وتی: ئاگردانەکە بۆ ژێری تۆ باشترە.

دەڵێت: دوای ئەمە قسەیەکی قێزەونتر لەئەحنەف نەبیسترا چوونکە وەك کەسێکی خۆڕاگر و پشوودرێژ ناوی دەرکردبوو. ئەحنەف ئاڵاکەی خۆی داوا کرد و وتی: خواوەندا هاوکاری ئەم ئاڵایەبە و ڕیسوای مەکە. هاوکاری ئاڵا ئەوەیە بەهۆیەوە سەرکەوتن بەدەست بێنن و دوژمن سەرنەکەوێت. خواوەندا! خوێنی ئێمە بپارێزە و ئاشتی سەقامگیر بکە.

دواتر بەڕێکەوت. برازاکەی، ئەیاس کوڕی معاویە لەپێشیەوە بوو. دوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و شەڕێکی قورسیانکرد و ژمارەیەکی زۆر لەهەردوولا کوژرا. مناڵەکانی تەمیم وتیان: ئەی ئەزدییەکان، خواوەند! سەبارەت بەخوێنی ئێمە و خوێنی خۆتان، خواوەندتان لەبیر بێت، قورئان لەنێوان ئێمەدا بێت و هەرکام لەموسوڵمانان کەپێی ڕازی دەبن، ئەگەر شایەتێك هەبوو کەئێمە هاورێکەی ئێوەمان کوشتووە، باشترین پیاوی ئێمە بگرن و لەقەرەبووی خوێنی ئەو بیکوژن و ئەگەر شایەتتان نییە، سوێند دەخۆین کەئێمە نەمانکوشتووە و

فەرمانی کوشتنی ئەومان نەداوە و بکوژی هاورێکەی ئێوە ناناسین. ئەگەر بەمەیش ڕازی نابن، سەد هەزار درەم وەك خوێنبایی کوژراوەکەی ئێوە دەدەین.

دەڵێت: ڕێککەوتن و ئەحنەف کوڕی قەیس لەگەڵ سەرکردەکانی موزێر، ڕۆشتە لای عەمرۆ عەتکی و وتی: ئەی ئەزدییەکان، ئێوە جیرانی ئێمەن و لەکاتی جەنگ، برای ئێمە. هاتووین تا دڵنەواییتان بکەین و کینە و ڕق نەهێڵین، دەسەلات لەدەستی ئێوەدایە، سەبارەت بەئێمە و سامانی ئێمە، فەرمانی خۆتان بدەن چوونکە بۆ سەقامگیرکردنی ئاشتی لەنێوان خۆماندا، گرنگی بەسامان و ماڵی دنیا نادەین.

وتیان: بۆ قەرەبووی هاورێکەی ئێمە دەخوێنبایی دەدەن؟

وتی: ڕازین. بەمشێوەیە پەیمانی ئاشتییان بەست.

عوبەیداڵڵە کوڕی حوڕ لەمبارەوە هۆنراوەیەکی هەیە بەم ناوەڕۆکە:

(( بەردەوام بەئەزدییەکان هیوادار و دڵگەرم بووین

تا ئەوکاتەی بینیم لەکارەکەی خۆیان ناتەوانن

مەسعود کوژرا بەلام

تۆڵەی ئەویان وەرگرت

و شمشێری ئەزدییەکان بوو بەداس

خوێنبایی بوو بەهۆکاری ڕیسوایی ئەوان

و بەهۆیەوە زیندووەکانیان

لەکۆڕەکاندا جوێن دەدەن

چ سوودێکی بوو؟

خەڵکێکی پەرژ و بلاو و ڕیشیان

هاوشێوەی زەنگۆڵەکانە

کە بەملی ڕێوییەکانەوە هەڵواسراوە)).

دەڵێت: خەڵکی بەسرە ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی فەرمانڕەوایەك هەڵبژێرن بۆ ئەوەی پێشنوێژ بێت تا ئەو کاتەی خەڵك خەلیفەیەك هەڵدەبژێرن. عەبدولمەلیك کوڕی عوبەیداڵڵە کوڕی عامریان وەك فەرمانڕەوا هەڵبژارد کەماوەی یەك مانگ لەو

پۆستەدا مایەوە. دواتر عەبدوڵڵە کوڕی حارس کوڕی عەبدولموتەلیب ناسراو بە بەبەیان وەك فەرمانڕەوا هەڵبژارد و دوو مانگ پێشنوێژی بۆ خەڵكان كرد.دواتر عومەر کوڕی عەبدوڵڵە کوڕی مەعمەر بەنوێنەرایەتی کوڕی زوبەیر هات و یەك مانگ فەرمانڕەوا بوو. حارس کوڕی عەبدوڵڵە کوڕی ڕەبیعەی مەخزومی هات و ئەوی لەفەرمانڕەوایەتی دوورخستەوە و خۆی جڵەوی کاروبارەکانی گرتەدەست. نازناوی حارس، قوباع بوو.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: سەبارەت بەعەبدولمەلیك کوڕی عەبدوڵڵە کوڕی عامر و بەبە و مەسعود و کوژرانی ئەو و فەرمانڕەوایەتی عومەر کوڕی عەبدوڵڵە، گێڕانەوەیەکی دیکە لە عوبەیدالڵە دەهنی ئامازەی پێدراوە: کاتێك خەڵك لەگەڵ بەبە بەیعەتیان بەست، ئەو هەمیان کوڕی عودەی وەك سەرکردەی پاسەوانەکانی دیاریکرد. دواتر یەکێك لەخەڵکانی مەدینە هاتە لای بەبە کە بەهەمیان کوڕی عودەی وت ئەو لەنزیك ماڵەکەی خۆی نیشتەجێ بکات. هەمیان دەیویست ماڵی فیل کوڕی زیاد لەگەڕەکی مناڵەکی سەلیم چۆڵ بکات و ئەو پیاوە لەوێ نیشتەجێ بکات چوونکە فیل هەڵاتبوو و دەرگای ماڵەکەی داخستبوو. مناڵەکانی سەلیم ڕێگەی ئەو کارەیان لێگرت و ڕووبەڕووی بوونەوە و داوای هاوکارییان لەعەبدولمەلیك کوڕی عامر کرد. عەبدولمەلیك، بوخارییە و کۆیلە چەکدارەکانی خۆی نارد و هەمیانیان دوورخستەوە و ڕێگەیان نەدا بڕواتە ناو ماڵەکەی فیل.

بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر، عەبدولمەلیك ڕۆشتە کۆشکی فەرمانڕەوایەتی تا سڵاو لەبەبە بکات، یەکێ: لەمناڵەکانی قەیس کوڕی سەعلەبە ئەوی لەبەردەم دەروازەکە بینی و وتی: تۆ بوویت دوێنێکە دژی ئێمە هاوکاری خەڵکانت کرد! دەستی بەرز کردەوە و شەقەزللەیەکی لێدا. یەکێك لەبوخارییە، بەشمشێر دەستی ئەو پیاوەی قرتاند. دەستەیەك دەڵێن پیاوی قەیسی بەسلامەت ڕزگاری بوو.

کوڕی عامر توڕە بوو و گەڕایەوە و موزێرییەکان لەبەر ئەو هاتنە جۆش و کۆبوونەوە. خەڵکی بەکر کوڕی وائیل ڕۆشتنە لای ئەشیم کوڕی شەقیق کوڕی سەور و داوای هاوکارییان لێکرد. ئەوهات، مالیك کوڕی موسەممەع هاوڕێیەتی دەکرد. ئەشیم ڕۆشتە سەر مینبەر و وتی: هەرکەس لەمناڵەکانی موزێرتان بینی،

جلەکانی لەبەر داکەنن. منداڵەکانی موسەممەع گومانیانکردووە کەئەو ڕۆژە مالیك بەمەبەستی نێوەنجیگەری هاتبوو، شمشێری پێنەبوو و دەیویست ئەشیم لەبڕیارەکەی پەشیمان بکاتەوە.

دواتر بەکرییەکان ڕۆشتن و لەموزێرییەکان خۆیان بەدوورگرت. ئەزدییەکان ئەم هەلەیان قۆستەوە و لەگەڵ خەڵکانی بەکر پەیمانیان بەست و لەگەڵ مەسعود ڕوویان لەمزگەوتی گەورەی شارە کرد. تەمیمییەکان، ڕۆشتنە لای ئەحنەف کەدەستارەکەی سەری بەڕمێکەوە بەست و تەسلیم بەسەلمە کوڕی زوەیبی ڕیاحی کرد و هات. سوارەکان لەپێشیەوە بوون تا ئەوکاتەی ڕۆشتە ناو مزگەوتەکە. مەسعود، قسەی بۆ خەڵکان دەکرد، لەسەر مینبەر هێنایانە خوار و کوشتیان.

بەگومانی خەڵکانی ئەزد، ئەزاریقەکان ئەویان کوشت و بەمشێوەیە ئاژاوە بلاّو بوویەوە. عومەر کوڕی عوبەیدالڵە کوڕی مەعمەر و عەبدولڕەحمان کوڕی حارس نێوەنجیگەرییان کرد و ئەزدییەکان لەقەرەبووی کوشتنی مەسعود، بەدە خوێنبایی ڕازی بوون. عەبدوڵڵە کوڕی حارس کەپیاوێکی خۆپاریز بوو، لەماڵەکەی دانیشت و وتی: من کەسێك نیم بە بەفیڕۆدانی دینەکەم، ئاشتی لەنێوان خەڵکان سەقامگیر بکەم.

باوکی حەسەن دەڵێت: خەڵکی بەسرە نامەیان بۆ کوڕی زوبەیر نووسی و ئەو، نامەی بۆ ئەنس نووسی و فەرمانی پێدا پێشنوێژی خەڵکان بێت. ئەنس، بۆ ماوەی چل ڕۆژ پێشنوێژی بۆ کردن.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: کوڕی زوبەیر فەرمانی فەرمانڕەوایەتی بەسرەی بۆ عومەر کوڕی عەبدوڵڵە تەمیمی نووسی و نارد و کاتێك پێیگەیشت، بەمەبەستی عەمرە، بەڕێکەوتبوو. لەبەر ئەمە نامەی بۆ عەبدوڵڵەی باوکی نووسی تا پێشنوێژی بۆ خەڵکان بکات و ئەو پێشنوێژی کرد تا عومەر گەڕایەوە.

محەممەد کوڕی زوبەیر دەڵێت: خەڵکان بۆ فەرمانڕەوایەتی عەبدوڵڵە کوڕی حارسی هاشمی ڕێککەوتبوون و ئەو بۆ ماوەی چوار مانگ، جڵەوی کاروبارەکانی لەدەستا بوو. دواتر نافیع کوڕی ئەزرەق ڕێگەی ئەهوازی گرتەبەر. خەڵکان بەعەبدوڵڵەیان وت: خەڵکان سەرقاڵی یەکتر خواردنن، لەسەر ڕێگە دەستدرێژی

دەکەنە سەر ژنان و کەس نییە ڕێگەی ئەم کارەیان لێبگرێت.

وتی: دەتانەوێت چی بکەم؟

وتی: شمشێر هەڵگرە و هێرش بکەرەسەر ئەو کەسانە.

وتی: ئەو کەسە نیم بەبەفیڕۆدانی خۆم، چاکسازی وئاشتی سەقامگیر بکەم، ئەی کۆیلە، پێپۆشەکانم بۆ بێنە. پێپۆشەکانی لەپێکرد و بۆ لای کەسەکانی گەڕایەوە و خەڵك، عومەر کوڕی عوبەیدالڵەی تەمیمیان وەك فەرمانڕەوای خۆیان هەڵبژارد.

سەعب کوڕی زەید دەڵێت: لەبەسرە کۆلێرە بڵاو بوویەوە. عەبدوڵڵە فەرمانڕەوای بەسرە بوو. دایکی بەهۆی ئەم نەخۆشییەوە مرد و کەسیان دەستنەکەوت، جەنازەکەی هەڵبگرێتەوە تا ئەوەی چوارکەس لەسارانشینەکانیان بەکرێ گرت و ئەویان بەخاك سپارد. لەو کاتەدا عەبدوڵڵە فەرمانڕەوا بوو.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: بەبە لەکاتی فەرمانڕەوایەتی بەسرە، چل هەزاری لەخەزێنەی موسوڵمانان هەڵگرتبوو، لای کەسێك دایناببوو. کاتێك عومەر کوڕی عوبەیدالڵە وەك فەرمانڕەوا هات، عەبدوڵڵە کوڕی حارسی گرت و زیندانیکرد و لەسەر ئەم سامانە ئەشکەنجەی یەکێك لەکۆیلەکانی کرد تا ئەوکاتەی بڕە پارەکەی وەرگرتەوە.

یەزید کوڕی عەبدوڵڵە کوڕی شەخیر دەڵێت: بە عەبدوڵڵە کوڕی حارسم وت: لەو کاتەی فەرمانڕەوای ئێمە بوویت، بینیم لەم سامانەت هەڵدەگرت، بەڵام لەخوێن خۆت بەدوور دەگرت.

وتی: لێپرسراویەتی سامان لەخوێن ئاسانترە.

لەم ساڵەدا خەڵکی کوفە، کاروباری خۆیان بەعامر کوڕی مەسعود سپارد.

عەوانە کوڕی حەکەم دەڵێت: کاتێك خەڵکانی کوفە، نێردراوانی خەڵکی بەسرەیان گەڕاندەوە، گەورەکانی کوفە کۆبوونەوە و ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی عامر کوڕی مەسعود پێشنوێژی خەڵکان بێت تا ئەوەی موسوڵمانان کەسێك وەك خەلیفە دەستنیشان دەکەن.

دەڵێت: ئەو تا سێ مانگ دوای مردنی یەزید، جڵەوی کاروبارەکانی لەدەستا

بوو، دواتر عەبدوڵڵە کوڕی یەزیدی ئەنساری خەتەمی وەك پێشنوێژی خەڵكان هات و ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی تەڵحە وەك لێپرسراوی باج و خەراج. خەڵکی کوفە و بەسرە و عەرەبەکانی حیجاز و خەڵکی شام و جەزیرە بۆ خەلافەتی کوڕی زوبەیر ڕێککەوتن جگە لەخەڵکانی ئەردەن.

لەم ساڵەدا لەشام لەگەڵ مەروان کوڕی حەکەم وەك خەلیفە بەیعەتیان بەست.

محەممەد کوڕی عومەر دەڵێت: کاتێك لەگەڵ عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر بەیعەتیان بەست، عوبەیدە کوڕی زوبەیری وەك کارگوزاری مەدینە دەستنیشانکرد، عەبدولڕەحمان کوڕی جەحدەمی فیهری بۆ میسر ڕەوانە کرد و مناڵەکانی ئومەییە و مەروان کوڕی حەکەمی بۆ شام نارد. لەو کاتەدا عەبدولمەلیك بیست و هەشت ساڵە بوو. کاتێك حەسین کوڕی نەمیر لەگەڵ هاوەڵانی هاتە شام، بەمەروانی وت کەچۆن کوڕی زوبەیری بەجێهێشتووە و پێشنیاری بەیعەتی پێکردووە بەڵام ئەو ڕازی نەبووە.

دواتر بەمەروان و مناڵەکانی ئومەییەی وت: ئێوە لەبارودۆخێکی پەرێشاندا دەبینم، پێش ئەوەی شامتان لەدەست بڕوات و ئاژاوەیەکی نەزانراو سەرهەڵبدات، کاروباری خۆتان ڕێکبخەن.

دەڵێت: مەروان پێی باش بوو بڕواتە لای کوڕی زوبەیر و بەیعەتی لەگەڵ ببەستێت، بەڵام عوبەیدالڵە کوڕی زیاد هات و مناڵەکانی ئومەییە لەدەوری کۆبوونەوە. عوبەیدالڵە لەمەبەستی مەروان ئاگادار بووبوویەوە و پێی وت: سوێند بەخوا لەوەی دەتەوێت ئەنجامی بدەیت، شەرم دەکەم، تۆ گەورە و سەروەری قوڕەیشیت، دەتەوێت ئەو کارە بکەیت؟

مەروان وتی: هێشتا هیچمان لەدەست نەچووە.

دەڵێت: مناڵەکانی ئومەییە و کۆیلەکانیان ڕێککەوتن، خەڵکانی یەمەنیش لەدەوری کۆبوونەوە و بەرەو دیمەشق بەڕێکەوت و دەیوت: هێشتا هیچمان لەدەست نەچووە. کاتێك لەگەڵ هاوەڵانی خۆی گەیشتە دیمەشق، خەڵکی ئەو شارە لەگەڵ زوحاك کوڕی قەیسی فیهری بەیعەتیان بەستبوو تا پێشنوێژییان بۆ بکات و کارەکانیان ڕاپەڕێنێت و چاوەڕوان بن ئۆمەتی محەممەد کەسێك وەك

خەلیفە هەڵبژێرێت.

عەوانە دەڵێت: کاتێك یەزید کوڕی معاویە مرد، دوای ئەو معاویە کوڕی خەلافەتی گرتەدەست و بیستم فەرمانیدا لەناو خەڵکانی شام بانگی نوێژی گشتی بدەن. سپاسی خواوەندی کرد و وتی: لێکۆڵینەوەم لەکاروباری ئێوە کرد، خۆم بەکەسێکی ناتەوان دەبینم، بۆ ئێوە بەدوای کەسێکی وەك عومەر کوڕی خەتاب گەڕام بەڵام دەستم نەکەوت، هاوشێوەی عومەر کوڕی خەتاب، بەدوای شەش کەسدا گەڕام وەك شۆرا کەسێك هەڵبژێرن بەڵام دەستم نەکەوت، ئێوە کاروباری خۆتان باشتر دەزانن، کەسێك بەدڵخوازی خۆتان هەڵبژێرن.

دەڵێت: بۆماڵەکەی خۆی گەڕایەوە و نەهاتە ناو خەڵکان تا ئەو کاتەی مرد. دەستەیەك وتیان: ژەهرخواردیان کرد. دستەیەك وتیان: بەئەشکەنجە کوشتیان.

عەوانە دەڵێت: عوبەیدالله کوڕی زیاد هاتە دیمەشق و لەو کاتەدا زوحاك کوڕی قەیسی فیهری فەرمانڕەوا بوو. زەفەر کوڕی عەبدوڵڵەی کەلابی لەقینسرین شۆڕشی دەستپێکردبوو و بەیعەتی بۆ کوڕی زوبەیر وەردەگرت. نەعمان کوڕی بەشیری ئەنساری لەحیمس بەیعەتی بۆ کوڕی زوبەیر وەرگرتبوو. حسان کوڕی مالیکی کەلبی کە لەفەلەستین کارگوزاری معاویە و دواتر کارگوزاری یەزید و خوازیاری خەلافەتی مناڵەکانی ئومەییە وسەروەری خەڵکی فەلەستین بوو، ڕوەح کوڕی ڕەنباعی جوزامی بانگکرد و وتی: من تۆ دەکەمە جێگری خۆم لەفەلەستین و دەڕۆمە ناو هۆزی لەخم و جوزام، تۆ بێ کەس نیت و هاوشێوەی چاوی ئەوانیت. بەهاوکاری ئەو کەسانەی لەخەڵکەکەی تۆن، دەتوانی بجەنگیت.

دەڵێت: حسان کوڕی مالیك ڕێگەی ئەردەنی گرتەبەر و ڕوەح کوڕی زەنباعی وەك جێگری خۆی لەفەلەستین دەستنیشانکرد. ناتل کوڕی قەیس دژی ڕوەح کوڕی زەنباع ئاڵای شۆڕشی بەرز کردەوە و ئەوی لەفەلەستین دەرپەڕاند و دەستی بەسەر ئەو سەرزەمینەدا گرت و بەیعەتی بۆ کوڕی زوبەیر وەردەگرت.

دەڵێت: عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر نامەی بۆ کارگوزارەکەی خۆی لەمەدینە نووسی تا مناڵەکانی ئومەییە لەمەدینە دووربخاتەوە و بەمشێوەیە هەموویان و ژن و مناڵەکانیان بۆ شام دوورخرانەوە. مناڵەکانی ئومەییە گەیشتنە دیمەشق. مەروان

کوڕی حەکەم لەناو ئەواندا بوو. بەمشێوەیە خەڵکان دوو دەستە بوون: حسان کوڕی مالیك لەئەردەن بەیعەتی بۆ منداڵەکانی ئومەییە وەردەگرت و زوحاك کوڕی قەیسی فیهری لەدیمەشق خوازیاری خەلافەتی عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر بوو و بەیعەتی بۆ ئەو وەردەگرت.

دەڵێت: حسان کوڕی مالیك لەئەردەن قسەی بۆ خەڵکان کرد و وتی: ئەی خەڵکینە! سەبارەت بە کوڕی زوبەیر و کوژراوانی حوڕە چی دەڵێن؟

وتیان: دەڵێین کوڕی زوبەیر ڕیاکارە و کوژراوانی حوڕە لەئاگری جەهەننەمدان.

وتی: سەبارەت بەیەزید کوڕی معاویە و کوژراوەکانی خۆتان لەجەنگدا چی دەڵێن؟

وتیان: یەزید ڕاست و کوژراوەکانی ئێمە لەبەهەشتان.

وتی: من دەڵێم: ئەگەر دینی یەزید کوڕی معاویە کاتێك زیندوو بوو، ڕاست بوو، هەنووکەیش دینی هاوەڵان و شوێنکەوتەکانی ئەو ڕاستە و ئەگەر کوڕی زوبەیر و هاوەڵانی ئەوکاتە ناڕاست بوون، هەنووکەیش ناڕاست و داواکەیان ناڕەوایە.

وتیان: ڕاست دەکەیت، ئێمە بەیعەت لەگەڵ تۆ دەبەستین و هەرکەس دژایەتی تۆ بکات و بەیعەت لەگەڵ کوڕی زوبەیر ببەستێت، ڕووبەڕووی دەبینەوە بەو مەرجەی ئێمە لەم دوو کوڕە دوور بخەیتەوە – مەبەستیان عەبدوڵڵە و خالید دوو کوڕەکەی یەزید کوڕی معاویە بو–چوونکە منداڵن و ئێمە بەمە ڕازی نابین، نامانەوێت خەڵکان پیرێکی بەئەزموون وەك خەلیفە دەستنیشان بکەن و ئێمە منداڵێك.

دەڵێت: زوحاك کوڕی قەیسی فیهری لەدیمەشق خوازیاری خەلافەتی کوڕی زوبەیر بوو، تەنیا شتێك کەڕێگەی نەدەدا مەبەستەکەی ئاشکرا بکات، بوونی منداڵەکانی ئومەییە لەو شارە بوو. بۆیە بەنهێنی بەیعەتی بۆ کوڕی زوبەیر وەردەگرت. حسان کوڕی مالیك لەمە ئاگادار بوویەوە و نامەیەکی بۆ زوحاك نووسی و ماف منداڵەکانی ئومەییەی بیرخستەوە و سەبارەت بەچاکییەکانی بنەماڵەی ئومەییە دووا و پێشنیاری ملکەچی ئەوانی پێکرد. هەروەها ئاماژەی

بـەکوڕی زوبـەیردا و بەخراپـە وەسـفی کـرد و وتـی: کەسـێکی ڕیاکـارە و دوو خەلیفەی لەسەر کار لابردووە و پێی وت نامەکە بۆ خەڵکان بخوێنێتەوە.

دەڵێت: یەکێك لەپیاوانی کەلب بەناوی ناغیزەی بانگکرد و بەودا نامەیەکی بۆ زوحاك کوڕی قەیس نارد، هەروەها نوسخەیەکی لەنامەکە بەناغیزەدا و پێی وت: ئەگەر زوحاك نامەکەی بۆ خەڵك خوێندەوە، باشتر، ئەگەر ئەو کارەی نەکرد، ئەم نامە بۆ خەڵکان بخوێنەرەوە.

دەڵێـت: حـسان نامـەی بـۆ مناڵـەکانی ئومەییـە نووسـی تـا لـەکاتی خوێنـدنی نامەکە ئامادەبن.

دەڵێت: ناغیزە نامەکەی بەزوحاك گەیاند و نامەی مناڵەکانی ئومەییەی تەسلیم بەخۆیان کـرد. لـەڕۆژی هـەینی، زوحـاك ڕۆشـتە سـەر مینبـەر، نـاغیزە هەسـتایە سەرپێ و وتی: خواوەند، فەرمانڕەوا تەمەن درێژ بکات، نامەی حسان بۆ خەڵکان بخوێنەرەوە.

زوحاك وتی: دانیشە. دانیشت.

جارێکی دیکە ناغیزە هەستا و زوحاك پێی وت: دانیشە و دانیشت.

جـاری سـێیەم هەسـتا و پێـی وت: دانیـشە. نـاغیزە کاتێـك دڵنیـابوو نامەکـە ناخوێنێتـەوە، نامەکـەی خـۆی دەرهێنـا و بـۆ خـەڵکانی خوێنـدەوە. دواتـر وەلیـد کـوڕی عوتەبـە کـوڕی ئەبوسـوفیان هەسـتایە سـەرپێ و وتـەکانی حـسانی پشتڕاستکردەوە و کـوڕی زوبـەیری بەدرۆخستەوە و جوێنی پێدا. یەزیـد کـوڕی باوکی نەمسی غەسانی هەستا و وتـەکانی حسانی پشتڕاستکردەوە و جـوێنی بـەکوڕی زوبـەیردا، عـەمرۆ کوڕی یەزیـدی حەکـەمی هەسـتا و جوێنی بەحـسان و وەسفی کوڕی زوبەیری کرد و خەڵکان پەرێشان بوون.

دەڵێت: زوحـاك فەرمانیـدا وەلیـد کـوڕی عوتەبە و یەزیـد کـوڕی بـاوکی نـەمس و سوفیان کوڕی ئـەبرەد زینـدانی بکـەن کەوتـەکانی حسانیان پـشتڕاستکردبوویەوە. خەڵك کەوتنە گیانی یەك. خەڵکی کەلب، هێرشیانکردە سەر عەمرۆ کوڕی یـەزیـدی حەکەمی و لێیاندا و جلەکانیان دڕاند.

دەڵێت: خالید کوڕی یەزید کوڕی معاویە کـەکوڕێك بـوو، هەستا و دوو قاڵدرمـە

بەمینبەرەکەدا سەرکەوت. زوحاك هێشتا لەسەر مینبەرەکە بوو. خالید زۆر بەکورتی قسەی کرد و خەڵکانی هێدی کردەوە. دواتر زوحاك لەمینبەر هاتەخوار و نوێژی هەینی لەگەڵ خەڵکان خوێند و گەڕایەوە بۆ ماڵ. خەڵکی کەلب هاتن و سوفیان کوڕی ئەبرەدیان لەزیندان هێنایەدەر. خەلکی غەسانیش هاتن و یەزید کوڕی باوکی نەمسیان برد، وەلید کوڕی عوتەبە وتی: ئەگەر منیش لەتایەفەی کەلب و غەسان دەبووم، منیشان ئازاد دەکرد.

دەڵێت: کوڕەکانی یەزید کوڕی معاویە، خالید و عەبدوڵڵە، لەگەڵ خاڵەکانی خۆیان لەکەلب هاتن و ئەویان لەزیندان هێنایەدەر. خەڵکی شام، ئەمڕۆژەیان بە(جەیرونی یەکەم) ناوبرد. زوحاك ڕۆشتە مزگەوتی دیمەشق و لەوێ دانیشت، باسی یەزید کوڕی معاویەی کرد و خراپەی ئەوی هێنایە سەرزمان. گەنجێك لەخەڵکانی کەلب هەستا و بەداردەستەکەی لێیدا. ئەو خەڵکەی لەمزگەوت ئاڵقەیان بەستبوو و شمشێرەکانیان هەڵواسیبوو، ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و جەنگ دەستپێکرد. خەڵکی قەیس پێشنیاری بەیعەت لەگەڵ کوڕی زوبەیر و هاوکاری کردنی زوحاکیان دەدا و خەڵکانی کەلب پشتیوانییان لەمناڵەکانی ئومەییە و خالید کوڕی یەزید دەکرد. زوحاك ڕۆشتە کۆشکی فەرمانڕەوایەتی و بەرەبەیان بۆ نوێژی بەیانی نەهاتەدەر. سوپاییەکان دەستەیەك شوێنکەوتەی مناڵەکانی ئومەییە و دەستەیەك خوازیاری کوڕی زوبەیر بوون. زوحاك کەسی بۆ لای مناڵەکانی ئومەییە ناردبوو کەڕۆژێك دواتر ڕۆشتنە لای و داوای لێبوردنی لێکردن و باسی چاکی مناڵەکانی ئومەییەی لەگەڵ بنەماڵەکەی کرد و وتی مەبەستی نیگەران کردن و ناڕاحەت کردنی ئەوانی نەبووە. وتی: ئێوە بۆ حسان نامە بنووسن و منیش نامەی بۆ دەنووسم تا لەئەردەنەوە بێت و لەجابییە جێگیر ببێت. ئێمە و ئێوەیش دەڕۆینە ئەوێ و لەگەڵ یەکێك لەئێوە بەیعەت دەبەستین.

دەڵێت: مناڵەکانی ئومەییە بەمە ڕازی بوون و نامەیان بۆ حسان نوسی: زوحاکیش نامەی نووسی. خەڵکان ڕۆشتنەدەر، مناڵەکانی ئومەییش ڕۆشتن و ئاڵاکان بەڕێکەوت و ڕوویان لەجابییە کرد.سەور کوڕی مەعنی سەلەمی هاتە لای زوحاك و وتی: پێشنیاری بەیعەتی کوڕی زوبەیرت پێکردین و لەسەر ئەو

پێشنیارە بەیعەتمان لەگەڵ بەست، هەنووکە دەڕۆیتە لای ئەو پیاوە کەلبییە تا برازاکەی، خالید کوڕی یەزید، وەك خەلیفە هەڵبژێریت؟

زوحاك پێی وت: دەبێت چی بکەین؟

وتی: دەبێت بانگەوازەکەمان ئاشکرا بکەین و بەیعەت بۆ کوڕی زوبەیر وەربگرین و دژی نەیارەکانی بجەنگین.

دەڵێت: زوحاك و هاورێکانی لەڕێگە گەڕانەوە و لەمەرج ڕاهیت جێگیر بوو.

سەبارەت بەو جەنگەی لەمەرج ڕاهیت لەنێوان زوحاك کوڕی قەیس و مەروان کوڕی حەکەم ڕوویدا، بۆچوونەکان جیاوازە. محەممەد کوڕی عومەری واقدی دەڵێت: لەگەڵ مەروان کوڕی حەکەم لەموحەڕەمی ساڵی شەست و پێنجەم بەیعەتیان بەست. ئەو لەشام بوو و بیری لەخەلافەت نەدەکردەوە، عوبەیدالڵە کوڕی زیاد کاتێك لەعێراقەوە هاتە لای، بیری خەلافەتی لای دروستکرد و وتی: تۆ گەورە و سەروەری قوڕەیشیت و زوحاك کوڕی قەیس، فەرمانڕەوایەتی تۆ دەکات؟ ئەمە لەکاتێکدا بوو ئەو ڕووداوانە ڕوویدابوو. مەروان لەگەڵ سوپایەك ڕووبەڕووی زوحاك بوویەوە و ئەوانی کوشتار کرد. زوحاك لەو کاتەدا شوێنکەوتەی کوڕی زوبەیر بوو. لەمەرج ڕاهیت بەڕادەیەك لەقەیسییەکان کوژرا کەپێشتر لەهیچ جەنگێکدا هاوشێوەی نەبینراوە.

هشام کوڕی عوروە دەڵێت: زوحاك لەجەنگی مەرج ڕاهیت کوژرا بەهۆی ئەوەی بەیعەتی بۆ عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر وەردەگرت. عەبدوڵڵە کوڕی زوبەریان لەچاکەخوازی و کوژرانی ئەو ئاگادار کردەوە.

بێژەران وتوویانە جەنگی مەرج ڕاهیت لەنێوان زوحاك و مەروان، لەساڵی شەست و چوارەم ڕوویدا.

موسا کوڕی یەعقوب دەڵێت: خەڵکی ئەردەن و کەسانی دیکە بەمەروانیان وت: تۆ پیرێکی بەتەمەنیت و کوڕەکەی یەزید، میردمنداڵێکە، کوڕی زوبەیریش بەتەمەنە، ئاسن بەئاسن دەکوتن. ئەم مێردمنداڵە ڕووبەڕووی کوڕی زوبەیر مەکەرەوە، سینەی خۆت لەبەرابەر سینەی عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر دابنێت و ئێمە بەیعەت لەگەڵ تۆ دەبەستین، دەستی خۆت بێنە پێش. مەروان دەستی بردە پێش

و بەیعەتیان لەگەڵ بەست. لەجابییە، لەڕۆژی چوارشەممە، دوای تێپەڕینی سێ ڕۆژ لەمانگی زیقەعدەی ساڵی شەست و چوارەم، بەیعەتیان لەگەڵ بەست.

عامر کوڕی عەبدوللە دەڵێت: زوحاك ئاگادار بوویەوە کەخەڵکان لەگەڵ مەروان وەك خەلیفە بەیعەتیان بەستووە و هاوەڵانی ئەویش بەیعەتیان بەکوڕی زوبەیر داوە. دواتر ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و جەنگێکی قورسیان کرد و زوحاك و هاوەڵانی کوژران.

کوڕی باوکی زەناد لەباوکی دەگێڕێتەوە: کاتێك عەبدولڕەحمان کوڕی زوحاك، فەرمانڕەوایەتی مەدینەی گرتەدەست، گەنجێکی کەم تەمەن بوو و دەیوت: زوحاك کوڕی قەیس، پێشنیاری بەیعەتی بەهۆزی قەیس و کەسانی دیکەدا و بەیعەتی خەلافەتی لەگەڵ بەستن. زەفەر کوڕی عەقیلی فیهری وتی: ئەمە شتێك بوو ئێمە دەمانزانی بەڵام منداڵەکانی زوبەیر دەیانوت بەیعەتی بۆ عەبدوللە کوڕی زوبەیر وەرگرتووە و بۆ خەلافەتی ئەو هەوڵیدا و کوژرا. سوێند بەخوا ڕاست ناکەن و یەکەم هەنگاو ئەوە بوو قورەیشییەکان پێشنیاری ئەو کارەیان پێکرد بەڵام ڕازی نەبوو و سەرئەنجام نا بەدڵخواز، پەیوەستیان بوو.

## جەنگی مەرج ڕاهیت لەنێوان زوحاك کوڕی قەیس و مەروان کوڕی حەکەم، ڕووداوە گرنگەکانی ساڵی شەست و چوارەمی کۆچی

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەگێڕانەوەی عەوانە کوڕی حەکەمی کەلبی ئاماژەی پێدراوە: زوحاك کوڕی قەیس کە بەمەبەستی جابییە و بینینی حسان کوڕی مالیك بەڕێکەوتبوو، لەگەڵ هاوەڵانی خۆی ڕێگەی گۆڕی و ڕوویکردە مەرج ڕاهیت و بەیعەتی کوڕی زوبەیری ئاشکرا کرد و خەلافەتی لەمناڵەکانی ئومەییە سەندەوە و زۆربەی خەڵکانی دیمەشق لەیەمەنییەکان و کەسانی دیکە، بەیعەتیان لەگەڵ بەست.

دەڵێت: مناڵەکانی ئومەییە و شوێنکەوتەکانیان ڕۆشتن و لەجابییە پەیوەستی حسان بوون. حسان چل ڕۆژ پێشنوێژی بۆ خەڵکان دەکرد و خەڵکان ڕاوێژیان دەکرد. زوحاك بۆ نەعمان کوڕی بەشیر (کارگوزاری حیمس) و زەفەر کوڕی حارس

(کارگوزاری قێنسرین) و ناتل کوڕی قەیس ( فەرمانڕەوای فەلەستین) نامەی نووسی و داوای هاوکاری لێکردن چوونکە هەموویان بەیعەتیان بەکوڕی زوبەیردا بوو. نەعمان، شورەحبیل کوڕی زی ئەلکەلاعی بۆهاوکاری کردنی ئەو ڕەوانە کرد، زەفەر، خەڵکی قێنسرینی بۆ هاوکاری ئەو نارد و ناتلیش خەڵکی فەلەستینی بەڕێخست و هەموو سوپاییەکان لەمەرج ڕاهیت لەدەوری زوحاك کۆبوونەوە. بۆچوونی کەسانی جابییە جیاواز بوو. مالیك کوڕی هوبەیرەی سەکوونی خوازیاری خەلافەتی کوڕەکانی یەزید و دەیویست خەلافەت لەدەستی ئەواندا بێت، حەسین کوڕی نەمیری سەکوونی دەیویست مەروان کوڕی حەکەم خەلافەت بگرێتەدەست. مالیك کوڕی هوبەیرە بەحەسین کوڕی نەمیری سەکوونی وت: با لەگەڵ ئەم گەنجە کەباوکی لەنێوان ئێمەدا چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و خوشکەزای ئێوەیە، بەیعەت ببەستین چوونکە پێگەی ئێمە لای باوکی دەزانی و بەیانی ئێمە دەکاتە سەروەری عەرەبەکان. مەبەستی خالید کوڕی یەزید بوو.

حەسین وتی: نا، سوێند بەخوا شیاو نییە عەرەبەکان پیرێکی بەئەزموون بۆ خەلافەت دەستنیشان بکەن و ئێمە منداڵێك.

مالیك وتی: لەبەر ئەوە ئەو قسە دەکەیت چوونکە سەختیت نەچێشتووە و ڕووبەڕووی دژواری نەبوویتەوە.

وتیان: ئەی باوکی سلێمان ئارام بە.

مالیك وتی: سوێند بەخوا ئەگەر خەلافەت بەمەروان و بنەماڵەی مەروان بدەیت، بەچاوی کەسێکی ڕژد سەیری قامچی و پێپۆش و ئەو دارەی لەسێبەریدا دەحەوێیتەوە، دەکەن، مەروان باوکی عەشیرە و برای عەشیرە و مامی عەشیرەکەیە، ئەگەر بەیعەتی لەگەڵ ببەستن، دەبنە بەندەی ئەو. بەیعەت لەگەڵ خالیدی خوشکەزاتان ببەستن.

حەسین وتی: لەخەودا چل چرایەکم بینی لەئاسمانەوە هەڵواسرابوو، هەرکەس خوازیاری خەلافەت بوایە، دەستی بۆ دەبرد و نەیدەتوانی بیگرێت بەڵام مەروان دەستی برد و گرتی، سوێند بەخوا خەلافەت بەو دەدەین.

مالیك پێی وت: هاوار لەتۆ، ئەی حەسین، بەیعەت لەگەڵ مەروان و بنەماڵەی

مەروان دەبەستیت لەکاتێکدا دەزانی ئەوان بنەماڵەیەك لەتایەفەی قەیسن.

دەڵێت: کاتێك بۆ بەستنی بەیعەت لەگەڵ مەروان ڕێککەوتن، ڕوەح کوڕی زەنباعی جوزامی هەستایە سەرپێ، سپاسی خواوەندی کرد، وتی: ئەی خەڵکینە، ئێوە باسی عەبدوڵڵە کوڕی عومەر و ئەوەی هاودەم وهاونشینی پێغەمبەر (د.خ) و پێشینەی لەئیسلامدا قسە دەکەن و بەهەمانشێوەیە کەدەڵێن بەڵام کوڕی عومەر کەسێکی لاوازە و کەسی لاواز ناتوانێت کاروباری ئۆمەتی محەممەد ڕاپەڕێنێت، ئەوەی خەڵکان باسی عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر دەکەن، سوێند بەخوا بەوشێوەیە کەدەڵێن، ئەو کوڕی زوبەیر هاوڕێی پێغەمبەرە و کوڕی ئەسما، کچی ئەبوبەکری سدیقە و پێشینەی بەوشێوەیە کەئاماژەی پێدەدەن، بەڵام کوڕی زوبەیر ڕیاکارێکە و دوو خەلیفە، یانی یەزید کوڕی معاویە و معاویە کوڕی یەزیدی لەسەر کار لابرد و خوێن ڕژا و دووبەرەکی و ئاژاوە لەنێوان موسوڵمانان سەریهەڵدا و کەسی ڕیاکار شیاوی خەلافەتی موسوڵمانان نییە. بەڵام سەبارەت بەمەروان کوڕی حەکەم، سوێند بەخوا لەهەر شوێنێك کەلێنێك لەئیسلام دەرکەوتبێت، مەروان هەوڵی پڕکردنەوەی داوە و ئەو بوو بۆ بەرگریکردن لەخەلیفەی موسوڵمانان، عوسمان کوڕی عەفان جەنگا و لەجەنگی جەمەلیش دژی عەلی کوڕی ئەبی تالیب شەڕیکرد، بۆچوونی ئێمە ئەوەیە خەڵك لەگەڵ پیرێکی بەئەزموون بەیعەت ببەستن و منداڵەکان پشتگوێ بخەن. (مەبەستی لەپیر مەروان کوڕی حەکەم و لەمنداڵ، خالید کوڕی یەزید کوڕی معاویە بوو).

دەڵێت: خەڵکان ڕێککەوتن لەگەڵ مەروان کوڕی حەکەم بەیعەت ببەستن و دوای ئەو لەگەڵ خالید کوڕی یەزید و دوای خالید، لەگەڵ عەمرۆ کوڕی سەعید کوڕی عاس بەو مەرجەی فەرمانڕەوایی دیمەشق لەدەستی عەمرۆ کوڕی سەعید کوڕی عاس بێت و فەرمانڕەوایی حیمس لەدەستی خالید کوڕی یەزید کوڕی معاویە.

دەڵێت: حسان کوڕی مالیك، خالید کوڕی یەزیدی بانگکرد و پێی وت: خوشکەزاکەم، خەڵك تەنیا لەبەر کەم تەمەنیت وەك خەلیفە تۆیان هەڵنەبژارد. سوێند بەخوا ئەم کارەم تەنیا بۆ تۆ کرد و تەنیا لەبەر تۆ، بەیعەتم لەگەڵ مەروان بەست.

خالید کوڕی یەزید وتی: بۆ ئەمکارە، ناتەوان بوویت.

وتی: نا، سوێند بەخوا ناتەوان نەبووم بەلام بەرژەوەندی موسوڵمانانم لەوەدا بینی.

دەڵێت: حسان، مەروانی بانگکرد و وتی: ئەی مەروان، سوێند بەخوا، خەڵکان هەموو بەتۆ ڕازی نابن.

مەروان وتی: سوێند بەخوا ئەگەر خواوەند بخوازێت خەلافەت بەمن ببەخشێت، کەس ناتوانێت ببێتە ڕێگر و ئەگەر خواوەند نەیەوێت، کەس لەبەندەکانی ناتوانێت ئەو پێگەیە بەمن ببەخشێت.

دەڵێت: حسان پێی وت: ڕاست دەکەیت.

دواتر حسان لەڕۆژی دووشەممە ڕۆشتە سەر مینبەر و وتی: ئەی خەڵکینە، بەخواستی خواوەند، ڕۆژی پێنجشەممە، خەلیفە دەستنیشان دەکەین.

دەڵێت: ڕۆژی پێنجشەممە، بەیعەتی لەگەڵ مەروان بەست. خەڵکانیش بەیعەتیان بەست و مەروان لەگەڵ خەڵکان ڕێگەی جابییەی گرتەبەر و لەمەرج ڕاهیت لەگەڵ خەڵکانی ئەردەن لەهۆزی کەلب، لەبەرابەر زوحاک و سوپاکەی دابەزی. هۆزی سەکاسەك و سەکون و غەسان هاتنە لای. حسان کوڕی مالیك بۆ ئەردەن گەڕایەوە.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی سەعید کوڕی عاس، فەرماندەی باڵی ڕاستی سوپاکەی مەروان و عوبەیداللە کوڕی زیاد، فەرماندەی باڵی چەپ. فەرماندەی باڵی ڕاستی سوپاکەی زوحاك، زیاد کوڕی عەمرۆ عەقیلی و فەرماندەی باڵی چەپ کەسێك بوو کەناوەکەیم لەبیرکردووە.

دەڵێت: یەزید کوڕی باوکی نەمسی غەسانی لەجابییە ئامادە نەبوو، لەدیمەشق خۆی حەشاردابوو. کاتێك مەروان لەمەرج ڕاهیت دابەزی، یەزید کوڕی باوکی نەمس لەگەڵ خەڵکانی دیمەشق و کۆیلەکان ئالای شۆڕشی بەرز کردەوە و کارگوزاری زوحاکی لەشارەکە دەرپەڕاند و دەستی بەسەر خەزینەکاندا گرت و بەیعەتی لەگەڵ مەروان بەست و بەچەنگاوەر و سامان، هاوکاریکرد. ئەمە یەکەم سەرکەوتن بوو منداڵەکانی ئومەییە بەدەستیان هێنا.

دەڵێت: مەروان بۆ ماوەی بیست ڕۆژ لەگەڵ زوحاك جەنگا. سوپای مەرج شکستیان خوارد و کوژران. زوحاکیش کوژرا. ئەو ڕۆژە هەشتا کەس لەگەورەکانی شام کە لەسوپاکەی زوحاکدا بوون، کوژران کەهەموویان قەتیفەیان وەردەگرت. ئەو کەسەی قەتیفەی وەردەگرت، مانگانەکەی دوو هەزار بوو. لەخەڵکانی شام لەهەموو هۆزەکان ژمارەیەکی زۆر کوژرا کەپێشتر هاوشێوەی نەبینراوە. لەمناڵەکانی بەنی عولەیمی کەلبیش یەکێك بەناوی مالیك کوڕی یەزید کە لەناو سوپاکەی زوحاکدا بوو، کوژرا. ئەو کەسەی لەڕۆژی ڕۆشتنی قوزاعە بۆ شام ئالاهەڵگری خەڵکەکەی بوو، کوژرا. ئەو باوەگەورێی مەدلەج کوڕی میقدامی جورەشی بوو. سەور کوڕی مەعدیش کەزوحاکی پەشیمانکردبوویەوە، کوژرا.

دەڵێت: یەکێك لەمناڵەکانی کەلب سەری زوحاکی هێنا وەك دەڵێن کاتێك سەری زوحاکیان بردە لای مەروان، خەمبار بوو و وتی: ئێستا کەتەمەنم زۆر بووە و ئێسکەکانم لاواز بوون و ماوەیەکی کەم لەتەمەنم ماوەتەوە، دەبێت دەستەکانی خەڵك بۆ جەنگی یەك ناچار بکەم.

دەڵێت: ئەو ڕۆژە مەروان لای کوژراوێك گوزەری کرد و هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

((جگە لەمەرگی خەڵکان، ئەوان چ زیانێکیان پێدەگات؟

کەکام یەك لەم دوو سەرکردەی قوڕەیشە سەرکەوتن بەدەست دێنێت)).

یەکێك لەمناڵەکانی عەبدود کە لەکاتی کوژرانی زوحاك ئامادە بوو، دەڵێت: یەکێك لەخەڵکانی کەلب بەناوی زەحنە کوڕی عەبدوڵڵە لای ئێمە تێپەڕی، گورزی ڕمەکەی بەهەر کەس دەکەوت، لەپێدەکەوت و شمشێری لەهەرکەس دەدا، گیانی دەدا، سەیرم دەکرد و لەوەی چۆن دەتوانێت بەوشێوەیە خەڵکان بکوژێت، سەرمسوڕمابوو، لەناکاو کەسێك هێرشیکردەسەر بەڵام زەحنە لەپێی خست. ڕۆشتم و سەیری کوژراوەکەم کرد، دەرکەوت زوحاك کوڕی قەیسە. سەرم بڕی و بردمە لای مەروان، وتی: تۆ ئەوت کوشت؟

وتم: نا، زەحنە کوڕی عەبدوڵڵەی کەلبی ئەوی کوشت.

دەڵێت: مەروان ڕاستگۆیی منی پەسەند کرد و وتی: بڕێك پارەم وەك خەڵات

پێیببەخشن، هەروەها دواتر چاکەی لەگەڵ زەحنەدا کرد.

حەبیب کوڕی کوڕە دەڵێت: سوێند بەخوا ئەو ڕۆژە ئاڵای مەروان بەدەستی من بوو، ئەویش کالآنی شمشێرەکەی بەپشتی منەوە بەستبوو، دەیوت: بێ باوك، ئاڵاکەت بۆ پێشەوە ببە، ئەگەر ئەوان تیژی شمشێرەکانی ئێمە بچێژن، هاوشێوەی مەڕ لەشوانەکەیان جیا دەبنەوە.

دەڵێت: سوپاکەی مەروان شەش هەزار کەس بوو، سەرکردەی سوارەکانی عوبەیدالله کوڕی زیاد و سەرکردەی پیادەکانی مالیك کوڕی هوبەیرە بوو.

عەبدولمەلیك کوڕی نەوفل دەڵێت: وەك دەڵێن لەو ڕۆژەدا بوشر کوڕی مەروان ئاڵایەکی پێبوو و دەجەنگی و نەشیدی دەخوێند، هەروەها لەو ڕۆژەدا عەبدولعەزیز کوڕی مەروان کوژرا.

دەڵێت: ئەو ڕۆژە مەروان لای یەکێك لەخەڵکانی موحاریب تێپەڕی کە لەگەڵ چەند کەسێك لەژێر ئاڵایەکدا بوو و بۆ پشتیوانی کردنی مەروان دەجەنگی و پێی وت: خوا بتبەخشێت، بۆ پەیوەستی هاوەڵانت نابێت، ژمارەی ئێوە کەمە.

وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ژمارەیەکی زۆر لەفریشتەکان بۆ هاوکاری کردنی ئێمە هاتوون.

دەڵێت: مەروان شادومان بوو، بزەی گرت و ژمارەیەك لەکەسانی دەوروبەری خۆی پەیوەستی ئەوانکرد.

دەڵێت: کەسانێك لەمەرج هەڵاتن و بۆ ویلایەتەکانی خۆیان گەڕانەوە. خەڵکی حیمس، ڕوویان لەحیمس کرد کەنەعمان کوڕی بەشیر کارگوزارەکەی بوو. کاتێك نەعمان ئاگادار بوویەوە، شەوانە هەڵات. هاوسەرەکەی، نایلە کچی عەمارەی کەلبی هاوڕێیەتی دەکرد، هەروەها هەموو کەرەستەکان و منداڵەکانی لەگەڵ خۆی برد. بەدرێژایی شەو سەرگەردان بوو. بەرەبەیان، خەڵکانی حیمس شوێنیکەوتن. کەسێك بەناوی عەمرۆ کوڕی خولی لەکەلاعییەکان پێی گەیشتەوە و کوشتی و سەری خۆی و منداڵەکانی هێنا و سەری ئەوی لای دایکی ئەبان کچی نەعمان فڕێدا کەدواتر بوو بەهاوسەری حەجاج کوڕی یوسف، بەڵام نایلە وتی: سەرەکەی فڕێبدەنە لای من چوونکە ماف من زیاترە. سەری نەعمانیان خستە لای ئەو. دواتر

ئەوانیان بۆ حیمس برد و کەلبییەکانی حیمس هاتن و نایله و منداڵەکەیان برد.

دەڵێت: زەفەر کوڕی قەیس لەقێنسرین هەڵات و ڕوویکردە قرقیسیا کەکارگوزارەکەی عەیازی جورەشی و یەزید پێشتر ئەوی دانابوو. عەیاز ڕێگەی نەدا زەفەر بڕواتە ناو قرقیسیا بەڵام زەفەر پێی وت سوێند و تەڵاقت بۆ دەخۆم کاتێك بڕۆمە ناو گەرماوی قرقیسیا، شارەکە بەجێدێڵم و کاتێك ڕۆشتە ناو شارەکە، نەچووە گەرماو و لەوێ مایەوە و عەیازی دەرکرد و سەنگەری گرت و خەڵکانی قەیس لەدەوری کۆبوونەوە.

دەڵێت: ناتل کوڕی قەیسی جوزامی، فەرمانڕەوای فەلەستین، هەڵات و لەمەککە پەیوەستی کوڕی زوبەیر بوو. خەڵکانی شام بەگشتی ملکەچی مەروان بوون و پەیمانیان لەگەڵ بەست. مەروان کارگوزارەکانی خۆی بۆ شارەکان ڕەوانە کرد.

بێژەر دەڵێت: دوای ئەوەی مەروان کاروباری شامی گرتەدەست، ڕوویکردە میسر کەکارگوزارەکەی، عەبدولڕەحمان کوڕی جەحدەمی قورەیشی بەیعەتی بۆ کوڕی زوبەیر وەردەگرت. عەبدولڕەحمان لەگەڵ هەموو ئەو کەسانەی لەمناڵەکانی فیهر لەگەڵیدا بوون، بۆ پەیوەست بوون بەکوڕی زوبەیر بەڕێکەوت. دوای ئەو مەروان، عەمرۆ کوڕی سەعیدی ئەشدەقی نارد کەڕۆشتە میسر و لەسەر مینبەر، قسەی بۆ خەڵکان کرد و کاتێك بەخەڵکیان وت، عەمرۆ هاتۆتە ناو میسر، پەشیمانبوونەوە و بەخەلافەتی مەروان ڕازیبوون و بەیعەتیان لەگەڵ بەست. مەروان بۆ دیمەشق گەڕایەوە و کاتێك لەشارەکە نزیکبوویەوە، ئاگادار بوویەوە کەکوڕی زوبەیر، مەسعەبی برای بۆ فەلەستین ناردووە. مەروان، عەمرۆ کوڕی سەعید کوڕی عاسی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو نارد و سەرئەنجام شکستی بەسوپاکەی مەسعەب هێنا. یەکێك لەمناڵەکانی عوزرە بەناوی محەممەد، کوڕی حورەیس کەخالی کوڕەکانی ئەشدەق و هاوڕێیەتی دەکرد، دەیوت: سوێند بەخوا هیچ کەسێکم لەگۆڕەپانی جەنگ، پیادە یا سوار هاوشێوەی مەسعەب نەبینیوە، لەڕێگەدا بینیم پیادە دەڕۆشت و هاوەڵانی خۆی بۆ پێشەوە دەبرد، ئەوەندە بەپێ دەڕۆشت تا ئەوەی خوێن لەپێکانی دەچۆڕا.

دەڵێت: مەروان گەڕایەوە و لەدیمەشق جێگیر بوو. عەمرۆ کوڕی سەعید بۆ

دیمەشق گەڕایەوە.

دەڵێت: وەك دەڵێن: کاتێك عوبەیدالله کوڕی زیاد لەعێراقەوە ڕوویکردە شام، منداڵەکانی ئومەییەی لەتەدمور بینی کەکوڕی زوبەیر، لەمەدینە و مەککە و حیجاز دووری خستبوونەوە و لەتەدمور جێگیر بووبوون چوونکە زوحاك کوڕی قەیسی فیهری فەرمانڕەوای شام، پشتیوانی لەکوڕی زوبەیر دەکرد. کاتێك کوڕی زیاد هات، مەروان دەیویست سوار بێت و بڕواتە لای کوڕی زوبەیر و بەیعەتی لەگەڵ ببەستێت و ئەمان بۆ منداڵەکانی ئومەییە وەربگرێت.

دەڵێت: کوڕی زیاد پێی وت: سوێندت دەدەم بەخوا ئەو کارە نەکەیت چوونکە بۆچوونێکی ڕاست نییە، لەبەر ئەوەی تۆ پیری قورەیشیت و هەنووکە دەخوازی بۆ لای باوکی خەبیب بڕۆیت و بەخەلافەتی ئەو ڕازی ببیت، لەجیاتی ئەوە، دانیشتووانی تەدمور کۆبکەرەوە و بەیعەتیان لەگەڵ ببەستە. دواتر لەگەڵ ئەوان و منداڵەکانی ئومەییە، ڕێگەی شام بگرەبەر و دژی زوحاك کوڕی قەیس بجەنگە و لەشام دەریپەڕێنە.

عەمرۆ کوڕی سەعید کوڕی عاس وتی: سوێند بەخوا کوڕی زیاد ڕاست دەکات، تۆ سەروەری قوریشیت و لەهەمووان بۆ خەلافەت شیاوتریت، خەڵك خوازیاری خەلافەتی ئەم کوڕەن -مەبەستی خالید کوڕی یەزید- بوو، دایکی ئەو بکەرە هاوسەری خۆت تا کوڕەکە لەنزیك تۆوە بێت.

دەڵێت: مەروان ئەو کارەی کرد و دایکی خالیدی کردە هاوسەری خۆی. ئەو، فاختە کچی هاشم کوڕی عوتبە کوڕی ڕەبیعە بوو. دواتر منداڵەکانی ئومەییەی کۆکردەوە و وەك فەرمانڕەوا بەیعەتیان لەگەڵ بەست. خەڵکانی تەدموریش بەیعەتیان لەگەڵ بەست.

مەروان لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ جەنگی زوحاك کوڕی قەیس بەڕێکەوت کە لەو کاتەدا لەدیمەشق بوو. کاتێك زوحاك لەهاتنی سوپاکەی مەروان و منداڵەکانی ئومەییە ئاگادار بوویەوە، لەگەڵ کەسانێك لەدیمەشق و شوێنکەوتەکانی و کەسانی وەك زەفەر کوڕی حارس ڕۆشتنەدەر و لەمەرج ڕاهیت ڕووبەڕوویان بوونەوە. جەنگێکی قورسیانکرد و زوحاك کوڕی قەیس و زۆربەی کەسەکانی

کوژران و سوپاکەی شکستی خوارد و بڵاوەیان لێکرد. زەفەر کوڕی حارس لەگەڵ دوو گەنجی لەمناڵەکانی سەلیم ڕێگەیەکی گرتەبەر. سوارەکانی مەروان شوێنیان کەوتن و لەبەر ئەوەی ئەو دووگەنجە، لەسوارەکانی مەروان ترسان، بەزەفەریان وت: تۆ ڕابکە، ئێمە دەکوژرێین. زەفەر ئەوانی بەجێهێشت و ڕۆشت تاگەیشتە قرقیسیا. خەڵکی ئەو دەڤەرە لەدەوری کۆبوونەوە و ئەویان وەك سەرکردەی خۆیان هەڵبژارد.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: حەسین کوڕی نەمیر، بەیعەتی لەگەڵ مەروان کوڕی حەکەم بەست و دژایەتی مالیك کوڕی هوبەیرەی کرد کەدەیویست بەیعەت لەگەڵ خالید کوڕی یەزید کوڕی معاویە ببەستێت. بەمشێوەیە خەلافەتی مەروان سەقامگیر بوو. حەسین کوڕی نەمیر مەرجی بۆ مەروان دانابوو کەهەموو خەڵکانی کێندە لەشام لەبەلقا نیشتەجێ ببن و داهاتەکەی بۆ ئەوان بێت. مەروان، بەلقای بەوان بەخشی. کاتێك کاروباری بنەماڵەی حەکەم سەقامگیر بوو، چەندین مەرج و پەیمانیان لەگەڵ خالید کوڕی یەزید کوڕی معاویە بەست. ڕۆژێك مەروان لەکۆڕەکەی دانیشتبوو، مالیك کوڕی هوبەیرە لەوێ بوو. مەروان وتی: کەسانێك بانگەشەی مەرجەکان دەکەن بۆنخۆشی سورمەکێشاو، یەکێکە لەوان. مەبەستی لەم وتەیە مالیك کوڕی هوبەیرە بوو چوونکە پیاوێك بوو، بۆنیخۆشی لەخۆی دەدا و سورمەی دەکێشا.

مالیك وتی: بۆیە ئەم وتارەت هێنایە سەرزمان، چوونکە سەختیت نەچێشتووە و دژواریت نەبینیوە.

مەروان وتی: ئەی باوکی سلێمان ئارام بە، گاڵتەم لەگەڵ کردیت.

مالیك وتی: باشە.

لەم ساڵەدا سوپای خوراسان، دوای مەرگی یەزید کوڕی معاویە بەیعەتیان لەگەڵ سەلەم کوڕی زیاد کرد بۆ ئەوەی کاروبارەکانیان ڕاپەڕێنێت تا ئەو کاتەی موسوڵمانان، خەلیفەیەك هەڵدەبژێرن.

ئاژاوەی عەبدوڵڵە کوڕی خازم لەخوراسان لەم ساڵەدا ڕوویدا.

## ئاژاوەکەی عەبدوڵڵە کوڕی خازم لەخوراسان

مەسلمە کوڕی موحاریب دەڵێت: سەلەم کوڕی زیاد لەو دیاریانەی لەسەمەرقەند و خوارەزم بەدەستی هێنابوو، بڕێکی بەعەبدوڵڵە کوڕی خازمدا بۆ یەزید کوڕی معاویە نارد. سەلەم فەرمانڕەوای خوراسان بوو تا ئەوکاتەی یەزید کوڕی معاویە مرد و دوای ئەو، معاویە کوڕی یەزیدیش مرد و سەلەم لەهەواڵی مەرگی ئاگادار بوویەوە. هەروەها لەکوژرانی یەزید کوڕی زیاد لەسیستان و گیرانی باوکی عوبەیدە کوڕی زیاد ئاگادار بوویەوە بەڵام هەواڵەکانی لەخەڵکان شاردەوە.

کوڕی عەرادەی هۆنراوەیەکی هۆنییەوە و سەلەمی سەرکۆنە کرد و کاتێک هۆنراوەکەی کوڕی عەرادە بڵاوبوویەوە، سەلەم، بەناچاری مەرگی یەزید کوڕی معاویە و معاویە کوڕی یەزیدی ئاشکرا کرد. داوای لەخەڵکان کرد بەدڵخواز بەیعەت ببەستن تا ئەو کاتەی موسوڵمانان خەلیفەیەك هەڵدەبژێرن. خەڵکانی خوراسان بەیعەتیان لەگەڵ سەلەم بەست و دوو مانگ بەردەوام بوون بەڵام دواتر دژایەتی کردنیان دەستپێکرد.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: پیرێك لەخەڵکانی خوراسان پێیوتم: خوراسانییەکان هیچ فەرمانڕەوایەکیان وەك سەلەم کوڕی زیاد خۆشنەدەویست و لەو ساڵانەی سەلەم لەخوراسان بوو، زیاتر لەبیست هەزار منداڵیان، لەبەر خۆشەویستی سەلەم، ناونا سەلەم.

حەفسی ئەزدی لەمامی خۆی دەگێڕێتەوە: کاتێك خوراسانییەکان دژایەتیکردنیان دەستپێکرد و بەیعەتەکەی سەلەمیان شکاند، سەلەم خوراسانی بەجێهێشت و موهەلیب کوڕی باوکی سەفرەی وەك جێگری خۆی دانا و کاتێك گەیشتە سەرەخس، سەلمان کوڕی مورسەد، یەکێك لەمناڵەکانی قەیس کوڕی سەعلەبە، ئەوی بینی و وتی: چ کەسێکت وەك جێگری خۆت لەخوراسان دانا؟

وتی: موهەلیب.

وتی: لەخەڵکانی نزار کەست دەستنەکەوت و پیاوێکی یەمەنیت کردە

فەرمانڕەوا؟

دەڵێت: سەلەم فەرمانڕەوایەتی ویلایەتی مەروود و فاریاب و تاڵەقان و گوزگانی پێسپارد.

ئەوس کوڕی سەعلەبە خاوەنی کۆشکی ئەوسی بەسرەی وەك کارگوزاری هەرات دەستنیشانکرد و ڕۆشت و کاتێك گەیشتە نەیشابور، عەبدوڵڵە کوڕی خازم ئەوی بینی و وتی: چ کەسێکت وەك فەرمانڕەوای خوراسان دەستنیشانکرد؟ وەڵامی دایەوە کەوتی: لەناو موزێرییەکان کەسێك نەبوو کەخوراسانت لەنێوان منداڵەکانی بەکر کوڕی وائیا و یەمەن و عەمان دابەشکرد؟ دواتر پێی وت: فەرمانی فەرمانڕەوای خوراسان بۆ من بنوسە؟

وتی: مەگەر من فەرمانڕەوای خوراسانم؟

وتی: فەرمانەکە بنووسە و خەمت نەبێت.

دەڵێت: فەرمانی فەرمانڕەوایی خوراسانی بۆ نووسی.

کوڕی خازم وتی: هەنووکە سەد هەزار درەم هاوکاریم بکە.

سەلەم وتی و سەد هەزار درەمیان پێدا و ڕێگەی مەروی گرتەبەر.

دەڵێت: موهەلیب کوڕی باوکی سەفرە ئاگادار بوویەوە و هات و یەکێك لەمناڵەکانی جوشمی وەك جێگری خۆی دیاریکرد.

محەممەدی زەببی دەڵێت: کاتێك عەبدوڵڵە کوڕی خازم بەفەرمانی سەلەم بەرەو مەرو ڕۆشت، جوشمی ڕێگەی لێگرت و جەنگ ڕوویدا و بەردێك بەرناوچاوی جوشمی کەوت و لێکجیابوونەوە. جوشمی مەروودی بەجێهێشت و کوڕی خازم ڕۆشتە ناو شارەکە. دوو ڕۆژ دواتر جوشمی مرد.

ڕەشیدی گوزگانی دەڵێت: کاتێك یەزید کوڕی معاویە و دوای ئەو معاویە کوڕی یەزید مرد، خوراسانییەکان دژی فەرمانڕەواکانی خۆیان شۆڕشیانکرد و ئەوانیان لەشارەکە دەرپەڕاند. هەر هۆز و تایەفەیەك بەسەر ناوچەیەکدا زاڵ بوو، ئاژاوە سەریهەڵدا و کوڕی خازم دەستی بەسەر خوراساندا گرت و جەنگ هاتە ئاراوە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەگێڕانەوەی باوکی نەعامە بەمشێوە هاتووە: عەبدوڵڵە کوڕی خازم هات و دەستی بەسەر مەرودا گرت. دواتر بەمەبەستی

ڕووبەڕووبوونـــەوە لەگـــەڵ ســـلێمان کـــوڕی مورســـەد بەڕێکـــەوت و لەمـــەرورود ڕووبەڕووی بوویەوە و چەند ڕۆژێك جەنگا و سەرئەنجام سلێمان کوڕی مورسەد کوژرا. دواتر، عەبدوڵڵە کوڕی خازم لەگەڵ حەوتسەد کەس بۆ جەنگی عەمرۆ کوڕی مورسەد ڕوویکردە تاڵەقان. عەمرۆ لەهاتنی عەبدوڵڵە و کوژرانی سلێمانی برای ئاگادار بوویەوە و بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی لەشارەکە هاتەدەر و پێش ئەوەی سوپاکەی کوڕی خازم پەیوەستی ببن، لای ڕووبارەکە جەنگیان دەستپێکرد. عەبدوڵڵە بەکەسەکانی خۆی وت: دابەزن، عەبدوڵڵە کوڕی خازمیش دابەزی و بەدوای زوهەیر کوڕی زوەیبی عەدەوی دەگەڕا، پێیان وت: نەهاتووە. دواتر هات و کاتێك گەیشت، بەکوڕی خازمایان وت: زوهەیر هات. عەبدوڵڵە پێی وت: پێشڕەوی بکە.

دەڵێت: ئاگری جەنگیان خۆشکرد و جەنگ، درێژەی کێشا. عەمرۆ کوڕی مورسەد کوژرا و سوپاکەی شکستیان خوارد و لەهەرات پەیوەستی ئەوس کوڕی سەعلەبە بوون. عەبدوڵڵە کوڕی خازم بۆ مەرو گەڕایەوە.

دەڵێ: وەك وتوویانە ئەو کەسەی عەمرۆ کوڕی مورسەدی کوشت، زوهەیر کوڕی حەییانی غەنەوی بوو.

باوکی سەری خوراسانی هەراتی دەڵێت: عەبدوڵڵە کوڕی خازم، سلێمان و عەمرۆی مورسەدی، کوڕەکانی مورسەد لەمناڵەکانی قەیس کوڕی سەعلەبەی کوشت و بۆ مەرو گەڕایەوە. مناڵەکانی بەکر کوڕی وائیل لەمەرو بەرەو هەرات هەڵاتن و هەموو بەکرییەکانی ویلایەتەکانی دیکەی خوراسان پەیوەستیان بوون و ژمارەیان زیادیکرد. سەرکردەکەیان ئەوس کوڕی سەعلەبە بوو.

دەڵێت: بەئەوسیان وت: بەیعەتت لەگەڵ دەبەستین بەو مەرجەی جەنگ دژی کوڕی خازم دەستپێبکەیت و موزێرییەکان لەخوراسان دەرپەڕێنێت.

وتی: ئەمە یاخیبوونە و خەڵکانی یاخی، ڕیسوا دەبن. لەشوێنی خۆتان بمێننەوە، ئەگەر کوڕی خازم پشتگوێی خستن کەگومان ناکەم ئەو کارە بکات، بەم ناوچەیە ڕازی بن.

مناڵەکانی سوهەیب کەخزمی مناڵەکانی جەحدەر بوون، وتیان: نا، سوێند

بەخوا هەرگیز ڕازی نابین ئێمە و موزێرییەکان لەیەك ویلایەتدا بین لەکاتێکدا ئەوان دوو کوڕی مورسەدیان کوشتووە. ئەگەر بەجەنگ ڕازی دەبیت چ باشتر، جیاواز لەوە کەسێکی دیکە وەك سەرکردە هەڵدەبژێرین.

وتی: من یەکێکم لەئێوە، چیتان پێخۆشە ئەنجامی بدەن.

دەڵێت: بەیعەتیان لەگەڵ بەست. کوڕی خازم بۆ جەنگی ئەوان هات و موسای وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد و بەڕێکەوت تا لەدۆڵێك لەنێوان ئۆردووگاکەی خۆی و هەرات جێگیر بوو.

دەڵێت: خەڵکانی بەکر بەئەوسیان وت: لەشارەکە بڕۆدەر و لەبەردەم شارەکە خەندەکێك لێبدە و لەوێ ڕووبەڕوویان ببەوە. بەمشێوەیە شارەکە لەپشت سەرمانەوە دەبێت.

ئەوس وتی: لەشارەکە بمێنینەوە و کوڕی خازم لەوێ بەجێبێڵن چوونکە ئەگەر ماوەیەکی زۆر بمێنێتەوە، بێزار دەبێت و داواکارییەکانی ئێوە جێبەجێ دەکات، ئەگەر ناچار بوون، ئاگری جەنگ هەڵبگیرسێنن.

دەڵێت: بەڵام ڕازی نەبوون و لەشارەکە ڕۆشتنەدەر و خەندەکێکیان لێدا و کوڕی خازم نزیکەی یەکساڵ دژی ئەوان جەنگی.

زوهەیر کوڕی هونەید دەڵێت: کوڕی خازم ڕێگەی هەراتی گرتەبەر کەژمارەیەکی زۆر لەمناڵەکانی بەکر کوڕی وائیل لەوێ بوون و خەندەکێکیان لێدابوو و پەیمانیان بەستبوو ئەگەر بەسەر خوراساندا زاڵ بن، موزێرییەکان لەو شارە دەرپەڕێنن.

دەڵێت: کوڕی خازم، ڕووبەڕووی ئەوان ڕیزی بەست، هیلالی زەببی یەکێك لەمناڵەکانی زوهەل پێی وت: دژی برا و مناڵەکانی باوکت دەجەنگیت؟ سوێند بەخوا ئەگەر سەرکەوتن بەدەست بێنیت، ژیان دوای ئەوان مانای نییە. لەمەڕوود ژمارەیەکت لەوان کوشتووە، چی دەبێت ئەگەر داواکارییەکانیان جیبەجێ بکەیت و ئاشتی باڵ بەسەر ئەم ویلایەتەدا بکێشێت.

وتی: ئەگەر هەموو خوراسانیان پێببەخشم، ڕازی نابن و ئەگەر بتوانن ئێوە لەم جیهانە بسڕنەوە، دڕێغی ناکەن.

وتی: نا، سوێند بەخوا نەمن و نەیەك كەس لەمناڵەكانی خیندەف كەشوێنكەوتەی منن، یەك تیر لەبەرژەوەندی تۆ ناهاوین تا ئەو كاتەی پێشنیاری ئاشتییان پێبكەیت.

وتی: تۆ نێردراوی من بۆ لای ئەوان بە و هەوڵبدە ڕەزامەندی ئەوان بەدەست بێنیت.

دەڵێت: هیلال ڕۆشتە لای ئەوس كوڕی سەعلەبە و بەخوا و پەیوەندی خزمایەتی سوێندیدا وتی: خوێنی خەڵكانی نیزار مەڕێژە و بەكوشتنی یەك ناچاریان مەكە.

وتی: چاوت بەمناڵەكانی سوهەیب كەوتووە.

وتی: نا.

وتی: سەردانی ئەوان بكە.

دەڵێت: هیلال ڕۆشت و ئەرقەم كوڕی موتەریفی حەنەڤ و زەمزەم كوڕی یەزید یا (عەبدوڵڵە كوڕی زەمزەم) و عاسم كوڕی سەلّ، هەموویان حەنەڤ، و دەستەیەك لەمناڵەكانی بەكر كوڕی وائیلی بینی و گفتوگۆی لەگەڵ كردن، لەوەلاّمدا وتیان: سەردانی مناڵەكانی سوهەیبت كردووە؟

وتی: نا، بەلاّم گومان بكەم پێگەی ئەوان لای ئێوە بەرزبۆتەوە.

وتی: سەردانی ئەوان بكە.

دەڵێت: هیلال ڕۆشتە لای مناڵەكانی سوهەیب و گفتوگۆی لەگەڵ كردن، وتیان: ئەگەر نێردراو نەدەبویت، دەمانكوشتیت.

وتی: بەهیچ شتێك ڕازی نابن؟

وتیان: یەكێك لەم دوو شتە: یا ئێوە لەخوراسان بڕۆن و كەس لەموزێرییەكان نەمێنێتەوە یا بمێننەوە و هەموو چوارپێ و زێڕ و زیوەكانتان بەئێمە بسپێرن.

وتی: جگە لەوە هیچ پێشنیارێكی دیكەتان نییە؟

وتیان: نە.

وتی: پشت بەخوا دەبەستین چوونكە باشترین پەناگەیە.

دەڵێت: هیلال بۆ لای كوڕی خازم گەڕایەوە و لێی پرسی: دەنگوباس؟

وتی: براکانمان بینی بەڵام ڕێز لەپەیوەندی خزمایەتی ناگرن.

وتی: پێم وتیت لەوکاتەوەی خواوەند پێغەمبەری لەخەڵکانی موزێر هەڵبژارد، خەڵکانی ڕەبیعە لەخواوەندی خۆیان تورەن.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەگێڕانەوەی موجالیدی زەببی هاتووە کاتێك کوڕی خازم لەهەرات بوو، تورکەکان هێرشییەکان کردە سەر کۆشکی ئەسفاد و گەمارۆیان خستە سەر خەڵکەکەی. زۆربەی ئەو کەسانەی لەوێ بوون، لەخەڵکانی ئەزد بوون و سەرئەنجام شکستیان خوارد و کەسیان بۆ لای ئەزدییەکانی دیکە نارد و داوای هاوکارییان کرد. تورکەکان شکستیان بەوانیش هێنا. سەرئەنجام کەسیان بۆ لای کوڕی خازم نارد و ئەویش، زوهەیر کوڕی حەییانی لەگەڵ خەڵکی تەمیم بۆ هاوکاری نارد و وتی: تورکەکان تیرباران مەکەن، کاتێك ئەوانتان بینی، هێرشیان بکەنەسەر.

دەڵێت: زوهەیر ڕۆژێکی سارد لێیان نزیکبوویەوە و کاتێك ڕووبەڕووبوونەوە، هێرشیانکردنەسەر و تورکەکان نەیانتوانی خۆڕاگری بکەن و شکستیان خوارد. شوێنیانکەوتن. ماوەیەك لەشەو تێپەڕی و گەیشتنە بیابانی قەسری. سوپا بەجێما و زوهەیر لەگەڵ کۆمەڵێك لەسوارەکان، شوێنپێی تورکەکانی هەڵگرت چوونکە ڕێگەکەی بەباشی دەناسی. نیوەشەو گەڕایەوە و بەهۆی سەرماوە، دەستی لەسەر ڕمەکە وشك بووبوو. کەعبی کۆیلەی بانگ کرد و ئەویش چەوری گەرمی دەهێنا و دەیخستە سەر دەستی. چەوریان دەکرد و ئاگریان کردەوە تا نەرم بوو. دواتر بۆ هەرات گەڕایەوە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەگێڕانەوەی باوکی حیمادی سولەمی هاتووە کەکوڕی خازم زیاتر لەساڵێك لەهەرات مایەوە و دژی ئەوس کوڕی سەعلەبە دەجەنگی.ڕۆژێك بەهاوەڵانی خۆی وت: مانەوەمان لەبەرابەر ئەمان درێژەی کێشا، بانگیان بکەن و پێیان بڵێن: ئەی خەڵکی ڕەبیعە، لەناو خەندەکەکەی خۆتان ماونەتەوە، مەگەر لەهەموو خوراسان بەم خەندەکە بەسەندەتان کردووە؟

دەڵێت: لەم وتەیە تورە بوون و یەکتریان بۆ جەنگ هاندەدا.

ئەوس کوڕی سەعلەبە وتی: لەناو خەندەکەکە بمێننەوە و هاوشێوەی پێشوو

دژی ئەوان بجەنگن.

دەڵێت: گوێیان لەوتەکانی نەگرت و لەخەندەکەکە هاتنەدەر و دوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە. کوڕی خازم بەسوپاکەی خۆی وت: ئەم ڕۆژە بەڕۆژی چارەنووس لەقەڵەم بدەن چوونکە فەرمانڕەوایەتی لەدەستی کەسێکدایە کەسەرکەوتن بەدەست دێنێت. ئەگەر کوژرام، شەماس کوڕی دساری عەتاردی سەرکردەی ئێوەیە، ئەگەر ئەویش کوژرا، بوکەیر کوڕی وەشاحی سەقەفی جێگەی دەگرێتەوە.

ئەیاس کوڕی زوهەیر کوڕی حەییان دەڵێت: ئەو ڕۆژەی ئەوس کوڕی سەعلەبە شکستی خوارد و کوڕی خازم سەرکەوتنی بەسەر خەڵکانی بەکر کوڕی وائیل بەدەستهێنا، لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەی دوو سوپاکە، کوڕی خازم بەهاوەڵانی خۆی وت: لەسەر ئەسپ نامێنمەوە، بەزینەکەوە بمبەستن و دڵنیابن، ئەوەندە قەڵغان و زرێ پێوەیە ئەگەر دوو وشتر بکوژرێت، من ناکوژرێم، ئەگەر هەواڵی کوژرانی منیان بۆ هێنان، باوەڕ مەکەن.

دەڵێت: ئاڵای منداڵەکانی عودەی لەدەستی باوکمدا بوو، خوم لەسەر ئەسپێکی دەستەمۆدا بووم، کوڕی خازم پێی وتبووین: کاتێك لەئەسپەکان نزیکبوونەوە، بەڕم لەکەپۆیان بدەن چوونکە کاتێك ڕم بەر کەپۆی ئەسپ بکەوێت، دەکشێتەوە و سوارەکەی دەخات.

دەڵێت: کاتێك ئەسپەکەم دەنگی بەریەککەوتنی شمشێرەکانی بیست، منی بەرەو دۆڵێك برد کە لەنێوان ئێمە و دوژمن بوو. لەوێ یەکێك لەمنداڵەکانی بەکر کوڕی وائیل هات و بەنووکی ڕمەکەم لەکەپۆی ئەسپەکەیمدا و سوارەکەی کەوتەخوار.

دەڵێت: باوکم لەگەڵ منداڵەکانی عودەی هێرشیبرد. منداڵەکانی تەمیم لەهەموو قۆڵەکانەوە دەهاتن، ماوەیەکیان بەجەنگ بەسەر برد. خەڵکانی بەکر کوڕی وائیل شکستیان خوارد و بۆ خەندەکەکەیان گەڕانەوە و ڕێگەی چەپ و ڕاستیان گرتەبەر. ئەو کەسانەی کەوتنە ناو خەندەکەکە، بەشێوەیەکی دڵتەزێن و قێزەون کوژران. کوڕی خازم سوێندی خوارد تا ئەو کاتەی هەتاو ئاوا دەبێت، هەر

ئەسیرێك بێنن، خوێنی برێژێت.

دوایین ئەسیر یەکێك لەمناڵەکانی رەبیعە بوو بەناوی مەحمەیە. بەکوڕی خازمیان وت: خۆر ئاوا بووە.

دەڵێت: ئەمە دوواهەمین کەس بێت. ئەویان کوشت.

دەڵێت: پیرێك لەمناڵەکانی سەعد کوڕی زەید پێی وتم ئەوس کوڕی سەعلەبە کە لەچەندین شوێنەوە بریندار بووبوو، بەرەو سیستان هەڵات و کاتێك گەیشتە شارەکە، یا لێی نزیکبوویەوە، مرد.

موغەیرە کوڕی حەبنابیکی لەمناڵەکانی ڕەبیعە کوڕی حەنزەلە سەبارەت بەکوژرانی کوڕی مورسەد و بەسەرهاتی ئەوس کوڕی سەعلەبە هۆنراوەیەکی هەیە بەم ناوەرۆکە:

((لەهەموو خوراسان و لەکاتی جەنگ

کوژراو بوون و زیندانی و هەڵاتوو

و ئەو ڕۆژەی کوڕی خازم لەناو چاڵەکە دەوری گرتن

جگە لەخەندەکەکە، گۆڕێکی دیکەتان شك نەبرد

ئەو ڕۆژەی کوڕی مورسەدتان لەناو تەپوتۆز بەجێهێشت

و ئەو ڕۆژەی ئەوستان لەبیر کرد...))

زوهەیر کوڕی هونەید لەباوەگەورێی دایکی دەگێڕێتەوە: لەو ڕۆژەدا لەخەڵکانی بەکر کوڕی وائیل نزیکەی هەشت هەزارکەس کوژرا.

یەکێك لەخەڵکانی خوراسان بەناوی تەمیمی لەیەکێك لەکۆیلەکانی کوڕی خازم دەگێڕێتەوە: کوڕی خازم لەهەرات دژی ئەوس کوڕی سەعلەبە جەنگی و سەرکەوتنی بەدەست هێنا. ئەوس هەڵات و کوڕی خازم دەستی بەسەر هەراتدا گرت و محەممەدی کوڕی وەك کارگوزاری شارەکە دانا و شەماس کوڕی دسای عەتاردی لای ئەو بەجێهێشت. بوکەیر کوڕی وەشاحی وەك سەرکردەی پاسەوانەکانی ئەو دیاریکرد و پێی وتن: پەروەردەی بکەن چوونکە خوشکەزای ئێوەیە. دایکی لەمناڵەکانی سەعد بوو بەناوی سەفییە. بەمحەممەدی وت: دژایەتی ئەوان مەکە. دواتر کوڕی خازم بۆ مەرو گەڕایەوە.

ئـەبو جەعفـەر دەڵێـت: لـەم سـاڵەدا شـیعەکان لەکوفـە کەوتنـە جموجـۆڵ و بەڵێنیانـدا لەسـاڵی شەسـت و پێـنج، بـۆ بەرێکـەوتن بەرەوشـام و تۆڵەسـەندنەوەی خوێنی حسەین لەنەخلیە کۆببنەوە و لەمبارەوە نامەیان بۆ یەك نووسی.

## دەستپێکردنی بزوتنەوەی شیعەکان بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی حسەین

عەبدوڵڵە کوڕی عەوف ئەزدی دەڵێت: کاتێك حسەین کوڕی عەلی کوژرا و کوڕی زیاد لەئوردووگاکەی خۆی لەنەخلیـەوە بۆ کوفە گەڕایـەوە، شیعەکان سـەرکۆنەی یـەکیان دەکـرد و پەشـیمانبوونەوە و هەسـتیان بەهەڵـە گەورەکـەی خۆیـانکرد چوونکە نامـەیان بـۆ حسەین نووسـی بـەڵام هاوکارییـان نـەکرد لەکاتێکدا لـەنزیك خۆیانـەوە کـوژرا. وتیـان ڕیـسوایی و ئـەو گوناحـەی لەکوشـتنی حـسەیندا لەئەسـتۆیاندایە، تـەنیا بەکوشـتنی بکوژەکـانی ئـەو یـا کـوژران لەمڕێگـەدا، پـاك دەبێتەوە.

دەڵێت: لەکوفە ڕۆشتنە لای پێنج کەس لەسەرکردەی شیعەکان: سـەلمان کوڕی سـەردی خـوزاعی کـەهاودەمی پێغەمبـەر (د.خ) بـوو، موسـەییب کـوڕی نەجبـەی فـەزاری کە لـەهاوەڵانی عـەلی و چاکەخوازانی بنەماڵـەی عـەلی کوڕی ئـەبی تالیب بـوو و عوبەیدالڵـە کـوڕی سـەعد ئـەزدی و عەبدوڵڵـە کـوڕی والـی تیمـی و ڕەفاعـە کوڕی شەدادی بوجلی.

دواتر ئەم پێنج کەسە کە لەباشترین هـاوەڵانی عـەلی کـوڕی ئـەبی تالیب بـوون، لەماڵی سلێمان کوڕی سـەرد کۆببوونـەوە. کەسـانێك لەچاکخوازان و سـەرکردەکانی شیعەیش ئامادە بوون.

دەڵێـت: کاتێـك لـەماڵی سـلێمان کۆببوونـەوە، موسـەییب کـوڕی نەجبـە، پـێش هەمووان دەستی بەقسە کرد، سپاسی خواوەندی کـرد و نـاوی پێغەمبـەری هێنایـە سەرزمان و وتی:

(( بـەڵام دواتـر، ئێمـە تەمـەنمان درێـژ بۆتـەوە و ڕووبـەڕووی چـەندین فیتنـە و ئاژاوەی جۆراوجۆر بووینەتەوە، داوا لەپەروەردگار دەکەین لەڕیزی ئـەو کەسـانەدا نەبین کەبەیانی پێمان دەڵێت: مەگـەر ئەوەنـدە تەمـەنمان پێنەبەخشیت کـەبۆ وانـە

وەرگـرتن بەسـەندە بـوو، تـا لـەو ماوەیـەدا وانـە وەربگـرن و کەسـێکمان وەك وشیارکەرەوەی ئێوە نارد.

سـەروەری بـاوەڕداران فەرموویـەتی: ئەنـدازەی ئـەو تەمەنـەی خواوەنـد تیایـدا هەموو بەڵگـەکانی خـۆی نیـشانی منالـەکانی ئـادەم دەدات شەسـت ساڵە. لـەناو ئێمـەدا کەسـێك نییـە تەمـەنی لـەوە کـەمتر بێـت، ئێمـە خوازیـاری وەسـف کردنـی خۆمان و هاورێکانمان بووین، تا ئەوەی خواوەند چاکەکارانی ئێمەی ئـەزمون کـرد و لـەدوو بابـەت ئێمـەی بـەدرۆزن بینی. سـەبارەت بـەکوڕی کـچی پێغەمبـەر (د.خ) کەپێشتر نامەکانی ئێمەی بەدەست گەیشتبوو و نێردراوەکانی هاتبوون و هەموو شـتێکی پێڕاگەیانـدبووین و لەسـەرەتا وکۆتـایی، بەئاشـکرا و نهـێنی خوازیـاری هاوکاری کردنـی ئێمـە بـوو، بـەڵام ئێمـە گیـانی خۆمـان لـەو درێـغ کـرد تـا ئـەوەی سەرئەنجام لـەنزیك ئێمـە کوژرا، نەبەدەسـتی خۆمـان هاوکاریمـان کـرد، نـە بـەزمان بـەرگریمان لێکـرد، نـە بەسـامان شـۆڕشـەکەیمان پـشتڕاست کـردەوە و نـە داوامـان لەعەشیرەکانمان کرد هاوکاری بکەن، لەپێشگای پەروەردگار چ پاساوێکمان هەیـە کەمندالْ و خۆشەویستەکەی و پاشماوەی بنەماڵەکەی لەناو ئێمەدا کوژرا. سـوێند بەخوا هـیچ پاسـاوێکمان نییـە مەگـەر ئـەوەی بکوژەکـانی بکـوژین یـا لـەم ڕێگـەدا خۆتـان بکـوژرێن تـا بەهۆیـەوە پـەروەردگار لەئێمـە ڕازی بێـت چوونکە مـن کاتێـك دەڕۆمە پێشگای خواوەند، لەئازابەکانی ئەو لەئەماندا نیم.))

دواتـر وتـی:ئـەی خەڵکینـە، کەسـێك وەك سـەرکردەی خۆتـان هەڵبـژێرن تـا فـەرمانڕەوای ئێـوە بێـت و ئاڵایـەك کـە لـەدەوری کۆببنـەوە، ئـەم وتەیـە دەڵـێم و لەخواوەند، داوای بەخشینی خۆم و ئێوە دەکەم.

دەڵێت: دوای موسەییب، ڕەفاعە کوڕی شەداد قسەی کرد، سپاسـی خواوەنـدی کرد و وتی:

(( بەڵام دواتر، خواوەند بۆ ڕێگەی ڕاست ڕێنوێنی کردیت کەڕێگەی راسـتت نیـشانی ئێمـەدا، وەسـفی پـەروەدگار و پێغەمبـەرت کـرد و پێـشنیاری جـەنگی ڕیاکارانت پێکردین و لەو گوناحە گەورە تۆبەت کرد. وتەکانت بیستراوە و شیاوی ڕازی بوون و پەسـەند بوون. کەسێك وەك سەرکردەی خۆتـان هەڵبژێرن تا پشتی

پێببەستن و لەدەوری ئالآکەی کۆببنەوە، بۆچوونی ئێمەیش هاوشێوەی بۆچوونی تۆیە، ئەگەر ئەو کەسە تۆ بێت، لەلایەن ئێمەوە پشتیوانی دەکرێت چوونکە کەسێکی چاکەکار و خۆشەویستی هەمووانیت. ئەگەر بۆچوونی تۆ و هاوەڵانت کۆك بێت، ئەم کارە بەپیری شیعە و هاوەڵی پێغەمبەر (د.خ)، سلێمان کوڕی سەرد دەسپێرین چوونکە کەسێکی بوێر و خواپەرەست و دوورئەندێشە. ئەم وتەیە دەڵێم و لەپەروەردگار داوای بەخشینی خۆم و ئێوە دەکەم.)).

دەڵێت: عەبدوڵلە کوڕی والٙ و عەبدوڵلە کوڕی سەعد قسەیان کرد، سپاسی خواوەندیان کرد و هاوشێوەی ڕەفاعە کوڕی شەداد دووان، باسی گەورەیی و چاکەکاری موسەییب کوڕی نەجبەیان کرد و ئاماژەیان بەسلێمان کوڕی سەردد‌ا و ڕەزامەندی خۆیان لەسەرکردایەتی ئەو نیشاندا.

دەڵێت: موسەیب کوڕی نەجبە وتی: ڕاست دەڵێت و هیوای سەرکەوتنتان بۆ دەخوازم، بۆچوونی منیش هاوشێوەی ئێوەیە. کاروباری خۆتان بەسلێمان کوڕی سەرد بسپێرن.

باوکی میحنەف دەڵێت: ئەم حەدیسەم بۆ سلێمان کوڕی باوکی ڕاشد گێڕایەوە، وتی: لەحەمید کوڕی موسلیم بیست، دەیوت: سوێند بەخوا ئەو ڕۆژە لەویٙ بووم، ئەو ڕۆژەی سلێمان کوڕی سەردیان کردە سەرکردە، ئەو ڕۆژە زیاتر لەسەد کەس لەشاسواران و سەرکردەکانی شیعە لەماڵەکەی ئەودا بووین.

بێژەر دەڵێت: سلێمان کوڕی سەرد کەوتە قسە و بەردەوام هەموو هەینییەك، وتەکانی خۆی دووبارە دەکردەوە، دەیوت:

(بۆ ئەو نیعمەتانەی پێی بەخشیوین، سپاسی خواوەند دەکەین وشایەتی دەدەم خوایەك جگە لەخواوەندی تاقانە بوونی نییە و محەممەد نێردراوی ئەوە. بەڵام دواتر، سوێند بەخوا دەترسم لەم ڕۆژگارە کەبژێوی ژیان سەختە و بەڵای گەورە و ستەمێکی گشتگیر بەرۆکی گرتووین، ئەنجامی ئێمەی شیعە، خوازراو نەبێت. ئێمە چاوەڕوانی هاتنی بنەماڵەی پێغەمبەر (د.خ) بووین و بەڵێنی هاوکاریمان پێدان وبۆ هاتن، هانماندان، کاتێك هاتن، سستیمان لەخۆمان نیشاندا و ناتەوان بووین و هاوشێوەی کەسانی دووڕوو دەرکەوتین و چاوەڕوان بووین تا

دەرئەنجامی ڕووداوەکان ببینین تا ئەوەی سەرئەنجام منالّی پێغەمبەر (د.خ) و پاشماوەی بنەماڵەکەی لەتەنیشت ئێمە کوژرا، هاوکاری دەویست و دەستی نەکەوت، دادپەروەری دەویست و پێی نەگەیشت. ڕیاکاران ئەویان کردە ئاماجی ڕەمکانیان و کوشتیان، هێرشیانکردە سەر و جلەکانیان دڕاند و بردیان، ڕاپەڕن، سوێند بەخوا، خواوەند تووڕەیە، بۆ لای ژن و منالّی خۆتان مەگەڕێنەوە تا ڕەزامەندی خواوەند بەدەست دێنن، یا بکوژەکانی حسەین دەکوژن یا لەم ڕێگەدا لەناو دەچن. لەمەرگ مەترسن چوونکە هەرکەس لەمەرگ ترسا بێت، ڕیسوا بووە، هاوشێوەی باپیرانی منالّەکانی ئیسرائیل مەبن کەپێغەمبەرەکەیان پێی وتن:

ئەی خەڵکینە، ئێوە بەپەرەستنی گوێرەکە، ستەمتان لەخۆتان کرد، بۆ لای ئافرێنەری خۆتان بگەڕێنەوە و یەکتر بکوژن چوونکە ئەمە ڕەزامەندی پەروەردگاری لێدەکەوێتەوە.

ئەوان چییان کرد؟ کەوتنە سەرچۆك و گەردنیان بردە پێش و بەقەزای خوا ڕازی بوون تا ئەو کاتەی دڵنیابوون خواوەند جگە لە ڕازیبوون بەکوژران، لەگوناحی گەورە، ڕزگاریان ناکات. ئەگەر داوایەکی هاوشێوەی ئەو نەتەوەتان پێشکەش بکەن، چی دەکەن.؟ شمشێرەکانتان تیژ بکەن، ڕمەکان ئامادە بکەن و تا ئەو جێگەی دەتوانن، هێز و ئەسپ کۆبکەنەوە و چاوەڕوانی فەرمان بن)).

دەڵێت: خالید کوڕی سەعد کوڕی نوفەیل هەستا و وتی:

((سوێند بەخوا ئەگەر دەمزانی بەکوشتنی خۆم لەگوناح پاك دەبمەوە و پەروەردگار لێم ڕازی دەبێت، خۆم دەکوشت بەلاّم خەڵکانی پێش ئێمە، بۆ ئەم کارە ڕاسپێردراون و ڕێگەی ئەو کارەیان لەئێمە گرتووە، خواوەند و موسوڵمانە ئامادەبووان بەشایەت دەگرم کەهەرچیم هەیە جگە لەو شمشێرەی دژی دوژمنان پێی دەجەنگم، تایبەتە بەموسوڵمانان تا بەهۆیەوە لەجەنگی دژ بەدوژمنان و ستەمکاران بەهێز بن))

باوکی موعتەمەر، حەنس کوڕی ڕەبیعەی کەنانی هەستا و وتی: منیش بەمشێوەیە پەروەردگار و ئێوە دەکەمە شایەت.

سلێمان کوڕی سەرد وتی: هەرکەس ئەم مەبەستەی هەیە، سامانەکەی خۆی

بێنێتە لای عەبدوڵڵە کوڕی واڵی تیمی و ئەوەی لەسامانی خۆتان دەتانەوێت ببەخشن، لای ئەو کۆیبکەنەوە تا هاوەڵە نەدار و هەژارەکانی ئێوەی پێبەهێز بکەن.

حەمید کوڕی موسلیمی ئەزدی دەڵێت: کاتێك خالید کوڕی سەعد وتی: ئەگەر دەمزانی بەکوشتنی خۆم، لەگوناح پاك دەبمەوە و پەروەردگار لێم ڕازی دەبوو، خۆم دەکوشت، سلێمان کوڕی سەرد پێی وت: بەڵام ئەو خەڵکەی پێش ئێمە بوون، بۆ ئەو کارە ڕاسپێردران و ئەو کارەیان لەئێمە یاساغ کردووە. ئەو وتی: ئەم برایەتان سبەی دەبێتە پارووی یەکەم ڕم.

دەڵێت: کاتێك سامانەکەی پێشکەش بەموسوڵمانان کرد، پێی وت: مژدەی ئەو پاداشتەت پێدەدەم کەخواوەند بەبەندە چاکەکارەکانی بەخشیوە.

حەسین کوڕی یەزید دەڵێت: ئەو نامەی سلێمان کوڕی سەرد لەکاتی ڕازیبوون بەسەرکردایەتی شیعەکان بۆ کوڕی حوزەیفە کوڕی یەمانی نووسیبوو، لەمەداین بەدەستم هێنا و خوێندمەوە. کاتێك خوێندمەوە، سەرسوڕما، لەبەرم کرد و هیچکات فەرامۆشم نەکرد، نووسیبووی:

(بەناوی خواوەندی بەخشندە و میهرەبان

لەسلێمان کوڕی سەرد بۆ سەعد کوڕی حوزەیفە و موسڵمانەکانی هاوڕێی، سڵاو لەئێوە، بەڵام دواتر، جیهانماڵێکە چاکییەکانی ڕۆشتووەو خراپییەکانی ماوەتەوە، لەگەڵ بیرمەندان ناسازگارە و بەندە چاکەکارەکانی خواوەند مەبەستی کۆچیان کردووە و پاشماوەی کەمی دنیایان بەمەبەستی بەدەستهێنانی پاداشتی ئەو دنیا، فرۆشتووە، هاوڕێیانی خواوەند، براکانی ئێوە، شیعەکانی بنەماڵەی پێغەمبەر (د.خ)، لەچارەنووسی خۆیان و ئەو بەڵایەی بەسەر کوڕی کچی پێغەمبەر (د.خ) هات، تێڕامان چوونکە بانگیان کرد و وەڵامی دانەوە و داوای هاوکاری لێکردین بەڵام وەڵامی نەبیست. ویستی بگەڕێتەوە، بەڵام ڕێگەیان لێگرت، داوای ئەمانی کرد پێی نەبەخشرا، دەستی لەخەڵکان هەڵگرت بەڵام دەستیان لێهەڵنەگرت و هێرشیانکردە سەر و خوێنیان ڕشت، جلوبەرگەکانیان هەڵگرت و ڕووتیان کردەوە و بەهەموو شێوەیەك ستەم و دەستدرێژییان

کردەسەر. خواوەند بینەر و زانەری هەموو کردەوەکانە و سەرئەنجامی هەمووان، گەڕانەوە بۆ بارەگای ئەوە (( بەزووترین کات ئەو کەسانەی ستەمیان کردووە دەزانن بۆ کوێ دەگەڕێنەوە.[١٠]

براکانتان ئەندێشەیان کرد و لەسەرئەنجامی ئەم کارە تێڕامان و بۆیان دەرکەوت هەڵەیەکی گەورەیان کردووە و پشتیوانی ئیمامی خۆیان نەکردووە و لەبەرابەر دوژمندا بەتەنیا جێیان هێشتووە، هەڵەیەك کەڕزگار بوون و تۆبە لێی، تەنیا بەکوشتنی بکوژەکانی یا کوژران لەم ڕێگەیەدا پاك دەبێتەوە. براکانتان هەوڵیانداوە، ئێوەیش هەوڵ بدەن و خۆتان ئامادە بکەن. بۆ براکانمان کاتێکمان دیاریکردووە تا بێن و پەیوەستمان بن، کات، سەرەتای مانگی ڕەبیع الاوەلی ساڵی شەست و پێنجەم و شوێن، نەخلییە. دەزانین ئێوە هەمیشە هاودڵ و هاوەڵی ئێمە بوون و پێشنیاری ئەم کارەتان پێدەکەین کەخواوەند وەك چارەنووسی براکانتان دیاریکردووە و دەیانەوێت بەهۆیەوە، تۆبە بکەن چوونکە ئێوە شیاون بەدوای پاداشتتدا بگەڕێن و تۆبە بۆ پێشگای خواوەند بەرز بکەنەوە هەرچەند لەم ڕێگەدا کوشتنی خۆتان و لەدەستدانی سامانی خۆتان و هۆزەکەتانی تیا بێت. ئەو کەسانەی لەمەرج عوزرا کوژران —حوجر و هاوڕێکانی— لەوەی هەنووکە زیندوونین، زیانیان نەکردووە و شەهیدن و لای پەروەردگار، ڕۆژی دەخۆن و خواوەند پاداشتی کەسانی خۆڕاگری پێبەخشیون، هاوڕێکانتان کە بەدەست بەستراوی کوژران و بەستەم هەڵواسران و ئەندامەکانیان بڕا و ستەمیان لێکرا، زیانیان لێنەکەوت چوونکە زیندوون نین و گیرۆدەی گوناحەکەی ئێوە نین، خواوەند ڕێگەی بۆ هەڵبژاردن و گەڕانەوە بۆ پێشگای پەروەردگار و هیوادارین خواوەند پاداشتییان بداتەوە. خواوەند بتانبەخشێت، لەسەختی و جەنگ خۆڕاگری بکەن و هەرچی زووتر تۆبە بۆ بارەگای پەروەردگار بەرز بکەنەوە چوونکە شیاون، هەرکەس لەهاوڕێکانتان بەمەبەستی بەدەستهێنانی پاداشتی خواوەند، خۆڕاگری کردووە، ئێوەیش هاوشێوەی ئەوان خۆڕاگری بکەنە پیشە و هەرکەس بەکردەوەیەك خوازیاری بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خواوەند بووە،

---

[١٠] - سورەی شعراء، دووا ئایە.

تەنانەت ئەگەر بەکوژرانیش بێت، ئێوەیش بەهەمان شێوە خوازیاری بەدەستهێنانی ڕەزامەندی پەروەردگار بن. خۆپارێزی باشترین توێشووی ئەم جیهانەیە و هەموو شتێك جگە لەوە، لەناو دەچێت و دەبێت چاوپۆشی لێبکرێت. خوازیاری بەخشین بن و جەنگ لەگەڵ دوژمنی خوا و دوژمنی خۆتان و دوژمنی بنەماڵەی پێغەمبەر (د.خ)، تا بەتۆبەوە بۆ پێشگای خواوەند بگەڕێنەوە. خواوەند ژیانێکی سەرفرازمان پێببەخشێت و ئێمە و ئێوە لەجەهەننەم ڕزگار بکات، مەرگتان کوژران بێت بەدەستی ئەو کەسانەی خواوەند، زیاتر لەهەموو بوونەوەرەکان لێیان بێزارە و زیاتر لەهەمووان، دوژمنی پەروەردگارن، چوونکە هەرچی بخوازێت، دەتوانێت و بۆ هاورێکانی خۆی، کارئاسانی دەکات و سلاو لەئێوە بێت)).

دەڵێت: کوڕی سەرد ئەم نامەی نووسی و بە عەبدوڵڵە کوڕی مالیکی تایی بۆ سەعد کوڕی حوزەیفەی نارد. سەعد، نامەکەی بۆ شیعەکانی مەداین خوێندەوە. دەستەیەك لەخەڵکانی کوفە بوون کەمەداینیان هەڵبژاردبوو و بۆ وەرگرتنی مانگانە، دەهاتنەوە بۆ کوفە و ماف خۆیان وەردەگرت و دەگەڕانەوە بۆ شوێنی نیشتەجێبوونی خۆیان. سەعد، نامەکەی سلێمانی بۆ خوێندەوە، دواتر ناوی خواوەندی هێنایە سەرزمان، وتی:

بەلأم دواتر، ئێوە هاودەنگ و مەبەستی هاوکاریکردنی حسەین و جەنگ دژی دوژمنانی ئەوتان لاسەردابوو، بەلأم بەشێوەیەکی لەناکاو لەکوژرانی ئەو ئاگادار بوونەوە، هەنووکە براکانتان کەسیان ناردووە و داوای هاوکاریتان لێدەکەن و پێشنیاری گەڕانەوە بۆ لای ڕاستی و بەدەستهێنانی پاداشتی پەروەردگارتان پێدەکەن، بۆچوونی ئێوە چییە و چی دەڵێن؟

هەمووان پێکەوە وتیان: وەلأمیان دەدەینەوە و شانبەشانی ئەوان دژی دوژمن دەجەنگین و بۆچوونی ئێمە هاوشێوەی ئەوانە.

عەبدوڵڵە کوڕی خەنزەلی تایی حەزمەری هەستا، سپاسی خواوەندی کرد و وتی: بەلأم دواتر، ئێمە بەپێشنیاری براکانی خۆمان ڕازی دەبین و بۆچوونی ئێمە هاوشێوەی ئەوانە، من لەگەڵ سوارەکان بۆ لای ئەوان بنێرە.

سەعد وتی: ئارام بگرە و پەلە مەکە، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن خۆتان ئامادە بکەن، کەرەستەی جەنگ کۆبکەنەوە، دواتر بەڕێدەکەوین.

دەڵێت: سەعد کوڕی حوزەیفە، بە عەبدوڵڵە کوڕی مالیکی تایی، نامەیەکی بۆ سلێمان کوڕی سەرد نارد:

(( بەناوی خواوەندی بەخشندەی میهرەبان

بۆ سلێمان کوڕی سەرد

لەسەعد کوڕی حوزەیفە و موسوڵمانانی هاوڕێی

بەڵام دواتر، نامەکەی تۆمان خوێندەوە و زانیمان پێشنیاری کارێکت پێکردووین کەخۆت و هاوڕێکانت لەسەری ڕێککەوتوون. بەڕاستی ڕێگەی ڕاستت دۆزیوەتەوە و ڕێنوێنی کراویت، ئێمەیش هەوڵ دەدەین و خۆمان ئامادە دەکەین، زین و جڵو ساز دەکەین و چاوەڕوانی فەرمان دەبین، ملکەچ و گوێڕایەڵین و کاتێک فەرمان بێت، بەڕێدەکەوین، لەڕێدەرناچین بەخواستی خواوەند)).

دەڵێت: کاتێک سلێمان کوڕی سەرد نامەکەی خوێندەوە، بۆ هاوەڵانیشی خوێندەوە و هەموویان شادومان بوون.

دەڵێت: سلێمان نوسخەیەك لەو نامەی بۆ سەعد کوڕی حوزەیفەی نووسیبوو، بۆ موسەنا کوڕی مەخرەبەی عەبدی نووسی و بەزەبیان کوڕی عەمارەی تەمیمی سەعدی بۆ نارد: نووسی:

(( نامەکەم خوێندەوە و هاوڕێکانیشت خوێندیانەوە و بۆچوونەکەی تۆیان پەسەند کرد و وەڵامی داوا و پێشنیارەکەی تۆیان دایەوە. بەخواستی خوا، لەو کات و شوێنەی دیاریت کردووە، لای تۆ دەبین و سڵاو لەتۆ)).

عەبدوڵڵە کوڕی سەعد کوڕی نوفەیل دەڵێت: سەرەتای دەستپێکی شۆڕشەکەیان ساڵی شەست و یەکی کۆچی بوو کەتیایدا حسەین کوڕی عەلی کوژرا، بەردەوام سەرقاڵی ئامادە کردنی کەرەستەی جەنگ و خۆ ئامادە کردن بووین و بەنهێنی شیعەکانیان بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی حسەین هاندەدا و دەستە دەستە، وەڵامی بانگەوازەکەیان دەدانەوە تا ئەو کاتەی یەزید کوڕی معاویە لەڕۆژی پێنجشەممە، دوای تێپەڕینی چواردە ڕۆژ لەمانگی ڕەبیع الاوەلی

ساڵی شەست و چوارەمی کۆچی، مرد.

لەکوژرانی حسەین کوڕی عەلی تا مردنی یەزید کوڕی معاویە، سێ ساڵ و دوو مانگ و چوار ڕۆژ تێپەڕیبوو. کاتێک یەزید مرد، فەرمانڕەوای عێراق، عوبەیداللە کوڕی زیاد بوو. خۆی لەبەسرە و جێگرەکەی لەکوفە، عەمرۆ کوڕی حورەیسی مەخزومی بوو. هاوەڵانی سلێمان و شیعەکان ڕۆشتنە لای و وتیان: ئەم ستەمکارە مردووە و دەسەڵاتیان لاواز بووە، ئەگەر دەخوازێت، ئێستا هێرشدەکەینە سەر عەمرۆ کوڕی حورەیس و لەکۆشکی فەرمانڕەوایەتی دەریدەپەڕێنین و مەبەستی خۆمان بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی حسەین ئاشکرا دەکەین و شوێن بکوژەکانی دەکەوین و بەردەوام خەڵکان بۆ وەرگرتنەوەی ماق ئەم بنەماڵە ستەملێکراوە، بانگێشت دەکەین.

دەڵێت: لەمبارەوە گفتوگۆیان کرد، بەڵام سلێمان کوڕی سەرد پێی وتن: ئارام بگرن و پەلە مەکەن، سەیری بارودۆخم کردووە و دەزانم بکوژەکانی حسەین، گەورەکانی کوفە و شاسوارەکانی عەرەبن و دەبێت داوای خوێنی حسەین لەوان بکەین، ئەگەر لەمەبەستەکەی ئێوە ئاگادار ببنەوە و بزانن بەدوای ئەواندا دەگەڕێن، خۆیان بۆ ڕووبەڕووبوونەوە ئامادە دەکەن. ژمارەی شوێنکەوتەکانی خۆمان دەزانم و دڵنیام ئەگەر شۆڕش بکەین، ناتوانین تۆڵەی خۆمان بسێنینەوە و دوژمنەکەی خۆمان سەرکوت بکەین و دەبینە پارووی ئەوان. لەجیاتی ئەو کارە، نێردراوانی خۆتان بۆ شارەکان ڕەوانە بکەن تا شیعە و خەڵکانی دیکە بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی حسەین هان بدەن. هیوادارم ئێستا کەئەو ستەمکارە مردووە، خەڵکان بێ ترس و زیاتر لەجاران، وەڵامی داواکەی ئێمە بدەنەوە.

دەڵێت: ئەو کارەیان کرد و دەستەیەک لەوان سەرقاڵی بانگێشتکردن و هاندانی خەڵکان بوون و ژمارەیەکی زۆر وەڵامیان دانەوە. ژمارەی ئەو کەسانەی دوای مردنی یەزید وەڵامی داواکەیان دایەوە، چەند بەرابەری ئەو کەسانە بوو پێش مردنی یەزید، ئامادەیی خۆیان نیشاندابوو.

حەسین کوڕی یەزید لەیەکێك لەخەڵکانی موزەینە دەگێڕێتەوە: لەناو ئەم ئۆمەتە هیچکەسم زمانپاراوتر لە عوبەیداللە کوڕی عەبدوڵڵە موری نەبینیوە. ئەو

لەڕۆژگاری سلێمان کوڕی سەرد، یەکێك بوو لەو کەسانەی خەڵکی هاندەدا و قسەی بۆ خەڵك دەکرد، کاتێك خەڵك لەدەوری کۆدەبوونەوە، سپاسی خواوەندی دەکرد و دەیوت: بەڵام دواتر: خواوەند، محەممەدی وەك پێغەمبەر (د.خ) هەڵبژارد و هەموو چاکییەکانی تایبەت کرد بەو و پێگەی ئێوەی بەشوێنکەوتنی ئەو، بەرز کردەوە و بەئیمان، بەڕێزی کردن. خوێنەکانی ئێوەی پاراست و ڕێگە نائەمنەکانی، ئەمن کرد، لەسەر تەپۆڵکەیەکی ئاگر بوون و ئێوەی ڕزگار کرد. بەمشێوەیە خواوەند ئایە و نیشانەکانی بۆ ئێوە باس دەکات، تا ڕێنوێنی بکرێن.

مەگەر پەروەردگار، لەنێوان خەڵکانی کۆن و ئەوانەی لەداهاتوودا دێن، کەسێك بەگەورەتر لە پێغەمبەر (د.خ) دەزانێت؟ مەگەر پاشماوە و بنەماڵەی هیچکام لەپیغەمبەران، زیاتر لەپاشماوەی ئەم پێغەمبەرە، ماف بەسەر ئۆمەتەکەیەوە هەیە؟ نا، سوێند بەخوا نەبووە و نابێت. ئەی چاکەکاران، مەگەر ئەو جەنایەتی بەرامبەر بەکوڕی کچی پێغەمبەر (د.خ) کردتان، نەتانبینیوە و نەتانبیستووە؟ مەگەر نەتانبینی ئەم خەڵکە ڕێزیان شکاند، بێ پەنا، گرتیان و کوشتیان، لەخوا بێ ئاگا بوون و ڕێزیان لەمافی خزمایەتی پێغەمبەر (د.خ) نەگرت، ئەویان کردە ئاماجی تیرەکان و تەنیا وتارەکان بەجێمان. سوێند بەخوا، چاو، هاوشێوەی ئەوی نەبینیوە، چەندە جوامێر و ڕێزدار بوو حسەین کوڕی عەلی کەخیانەتیان لێکرد، ڕاستکردار، خۆڕاگر، جوامێر، کارزان، داوێنپاك و کوڕی یەکەم کەسە کەباوەڕی بەئیسلام هێنا و کچەزای دوواهەمین پێغەمبەری خواوەند. بەرگریکارانی کەم بوون و دژمنەکانی فراوان، دوژمن ئەوی کوشت و دۆست، لەهاوکاریکردنی درێغی کرد، هاوار لەبکوژەکە و شەرم بۆ هاوڕێی بێ ئاگا. خواوەند هیچ پاساوێکی بۆ بکوژەکەی نییە و هاوڕێی بێ ئاگا لای پەروەردگار بێ بەڵگەیە مەگەر ئەوەی تۆبە بۆ پێشگای خواوەند بەرز بکاتەوە و دژی بکوژەکانی بجەنگێت و دژایەتی ستەمکاران بکات، بەمشێوەیە ئەگەری هەیە ئافرێنەر لەگوناحەکەی خۆش ببێت و بەتۆبەکەی ڕازی بێت. ئێمە پێشنیاری گەڕانەوە بۆ کتێبی خواوەند و سوونەتەکانی پێغەمبەر (د.خ) و جیهاد و جەنگ دژی ستەمکاران بانگێشت دەکەین، ئەگەر کوژراین، ئەوەی لای خواوەندە، بۆ چاکەکاران باشترە و ئەگەر

سەرکەوتن بەدەست بێنین، خەلافەت بۆ بنەماڵەی پێغەمبەر (د.خ) دەگێڕینەوە.

دەڵێت: هەموو ڕۆژێك ئەم وتانەی بۆ ئێمە دووبارە دەکردەوە تا ئەو جێگەی زۆرینەمان وتەکانی ئەومان لەبەر کردبوو.

دەڵێت: لەکاتی مردنی یەزید کوڕی معاویە، خەڵك هێرشیان کردە سەر عەمرۆ کوڕی حورەیس و لەکۆشك دەریانپەڕاند و عامر کوڕی مەسعودی جومەحییان وەك فەرمانڕەوا هەڵبژارد. شاعیر ئەوی بە(تەرسەقولی خڕ) ناو بردبوو چوونکە کەسێکی کورتەبالاّ بوو، زەیدی کۆیلەی، خەزێنەداری بوو، عەمرۆ، پێشنوێژی دەکرد و بەیعەتی بۆ کوڕی زوبەیر وەرگرتبوو. هاوەلاّنی سلێمان کوڕی سەرد، بەهەمانشێوە لەهاندانی شیعەکان و خەڵکانی دیکە بەردەوام بوون تا ئەوەی شوێنکەوتەکانیان فراوان بوو و دوای مەرگی یەزید کوڕی معاویە،، خەڵکان ئاسانتر لەپێشوو، لەدەوریان کۆدەبوونەوە.

دەڵێت: دوای تێپەڕینی شەش مانگ لەمردنی یەزید، لەڕۆژی هەینی، نیوەی مانگی ڕەمەزان، موختار کوڕی باوکی عوبەیدە هاتە کوفە.

دەڵێت: عەبدوللە کوڕی یەزیدی ئەنساری بەنوێنەرایەتی کوڕی زوبەیر وەك فەرمانڕەوای کوفە دەهات کەلێپرسراوی جەنگ و سنوورەکان بوو. ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی تەڵحە بەنوێنەرایەتی کوڕی زوبەیر لەگەڵ ئەو هاتبوو و کۆکردنەوەی خەراجیان پێسپارد، عەبدوللە کوڕی یەزید لەڕۆژی هەینی، هەشت ڕۆژ بۆ کۆتایی مانگی ڕەمەزانی ساڵی شەست و چوارەم، گەیشتە کوفە.

دەڵێت: موختار هەشت ڕۆژ پێش عەبدوللە کوڕی یەزید و ئیبراهیم کوڕی محەممەد گەیشتە شارەکە و کاتێك هاتە ناو شارەکە، سەرکردەکان و گەورەکانی کوفە، لەدەوری سلێمان کوڕی سەرد کۆبووبوونەوە. موختاریان بەهاوشانی ئەو نەدەزانی. کاتێك موختار داوای لەخەڵکانکرد لەدەوری کۆببنەوە بۆ ئەوەی بتوانێت تۆڵەی خوێنی حسەین بکاتەوە، پێیان وت: سلێمان کوڕی سەرد، پیری شیعەیە و خەڵکان لەدەوری کۆبوونەتەوە.

بەلاّم موختار بەشیعەکانی وت: من لەلای مەهدی، محەممەد کوڕی حەنیفە، کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب هاتووم کەبڕوپێکراو و هەڵبژێردراو و وەزیری

ئەوم. سوێند بەخوا ئەوەندە وتەکانی دووبارە کردەوە، کەدەستەیەك لەدەوری کۆبوونەوە و ڕێزیان گرت و بەوتەکانی ڕازی بوون و چاوەڕوانی ئەنجامی کارەکانیان دەکرد بەڵام زۆرینەی شیعەکان شوێنکەوتەی سلێمان کوڕی سەرد بوون و سلێمان بۆ موختار، دوژمنترینی خەڵکان بوو. موختار بەهاوەڵانی خۆی دەوت: دەزانن ئەم پیاوە- سلێمان کوڕی سەرد- چی دەوێت؟ تەنیا دەیەوێت شۆڕش بکات و خۆی بەکوشتن بدات چوونکە خاوەن ئەزموونی جەنگ نییە.

دەڵێت: یەزید کوڕی حارسی شەیبانی ڕۆشتە لای عەبدوڵڵە کوڕی یەزیدی ئەنساری و وتی: خەڵك دەڵێن شیعەکان بەسەرکردایەتی کوڕی سەرد دژی تۆ شۆڕش دەکەن، دەستەیەك لەوان شوێنکەوتەی موختارن بەڵام ژمارەیان کەمە. وەك خەڵکانی باسی دەکەن موختار نایەوێت شۆڕش بکات و چاوەڕوانی ئەنجامی شۆڕشەکەی سلێمانە چوونکە بەنیازە لەچەند ڕۆژی داهاتوودا شۆڕشەکەی دەست پێبکات. ئەگەر دەخوازیت پاسەوانەکان و جەنگاوەران و سەرکردەکان کۆبکەیتەوە و هێرشیان بکەیتەسەر، ئێمەیش لەگەڵ تۆ دەبین، کاتێك هێرشت کردە سەر ماڵەکەی، بانگی بکە. ئەگەر هات، بەسە و ئەگەر جەنگی، جەنگ دەستپێبکە چوونکە تۆ ئامادەیت و هاوەڵانی ئەو بێ ئاگا. دەترسم ئەگەر ئەو دەستپێبکات و ڕێگەی شۆڕشی پێبدەیت، هێزی فراوان و پێگەی بەرز ببێتەوە.

عەبدوڵڵە کوڕی یەزید پێی وت: خواوەند لەنێوان ئێمە و ئەوانە، ئەگەر بۆ جەنگی ئێمە بێن، ڕووبەڕوویان دەبینەوە، ئەگەر کاریان بەئێمە نەبێت، کارمان پێیان نییە. ئەم کەسانە چییان دەوێت؟

وتی: ئەم کەسانە دەڵێن دەیانەوێت تۆڵەی خوێنی حسەین کوڕی عەلی بکەنەوە.

وتی: مەگەر من حسەین کوڕی عەلیم کوشتووە؟ خوا بکوژەکەی نفرین بکات.،

دەڵێت: سلێمان کوڕی سەرد و هاوەڵانی دەیانویست لەکوفە شۆڕش بکەن، عەبدوڵڵە کوڕی یەزید هات و ڕۆشتە سەر مینبەر، سپاسی خواوەندی کرد و وتی:

بەڵام دواتر: بیستوومە دەستەیەك لەخەڵکی ئەم شارە دەیانەوێت دژی ئێمە شۆڕش بکەن. پرسیم مەبەستیان لەم کارە چییە؟ وتیان: بەگومانی خۆیان

دەیانەوێت تۆڵەی خوێنی حسەین وەربگرن. خواوەند ئەو دەستەیە ببەخشێت، شوێن و جێگەیان دەزانم و پێیان وتم بیانگرم، وتیان پێش ئەوەی شۆڕش دەستپێبکەن، من دەستپێبکەم، بەڵام ڕازی نەبووم و وتم: ئەگەر بۆ جەنگی من بێن، ڕووبەڕوویان دەبمەوە، ئەگەر من فەرامۆش بکەن، فەرامۆشیان دەکەم، بۆ دەبێت دژی من بجەنگن؟ سوێند بەخوا من حسەینم نەکوشتووە و دژی ئەو نەجەنگاوم و لەکوژرانی ئەو خەمبار بووم. ئەم دەستەیە لەئەماندان، خۆیان ئاشکرا بکەن و هێرش بکەنە سەر بکوژەکانی حسەین. من دژی بکوژەکانی حسەین، پشتیوانییان لێدەکەم، هەنووکە کوڕی زیاد و بکوژەکانی حسەین و گەورەکانی ئێوە، بۆ لای ئێوە بەڕێکەوتوون، ئەوانیان لەیەك مەنزڵی پردی مەنبەج بینیوە، جەنگ دژی ئەو و خۆ ئامادە کردن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو، باشتر و عاقڵانەتر لەمەیە کەشمشێر بخەنە ناو یەك و یەکتر بکوژن و خوێنی یەك بڕێژن چوونکە جیاواز لەوە، لاواز دەبن و بەیانی کاتێك دوژمن بۆ جەنگی ئێوە دێت، لاواز و ناتەوانن. سوێند بەخوا ئەمە ئارەزووی دوژمنی ئێوەیە، ئێستا کەسێك بۆ جەنگی ئێوە دێت کەزیاتر لەهەمووان دوژمنی ئێوەیە، کەسێك کەخۆی و باوکی بۆ ماوەی حەوتساڵ فەرمانڕەوای ئێوە بووە و بەردەوام سەرقاڵی کوشتنی چاکەکاران و پیاوانی دین بووە. ئەو بەردەوام لەئێوەی کوشتووە و زیانی زۆرتان لەدەستی ئەو پێگەیشتووە و کەسێکی کوشتووە کەئێستا دەتانەوێت تۆڵەی خوێنەکەی بکەنەوە. ئەو بۆ جەنگی ئێوە دێت. بەهەموو هێز و توانای خۆتان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو بڕۆن و هێزی خۆتان دژی ئەو بەکار بەرن و دڵنیابن کەسێکی چاکەخوازی ئێوەم. هیوادارم خواوەند ڕیزەکانمان یەکبخات و ئاشتی لەنێوان پێشەواکانمان بێتە ئاراوە.

دەڵێت: ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی تەڵحە وتی: ئەی خەڵکینە، وتاری ئەم پیاوە لاوازە و ئاشتی ویستە، ئێوە بۆ هێرشکردنە سەر ئێمە بوێر نەکات، سوێند بەخوا ئەگەر کەسێك دژی ئێمە شۆڕش بکات، دەیکوژین و ئەگەر دڵنیابم دەستەیەك دەیانەوێت دژی ئێمە شۆڕش بکەن، باوك بەتاوانی کوڕ دەگرم و منداڵ بەتاوانی باوك، دۆست لەجیاتی دۆست دەگرم و سەرکردە لەجیاتی خەڵکان، تا

ئەوکاتەی تەسلیم دەبن و ملکەچی فەرمانەکانی دەبن.

دەڵێت: موسەییب کوڕی نەجبە، هەستایە سەرپێ، قسەکانی بڕی و وتی: ئەی کوڕی پەیمانشکێن، ئێمە لەتوندوتیژی و شمشێر دەترسێنیت، سوێند بەخوا پڕ ەمواتری لەوە، سەرکۆنەت ناکەم ئەگەر ئێمە بەدوژمنی خۆت بزانی چوونکە باوکت و باوەگەورێی تۆمان کوشتووە، سوێند بەخوا هیوادارم خواوەند ڕێگەی چوونەدەرەوەت لەم شارە پێنەدات و پەیوەستی باوك و باوەگەورێت ببیت، بەڵام تۆ ئەی فەرمانڕەوا، وتەکانت شیاو و گونجاوە، سوێند بەخوا دڵنیام ئەو کەسانەی سەرقاڵی شۆڕشن، گوێ لەمۆجیارییەکانی تۆ دەگرن.

ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی تەڵحە وتی: بەڵێ، سوێند بەخوا دەکوژرێت چوونکە لاوازی لەخۆی نیشاندا و بۆ خەڵکانی ئاشکرا کرد.

دەڵێت: عەبدوڵڵە کوڕی واڵی تیمی هەستا و وتی: ئەی پیاوی تیمی! قسەکردنی تۆ لەنێوان ئێمە و فەرمانڕەواکەمان نابەجێیە؟ تۆ فەرمانڕەوای ئێمە نیت و دەسەڵاتت بەسەر ئێمەدا نییە، تۆ لێپرسراوی کۆکردنەوەی باجیت، بڕۆ و سەرقاڵی کاری خۆت بە، سوێند بەخوا ئەگەر ئێستا سامانی ئەم ئۆمەتە بەفیڕۆ دەدەیت، لەباوکت و باوەگەورێت بۆت ماوەتەوە. ئەوان سزای کارەکانی خۆیاندی.

دەڵێت: موسەییب کوڕی نەجبە و عەبدوڵڵە کوڕی واڵ، ڕوویانکردە عەبدوڵڵە کوڕی یەزید و وتیان: بەڵام سەبارەت بەتۆ ئەی فەرمانڕەوا! سوێند بەخوا هیوادارین بەهۆی وتەکانت، هەمووان وەسفت بکەن و لای ئەو کەسەی دەتەوێت، بڕواپێکراو و پەسەند بیت.

دەڵێت: کەسانێك لەبەردەستەکانی ئیبراهیم کوڕی محەممەد و دەستەیەك لەهاوەڵانی تووڕە بوون و بۆ بەرگریکردن لەو، جوێنیاندا. خەڵکانیش وەڵامیاندایەوە و دەمەقاڵێ دەستپێکرد. کاتێك عەبدوڵڵە کوڕی یەزید، وتەکانی بیست، لەمینبەر هاتەخوار و گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی.

دەڵێت: ئیبراهیم کوڕی محەممەد ڕۆشت و دەیوت: سوێند بەخوا عەبدوڵڵە کوڕی یەزید لاوازی نیشاندا. دەبێت کوڕی زوبەیر لەمە ئاگادار بکەمەوە.

هاوڕا و هاوبۆچوونی ئێمە بێت، شانبەشانی ئەو دەجەنگن و ئەگەر بۆچوونەکانی جیاواز بێت، تا ئەو جێگەی دەتوانین بەرگری لەکەعبە دەکەین و دواتر ڕێگە و ئەندێشەیەکی دیکە دەگرینەبەر.

دەڵێت: بەڕێکەوتن تا گەیشتنە لای عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر کە لەهاتنیان شادومان بوو و پێی وتن هاوڕا و هاوهەڵویستی ئەوانە و بێدرەنگ، ڕەزامەندی ئەوانی بەدەستهێنا و بەمپێیە خەواریج شانبەشانی ئەو جەنگان تا ئەو کاتەی یەزید مرد و سوپای شام گەڕایەوە.

دواتر خەواریج وتیان: ئەوەی پێشتر کردووتانە، بیرکردنەوەی لەگەڵدا نەبووە و پاداشتی تیا نییە، هاوڕێ لەگەڵ کەسێك جەنگاون کەنازان لەگەڵ بۆچوونەکانی ئێوەدایە یا نە، ماوەیەك پێشتر خۆی دژی ئێوە دەجەنگی و باوکی بانگەوازی تۆڵەی خوێنی عوسمانی بەرز کردبوویەوە، بڕۆنە لای و سەبارەت بەعوسمان پرسیاری لێبکەن، ئەگەر بێزاری خۆی لەو دەربڕی، هاوڕێی ئێوەیە و جیاواز لەوە، دوژمنتانە.

دەڵێت: ڕۆشتنە لای و وتیان: ئێمە لەگەڵ تۆ جەنگاین، بەڵام سەبارەت بەبۆچوونی تۆ پرسیارمان نەکرد تا بزانین دۆستی ئێمەیت یا دوژمن. پێمان بڵێ سەبارەت بەعوسمان کوڕی عەفان چی دەڵێیت؟

دەڵێت: عەبدوڵڵە سەیری دەروروبەری کرد و بینی ژمارەی هاوەڵانی کەمە، وتی: ئێوە کاتێك هاتوون کەدەمەوێت بڕۆم، شەو وەرن تا لەهەموو شتێك ئاگادارتان بکەمەوە.

خەواریج ڕۆشتن و عەبدوڵڵە کەسی بۆ لای هاوەڵانی خۆی نارد و پێی وتن هەمووان سیلاح هەڵگرن و لای من کۆببنەوە. هاوەڵانی ئەو کارەیان کرد. کاتێك خەواریج هاتن، هاوەڵانی کوڕی زوبەیر لەدوو ڕیزدا و بەدەوریدا وەستابوون و ژمارەیەك لەوان لەپشت سەریەوە بوون. کوڕی ئەزرەق بەهاوەڵانی خۆی وت: ئەم پیاوە لەمەبەستی ئێوە نیگەرانە و دەیەوێت دژایەتیتان بکات و وەك دەبینن دژی ئێوە خۆی ئامادە کردووە.

دەڵێت: کوڕی ئەزرەق لێی نزیکبوویەوە و وتی: ئەی کوڕی زوبەیر، لەخواوەند

بترسە و خیانەتکاران بەدوژمن بەزانە و یەکەم کەس کەتاریکی و دیاردەی تازەی هێنایە ناو ئیسلام و بەپێچەوانەی فەرمانی قورئان جوولایەوە، بەدوژمنی خۆت لەقەڵەم بدە، چوونکە بەم کارەت پەروەردگار ڕازی و لەئازابی مەترسیدار ڕزگارت دەبێت و جیاواز لەوە لەڕیزی ئەو کەسانەیت لەبەشی خۆیان کەڵکیان وەرگرتووە. و لەژیان و دنیا، کۆتاییان بەبەرەکەتەکانی خۆیان هێناوە. ئەی عوبەیدە کوڕی هیلال، باسی بۆچوون و مەبەستی ئێمە بۆ ئەم پیاوە و هاوەڵانی بکە تا بزانن پێشنیاری چییان پێدەکەین. عوبەیدە کوڕی هیلال هاتەپێش.

باوکی قەبیسە کوڕی عەبدولڕەحمانی قوحافی خەسعەمی دەڵێت: سوێند بەخوا عوبەیدە کوڕی هیلالم بینی کەهاتە پێش و قسەی کرد، کەسێکی زمان پاراوتر و بەتواناتر لەوم نەبینیوە. هەڵگری بۆچوونی خەواریج بوو.

دەڵێت: بەشێوەیەك بوو وتارێکی زۆر و پڕمانای بەکەمترین وشە دەردەبڕی.

دەڵێت: ناوی خواوەندی هێنایە سەرزمان، دواتر وتی:

(( بەڵام دواتر: خواوەند محەممەدی نارد تا پێشنیاری خواپەرەستی بەخەڵکان بکات، بانگەوازەکەی بڵاو کردەوە و موسوڵمانان وەڵامیان دایەوە و لەناو ئەوان، بەپێی فەرموودەکانی خواوەند و قورئان هەڵسوکەوتی کرد تا ئەو کاتەی بۆ لای خواوەند گەڕایەوە. دواتر خەڵکان ئەبوبەکریان وەك خەلیفە هەڵبژارد، ئەبوبەکر، عومەر کوڕی خەتابی کردە خەلیفە، هەردووکیان بەپێی قورئان و سوونەتی پێغەمبەر (د.خ) جووڵانە و سپاس بۆ خوا. دواتر خەڵکان عوسمان کوڕی عەفانییان وەك خەلیفە هەڵبژارد کەجیاوازی دروستکرد و خزمەکانی پێشخست و ستەمکارانی نزیککردەوە و ئەو کەسانەی پێغەمبەر (د.خ) دووری خستبوونەوە، لەدەوری خۆی کۆیکردنەوە. ئەو تالانییەی خواوەند بەموسوڵمانانی بەخشیبوو، لەنێوان خراپەکارانی قوڕەیش و عەرەب دابەشیکرد. دەستەیەك لەموسوڵمانان کەپەیمانی گوێڕایەڵییان بەخواوەند دابوو و بۆ ڕەزامەندی خوا، لەسەرکۆنەی سەرکۆنەکەران نەدەترسان، هێرشیانکردەسەر و خوێنیان ڕشت. ئێمە هاوڕێی ئەوانین و لەعوسمانی کوڕی عەفان بێزارین، تۆی ئەی کوڕی زوبەیر، چی دەڵێیت؟

دەڵێت: کوڕی زوبەیر وتی: بەڵام دواتر: لەمەبەست و وتەکانت تێگەیشتم،

ئاماژەت بەناوی پێغەمبەر (د.خ)دا و بەهەمانشێوەیە کەباستکرد، ئەوەی سەبارەت بەئەبوبەکر و عومەر، ئاماژەت پێدا، لەگەڵ بۆچوونی ئێمە یەك دەگرێتەوە. لەمەبەستی ئێوە سەبارەت بەعوسمان کوڕی عەفان تێگەیشتم و کەس لەمرۆڤەکان ناناسم لەمن زیاتر شارەزای کاروباری عوسمان بێت، کاتێك خەڵکان ڕەخنەیان لێگرت و خوازیاری گۆڕینی هەڵسوکەوتی بوون، لەگەڵ ئەودابووم و داواکاری هەموویانی هێنایەدی، دواتر لەگەڵ نامەکان گەڕانەوە و گومانیان دەکرد عوسمان فەرمانی کوشتنی ئەوانی دەرکردووە، بەلام عوسمان پێی وتن: من ئەو نامانەم نەنووسیوە، ئەگەر دەتانەوێت شایەت بێن و ئەگەر شایەت نەبوو، سوێند دەخۆم. سوێند بەخوا شایەتییان نەهێنا و ڕێگەیان نەدا سوێند بخوات، هێرشیانکردەسەر و خوێنیان ڕشت. سەبارەت بەو ڕەخنانەی لەعوسمانت گرت، بەوشێوە نییە و شیاوی هەموو جۆرە وەسفێکە، من ئێوە و ئامادەبووانم بەشایەت دەگرم کە لەم دنیا و لەو دنیا، دۆست و هاوڕێی کوڕی عەفانم و دۆستی دۆستەکانی و دوژمنی دوژمنەکانی. هیوادارم خواوەند لەئێوە، ئەی دوژمنانی خواوەند بێزار بێت.

عوبەیدە وتی: لەئێوە بێزار بێت ئەی دوژمنانی خوا و بلاوەیان لێکرد.

دەڵێت: نافیع کوڕی ئەزرەقی حەنزەلی و عەبدوڵڵە کوڕی سەفاری سەعدی سورەیمی و عەبدوڵڵە کوڕی ئەبازی سورەیمی و حەنزەلە کوڕی بەیهەس و عەبدوڵڵە و عوبەیداللە و زوبەیر، کوڕەکانی ماخوز لەمناڵەکانی سەلیت، ڕوویانکردە بەسرە و باوکی تالووتی زەمانی و عەبدوڵڵە کوڕی سەوری قەیسی، ئەبو فەدیك و عەتییە کوڕی ئەسوەدی یەشکوری، ڕێگەی یەمامەیان گرتەبەر و لەگەڵ باوکی تالوت هێرشیانکردە سەر یەمامە. دواتر لەدەوری نەجدە کوڕی عامری حەنەفی کۆبوونەوە. بەلام خەواریجی بەسرە، ڕوویانکردە بەسرە و هەموویان شوێنکەوتەی بۆچوونەکانی باوکی بیلال بوون.

باوکی موسەنا لەیەکێك لەهاوەڵە بەسرییەکانی خۆی دەگێڕێتەوە: خەواریج کۆبوونەوە و زۆربەیان وتیان: دەبێت کەسانێك لەئێمە لەڕێگەی خوادا شۆڕش بکەن چوونکە لەسەرەتای دەستپێکردنەوە، ئەوە لەخوێنماندایە. زاناکانی ئێمە لەم سەرزەمینەدا بمێنن و ببنە چرای ڕێنوێنی خەڵکان و بانگێشتی ئەم دینەیان

بکەن و خواپەرەستەکان شۆڕش بکەن و پەیوەستی پەروەردگار ببن و شەربەتی شەهادەت نۆش بکەن و بۆ لای پەروەردگار بگەڕێنەوە.

دەڵێت: نافیع کوڕی ئەزەرق ئامادەیی خۆی نیشاندا و لەگەڵ سێسەد کەس شۆڕشی دەستپێکرد ئەمە لەکاتێکدا بوو خەڵکان دژی عوبەیدالله کوڕی زیاد ڕاپەڕیبوون و خەواریج، دەرگای زیندانەکانیان شکاندبوو و هاتبوونەدەر. خەڵکان سەرقاڵی جەنگی ئەزد و ڕەبیعە لەگەڵ مناڵەکانی تەمیم و قەیس سەبارەت بەخوێنی مەسعود کوڕی عەمرۆ بوون و خەواریج ئەم هەلەیان قۆستەوە و خۆیان ئامادە کرد و کاتێك نافیع کوڕی ئەزەرق ئالای شۆڕشی بەرز کردەوە، شوێنیکەوتن. خەڵکی بەسرە ڕێککەوتن عەبدوللە کوڕی حارس پێشنوێژیان بێت. کوڕی زیاد ڕێگەی شامی گرتەبەر. ئەزد و مناڵەکانی تەمیم پەیمانی ئاشتییان بەست و خەڵکان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی خەواریج ئامادە بوون و شوێنیان کەوتن تا ئەوەی سەرئەنجام توانیان لەبەسرە دووریان بخەنەوە. بەمشێوەیە خەواریج پەیوەستی کوڕی ئەزەرق بوون جگە لەو کەسانەی لەو کاتەدا لەگەڵ دەستپێکردنی شۆڕش ڕازی نەبوون، کەسانی وەك عەبدوللە کوڕی سەفار و عەبدوللە کوڕی ئەباز و ژمارەیەك لەشوێنکەوتەکانیان.

نافیع کوڕی ئەزەرق ئەندێشەی کرد و گومانیکرد هاوڕێیەتی لەگەڵ ئەو کەسانەی بەجێماون، ڕەوا نییە و ئەوان شیاوی ڕزگار بوون نین، بەهاوڕێکانی خۆی وت: خواوەند بەهۆی ڕۆژی پسلانەوە، ڕێزی پێبەخشیون و سەبارەت بەشتێك کەکەسانی دیکە، لەئاستیا کوێرن، ڕووناکی پێبەخشین، مەگەر نازانن ئێوە بەمەبەستی زیندووکردنەوەی دینی ئیسلام شۆڕشتان کردووە و فەرمان و فەرموودەکانی ئەو، پێشەوای ئێوەیە و شوێنکەوتەی سوونەتەکانن؟

وتیان: بۆنا.

وتی: مەگەر فەرمانی ئێوە سەبارەت بەهاوڕێکانتان هاوشێوەی فەرمانی پێغەمبەر (د.خ) سەبارەت بەهاوڕێکەی نییە و فەرمانی ئێوە سەبارەت بەدوژمنان هاوشێوەی فەرمانی پێغەمبەر (د.خ) سەبارەت بەدوژمنان نییە؟ نها، هەرکەس دوژمنی ئێوەیە، دوژمنی خوایە و دوژمنی پێغەمبەر (د.خ). بەهەمانشێوەکە

هەرکەس دوژمنی پێغەمبەر بێت، دوژمنی خوایە و دوژمنی ئێوە.

وتیان: بۆنا.

وتی: خواوەند دەفەرمێت: (( برائة من الله و رسوله الی الذین عاهدتم من المشركین

واتاکەی: بێزاری خواوەند و پێغەمبەرە لەکەسانێك لەناباوەڕان کەپەیمانتان لەگەڵ بەستوون)).

هەروەها فەرموویەتی: (( لا تنكحوا المشركات حتی یومن

واتاکەی: ژنانی ناباوەڕ مەکەنە هاوسەری خۆتان تا ئەو کاتەی باوەڕ دێنن، چوونکە خواوەند خۆشویستی ئەوان و کۆبوونەوە لەگەڵ ئەوان و ڕازی بوون بەشایەتی ئەوان و فێربوونی زانستی دین و بەستنی پەیوەندی هاوسەرگیری لەگەڵ ئەوان حەرام کردووە، خواوەند بەهۆی زانینی ئەم شتانە، هەموو بەڵگە و نیشانەکانی بۆ ئێمە سەلماندووە و دەبێت، کاروباری دین فێری ئەو کەسانە بکەین کەلای ئەوانەوە هاتووین و ئەوەی خواوەند ڕەوانەی فەرمووە، نەیشارینەوە چوونکە دەفەرمێت:

(( ان الذین یكتمون ما انزلنا من البینات و الهدی من بعد ما بیناه للناس فی الكتاب، اولئك یلعنهم الله و یلعنهم اللاعنون

واتاکەی: ئەو کەسانەی بەڵگە و ڕێنوێنییەکان بشارنەوە کەئێمە ناردوومانە و لەناو کتێبە ئاسمانییەکاندا بۆ خەڵکان ڕوونکردۆتەوە، خواوەند و نفرینکەران، نفرینیان دەکەن))

دەڵێت: هەموو هاوەڵانی بەم بۆچوونە ڕازی بوون و ئەو نووسی:

(( لەبەندەی خوا، نافیع کوڕی ئەزرەق

بۆ عەبدوڵڵە کوڕی سەفار و عەبدوڵڵە کوڕی ئەباز و ئەو کەسانەی لەگەڵ ئەواندان

سڵاو لەبەندە ملکەچەکانی خواوەند، و بارودۆخ بەو شێوەیە.....

هەمان وتاری خوێندەوە و هەمان ڕوونکردنەوەی ئاماژە پێدا و نامەکەی بۆ ناردن. کاتێك بەدەستیان گەیشت، عەبدوڵڵە کوڕی سەفار خوێندییەوە بەڵام بۆ

کەسانی دیکەی نەخوێندەوە لەترسی ئەوەی نەکا دووبەرەکی لەناویاندا بێتە ئاراوە و سەرگەردان بن.

عەبدوللە کوڕی ئەباز پێی وت: چ هەواڵێکت پێگەیشتووە، مەگەر هاوەڵانی ئێمە کوژراون یا کەسێکیان ئەسیر بووە؟

کوڕی سەفار نامەکەی پێدا، خوێندییەوە و وتی: خوا بیکوژێت، چ بۆچوونێکی هەیە نافیع کوڕی ئەزرەق، ڕاست دەکات، ئەگەر ئەم خەڵکە ناباوەڕ دەبوون، بۆچوونەکەی شیاوە و ئەو حوکمەی دەیدات، ڕەوایە و شێوازەکەی هاوشێوەی شێوازی پێغەمبەر (د.خ) دەبێت بەڵام ئەوەی دەڵێت ئەم خەڵکە حاشا لەنیعمەتەکان و شەرع دەکەن، درۆیە و درۆ دەکات. ئەوان لەناباوەڕی بەدوورن و تەنیا خوێنی ئەوان بۆ ئێمە حەڵاڵە و سامانەکانیان حەرامە.

کوڕی سەفار پێی وت: خواوەند لەتۆ بێزار بێت چوونکە کەمتەرخەمیت و لەکوڕی ئەزرەقیش بێزار بێت چوونکە زێدەڕۆیی کرد، خوا لەهەردووکتان بێزار بێت.

کوڕی ئەباز پێی وت: خوا لەتۆ و لەو بێزار بێت. دواتر بڵاو بوونەوە و پێگەی کوڕی ئەزرەق بەرز بوویەوە و ژمارەی شوێنکەوتەکانی زیادیانکرد و ڕوویکردە بەسرە و لەپردەکە نزیکبوویەوە.

عەبدوللە کوڕی حارس، موسلیم کوڕی عەبیس کوڕی کورەیز و خەڵکانی بەسرەی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو نارد.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەنیوەی مانگی ڕەمەزانی ئەم ساڵە، موختار کوڕی باوکی عوبەیدەی سەقەفی هاتە کوفە.

## هۆکاری هاتنی موختار بۆ کوفە

نەزر کوڕی سالح دەڵێت: شیعەکان جوێنیان بەموختار دەدا و سەرکۆنەیان دەکرد بەهۆی کردەوەکانی پێشووتری لەگەڵ حەسەن کوڕی عەلی، ئەو ڕۆژەی لەسیاچاڵی سابات بریندار بوو و ئەویان بۆ ئەبیەز برد.

دەڵێت: لەڕۆژگاری حسەین کوڕی عەلی و کاتێك موسلیم کوڕی عەقیلی بۆ کوفە نارد، ئەو لەماڵی موختار نیشتەجێ بوو. ئەو ماڵەی هەنووکە ماڵی سەلەم کوڕی موسەییبە.

موختار کوڕی باوکی عوبەیدە، لەگەڵ خەڵکانی دیکەی کوفە بەیعەتی لەگەڵ موسلیم کرد، چاکەخوازی خۆی نیشاندا وشوێنکەوتەکانی بۆ بەستنی بەیعەت لەگەڵ موسلیم هاندەدا تا ئەو کاتەی موسلیم شۆڕشی کرد. ئەو ڕۆژە موختار لەگوندەکەی خۆی بەناوی لەقفا لەناوچەی خەتەرنییە بوو. دەمەونیوەڕۆ ئاگادار بوویەوە کەکوڕی عەقیل لەکوفە شۆڕشی دەستپێکردووە بەڵام شۆڕشەکەی موسلیم پێش کاتی خۆی دەستیپێکردبوو و کاتێك لەکوژرانی هانی کوڕی موسلیم ئاگادار بوویەوە، شۆرشی دەستپێکرد. موختار لەگەڵ کویلەکانی خۆی هات و دوای ئێواریێ گەیشتە باب ئەلفیل (دەروازەی فیل). عوبەیدالله بۆ عەمرۆ کوڕی حورەیس ئالآیەکی بەستبوو و ئەوی وەك سەرکردەی هەمووان دەستنیشان وفەرمانی پێدابوو، لەمزگەوت دانیشێت. کاتێك موختار هات و لەدەروازەی فیل وەستا، هانی کوڕی باوکی حەییەی وادعی لای تێپەڕی و وتی: (( بۆ لێرەدا وەستاویت، لەگەڵ خەڵکانیت و نە لەماڵەکەی خۆت)).

وتی: بۆچوونی من لەگەورەی گوناحەکەی ئێوە پەرێشانە.

وتی: سوێند بەخوا دەزانم خۆت بەکوشتن دەدەیت. دواتر ڕۆشتە لای عەمرۆ کوڕی حورەیس و لەگفتوگۆکەی لەگەڵ موختار ئاگاداری کردەوە.

عەبدولرەحمان کوڕی باوکی عومەیری سەقەفی دەڵێت: کاتێك هانی کوڕی باوکی حەییە، عەمرۆ کوڕی حورەیسی لەبوونی موختار ئاگادار کردەوە، لای ئەو دانیشتبووم، پێی وتم: بڕۆ لای ئامۆزاکەت و پێی بڵێ هاورێکەی نازانێت ئەو

لەکوێیە، یا خۆی ڕووبەڕووی دژواری نەکاتەوە.

دەڵێت: هەستام بڕۆم، زایدە کوڕی قودامە کوڕی مەسعود هاتە پێش و وتی: دێتە لای تۆ، بەو مەرجەی ئەمانی پێببەخشیت.

عەمرۆ کوڕی حورەیس وتی: لەلایەن منەوە ئەمانی هەیە، ئەگەر سەبارەت بەو شتێك لای عوبەیدالله بڵێن، تکای بۆ دەکەم.

زایدە کوڕی قودامە پێی وت: بەمشێوەیە بەخواستی خواوەند تەنیا چاکە چاوەڕێمانە.

عەبدولڕەحمان دەڵێت: لەگەڵ زایدە بەڕێکەوتین و ڕۆشتینە لای موختار. لەوتەکانی کوڕی باوکی حەبیە لەگەڵ کوڕی حورەیس ئاگادارمان کردەوە و سوێندماندا خۆی ڕووبەڕووی دژواری نەکاتەوە. موختار هاتە لای کوڕی حورەیس، سلاوی لێکرد و لەژێر ئالاکەی دانیشت تا بەیانی بوویەوە. خەڵکان سەبارەت بەکردەوەکانی موختار قسەیان دەکرد و عەمارە کوڕی عوقبە کوڕی باوکی موعیت ڕۆشتە لای عوبەیدالله و لەبەسەرهاتەکە ئاگاداری کردەوە. کاتێك ڕۆژبوویەوە و دەرگای عوبەیدالڵەیان ئاوەلا کرد و ڕێگەیان بەخەڵکاندا، موختاریش لەناو ئەوان ڕۆشتەژوور. عوبەیدالله کوڕی زیاد بانگیکرد و پێی وت: تۆ بوویت لەگەڵ ژمارەیەك لەخەڵك هاتبوویت هاوکاری کوڕی عەقیل بکەیت؟

وتی: ئەو کارەم کردووە، بەڵکو هاتم و لەژێر ئالای کوڕی حورەیس جێگیر بووم و شەوم لەگەڵ ئەوبردە سەر.

عەمرۆ وتی: خوا بتبەخشێت، ڕاست دەکات.

دەڵێت: عوبەیدالڵە کوڕی زیاد دارەکەی بەرز کردەوە و کێشای بەڕوخساری موختار و بەرچاوی کەوت، وتی: گیانت لەمەترسیدابوو، سوێند بەخوا ئەگەر شایەتی عەمرۆ نەدەبوو، دەمکوشتی، زیندانی بکەن.

ئەویان بردە زیندان و لەوێ مایەوە تا ئەو کاتەی حسەین کوژرا.

دەڵێت: موختار کەسی بۆ لای زایدە کوڕی قودامە نارد و داوای لێکرد لەمەدینە بڕواتە لای عەبدوڵلە کوڕی عومەر بۆ ئەوەی نامە بۆ یەزید بنووسێت تا فەرمان بە عوبەیدالڵە بدات ئازادی بکات.

دەڵێت: زایدە ڕۆشتە لای عەبدوڵڵە کوڕی عومەر و پەیامەکەی موختاری گەیاند. سەفییە خوشکی موختار کەهاوسەری عەبدوڵڵە کوڕی عومەر بوو، لەزیندانیبوونی براکەی ئاگادار بوویەوە و گریانی دەستپێکرد، کاتێك عەبدوڵڵە کوڕی عومەر ئەمەی بینی، بەزایدە، نامەیەکی بۆ یەزید کوڕی معاویە نووسی:

((بەڵام دواتر: عەبدوڵڵە کوڕی زیاد، موختاری زیندانی کردووە و خزمی منە، هیوادارم ئازاد بکرێت و بارودۆخی سەقامگیر بێت، خواوەند تۆ و ئێمە ببەخشێت، ئەگەر دەخوازی، فەرمانی ئازادکردنی بۆ کوڕی زیاد بنووسە. سڵاو لەتۆ)).

دەڵێت: زایدە سوار لەسەر چوارپێکەی، ڕێگەی شامی گرتەبەر. یەزید کاتێك نامەکەی خوێندەوە، پێکەنی و وتی: باوکی عەبدولرەحمان شیفاعەت دەکات و شیاوە. بەمشێوەیە نامەی بۆ کوڕی زیاد نووسی:

(( بەڵام دواتر، کاتێك نامەکەی منت بەدەست گەیشت، موختار کوڕی باوکی عوبەید ئازاد بکە و سڵاو لەتۆ)).

دەڵێت: زایدە نامەکەی هێنا و تەسلیم بەکوڕی زیادیکرد. کوڕی زیاد، موختاری بانگکرد و ئازادیکرد و وتی: سێ ڕۆژ مۆڵەتت هەیە، ئەگەر دوای ئەوە لەکوفە بتبینم، ژیانت لەمەترسیدایە. موختار بۆ شوێنەکەی گەڕایەوە.

کوڕی زیاد وتی: زیادە چاوی کراوەتەوە و دەڕواتە لای سەروەری باوەڕداران تا بۆ ڕزگاری کەسێك کەدەمویست لەزیندان بمێنێتەوە، نامە بێنێت. ئەو بێننە لای من.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی نافیع، باوکی عوسمان، یەکێك لەدەبیرەکانی کوڕی زیاد، چاوی بەزایدە کەوت و پێی وت: ڕابکە و ئەم چاکەی منت لەبیر بێت.

دەڵێت: زایدە ڕۆشت و ئەو ڕۆژە خۆی شاردەوە و دواتر لەگەڵ کەسەکانی خۆی ڕۆشتە لای قەعقاع کوڕی شوری زوهەلی و موسلیم کوڕی عەمرۆ باهلی و ئەوان، لەکوڕی زیاد ئەمانیان بۆ وەرگرت.

باوکی میخنەف دەڵێت: لەڕۆژی سێیەم، موختار ڕێگەی حیجازی گرتەبەر.

کوڕی عیرەق دەڵێت: لەحیجازەوە دەهاتم، کاتێك گەیشتمە بەسیتە، لەولای

واقیسە، موختار کوڕی باوکی عوبەیدم بینی کەدەیویست بەرەو حیجاز بڕوات. ئەمە دوای ئەوەبوو کوڕی زیاد ئازادی کردبوو. کەبینیم، لێی نزیکبووزمەوە و کاتێك پێڵووی چاوەکانیم بینی، اناللە م هێنایە سەرزمان و دوای هاوخەمی پێم وت: خوا خراپ نەدات، چاوت چی لێهاتووە؟

وتی: ئەو کوڕی ڕوو سپییە، بەدار کێشای بەچاوی مندا و ئاوای لێکردم.

وتم: پەنجەی هەڵوەڕێت.

موختار وتی: خوا بمکوژێت ئەگەر پەنجە و دەماڕ و ئەندامەکانی نەبڕم.

دەڵێت: لەوتەکانی سەرمسوڕما و وتم: چۆن ئەمە دەزانی.

وتی: ئەمەت لەبیر بێت تا ڕاستی وتەکانی منت بۆ دەرکەوێت.

دەڵێت: دواتر سەبارەت بە عەبدوللە کوڕی زوبەیر، پرسیاریکرد.

پێم وت: پەنای بۆ کەعبە بردووە و دەڵێت پەنابەری پەروەردگاری ئەم ماڵەم، خەڵك دەڵێن بەشێوەیەکی نهێنی بەیعەت لەخەڵکان وەردەگرێت و گومان دەکەم ئەگەر هێزی زیاد و فراوانی لەبەردەستا بێت، دژایەتی خۆی ئاشکرا دەکات.

وتی: بەڵێ، گومانی تێدا نییە. هەنووکە پیاوی عەرەب ئەوە، ئەگەر شوێن من کەوێت و گوێ لەوتەکانم بگرێت، کاروباری خەڵکان دەگرمە ئەستۆ. من لەهیچکام لەعەرەبەکان کەمتر نیم، ئەی کوڕی عیرەق، ئاژاوە سەریهەڵداوە، دەبێت ئەمە لەشوێنێکدا ببینیت و ببیستیت کەشۆڕشم کردووە و دەڵێن موختار لەگەڵ دەستەیەك لەموسوڵمانان بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی حسەینی ستەملێکراو، سەروەری موسوڵمانان و کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب، ئالأی شۆڕشی بەرز کردۆتەوە، سوێند بەپەروەدگار، لەتۆڵەی خوێنی ئەو، بەژمارەی ئەو کەسانەی لەبری خوێنی یەحیا کوڕی زەکەریا کوژران، دوژمنان دەکوژم.

دەڵێت: وتم: سبحان اللە، ئەم بلیمەتێکە و ئەفسانەیەکی سەیر باس دەکات.

وتی: هەموو شتێکم پێ وتیت، لەبیرت بێت تاڕاستییەکان ببینیت.

دواتر بەڕێکەوت و کەمێك لەگەڵیدا ڕۆشتم و چاکە و تەندروستیم بۆ خواست.

دەڵێت: وەستا و سوێندیدام بگەڕێمەوە. دەستم گرت و ماڵئاواییم لێکرد. گەڕامەوە و بەخۆم وت: ئەگەری هەیە ئەم وتەیە کەئەم کەسە، یانی موختار،

دەڵێت و گومان دەکات کەڕوودەدات، شتێکە و تەنیا بەخۆی وتووە؟ سوێند بەخوا، خواوەند کەسی لەغەیب ئاگادار نەکردۆتەوە. ئەمە شتێکە ئەو ئارەزووی دەکات و گومان دەکات ڕوودەدات و شەیدای ئەندێشەکانی خۆیەتی. سوێند بەخوا ئەندێشەیەکی پەرێشانە. سوێند بەخوا بەو شێوە نییە هەرکەس گومانی هەر شتێك بکات، بێتەدی و ڕووبدات.

دەڵێت: سوێند بەخوا زیندوو مامەوە و هەموو ڕاستییەکانم بینی.

دەڵێت: ئەمە زانستێك بوو پێی بەخشرا بوو و هاتەدی، ئەگەر بۆچوونێکی دەبوو یا ئارەزوویەکی دەکرد، ڕوویدەدا.

کوڕی عیرەق دەڵێت: ئەم بەسەرهاتەم بۆ کوڕی حەجاج باسکرد، وتی: موختار دەیوت:

(( ئەو کەسەی کلکی خۆی ڕابکێشێت

هاوار لەدیجلە

یا دەروبەرەکەی دەکات))

پێم وت: ئایا ئەم شتانەی دروست دەکرد و گومانی دەکرد، یا زانستێك بوو و خواوەند پێی بەخشیبوو؟

وتی: سوێند بەخوا نازانم بەڵام پیاوێکی بوێر و باوەڕدار و لەگەڵ دوژمنانی سەختگیر بوو.

عەباس کوڕی سەهل کوڕی سەعد دەڵێت: موختار گەیشتە مەککە و هاتە لای کوڕی زوبەیر، لای ئەو دانیشتبووم، سڵاوی لەکوڕی زوبەیر کرد و وەڵامی دایەوە و بەخێرهاتنی کرد، دواتر وتی: ئەی باوکی ئیسحاق، سەبارەت بەخەڵکی کوفە گفتوگۆ بکە.

موختار وتی: بەڕواڵەت هاوڕای فەرمانڕەواکەی خۆیانن بەڵام لەناخدا بەدوژمنی دەزانن.

کوڕی زوبەیر وتی: ئەم تایبەتمەندی کەسانی خراپەکار کەکاتێك خودانەکانی خۆیان دەبینن، خزمەتیان دەکەن و ملکەچی نیشان دەدەن و کاتێك دەڕۆن، جوێنیان پێدەدەن و نفرینیان دەکەن.

دەڵێت: کەمێك لای ئێمە دانیشت، دواتر لەکوڕی زوبەیر نزیك بوویەوە. وەك بڵێی نهێنییەکی لاباس دەکرد، وتی: چاوەڕوانی چیت؟ دەستت بێنە پێش تا بەیعەتت لەگەڵ ببەستم، کارێك بکە ڕەزامەندی ئێمەی بەدواوە بێت، دەست بەسەر حیجازدا بگرە چوونکە خەڵکەکەی گوێڕایەڵی تۆن.

دەڵێت: موختار هەستا و ڕۆشت و بۆ ماوەی ساڵێك کەس نەیبینی. ڕۆژێك لای کوڕی زوبەیر دانیشتبووم، پێی وتم: موختار کوڕی باوکی عوبەیدت کەی بینیوە؟

وتم: لەساڵێك پێش ئێستا کەلای تۆ بینیم، ئیتر نەمبینیوە.

وتی: دەزانی بۆ کوێ ڕۆشتووە؟ ئەگەر لەمەککە دەبوو تا ئێستا دەبینرا.

وتم: یەك دوو مانگ دوای ئەوە ڕۆشتمە مەدینە و چەند مانگێك لەوێ مامەوە و دواتر گەڕامەوە بۆ لای تۆ. لەچەند کەسێکی خەڵکی تایفم بیست کەدەیانوت موختار لەتایف ڕۆشتۆتە لای ئەوان و وتوویەتی خودانی غەزەبە و بکوژی ستەمکاران.

وتی: خوا بیکوژێت، درۆزنە و درۆ دەکات، ئەگەر خواوەند ستەمکاران لەناو ببات، موختار یەکێکە لەوان.

دەڵێت: سوێند بەخوا هێشتا کۆتاییمان بەم گفتوگۆیە نەهێنابوو کەموختار لەسووچێکی مزگەوتەکەوە دەرکەوت.

کوڕی زوبەیر وتی: باسی غایب بکە تا بیبینیت، گومان دەکەی بۆ کوێ دەڕوات؟

وتم: پێم وابێت دەیەوێت بەرەو کەعبە بڕوات.

دەڵێت: ڕوویکردە کەعبە و مەبەستی حوجری کرد، دواتر حەوتجار بەدەوری کەعبەدا سووڕایەوە و لەنزیك حوجر دوو ڕەکعەت نوێژی خوێند، دواتر دانیشت و زۆری نەخایاند، کەسانێك لەناسراوەکانی لەخەڵکانی تایف و حیجاز لای ئەو تێپەڕین و دانیشتن. کوڕی زوبەیر چاوەڕوانی هاتنی ئەوی دەکرد و وتی: بەبۆچوونی تۆ بۆ سەردانی ئێمە ناکات.

وتم: نازانم بەڵام ئێستا ئەو ڕاستییە ئاشکرا دەکەم.

وتی: ڕازیم. بۆچوونەکەمی پەسەند کردبوو.

دەڵێت: هەستام و لای ئەو تێپەڕیم و وامنیشاندا دەمەوێت لەمزگەوت بڕۆمەدەر. دواتر ئاوڕم بۆ دایەوە و سڵاوم لێکرد، لای دانیشتم و دەستیم گرت و وتم: لەکوێ بوویت و دوای من بۆ کوێ ڕۆشتیت؟ ئایا لەتایف بوویت؟

وتی: لەتایف و شوێنەکانی دیکە. کاروکردەوەکانی خۆی لەمن شاردەوە.

دەڵێت: لێی نزیکبوومەوە، بەهێواشی قسەم دەکرد، وتم: کەسێکی وەك تۆ نابێت لەو کارەی باوەڕداران و گەورەکانی عەرەب لەقوڕەیش و ئەنسار و سەقیف لەسەری ڕێککەوتوون، بەدوور بێت؟ هیچ بنەماڵە و هۆزێك نەماوە سەرکردە و سالاریان نەهاتبێت و بەیعەتی لەگەڵ ئەم پیاوە نەکردبێت، لەتۆ و کارەکانی تۆ سەری سوڕماوە کەنەچوویتە لای و بەیعەتت لەگەڵ نەبەستبێت و لەمکارەدا بێبەش بیت.

وتی: مەگەر نازانی ساڵی پار هاتمە لای و لەبۆچوونی دروست و گونجاو ئاگادارم کردەوە، بەلأم ئەو کار و نهێنییەکانی خۆی لەمن شاردەوە و کاتێك بینیم نیازی بەمن نییە، ویستم بیسلەمێنم منیش نیازم پێی نییە، سوێند بەخوا زیاتر لەوەی من نیازم بەو بێت، ئەو نیازی بەمنە.

وتم: تۆ لەمزگەوت قسەت کرد و لەمزگەوت بەوشێوەیە قسە ناکرێت مەگەر ئەو کاتەی پەردەکان دادراو و دەرگاکان داخراوبن، ئەگەر دەخوازی ئەمشەو سەردانی بکە، منیش هاوڕێیەتیت دەکەم.

دەڵێت: هەستام و بۆ لای کوڕی زوبەیر گەڕامەوە و لەگفتوگەکەم لەگەڵ موختار ئاگادارم کردەوە و ڕازی بوو. کاتێك نوێژی خەوتنانمان خوێند، لەحوجر، چاومان بەیەك کەوت و بەرەو ماڵی کوڕی زوبەیر بەڕێکەوتین و داوای مۆڵەتی چوونە ژوورەوەمان کرد و پێماندرا. وتم: بەتەنیا جێتان دێڵم.

وتی: شتێکمان نییە لەتۆ شاراوە بێت. دانیشتم، کوڕی زوبەیر دەستی موختاری گرت و بەخێرهاتنی کرد و لەحاڵ و ئەحواڵی پرسی، دواتر بۆ ماوەیەك هەردووکیان بێدەنگ بوون.

دواتر موختار، قسەی دەستپێکرد، سپاسی خواوەندی کرد، وتی: نەزۆربڵەیی شیاوە و نەکەمتەرخەمی زیاد لەپێویست. هاتووم بەیعەت لەگەڵ تۆ ببەستم بەو

مەرجەی کاروبارەکان بێ ڕاوێژکردن بەمن ئەنجام نەدەیت و من یەکێك لەیەکەمین کەسەکان بم مۆڵەتی پێدەدەیت و کاتێك دەسەڵاتت گرتەدەست، گرنگترین پێگەی خەلافەت بەمن دەسپێریت.

کوڕی زوبەیر وتی: لەسەر کتێبی خواوەند و سوونەتی پێغەمبەر(د.خ)، بەیعەتت لەگەڵ دەبەستم.

موختار وتی: لەگەڵ خراپترین کۆیلەیش بەمشێوەیە بەیعەت دەبەستیت. بەشی من لەم کارە هاوشێوەی ئەو کەسە نابێت لەهەمووان لەتۆ دوورترە، سوێند بەخوا تەنیا بەو مەرجە بەیعەت دەبەستم.

عەباس کوڕی سەهل دەڵێت: بەهێواشی بەکوڕی زوبەیرم وت: دینەکەی بکڕەوە تا لەمبارەوە ئەندێشە دەکەیت.

دەڵێت: کوڕی زوبەیر پێی وت: بەداواکەت ڕازیم. دەستی هێنایە پێش و بەیعەتی لەگەڵ بەست. موختار لەگەڵ ئەودا مایەوە تا کاتی گەمارۆی یەکەم کەحەسین کوڕی نەمیری سەکونی هاتە مەککە. لەو ڕۆژەدا جەنگی کرد و لەهەمووان زیاتر تێدەکۆشا. کاتێك مونزەر کوڕی زوبەیر و مسوەر کوڕی مەخریمە و مەسعەب کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی عەوف کوژران، موختار دەنگی بەرز کردەوە: ئەی موسوڵمانان لەدەوری من کۆببنەوە، من کوڕی باوکی عوبەید کوڕی مەسعودم، مَن کەسێکم هێرش دەبەم نەك هەڵبێم، کوڕی هێرشبەرانم نەك هەڵاتووان، ئەی بەرگریکارانی ڕێز و پارێزەرانی شەرەف.

دەڵێت: ئەو ڕۆژە خەڵکی هێنایە جۆش و هەوڵیدا و بوێرانە جەنگی. دواتر لەگەڵ کوڕی زوبەیر لەناو گەمارۆکە مایەوە تا ئەو ڕۆژەی ماڵی خوا سووتا کەڕۆژی شەممە، دوای تێپەڕینی سێ ڕۆژ لەمانگی ڕەبیع الاوەلی ساڵی شەست و چوارەم بوو.

موختار و دەستەکەی ئەو ڕۆژە (نزیکەی سێسەد کەس دەبوون) بوێرانە جەنگان. دەجەنگا تا شەکەت دەبوو، دواتر دادەنیشت و هاوەڵانی دەوریان دەگرت و کاتێك دەحەوایەوە، هەڵدەستا و دووبارە ڕوویدەکردە گۆڕەپانی جەنگ و شمشێری دەوەشاند.

عەباس کوڕی سەهل دەڵێت: ڕۆژی سووتانی کەعبە، کاروباری جەنگ لەئەستۆی عەبدوڵلە کوڕی موتیع و من و موختاردا بوو.

دەڵێت: لەو ڕۆژەدا کەس بوێرتر لەموختار نەبوو.

دەڵێت: ڕۆژێك پێش ئەوەی خەڵکی شام لەمەرگی یەزید ئاگادار بوونەوە، دەجەنگا و ئەمە ڕۆژی شەممە، دوای تێپەڕینی پانزە ڕۆژ لەمانگی ڕەبیع الاخەری ساڵی شەست و چوارەم بوو، خەڵکی شام هیوادار بوون سەرکەوتن بەدەست بێنن و کۆڵانەکانی مەککەیان گرتبوو.

دەڵێت: ئەو ڕۆژە کوڕی زوبەیر هاتەدەر و ژمارەیەکی زۆری خەڵکان بەیعەتیان لەگەڵ بەست.

دەڵێت: منیش لەگەڵ دەستەیەك ڕۆشتمەدەر و لەسووچێکدا دەجەنگاین، موختار لەگەڵ دەستەیەکی دیکە بوو، دەستەیەکی کەمیش لەخەڵکی یەمامە (لەخەواریج) بۆ بەرگریکردن لەکەعبە دەجەنگان. موختار و دەستەکەی لەقۆڵێکدا بوون و عەبدوڵلە کوڕی موتیع لەقۆڵێکی دیکە.

دەڵێت: خەڵکانی شام هێرشیانکردە سەرمن و پاشەکشێیان پێکردین تا ئەوەی پەیوەستی موختار و هاوەڵانی بووین. هەرچیم دەکرد، ئەویش هەمانکاری دەکرد و ئەو هەرچی دەکرد، هەوڵمدەدا، خۆمی لەگەڵ بگونجێنم، کەسم بوێرتر لەو نەبینیوە.

دەڵێت: لەکاتێکدا سەرقاڵی جەنگ بووین، دەستەیەك سوار و پیادەی شام هێرشیانکردە سەرمان. من و موختار و نزیکەی حەفتاکەس بۆ ماڵەکانی مەککە پاشەکشێمان کرد. موختار دەجەنگی و دەیوت: پیاو لەمردن ڕزگاری نابێت، کەس ڕانەکات.

دەڵێت: موختار ڕۆشت، منیش لەگەڵی ڕۆشتم، وتی: کەسێك لەئێوە بۆ شەڕی دەستەویەخەی کەسێك بێت. پیاوێك بەرەوڕووی من هات و یەکی دیکە هێرشیکردە سەر موختار. من بۆ جەنگی ڕکەبەرەکەم ڕۆشتم و کوشتم، موختاریش ڕکەبەرەکەی خۆی کوشت. دواتر بانگی هاوەڵانی خۆمان کرد و هێرشمانکردە سەر دوژمن. سوێند بەخوا بوێرانە جەنگاین و لەهەموو کۆڵانەکان

دوورمان خستنەوە. دواتر بۆ سەر جەنازەی دوو ڕکەبەرە کوژراوەکە گەڕاینەوە.

دەڵێت: کوژراوەکەی دەستی من پیاوێکی سووربار بوو، لەڕۆمییەکان دەچوو و کوژراوکەی دەستی موختار، پیاوێکی ڕەشپێست بووە. موختار پێی وتم: دەزانی، سوێند بەخوا گومان دەکەم ئەم دووانە کوژراوەکانی دەستی ئێمە بن، ئەگەر ئەوان کوژراوی دەستی ئێمە بن، بنەماڵەکەمان و ئەو کەسانەی چاوی هیوایان بەئێمە بەستووە، سەرشۆڕ دەبن چوونکە ئەم دووانە لای من، هاوشێوەی دوو سەگن. چیتر شەڕی دەستەویەخە لەگەڵ کەس ناکەم مەگەر ئەوەی پێشتر بیناسم. وتم: سوێند بەخوا منیش شەڕی دەستەویەخەی کەسێك ناکەم نەیناسم.

دەڵێت: موختار لەگەڵ کوڕی زوبەیر مایەوە تا ئەو کاتەی یەزید کوڕی معاویە مرد و گەمارۆکە کۆتایی پێهات و سوپای شام گەڕایەوە و لەترسی مەرگی یەزید، خەڵکی کوفە، عامر کوڕی مەسعودی سەقەفیان وەك سەرکردەی خۆیان هەڵبژارد تا پێشنوێژ بێت و چاوەڕوان بن موسوڵمانان خەلیفەیەك هەڵبژێرن. مانگی نەخایاند عامر، کوڕی زوبەیری لەبەیعەتی خۆی و خەڵکانی کوفە ئاگادار کردەوە. دوای مەرگی یەزید، موختار بۆ ماوەی پێنج مانگ و چەند ڕۆژ لای کوڕی زوبەیر مایەوە.

سەعید کوڕی عاس دەڵێت: سوێند بەخوا لەگەڵ کوڕی زوبەیر بووم، عەبدوڵڵە کوڕی سەفوان کوڕی وئومەییش هاوڕێی ئەو بوو، بەدەوری کەعبەدا دەسوڕاینەوە. کوڕی زوبەیر چاوی دەگێڕا، موختاری بینیبوو، بەکوڕی سەفوانی وت: سوێند بەخوا لەگورگێك وشیارترە کەدڕندەکان دەوریان گرتبێت.

دەڵێت: کوڕی زوبەیر ڕۆشت و ئێمەیش. دوای ئەوەی بەدەوری کەعبەدا سووڕاینەوە، دوو ڕەکعەت نوێژمان خوێند، موختار هاتەلامان و بەکوڕی سەفوانی وت: کوڕی زوبەیر سەبارەت بەمن چی وت؟

دەڵێت: کوڕی سەفوان هیچی نەدرکاند و وتی: جگە لەچاکە باسی هیچی نەکرد.

وتی: بەڵێ، سوێند بەپەروەردگاری کەعبە دەزانم چی وت، سوێند بەخوا یا دەبێتە شوێنکەوتەی من، یا ئاگری تێبەردەدەم.

دەڵێت: دوای ئەوە، پێنج مانگ لای کوڕی زوبەیر مایەوە و کاتێك بینی کوڕی زوبەیر هیچ کارێکی پێ ناسپێرێت، هەرکەس لەکوفەوە دەهاتە لای، سەبارەت بەبارودۆخی خەڵکی کوفە پرسیاری لێدەکرد.

عەتییە کوڕی باوکی ڕەوقی هەمەدانی دەڵێت: هانی کوڕی باوکی حەییەی وادعی هاتە مەککە و دەیویست عەمرەی مانگی ڕەمەزان بەجێبێنێت، موختار سەبارەت بەخەڵکی کوفە پرسیاری لێکرد، وتی: هەمووان بۆ گوێڕایەڵی کوڕی زوبەیر هاودەنگن بەڵام دەستەیەك لەخەڵك بوونیان هەیە و ئەگەر کەسێك هەبێت و بتوانێت کۆیان بکاتەوە، بەهاوکاری ئەوان دەتوانێت بۆ ماوەیەك سامانی ئەو ویلایەتە بخوات.

موختار پێی وت: من باوکی ئیسحاقم، من کەسی ئەوانم، من ئەوان کۆدەکەمەوە و بەهاوکاری ئەوان، خراپەکاری لەناو دەبەم.

هانی کوڕی باوکی حەییە وتی: ئەی کوڕی باوکی عوبەید، هاوار لەتۆ! ئەگەر دەتوانی ڕێگەی گومڕایی مەگرەبەر! با بەرامبەرەکەیان کەسێکی دیکە بێت چوونکە تەمەنی ئاژاوەچی کورتە و کردەکانی لەکردەی هەمووان خراپتر.

موختار وتی: من بانگێشتی فیتنە ناکەم، ڕێگەی ڕاستیان نیشان دەدەم.

دواتر هەستا و سوارچوارپێکەی بوو و ڕێگەی کوفەی گرتەبەر. کاتێك گەیشتە قورعا، سەلمە کوڕی مورسەدی هەمەدانی (لەپاڵەوانەکانی عەرەب) بینی، پیاوێکی خۆپارێز و چاکەکار بوو. کاتێك چاویان بەیەك کەوت، گفتوگۆیان کرد. موختار لەڕووداوەکانی حیجاز ئاگاداری کردەوە. دواتر بەسەلمە کوڕی مورسەدی وت: لەڕووداوەکانی کوفە ئاگادارم بکەرەوە.

دەڵێت: هاوشێوەی ڕانەمەڕێ کەشوانەکەیان ون کردبێت.

موختار کوڕی باوکی عوبەید وتی: من دەبمە شوانیان و دەیانگەیێنمە مەنزڵ.

سەلمە وتی: لەخوا بترسە و بزانە مەرگ و هەستانەوە لەئارادایە و پاداشتی کردەوەکانی خۆت دەبینی، ئەگەر چاك بێت چاکە و ئەگەر خراپە بێت، خراپە دەبینیت.

دەڵێت: لێکجیابوونەوە و موختار درێژەی بەڕێگەدا و گەیشتە ڕووباری حیرە.

ڕۆژی هەینی بوو. دابەزی و غوسڵی کرد و کەمێك ڕۆنی لەخۆیدا و جلەکانی لەبەر کرد و شمشێرەکەی هەڵواسی و سواربوو، لای مزگەوتی سەکون و گۆڕەپانی کێندە تێپەڕی و لای هەر کۆڕێك تێپەڕی، سڵاوی دەکرد و دەیوت: مژدەی سەرکەوتن، ئەوەی دەتانویست، هات.

دەڵێت: ڕۆشت و گەیشتە مزگەوتی منداڵەکانی زوهەل و منداڵەکانی حوجر، کەسی لەوێ نەبینی چوونکە خەڵك لەنوێژی هەینی بوون. ڕۆشت و گەیشتە مزگەوتی گەڕەکی منداڵەکانی بودا و عوبەیدە کوڕی عەمرۆ بودی کێندی بینی و سڵاوی لێکرد و وتی: مژدەی سەرکەوتن، ئەی باوکی عومەر! تۆ بۆچوونێکی گونجاوت هەیە لەگەڵ ئەوەی خواوەند هەموو گوناحەکانی تۆ دەبەخشێت و لەهەڵەکانت چاوپۆشی دەکات.

دەڵێت: عوبەیدە یەکێك لەبوێران و شاعیرەکان بوو، خوازیاری هاوڕێیەتی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و شەرابی دەخواردەوە، کاتێك موختار گفتوگۆی لەگەڵ کرد، وتی: خواوەند مژدەی خێرت پێببەخشێت، مژدەت بەئێمەدا، ئایا ڕوونیدەکەیتەوە؟

وتی: بەڵێ، ئەمشەو لەماڵەکەم سەردانم بکەن.

عوبەیدە کوڕی عەمرۆ دەڵێت: موختار ئەم قسانەی پێ وتم، دواتر وتی: لەماڵەکەم بمبینە و بەخەڵکانی ناو مزگەوت بڵێ کەخواوەند پەیمانی لێوەرگرتوون گوێڕایەڵی ئەو بن و خراپەکاران بکوژن و چاکەخوازی بنەماڵەی پێغەمبەر(د.خ) بن تا بۆ ڕێگەی ڕاست ڕێنوێنیان بکات.

دەڵێت: بەڕێکەوت و پێی وتم: ڕێگەی گەڕەکی منداڵەکانی هیند لەکوێیە؟

پێم وت: چاوەڕێبە ڕێگەت نیشان بدەم. داوای ئەسپەکەم کرد، زینیان کرد و سوار بووم.

دەڵێت: لەگەڵ ئەو بەرەو گەڕەکی تایەفەی منداڵەکانی هیند بەڕێکەوتووم، پێی وتم: بمبە بۆ ماڵی ئیسماعیل کوڕی کەسیر.

دەڵێت: ئەوم بۆ ماڵی ئیسماعیل برد، کاتێك موختاری بینی، بەخێرهاتنی کرد. موختار دوا و مژدەی پێدا و وتی: ئەمشەو تۆ و براکەت و باوکی عەمرۆ،

لەماڵەکەم سەردانم بکەن چوونکە بەمژدەی خۆشەوە هاتووم.

دەڵێت: ڕۆشت و ئێمەیش لەگەڵی ڕۆشتین تا گەیشتە مزگەوتی جوهەینە، دواتر بەرەو دەروازەی فیل ڕۆشت و چوارپێکەی لەوێ بەستەوە و ڕۆشتە ناو مزگەوت. خەڵکان بینیان و وتیان: ئەوە موختارە گەڕاوەتەوە.

دەڵێت: موختار لای یەکێك لەکۆڵەکەکانی مزگەوت وەستا و نوێژی خوێند تا ئەوەی نوێژی جەماعەت دەستی پێکرد و هاتە ناو ڕیزەکەوە. دواتر بەرەو کۆڵەکەیەکی دیکە ڕۆشت و تا نوێژی ئێواریێ، سەرقاڵی نوێژ خوێندن بوو. کاتێك بەجەماعەت نوێژی ئێواریێ خوێند، ڕۆشت.

عامری شەعبی دەڵێت: موختار کەجلوبەرگی سەفەری لەبەردابوو، لای هەمەدانییەکان تێپەڕی و وتی: مژدەی سەرکەوتن و شادوومانی ئێوەم هێناوە. ڕۆشت و لەماڵەکەی خۆی جێگیر بوو، ئەو ماڵەی هەنووکە بەماڵی سەلەم کوڕی موسەییب ناسراوە. شیعەکان هاتوچۆیان دەکرد و لەوێ لەدەوری موختار کۆدەبوونەوە.

عوبەیدە کوڕی عەمرۆ دەڵێت: هەمانشەو، وەك پێشتر بەڵێنماندابوو، ڕۆشتینە لای موختار و کاتێك کۆبووینەوە و دانیشتین، سەبارەت بەکاروباری شیعەکان پرسیاریکرد، وتمان: شیعەکان لەدەوری سلێمان کوڕی سەردی خوازعی کۆبوونەتەوە و زۆری پێناچێت، شۆڕش دەستپێدەکەن.

دەڵێت: سپاسی خواوەندی کرد، سڵاواتی بۆ پێغەمبەر(د.خ) نارد و وتی:

(( بەڵام دواتر، مەهدی کوڕی جێنشین، محەممەد کوڕی عەلی منی بۆ لای ئێوە ناردووە کەبرواپێکراو و وەزیر و هەڵبـژێردراوی ئەوم و فەرمانی پێداوم دژی ناباوەڕان بجەنگم و بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی بنەماڵەکەی شۆڕش بکەم و بەرگری لەناتەوانەکان بکەم.

فوزەیل کوڕی خودەیج دەڵێت: عوبەیدە کوڕی عەمرۆ و ئیسماعیل کوڕی کەسیر دەیانوت یەکەم ئافرێنراوی خواوەند بوو وەڵامی بانگەوازەکەیان دایەوە و دەستی بەیعەتیان بۆ درێژ کرد.

دەڵێت: موختار کەسی بۆ لای ئەو شیعانە دەنارد کە لەدەوری سلێمان کوڕی

سەرد کۆبووبوونەوە، پێی دەوتن:

(( لەلایەن گەورەی باوەڕداران و کانی چاکییەکان و جێگر و لەلایەن ئیمامی مەهدییەوە هاتووم، بەمژدەیەك کەشیفای لەگەڵدایە و نهێنییەکان ئاشکرا و دوژمنەکان لەناو دەبات، سلێمان کوڕی سەرد (خوا ئێمە و ئەو ببەخشێت) پیرێکی پەککەوتەیە و ئەزموونێکی ئەوتۆی نییە و لەجەنگ بێ ئاگایە، دەیەوێت بتانبات، خۆی بەکوشتن بدات و ئێوەیش. بەپێی ئەو فەرمانەی پێیان کردووم و بەوشێوەی بۆیان ڕوونکردوومەتەوە، کارەکان ڕادەپەڕێنم و جێبەجێیان دەکەم کەدەبێتە هۆکاری سەربەرزی ئێوە و کوژرانی دوژمنان و فێنکبوونەوەی دڵتان، گوێ لەوتەکانم بگرن و ملکەچی فەرمانەکانم بن، دڵخۆش بن و مژدەی سەرکەوتن بەیەك بدەن، من دەستەبەری هەموو ئارەزوو و ئاواتەکانی ئێوەم)).

دەڵێت: سوێند بەخوا ئەوەندە وتەکانی دووبارە کردەوە کەدەستەیەك لەشیعەکان لەدەوری کۆبوونەوە و هاتوچۆیان دەکرد، ڕێزیان لێدەگرت و بەگەورەیان دەزانی و چاودێری کارەکانیان دەکرد، بەلاّم زۆربەی شیعەکان و سەرکردەکانیان لەدەوری سلێمان کوڕی سەرد بوون، سیلّمان پیری شیعە و بەتەمەنترینی ئەوان بوو، کەسیان بەگەورەتر لەو نەدەزانی، بەلاّم موختار توانی ژمارەیەك لەوان لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە. سلێمان کوڕی سەرد، گەورەترین بەربەستی موختار بوو.

دەڵێت: سلێمان کوڕی سەرد هەموو شتێکی ئامادە کرد و دەیویست ئالاّی شۆڕش بەرز بکاتەوە، بەلاّم موختار نەیدەویست بجووڵێتەوە و کارێك بکات، دەیویست ببینێت بەسەرهاتی سلێمان بەکوێ دەگات، چاوەڕوان بوو شیعەکانی دەوری سلێمان دواتر لەدەوری ئەم کۆببنەوە و بەهێز ببێت.

دەڵێت: کاتێك سلێمان کوڕی سەرد شۆڕشەکەی دەستپێکرد و ڕوویکردە جەزیرە، عومەر کوڕی سەعد کوڕی باوکی وەقاس و شیبس کوڕی ڕیبعی، بە عەبدوڵڵە کوڕی یەزیدی خوتەمی و ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی تەڵحەیان وت: موختار لەسلێمان کوڕی سەرد مەترسیدارترە. سلێمان بۆ جەنگی دوژمنانی ئێوە ڕۆشتووە و ئەوان ڕیسوا دەکات و لەسەرزەمینەکەی ئێوە ڕۆشتۆتەدەر، بەلاّم

موختـار دەیـەوێت لـەم شـارە هێرشـتان بکاتەسـەر. بڕۆن و بیگـرن بـا لەزیندانـدا بمێنێـەوە تا ئەو کاتەی بارودۆخ سەقامگیر دەبێت.

دەڵێت: لەگەڵ دەستەیەك ڕوویانکردەماڵەکەی و لـەناکاو هەستیکرد کـەخۆی و ماڵەکەی گەمارۆ دراوە. ئەویان لەماڵەکەی هێنایەدەر و کاتێك ئەوانی بینی، وتـی: چی ڕوویداوە، سوێند بەخوا سەرکەوتنێکی گەورەتان بەدەست نەهێناوە.

دەڵێت: ئیبراهیم کوڕی محەممەد کوڕی تەڵحە بە عەبدوڵڵە کوڕی یەزیـدی وت: بازووی ببەستەوە و بەپێ بەڕێکەوێت.

عەبدوڵڵە کوڕی یەزید وتی: سبحان الله، من پێپۆشەکانی لەپێ داناکەنم و بەپێ ئەو نابەم. لەگەڵ پیاوێك کەئاشکرا دوژمنایەتی و جەنگی لەگەڵ ئێمە نەکردووە و تەنیا لەڕووی گومانەوە گرتوومانە.

دەڵێت: ئیبراهیم کوڕی محەممەد، بەموختاری وت: ئێرە، شوێنی مانەوەی تـۆ نییـە، بەڕێکەوە، ئەی کوڕی باوکی عوبەیـد، ئەم دەنگۆیانـە چییە لـەتۆوە بەئێمـە دەگات؟

وتی: ئەوەی سەبارەت بەمن بیستووتانە، درۆیە، پەنا دەبەم بـەخوا هاوشێوەی خیانەتێك وەك خیانەتی باوك و باوەگەورێی تۆ.

فوزەیل دەڵێت: سوێند بەخوا بینیم لەماڵەکەی هێنایانەدەر، بیستم بـەئیبراهیم کوڕی محەممەدی وت بەڵام نازانم ئیبراهیم بیستی یا نە. کاتێك ئـەم وتـەی هێنایـە سەرزمان، بێدەنگ بوو.

دەڵێت: ئیسترێکی ڕەشیان هێنا تا موختار سواری بێت. ئیبراهیم بە عەبدوڵڵە کوڕی یەزیدی وت: نایبەستیتەوە؟

وتی: زیندان باشترین جێگایە.

یـەحیا کـوڕی بـاوکی عیـسا دەڵێـت: لەگـەڵ حەمیـد کـوڕی موسـلیمی ئـەزدی لەزینداندا سەردانی موختارمان کرد.

دەڵێـت: بیـستم دەیـوت: سـوێند بەپـەروەردگاری دەریاکـان و دارخورماکـان و بیابان و فریشتە چاکەکارەکان و هەڵبژێردراوان کەهەموو ستەمکاران بەشمشێری بڕەرر و بەهاوکاری هاوەڵان لەناو دەبەم و کاتێك کۆڵەکەی دینم چەقاند و کـەلێنی

نێوان موسوڵمانانم نەهێشت و دڵی باوەڕداران فێنك بوویەوە و تۆڵەی پێغەمبەرانم کردەوە، لەنەمان لەسەر گۆی زەوی باکم نییە.

دەڵێت: هەرکات لەزیندان سەردانم دەکرد، ئەم وتەی دووبارە دەکردەوە تا ئەو کاتەی لەزیندان هاتەدەر.

دەڵێت: دوای ئەوەی کوڕی سەرد پۆشت، موختار لای هاورێکانی بوێری لەخۆی نیشانددا.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەم ساڵەدا کوڕی زوبەیر ماڵی خوای وێران کرد چوونکە دیوارەکانی بەهۆی بەردی مەنجەنیقەکانەوە خوار بووبوو.

عیکرەمە کوڕی خالید دەڵێت: کوڕی زوبەیر کەعبەی وێران و لەگەڵ زەوی تەختیکرد، دواتر کۆڵەکەکانی هەڵکەند و حوجری پەیوەستی کەعبە کرد. کەسان لەدەرەوەی کۆڵەکەکان بەدەوری کەعبەدا دەسووڕانەوە و ڕوو لەحوجر نوێژیان دەخوێند. حەجەرلئەسوەدی لەپارچەیەکی هەوریشمینەوە ئالآند و لەناو سنووقێك لای خۆی هەڵیگرت، زێڕوزیوەکانی ناو کەعبە و جلوبەرگەکان و بۆنەخۆشەکانی لای حاجییەکانی لێپرسراوی خەزێنە دانا و کاتێك سەر لەنوێ بیناکەی نۆژەن کردەوە، ئەوانی گەڕاندەوە بۆ شوێنی خۆی.

عەتا دەڵێت: بینیم کوڕی زوبەیر هەموو شوێنیکی وێران و تەختی زەوی کرد.

لەم ساڵەدا عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر ڕێوڕەسمی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. کارگوزارەکەی لەمەدینە، براکەی عوبەیدە کوڕی زوبەیر بوو. کارگوزاری کوفە، عەبدوڵڵە کوڕی یەزیدی خوتەمی بوو، کاروباری دادی کوفە لەئەستۆی سەعد کوڕی نیمران بوو چوونکە شورەیح پێشتر دەستی لەکار کێشابوویەوە و وەك دەگێڕنەوە، وتبووی: من لەسەردەمی ئاژاوە و فیتنە، دادوەری ناکەم. کارگوزاری بەسرە عەبدوڵڵە کوڕی مەعمەری تیمی و کاروباری داد لەئەستۆی هوشام کوڕی هوبەیرەدا بوو. کارگوزاری خوراسان عەبدوڵڵە کوڕی خازم بوو.

ساڵی شەست و پێنجەمی کۆچی دەستیپێکرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی شەست و پێنجی کۆچی

لەڕووداوەکانی ئەم ساڵە، ڕووداوی تۆبەکەران بوو کە بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوەی خوێنی حسەین کوڕی عەلی، بۆ لەناوبردنی عوبەیداللە کوڕی زیاد بەڕێکەوتن.

عەبدوڵلە کوڕی عەوف ئەحمەری دەڵێت: کاتێك سلێمان کوڕی سەرد مەبەستی ڕۆشتنی کرد (لەساڵی شەست و پێنجەمی کۆچی) کەسی بۆ لای هاوەڵان و شوێنکەوتەکانی نارد. کاتێك کۆبوونەوە و هیلالی مانگی ڕەبیع الاخر بینرا، لەگەڵ سەرکردەی هاوەڵانی بەڕێکەوت. ئەو شەوەی بۆ ڕۆشتن لەگەڵ هەموو شوێنکەوتەکانی خۆی، ئوردووگای نەخلیەیان دیاریکردبوو. سلێمان گەیشتە ئوردووگاکە و بەناو کەسان و سەرکردەکانی سوپاکەیدا گەڕا و بینی ژمارەیان بەئەندازەی پێویست نییە. بەمپێیە، حەکیم کوڕی مەنقەزی کێندی لەگەڵ چەند سوارێك و وەلید کوڕی غەزینی کەنانی لەگەڵ چەند سوارێکی دیکەنارد و وتی: بڕۆنە ناو کوفە و هاوار بکەن ئەی تۆڵەستێنەکانی خوێنی حسەین. بڕۆنە مزگەوتی گەورە و بەدەنگی بەرز هاوار بکەن. ئەوان ڕۆشتن و یەکەم کەسان بوون ئەم دروشمەیان بەرز کردەوە.

دەڵێت: حەکیم کوڕی مەنقەزی کێندی لەگەڵ سوارەکان ڕۆشت، وەلید کوڕی غەزینیش بەهەمانشێوە و لای تایەفەی مناڵەکانی کەسیر گوزەریانکرد. یەکێك لەمناڵەکانی کەسیر بەناوی عەبدوڵلە کوڕی خازم لەگەڵ هاوسەرەکەی سەهلە کچی سەبرەی کوڕی عەمرۆ (ئەویش لەمناڵەکانی کەسیر بوو) کەژنێکی جوان و خۆشەویستی مێردەکەی بوو و کاتێك ئەو دروشمەی بیسترا، لەگەڵ ئەوەی نەڕۆشتبووە لای شیعەکان و پەیوەستیان نەبووبوو، بەرەو جلەکانی ڕۆشت و لەبەری کرد، سیلاحەکەی هەڵگرت و داوایکرد ئەسپەکەی بۆ زین بکەن. ژنەکەی وتی: مەگەر شێت بوویت؟

وتی: نا، سوێند بەخوا ئەو بانگەوازەم بیست و وەڵامی دەدەمەوە و بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی ئەو پیاوە دەڕۆم، یا دەمرم یا خواوەند فەرمانی خۆی

لەوبارەوە ڕەوانە دەفەرمێت.

ژنەکەی وتی: کوڕە بچکۆڵەکەمان بەکێ دەسپێریت؟

وتی: بەپەروەرگاری تاقانە، خواوەندا، ماڵ و منداڵەکەی خۆم بەتۆ دەسپێرم، بیانپارێزە.

دەڵێت: کوڕەکەی ناوی عوزرە بوو، تەمەنی زیادیکرد و دواتر لەگەڵ مەسعەب کوڕی زوبەیر کوژرا.

دەڵێت: عەبدوڵڵە ڕۆشت و پەیوەستی نێردراوەکانی سلێمان کوڕی سەرد بوو، هاوسەرەکەی دانیشت و گریانی دەستپێکرد و ژنانی دیکە لەدەوری کۆبوونەوە.

دەڵێت: ئەو شەوە سوارەکان بەناو کوفەدا گەڕان و دوای تاریکبوونی هەوا، گەیشتنە مزگەوت، ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان بۆ نوێژ ڕیزیان بەستبوو و دروشمی تۆڵەی خوێنی حسەینیان بەرز کردبوویەوە. باوکی عوزەی فایزی لەناو ئەواندا دەبینرا. کەرب کوڕی نەمران لەمزگەوت نوێژی دەخوێند، وتی: ئەی تۆڵەستێنەکانی خوێنی حسەین، ئێوە لەکوێن؟

وتیان: لەنەخلییە.

دەڵێت: شمشێری هەڵگرت، داوای ئەسپەکەی کرد و ویستی سوار بێت کەکچەکەی ڕەواغ (هاوسەری سەبیت کوڕی مورسەدی فایزی) هات و وتی: بابە گیان، دەبیت شمشێرت بەستووە و خۆت ئامادە کردووە؟

وتی: کچم، باوکت لەتاوانی گوناحەکەی بەرەو پەروەدگار غار دەدات. کچ گریانی دەستپێکرد. خزم و ئامۆزەکانی کەرب هاتن. ماڵئاوایی لێکردن و پەیوەستی شیعەکان بوو.

دەڵێت: سلێمان کوڕی سەرد شەوی نەگەیاندە بەیانی کەژمارەیەك هاوتای ژمارەی ئەو کەسانەی پێشتر لەنەخلییە چاوەڕێیان دەکرد، پەیوەستی بوون.

دەڵێت: دەمەوبەیان داوای دەفتەرەکەی کرد تا ژمارەی ئەو کەسانە بزانێت کەبەیعەتیان لەگەڵ کردبوو. شانزە هەزار کەس بوون.

وتی: سبحان الله، لەشانزە هەزار کەس تەنیا چوار هەزار کەس ئامادەیە.

حەمید کوڕی موسلیم دەڵێت: بەسلێمان کوڕی سەردم وت: سوێند بەخوا

موختار خەڵکان لەتۆ دوور دەخاتەوە. من یەکێك لەو سێ کەسە بووم پێش هەمووان گەیشتمە لای. بیستم ژمارەیەك لەهاوەڵانی دەیانوت: دوو هەزار کەس کۆدەکەینەوە.

وتی: ئەوە دوو هەزار کەس، بۆ دەهەزار کەس دیار نییە؟ مەگەر ئەوان باوەڕیان نییە؟ مەگەر لەخواوەند ناترسن؟ مەگەر خوا و پەیمان و بەڵێنەکانیان لەبیرکردووە؟

دەڵێت: سێ ڕۆژ لەنەخلییە مایەوە. کەسان و بڕواپێکراوانی خۆی بۆ لای خەڵکان دەنارد و خواوەند و پەیمانەکانی بیردەخستنەوە و نزیکەی هەزار کەسی دیکە پەیوەستی بوون.

دەڵێت: موسەییب کوڕی نەجبە ڕۆشتە لای سلێمان کوڕی سەرد و وتی: خوا بتبەخشێت، ئەوەی نابەدڵ پەیوەستی سوپاکەت بێت، سوودی نابێت، جگە لەو کەسانەی بەحەز و ویستی خۆیان هاتوون، کەس ناجەنگێت. چاوەڕوانی کەس مەبە و ئەندێشە لەمەبەستەکانی خۆت بکە.

سلێمان وتی: بۆچوونەکت ڕاست و شیاوە. دواتر وتارێکی پێشکەش بەخەڵکانکرد، پشتی بەکەوانێکی عەرەبی دابوو، وتی: ئەی خەڵکینە، هەرکەس بەمەبەستی بەدەستهێنانی پاداشتی خواوەندی هاتووە، لەئێمەیە و ئێمە لەوین، هیوادارین خواوەند لەژیان و مەرگ هاوکاری بێت وهەرکەس بەمەبەستی سامانی دنیا هاتووە، سوێند بەخوا بەمەبەستی کۆکردنەوەی تالآنی لێرە نین و جگە لەڕەزامەندی پەروەردگار، زێڕ و زیو و پارچەی گرانباییمان پێ نییە. تەنیا شمشێرمان لەشان و ڕممان بەدەستە و توێشوویەکی کەم تا کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن. هەرکەس مەبەست و نییەتی جیاوازە لەئێمە بگەڕێتەوە.

دەڵێت: سوخەیر کوڕی حوزەیفەی موزنی هەستا و وتی: ڕزگار بوویت و خواوەند بەڵگەکانی خۆی نیشاندایت. سوێند بەو خوایەی جگە لەو خوایەك نییە، هاودەمی و هاونشینی لەگەڵ ئەو کەسانەی تەنیا بیر لەسامانی دنیا دەکەنەوە، خێری تێدا نییە، ئەی خەڵکینە، تۆبە لەگوناح و تۆڵەسەندنەوەی خوێنی کوڕی

کچی پێغەمبەر(د.خ)، بۆ ئەم شۆڕشە ناچاری کردووین، دینار و درهەممان پێ نییە، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی شمشێر و نووکی ڕمەکان دەڕۆین. خەڵکان دەنگیان بەرز کردەوە: بۆ دنیا نەهاتووین و مەبەستمان ڕەزامەندی پەروەردگارە.

سەدی کوڕی کەعبی ئەزدی دەڵێت: ڕۆشتینە لای هاوەڵانی عەبدوڵڵە کوڕی سەد تا ماڵئاواییان لێبکەین.

دەڵێت: ئەو هەستا و ئێمەیش هەستاین. ڕۆشتە ناو خێوەتەکەی سلێمان، ئێمەیش لەگەڵی بووین. سلێمان بڕیاریدا بوو بەڕێکەوێت. عەبدوڵڵە کوڕی سەعد پێی وت بۆ جەنگی عوبەیداڵڵە کوڕی زیاد بڕوات. سلێمان و سەرکردەکانی وتیان: بۆچوونەکەی عەبدوڵڵە کوڕی سەعد گونجاوە و دەبێت بۆ جەنگی عوبەیداڵڵە کوڕی زیاد بڕۆین چوونکە بکوژی حسەینە و بەڵاکان لەلایەن ئەوەوە بەسەر ئێمەدا باریوە.

عەبدوڵڵە کوڕی سەعد بەسلێمان و سەرکردەکانی وت: ئەمە بۆچوونی منە و ئەگەر ڕاست بێت، ڕەزامەندی پەروەردگارە و ئەگەر نەبێت، لەلایەن منەوەیە و لەمۆجیاریکردنی ئێوە دەست هەڵناگرم تەنانەت ئەگەر ڕاست یا هەڵە بێت. ئێمە بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوەی خوێنی حسەین لێرەین و بکوژەکانی حسەین هەموویان لەکوفەن: کەسانی وەك عومەر کوڕی سەعد کوڕی ئەبی وەقاس و سەرکردە و گەورەی هۆزەکان. بۆ لێرە بڕۆین و بکوژەکانی ئەو لەبیر بکەین؟

سلێمان کوڕی سەرد وتی: بۆچوونی ئێوە چییە؟

وتیان: بۆچوونەکەی ڕاستە، سوێند بەخوا ئەگەر بەرەو شام بڕۆین لەبکوژەکانی حسەین تەنیا عوبەیداڵڵە کوڕی زیاد دەبینین. بکوژەکانی حسەین لێرە و لەکوفەن.

سلێمان کوڕی سەرد وتی: بەڵام بۆچوونی من جیاوازە، ئەوەی هاوڕێکەی ئێوەی کوشت و سوپای بۆ جەنگی ئەو نارد، لای ئێمە ئەمانی نییە مەگەر ئەوەی تەسلیم بێت و فەرمانی خۆمان سەبارەت بەو بدەین، ئەوە خراپەکاری کوڕی خراپەکار، کوڕی مەرجانە، عوبەیداڵڵە کوڕی زیاد بوو. بەناوی خواوەند بۆ جەنگی دوژمنەکەتان بەڕێکەون. ئەگەر خواوەند سەرکەوتنی پێبەخشین، هیوادارم

کەسانی دوای ئەو، هێزی کەمتریان هەبێت و چاوەڕوان دەکرێت ئەم کەسانە لەخەڵکی شارەکەتان کەبەجێیان دێڵن، خۆیان بەن بەدەستەوە بۆ ئەوەی بتوانن ئەوەی بەشداری کوشتنی حسەینی کردووە، بیکوژن و لەدژواریدا نەبن و ئەگەر شەهید بوون، لەگەڵ خراپەکاران جەنگاون و ئەوەی لای پەروەردگارە، بۆ چاکەکاران و ڕاستکرداران باشترە. سوێند بەخوا ئەگەر بەیانی لەگەڵ خەڵکی شارەکەتان بجەنگن بەو شێوە دەبێت کەهەرکەس کەسێك دەبینێت باوك یا برا یا هاوڕێ یا پیاوێکی کوشتووە کەخوازیاری کوشتنی ئەو نەبووە. لەپەروەردگار بپاڕێنەوە و بەڕێکەون. خەڵکان بۆ ڕۆشتن خۆیان ئامادە کرد.

دەڵێت: عەبدوڵڵە کوڕی یەزید و ئیبراهیم کوڕی محەممەد لەڕۆشتنی کوڕی سەرد و شوێنکەوتەکانی ئاگاداربوونەوە و ئەندێشەیان کرد. پێیان باشبوو بڕۆنە لایان و داوایان لێبکەن ببنە هاوپەیمانیان و ئەگەر لەسەر ڕۆشتن پێداگرییانکرد، بخوازن چاوەڕێ بن تا سوپایەك کۆدەکەنەوە و لەگەڵ ئەوان بۆ جەنگی دوژمنان ڕەوانەی بکەن.

دەڵێت: عەبدوڵڵە کوڕی یەزید و ئیبراهیم کوڕی محەممەد، سوەید کوڕی عەبدولڕەحمانیان بۆ لای کوڕی سەرد نارد، وتی: عەبدوڵڵە و ئیبراهیم دەڵێن ئێمە دەمانەوێت بۆ کارێك کەڕەزامەندی پەروەردگاری تێدایە، سەردانت بکەین.

سلێمان وتی: مۆڵەتیان هەیە. دواتر بەڕەفاعە کوڕی شەدادی بەجلی وت: کەسان ئامادە بکە چوونکە ئەم دوو پیاوە پەیامێکی لەوشێوەیان ناردووە.

دواتر سەرکردەکانی لەدەوری خۆی کۆکردەوە و زۆری نەخایاند عەبدوڵڵە کوڕی یەزد و سەرکردە و گەورەکانی کوفە و پاسەوانەکان و ژمارەیەك لەجەنگاوەران هاتن. ئیبراهیم کوڕی محەممەدیش لەگەڵ ژمارەیەك لەهاوەڵانی هات. عەبدوڵڵە کوڕی یەزید بەو کەسانەی دەوت کە لەکوشتنی حسەین بەشدار بوون: لەگەڵ مندا مەبە چوونکە دەترسا ئەگەر شوێنکەوتەکانی سلێمان ئەوان ببینن، هێرشیان بکەنەسەر. عومەر کوڕی سەعد لەو کاتەی سلێمان لەنەخلییە ئوردووی لێدابوو، شەوانی لەکۆشکی فەرمانڕەوایەتی بەسەر دەبرد لەترسی ئەوەی نەکا شەوان هێرش بکەنەسەر ماڵەکەی و بەناکاو بیکوژن.

عەبدوڵڵە کوڕی یەزید بەعەمرۆ کوڕی حورەیسی وتبوو: ئەگەر دواکەوتم، پێشنوێژی بۆ خەڵکان بکە.

دەڵێت: کاتێک عەبدوڵڵە کوڕی یەزید و ئیبراهیم گەیشتنە لای سلێمان، عەبدوڵڵە هەستا، سپاسی خواوەندی کرد و وتی:

موسوڵمان برای موسوڵمانە و خیانەتی لێناکات، ئێوە برادەران و هاوشارییانی ئێمەن و زیاتر لەخەڵکی هەموو شارەکانی دیکە، ئێوەمان خۆش دەوێت. ئێمە گرفتاری بەلاَ و جەنگی خۆتان مەکەن و لەسەر ڕۆشتن پێداگر مەبن و بەجیابوونەوە لەموسوڵمانان ژمارە و هێزی ئێمە لاواز مەکەن. بمێننەوە تا خۆمان ئامادە بکەین و کاتێك زانیمان دوژمن لەشارەکەمان نزیکبۆتەوە، بەهەموو هێز و توانای خۆمان ڕووبەڕوویان دەبینەوە.

دەڵێت: ئیبراهیم کوڕی محەممەدیش هاوشێوەی عەبدوڵڵە قسەی کرد. دواتر سلێمان، سپاسی خواوەندی کرد و وتی: دەزانم کەسێکی چاکەخواز و نییەت پاکیت و بۆ ڕاوێژکردن شیاویت. ئێمە پشتمان بەپەروەردگار بەستووە و لەڕێگەی خوادا دەجەنگین. بۆ مەبەستێك لێرە کۆبووینەتەوە و دەخوازین خواوەند بۆ ڕێگەی ڕاست ڕێنوێنمان بکات. بەخواستی خوا دەڕۆین.

عەبدوڵڵە کوڕی یەزید وتی: چاوەڕێ بن تا سوپایەکی گەورە پەیوەستی ئێوە بکەین و بەهاوکاری ئەوان ڕووبەڕووی دوژمن ببنەوە.

سلێمان وتی: ئێوە دەڕۆن و ئێمە ئەندێشە لەم پێشنیارە دەکەین و وەلاَمتان دەدەینەوە.

عەون کوڕی باوکی جوحەیفەی سوائی دەڵێت: عەبدوڵڵە کوڕی یەزید و ئیبراهیم پێشنیاریان بەسلێمانکرد لەگەڵ ئەوان بمێنێتەوە تا پێکەوە ڕووبەڕووی خەڵکی شام ببنەوە بەو مەرجەی خەراجی جوخی تایبەت بکەن بەوان.

سلێمان وتی: بەمەبەستی کۆکردنەوەی ماڵی دنیا شۆڕشمان نەکردووە.

دەڵێت: بۆیە ئەو پێشنیارەیان کرد چوونکە بیستبوویان عوبەیداڵڵە کوڕی زیاد دەیەوێت هێرش بکاتە سەر عێراق.

دەڵێت: عەبدوڵڵە و ئیبراهیم بۆ کوفە گەڕانەوە و سلێمان و شوێنکەوتەکانی

بڕیاریاندا بۆ جەنگی کوڕی زیاد بڕۆن و کاتێک بینییان شوێنکەوتەکانیان لەخەڵکی بەسرە و مەداین لەشوێنی پێویست، ئامادە نەبوون، کەسانێک لەهاوەڵانی سلێمان هاتن وسەرکۆنەیان کردن.

بەڵام سلێمان وتی: سەرکۆنەیان مەکەن، کاتێک لەمەبەست و بەڕێکەوتنی ئێوە ئاگادار ببنەوە، بەخێرایی پەیوەستی ئێوە دەبن. گومان دەکەم لەبەر ئەوە بەجێماون کەخەرجی پێویستیان بۆ کۆکردنەوەی کەرەستە پێ نییە و چاوەڕێی ئەوەن و کاتێک پەیوەستی ئێوە دەبن، بەهێز و کەرەستەی پێویستەوە دێن.

دەڵێت: سلێمان وتارێکی پێشکەش بەشوێنکەوتەکانی کرد، وتی:

(( ئەی خەڵکینە، خواوەند لەنییەتی ئێوە ئاگادارە و دەزانێت بۆ چ مەبەستێک شۆڕش دەکەن. دنیا بازرگانی هەیە و ڕۆژی پسلانیش بەهەمانشێوە. بازرگانی ئەو دنیا بەمەبەستی کۆکردنەوەی توێشووی ڕۆژی پسلان هەوڵ دەدات و لەبەرامبەر هیچ شتێک نایگۆڕێتەوە. بەردەوام سەرقاڵی خواپەرەستی و نوێژە. زێڕ و زیو و ماڵی دنیا، چێژی پێنابەخشێت. بەڵام بازرگانی دنیا مەبەستی کۆکردنەوەی سامانە و جگە لەوە هیچی ناوێت. خوا بتانبەخشێت، لەم سەفەرەدا، شەوان بەردەوام نوێژ بخوێنن و بەهەموو شێوەیەک خۆتان لەپەروەردگار نزیک بکەنەوە تا ڕووبەڕووی ئەو دوژمنە ستەمکارە دەبنەوە چوونکە لەپێشگای خواوەند هیچ کەرەستەیکتان نییە جگە لەپاداشتی جیهاد و نوێژ. هیوادارم پەروەردگار ئێمە و ئێوە لەڕیزی بەندە چاکەکارەکان لەقەڵەم بدات و بتوانین لەدژواری و سەختییەکان خۆڕاگربین. بەخواستی خوا، ئەمشەو ئەم مەنزڵگەیە بەجێدێڵین.

دەڵێت: بەڕێکەوتن و بەڕێکەوتنیان لەئێوارێی هەینی، پێنج ڕۆژی یەکەمی مانگی ڕەبیع الاخری ساڵی شەست و پێنجەم بوو.

دەڵێت: سلێمان و شوێنکەوتەکانی نەخلیەیان بەجێهێشت. سلێمان، حەکیم کوڕی مەنقەزی بانگرد و فەرمانی پێدا لەناو سوپاکەی جاڕ بدات کەس شەو لەمبەرەوەی دێری ئەعوەر نەمێنێتەوە و دەبێت هەمووان شەو لەدێری ئەعوەر بەسەر ببەن. ژمارەیەکی زۆر بەجێمابوون. سلێمان بەڕێکەوت و لەئەقساسی

مالیك، لەسەر کەناری فورات جێگیر بوو. لەوێ بەناو سوپاکەیدا گەڕا و هەزار کەسی ئەوانی جیاکردەوە. وتی: حەزم نەدەکرد ئەوانەی بەجێمابوون، لەگەڵ ئێوەدا دەبوون چوونکە جگە لەسەرگەردانی و پەرێشانی هیچ سوودێکی دیکەیان پێنەدەبەخشین. خواوەند نەیویست بێن و ڕێگەی هاتنی لێگرتن و ئەم چاکییەی تایبەت کرد بەئێوە. سپاسی پەروەردگار بکەن.

دواتر شەوانە مەنزڵگەی بەجێهێشت و بەرەبەیان لەنزیك گۆڕی حسەین کوڕی عەلی بوون و شەو و ڕۆژێك لەوێ مانەوە و بەردەوام دەپاڕانەوە و دۆعای خێریان دەکرد.

دەڵێت: کاتێك گەیشتنە سەر گۆڕەی حسەین کوڕی عەلی، بەیەکجار دەنگیان بەرز کردەوە و گریان.

عەبدولڕەحمان کوڕی غەزییە دەڵێت: کاتێك گەشتینە سەر گۆڕی حسەین کوڕی عەلی، هەموومان دەستمان بەگریان کرد و خەڵکان ئارەزوویان دەکرد ئەو ڕۆژە لەگەڵ ئەودا دەکوژران.

سلێمان وتی: خواوەندا، حسەینی شەهید کوڕی شەهید، مەهدی کوڕی مەهدی، سدیق کوڕی سدیق ببەخشە، خواوەندا تۆ بەشایەت دەگرین کەئێمە لەسەر دین و ڕێگەی ئەوانین و دوژمنی بکوژەکان و شوێنکەوتەی هاوەڵانیانین.

دواتر دابەزی و سوپاکەیشی بەهەمانشێوە.

باوکی ساجق دەڵێت: کاتێك سلێمان کوڕی سەرد و سوپاکەی گەیشتنە سەر گۆڕی حسەین، پێکەوە دەنگیان بەرز کردەوە کە: پەروەردگارا، ئێمە هاوکاری کوڕی کچی پێغەمبەرمان نەکرد، تاوانی ڕابردووی ئێمە ببەخشە و بەتۆبەی ئێمە ڕازی ببە چوونکە بەخشەر و میهرەبانیت. حسەین و هاوڕێ شەهیدەکانی ببەخشە، پەروەردگارا، تۆ بەشایەت دەگرین کەئێمەیش لەسەر دین و ڕێگەی ئەوانین کەبەهۆیەوە کوژران. ئەگەر لەگوناحەکانی ئێمە خۆش نەبیت، لەتاوانباران دەبین.

دەڵێت: شەو و ڕۆژێك لەوێ مانەوە و درووودیان بۆ حسەین کوڕی عەلی دەنارد و دەگریان و دەپاڕانەوە. بەردەوام سڵاویان بۆ حسەین و هاوڕێکانی دەنارد تا

ئەوەی بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر نوێژی بەیانییان لەنزیك گۆڕەکەی ئەو خوێند و ئەمەیش ڕق و تووڕەیی ئەوانی زیاتر کرد.

دەڵێت: سلێمان فەرمانی ڕۆشتنی دەرکرد و بەڕێکەوتن. کەسیان نەدەڕۆشت پێش ئەوەی لەگۆڕەکەی حسەین نزیك ببێتەوە و داوای بەخشین لەگوناحەکانی بکات.

دەڵێت: سوێند بەخوا بینیم لەدەوری گۆڕەکەی کۆبووبوونەوە بەهەمانشێوە کە لەدەوری حەجەرلئەسوەد کۆدەبنەوە.

دەڵێت: سلێمان لای گۆڕی حسەین وەستابوو و کاتێك دەستەیەك دۆعایان دەکرد، موسەییب کوڕی نەجبە و سلێمان کوڕی سەرد پێیان دەوتن: خوا بتانبەخشێت، پەیوەستی براکانتان بن.

بەمشێوە بوو تا ئەوەی نزیکەی سی کەس لەهاوڕێکانی مانەوە و سلێمان و هاوڕێکانی لەدەوری گۆڕی حسەین کۆبوونەوە. سلێمان وتی: سپاس بۆ خوا، ئەگەر دەیویست، شەرەفی شەهید بوون لەگەڵ حسەینی پێدەبەخشین، خواوەندا، هەنووکە کەڕێگر بووی لەوەی لەگەڵ ئەو شەهید ببین، لەشەهیدبوونی دوای ئەو بێ بەشمان مەکە.

عەبدوڵڵە کوڕی وال وتی: دەزانم لەڕۆژی پسلاَن حسەین و باوکی و براکەی لەلای پەروەردگار لەهەموو ئۆمەتی محەممەد باشترە. لەبەلاَکانی ئەم ئۆمەتە سەرتان سوڕنەمێنێت چوونکە دووان لەوانیان کوشتووە و ئەوەندەی نەمابوو، ئەوی دیکەیشان بکوژن.

دەڵێت: موسەییب کوڕی نەجبە وتی: من لەبکوژەکان و ئەوانەی هاوڕای ئەوانن، بێزارم، تا کاتی مەرگ دوژمنی ئەوان دەبم و دژیان دەجەنگم.

دەڵێت: سەرکردەکان بەمشێوەیە دووان، موسەنا کوڕی مەجزیە یەکێك لەسەرکردە و گەورەکانی ئەم خەڵکە بوو، لەوەی نەمبیست ئەویش هاوشێوەی سەرکردەکانی دیکە بدوێت، شەرم دایگرتم.

دەڵێت: زۆری نەخایاند ئەویش هاوشێوەی سەرکردەکانی دیکە دوا، وتی: خواوەند بەهۆی نزیکبوونیان لە پێغەمبەر(د.خ)، ڕێز و پێگەی بەم کەسانە

بەخشی، ئەو کەسانەی بکوژی ئەمانن، ئێمە لێیان بێزار و دوژمنیانین. لەدیار و ماڵ و سامانی خۆمان بەمەبەستی لەناو بردنی ئەوان جیابووینەتەوە، سوێند بەخوا ئەگەر جەنگ لەگەڵ ئەوان لەشوێنی ئاوابوونی خۆر بێت یا کۆتایی زەوی، شیاوە بەدوایاندا بگەڕێین چوونکە ئەمە تالأنییەکە و پاداشتەکەی بەهەشتە.،

دەڵێت: پێم وت: ڕاست دەکەیت هیوادارم خواوەند بتبەخشێت.

دەڵێت: سلێمان کوڕی سەرد لەسەر گۆڕی حسەینەوە بەڕێکەوت، ئێمەش بەڕێکەوتین و ڕێگەی حەساسەمان گرتەبەر، دواتر ئەنبار، دواتر سەدود و دواتر قیارەمان بەجێهێشت.

حارس کوڕی حوسەیرە دەڵێت: سلێمان، کورەیب کوڕی یەزیدی حومەیری وەك پێشەنگی سوپاکەی دیاریکرد.

سەری کوڕی کەعب دەڵێت: لەگەڵ یەکێك لەپیاوانی تایەفە ڕۆشتینەدەر و کاتێك گەشتینە سەر گۆڕی حسەین و سلێمان و سوپاکەی لەگۆڕەکە جیابوونەوە و ڕۆشتن، عەبدوڵڵە کوڕی عەوف کوڕی ئەحمەر پێشیانکەوت، سوار لەسەر ئەسپێکی کلك کورتی ڕەش بوو، هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( هاتنەدەر و بەخێرایی ئێمەیان برد

چوونکە دەمانویست ڕووبەڕووی بکوژەکان ببینەوە

بکوژە ستەمکار و خیانەتکارەکان

لەکەسان و سامانەکان

و چاوڕەشەکانی ناو پەردە

چاوپۆشیمان کرد

تا ڕەزامەندی خواوەند بەدەست بێنین)).

موحەل کوڕی خەلیفەیی تایی دەڵێت: عەبدوڵڵە کوڕی یەزید نامەیەکی بۆ سلێمان کوڕی سەرد نووسی.

بێژەر دەڵێت: گومان دەکەم کەوتی: نامەکەی بەمندا نارد.

تایی دەڵێت: لەقیارە چاوم بەسلێمان کەوت و ئەو پێش هاووڵاتی خۆی کەوتەوە.

دەڵێت: وەستا و ئاماژەی بەکەسەکان کرد لەدەوری کۆببنەوە و نامەکەی پێدان بیخوێننەوە. نووسرابوو:

بەناوی خواوەندی بەخشندە و میهرەبان

لە عەبدوڵڵە کوڕی یەزید

بۆ سلێمان کوڕی سەرد و موسوڵمانانی هاوڕێی: سلاوتان لێبێت.

بەلام دواتر: ئەم نامەی من، نامەی مۆجیاریکردنەوە و زۆر مۆجیاریکەری درۆزن کەهەن کەخەڵکان بەدۆستی خۆیانی دەزانن. بیستوومە دەتانەوێت بەژمارەیەکی کەم ڕووبەڕووی سوپایەکی گەورە ببنەوە. هەرکەس بیەوێت چیایەك هەڵکەنێت، پاچەکانی کول دەبێت و لەکار دوا دەکەوێت و ئاوزی سەرگەردان دەبێت. ئەی خەڵکی ئێمە، کارێك مەکەن دوژمن چاوی تەماح ببڕێتە ئەم ویلایەتە چوونکە ئێوە هەموو چاکەکارن و ئەگەر دوژمن سەرکەوتن بەدەست بێنێت کەکەسانی ناسراوی شارەکەی خۆتانن، چاوی تەماح دەبڕنە ئەو کەسانەی لەشارەکە بەجێماون. ئەی خەڵکینە، ئەگەر ئەوان سەرکەوتن بەدەست بێنن، بەردبارانتان دەکەن یا دەتانبەنە ویلایەتی خۆیان و هیچکات ڕزگارتان نابێت. ئەی خەڵکینە، هەنووکە دەستی ئێمە و ئێوە یەکێکە و یەك دوژمنیشمان هەیە و ئەگەر یەکبگرین، دەتوانین بەسەر دوژمندا سەرکەوین و ئەگەر دووبەرەکی لەنێواندا بێت، هێزمان لەبەرابەر دوژمن لاواز دەبێت. ئەی خەڵکینە، مۆجیارییەکانی من لەگوێ بگرن و سەرپێچی فەرمانەکانم مەکەن. کاتێك ئەم نامەیان بۆ خوێندنەوە، بگەڕێنەوە و هیوادارم خواوەند لەگوناح و تاوان بەدوورتان بگرێت. والسلام.

دەڵێت: کاتێك نامەکەیان بۆ سلێمان کوڕی سەرد و سوپاکەی خوێندەوە، وتی: بۆچوونی ئێوە چییە؟ کاتێك لەناو شار و کەسەکانی خۆماندا بووین، بەم داوایە ڕازی نەبووین، ئێستا کەلێرەین و مەبەستی جەنگمان لەسەردایە و لەسەرزەمینی دوژمن نزیك بووینەتەوە، گەڕانەوەمان بۆچوونێکی گونجاو نییە.

دەڵێت: وتیان: لەبۆچوونی خۆت ئاگادارمان بکەرەوە.

وتی: بۆچوونی من ئەوەیە هیچکات وەك ئەمڕۆ لەم دوو شتە نزیك نەبوون،

شەهادەت یا سەرکەوتن. بۆچوونی من ئەوەیە لەم کارە پەشیمان مەبنەوە کەخواوەند بۆ ئێوەی ئامادە کردووە، ئێمە و ئەوان جیاوازیمان هەیە، ئەگەر ئەوان سەرکەوتن بەدەست بێنن، پێشنیار دەکەن شانبەشانی کوڕی زوبەیر بجەنگین و من جەنگ بۆ کوڕی زوبەیر، بەشیاو نازانم. ئەگەر ئێمە سەرکەوتنمان بەدەست هێنا، خەلافەت بەکەسی شیاو دەسپێرین و ئەگەر کوژراین، بەمەبەست و ئامانجی خۆمان گەشتووین و لەگوناح پاکبووینەتەوە. ئێمە بۆچوونێکمان هەیە و کوڕی زوبەیر بۆچوونێکی دیکە، بەسەرهاتی ئێمە و ئەوان هاوشێوەی ئەوەیە کەشاعیری کەنانە دەڵێت:

(( تۆ لەڕوخسارێکدا دەبینم جیاواز لەڕوخساری خۆم

کەواتە کەم سەرکۆنەم بکە

چوونکە تۆ گۆڕاویت و ڕوخسارت گۆڕاوە)).

دەڵێت: بەڕێکەوتن تا گەیشتنە هیت و سلێمان نووسی:

بەناوی خواوەندی بەخشندە و میهرەبان

بۆ فەرمانڕەوا عەبدوڵڵە کوڕی یەزید لەسلێمان کوڕی سەرد و موسوڵمانانی هاوڕێی.

سڵاو لەتۆ. بەڵام دواتر: نامەکەی تۆمان خوێندەوە و لەنییەتی تۆ ئاگادار بووین کەچاکەخوازیت و فەرمانڕەوایەکی ڕاستکردار و برادەرێکی دڵسۆزیت. سوێند بەخوا هاوشێوەی کەسێکی کە بەئامادەنەبوونت لەئەمانداین و بۆ ڕاوێژکردن سوود لەمۆجیارییەکانت وەردەگرین و سپاسی خوا دەکەین. بیستوومە پەروەردگار لەقورئاندا دەفەرمێت:

(( انالله اشترى من المؤمنين انفسهم و اموالهم بان لهم الجنة يقاتلون فى سبيل الله فيقتلون ويقتلون و عداً عليه حقا فى التورية و الانجيل و القران و من اوفى بعهده من الله فاستبشروابيعيكم الذى بايعتم به و ذلك هو الفوز العظيم. التائبون العابدون الحامدون السائحون الراكعون الساجدون الامرون بالمعروف و الناهون عن المنكر و الحافظون لحدودالله و بشر المؤمنين.

واتاکەی: خواوەند لەباوەڕداران گیان و سامانەکانی کڕی (لەبەرامبەر ئەمە)

کەبەهەشت تایبەتە بەوان تا لەڕێگەی خوادا بجەنگن، تێبکۆشن و بکوژرێن، بەڵێنی خواوەندە کە لەتەورات و ئەنجیل و قورئان بەدەستی ئەو بەدیدێت و کێیە زیاتر لەهەمووان بەپەیمان لەگەڵ پەروەردگار ئەمەکدار بێت، بۆ ئەم مامڵە (پڕ سوودەی) خۆتان ئەنجامتانداوە، دڵخۆش بن چوونکە بەختەوەرییەکی گەورەیە (باوەڕداران) هەمان تۆبەکەرانی خواپەرەستی بەڕۆژووی نوێژخوێنی سوجدەبەر و کوڕنوش بەرن کەبۆچاکە هان دەدەن و لەخراپە دەگێڕنەوە و پارێزەرانی سنووری خواوەندن و مژدە بەباوەڕداران بدە)).

ئەم خەڵکە بەبەیعەتەکەی خۆیان دڵخۆشن و لەگوناحە گەورەکەیان تۆبەیانکردووە و پشتیان بەخواوەند بەستووە و بەقەزای ئەو، ڕازین. پەروەردگارا، پشت بەتۆ دەبەستین و بۆ لای تۆ دەگەڕێینەوە چوونکە سەرئەنجامی هەمووان بۆ لای تۆیە و سڵاو لەتۆ بێت)).

دەڵێت: کاتێك نامەکەی بەدەست گەیشت، وتی: ئەم خەڵکە بەدوای مەرگدا دەگەڕێن، یەکەم هەواڵ لەوان بەئێوە بگات، هەواڵی کوژرانی ئەوانە. سوێند بەخوا وەك موسوڵمانێکی ڕێزدار دەکوژرێن.

عەبدولڕەحمان کوڕی غەزییە دەڵێت: لەهیتەوە ڕێگەی قرقیسیامان گرتەبەر و کاتێك نزیکبووینەوە، سلێمان کوڕی سەرد وەستا و ڕیزی کردین. کاتێك لەکەنارەکانی قرقیسیا گوزەرمانکرد و لەنزیك ئەو ناوچەیە دابەزین، زەفەر کوڕی حارسی کەلابی کە لەترسا لەناو شارەکە سەنگەری گرتبوو، بۆ جەنگ نەهاتەدەر.

دەڵێت: سلیمان، موسەییب کوڕی نەجبەی نارد و وتی: بڕۆ لای ئامۆزاکەت تا بازارێك بۆ ئێمە دابین بکات چوونکە مەبەستمان جەنگ دژی ئەو نییە و بۆ جەنگی بکوژەکانی حسەین دەڕۆین.

دەڵێت:موسەییب کوڕی نەجبە ڕۆشت و کاتێك گەیشتە دەروازەی قرقیسیا، وتی: دەرگا بکەنەوە، لەبەرامبەر کێ سەنگەرتان گرتووە؟

وتیان: تۆ کێیت؟

وتی: موسەییب کوڕی نەجبە.

دەڵێت: هوزەیل کوڕی زەفەر ڕۆشتە لای باوکی و وتی: پیاوێك هاتووە و

بەرێزەوە داوای مۆڵەتی هاتنە ناو شار دەکات. لێم پرسی کێیە؟ وتی: موسەییب کوڕی نەجبە.

هوزەیل دەڵێت: ئەو کاتە کەسم بەباشی نەدەناسی و نەمدەزانی کێیە.

باوکم وتی: کوڕم، نازانی ئەو پیاوە کێیە. ئەمە شاسواری هەموو موزێرییەکانی حەمرایە و ئەگەر دەکەس لەگەورەکان هەڵبژێرن، یەکێکە لەوان. پیاوێکی چاکەکار و خواپەرەستە. مۆڵەتی پێبدەن.

دەڵێت: مۆڵەتم پێدا و باوکم ئەوی لای خۆی دانیشاند و پرسیاری لێکرد.

موسەییب کوڕی نەجبە وتی: دژی کێ سەنگەرت کردووە، سوێند بەخوا مەبەستی جەنگی دژی ئێوەمان نییە و هیچمان ناوێت جگە لەوەی دژی ئەو ستەمکارانە هاوکاریمان بکەیت، هەنووکە بازاڕێک بۆ ئێمە بکەرەوە چوونکە ڕۆژێك یا بەشێکی ڕۆژ لێرە دەمێنینەوە.

زەفەر کوڕی حارس وتی: ئێمە دەروازەکانمان بۆیە داخست تا بزانین مەبەستی ئێمەتان هەیە یا کەسانی دیکە، سوێند بەخوا ئەگەر ڕێگەی فرتوفێڵ نەگرنەبەر، ناتەوان و بێ هێز نین و نامانەوێت دژی ئێوە بجەنگین چوونکە خواپەرەستی و چاکەکاری ئێوەمان بیستووە.

دەڵێت: بانگی کوڕەکەی کرد و وتی: بازاڕێکیان بۆ بکەنەوە و فەرمانیدا هەزار درهەم و ئەسپێك بەموسەییب ببەخشن.

موسەییب وتی: پێویستم بەپارەکە نییە چوونکە بۆ ئەو مەبەستە لێرە نیم. بەڵام ئەسپەکە وەردەگرم، ئەگەری هەیە ئەسپەکەم لەپێ بکەوێت، ئەوسا دەتوانم کەڵکی لێوەربگرم.

دەڵێت: بۆلای هاورێکانی گەڕایەوە، بازاڕێکیان بۆ دانان و شتی پێویستی خۆیان کڕی.

دەڵێت: دوای بازارەکە و پێدانی ئالیك بەچوارپێکان، باری بیست وشتری بۆ موسەییب نارد، هاوشێوەکەی بۆ سلێمان نارد و زەفەری کوڕی ڕاسپارد پرسیاری سەرکردەکانی سوپاکەی سلێمان بکات کەناوی عەبدوڵڵە کوڕی سەعد کوڕی نوفەیل و عەبدوڵڵە کوڕی واڵ و ڕەفاعە کوڕی شەدادیان برد لەگەڵ سەرکردەی

هۆزەکان. بۆ سێ سەرکردەی ناوبراو، هەرکام دە وشتری نارد لەگەڵ ئالیک و خواردنی پێویست. بۆ ئوردوو، ژمارەیەکی زۆر وشتر و جۆی نارد. کۆیلەکانی زەفەر وتیان: لەم وشترانە چەندتان دەوێت بکوژن و لەم جۆ، هەرچەندتان دەوێت هەڵگرن و چەندتان ئارد پێویستە لەگەڵ خۆتان ببەن. ئەو ڕۆژە لەخۆشیدا بوون چوونکە پێویستیان بەکڕینی هیچ شتێك لەبازاڕەکان نەبوو، گۆشت و ئارد و جۆ بەئەندازەی پێویست لەبەردەستا بوو. تەنیا ژمارەیەك جلوبەرگ و قامچییان کڕی.

دەڵێت: ڕۆژی دواتر بەڕێکەوتن. زەفەر پەیامی نارد کەبۆ لای ئێوە دێم و ماڵئاواییتان لێدەکەم. زەفەر هات. سوپا بەشێوەیەکی ڕازاوە بەڕێکەوت. زەفەریش شانبەشانی ئەوان دەڕۆشت و بەسلێمانی وت: پێنج ئەمیریان ناردووە کە لەڕەققەوە بەڕێکەوتوون: حەسین کوڕی نەمیری سەکونی و شورەحبیل کوڕی زی ئەلکەلاع و ئەدهەم کوڕی موحریزی باهلی و باوکی مالیك کوڕی ئەدهەم و ڕەبیعە کوڕی باوکی موخاریقی غەنەوی و جەبلە کوڕی عەبدوڵڵە لەگەڵ ئەواندان و هاوشێوەی گەڵای دار، بۆ جەنگی ئێوە بەڕێکەوتوون. سوێند بەخوا سوپایەکی دەگمەن و بوێرت لەگەڵدایە بەڵام ژمارەی ئەوان فراوانە.

کوڕی سەرد وتی: پشت بەخوا دەبەستین و خەڵکان دەبێت پشت بەخوا ببەستن.

زەفەر وتی: دەخوازیت کارێك ئەنجام بدەیت، ئەگەری هەیە خواوەند خێرێکی بۆ ئێمە و ئێوە تیا دانابێت، ئەگەر دەتانەوێت، دەروازەکانی شار دەکەینەوە تا بێنە ناو شارەکە و یەکبگرین و ببینە هاوپەیمانی یەك و ئەگەر دەخوازیت لەبەردەم دەروازەی شارەکەی ئێمە ئوردوو لێبدە و ئێمەیش لەشارەکە دێینەدەر و لەگەڵ ئێوەدا ڕیز دەبەستین و پێکەوە ڕووبەڕووی دوژمن دەبینەوە.

سلێمان بەزەفەری وت: ئەمە داوای خەڵکی شارەکەی خۆیشمان بوو، پێشنیارێکی هاوشێوەی پێشنیارەکەی تۆیان پێکردین و دوای ئەوەی بەڕێکەوتین، دووبارە نامەیەکیان نارد، بەڵام ئەوەمان بەباش نەزانی و ئەو کارە ناکەین.

زەفەر وتی: بەپێشنیارەکەم ڕازی ببە چوونکە منیش دوژمنی ئەوانم و دەخوازم

خـوا لـەناویان ببـات، هـاوڕێ ئێـوەم و دەمـەوێت خواوەنـد تەندروسـتیتان پێببەخشێت. دوژمن لەڕەققەوە بەڕێکەوتووە، پێش ئەوان بگەینە عەین ئەلوەرد با شارەکە لەپشت سەرتان بێت تا گوند و ئاو وکەرەستەی پێویست لەنێوان شاری ئێمـە و شـارەکەتان لەبەردەسـتانا بێـت و ئاسـوودە بـن. سـوێند بـەخوا ئەگـەر ئەسپەکانیشم هاوشێوەی پیاوەکانم دەبوون، هاوکاریم دەکردن، هەنووکە ڕێگەی عەین ئەلوەرد بگرنەبەر چوونکە دوژمن هاوشێوەی سوپا ڕێگە دەبڕێت و ئێوە سوار لەسەر ئەسپن. سوێند بەخوا باشترین سوارکارانت لەگەڵدایە. ئامادە بن و هیوادارم خێراتر لەوان بگەنە شوێنی مەبەست. ئەگەر زووتر لەوان گەیشتنە عەین ئەلوەرد، لەگۆڕەپانێکی کراوە ڕووبەڕوویان مەبنەوە، تیربهاوێژن و بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشیان بکەنەسەر چوونکە ژمارەیان زیاترە و دەترسم چواردەورتان بگرن. لەبەرابەر ئەوان مەوەستن، تیر بهاوێژن و گورزیان لێبدەن چوونکە لەژمارەدا لەگەڵ ئەوان یەکسان نین و ئەگەر ببنە ئاماجی ئەوان، بەزووترین کات لەناو دەچن. کاتێك نزیکبوونەوە، لەبەرابەر ئەوان ڕیز مەبەستن چوونکە پیادەتان لەگەڵ نییە و هەمووتان سوارن. دوژمن بەسوار و پیادە بۆ جەنگی ئێوە دێت، سوارەکان پشتیوانی لەپیادەکان دەکەن و پیادەکان پشتیوانی لەسوارەکان. لەبەرابەر ئەوان ببنە چەندین دەستە و تاقم و ئەم دەستانە لەلای چەپ و ڕاستی ئەوان بڵاوە پێبکەن و هەردەستەیەك، دەستەیەکی پەیوەست بکەن تا ئەگەر هێرشیان کردە سەر یەکێك لەدوو دەستەکە، ئەوی دیکە لەئەسپەکان دابەزێت و سوار و پیادەکان لەوان دوور بکاتەوە و ئەگەر دەستەیەك بیەوێت، ڕێگەی سەرەوە بگرێتەبەر و ئەگەر دەستەیەك بیەوێت، ڕێگەی خوارەوە بگرێتەبەر. ئەگەر لەڕیزێکدا بن و پیادەکان هێرش بکەنە سەرتان، ڕیزەکەتان تێکدەشکێت و شکست دەخۆن.

دەڵێت: زەفەر وەستا و ماڵئاوایی لێکردن. خەڵکان سپاسیان بۆ کرد و بۆی پاڕانەوە. سلێمان کوڕی سەرد وتی: خانەخوێیەکی چاکەکار بوویت، ڕێزت لێگرتین و مۆجیارێکەرێکی بەڕێزیت.

دەڵێت: سوپا بەخێرایی بەڕێکەوتن و دوو مەنزڵیان دەکردە یەك.

دەڵێت: لەشارەکان تێپەڕین تا گەیشتینە ساع. سلێمان کوڕی سەرد، لەسەر

پێشنیارەکانی زەفەر، دەستەکانی جیاکردەوە و بەرێکەوت تا گەیشتە عەین ئەلوەرد و لەرۆژئاوای ئەو ناوچەیە دابەزی و زووتر لەدوژمنەکانی گەیشتە شوێنەکانی مەبەست. لەوێ ئوردوویان لێدا و پێنج ڕۆژ مانەوە و نەجوولان، پشوویاندا و ئەسپەکانیان حەوانەوە.

عەبدوڵڵە کوڕی غەزییە دەڵێت: خەڵکی شام هاتن و بەئەندازەی دووری شەو و ڕۆژێك ڕێگە، لەعەین ئەلوەردەوە دوور بوون.

دەڵێت: سلێمان لەناو ئێمەدا وەستا، سپاسی خواوەندی کرد. دواتر ئاماژەی بەئاسمان و زەمین و چیاکان و دەریاکان و نیشانەکاندا و نیعمەت و بەخششەکانی خواوەندی بیرهێنایەوە، باسی جیهانی کرد و بەهیچی لەقەڵەمدا، سەبارەت بەڕۆژی پسلاّن دوا و خەڵکی بۆ کۆکردنەوەی توێشووی ئەو دنیا هاندا. ئەوەندەی قسە کرد ناتوانم لێرەدا ئاماژە بەهەموویان بدەم.

دواتر وتی: خواوەند دوژمنی بۆ ڕووبەڕووی ئێوە هێناوە، ئەو دوژمنەی ڕێگەیەکی دوور و درێژتان بڕیوە تا بۆ پاکبوونەوە لەگوناح و پەشیمانبوونەوە لەتاوانەکان بۆ جەنگی هاتوون. ئەوان بۆ جەنگی ئێوە نەهاتوون بەڵکو ئێوە بۆ جەنگی ئەوان هاتوون لەناو ماڵ و دیاری خۆیان. کاتێك ڕووبەڕوویان بوونەوە، بوێرانە بجەنگن و خۆڕاگربن چوونکە خواوەند پشتیوانی خۆڕاگرانە. کەس پشتیان تێنەکات (مەگەر بەمەبەستی جەنگ یا بۆ پەیوەستبوون بەدەستەیەکی دیکە). هەلاّتووان مەکوژن و برینداران بێ گیان مەکەن. ئەسیری موسوڵمان مەکوژن مەگەر دوای ئەسیری، دژی ئێوە بجەنگێت یا یەکێك بێت لەبکوژەکانی براکانتان لەدەشتی تەف. شێوەی سەروەری باوەڕداران، عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەجەنگدا بەمشێوە بوو.

دواتر سلێمان وتی: ئەگەر من کوژرام، موسەییب کوڕی نەجبە سەرکردەی ئێوەیە، ئەگەر ئەویش کوژرا، عەبدوڵڵە کوڕی واڵ، سەرکردەی هەمووانە. ئەگەر عەبدوڵڵە کوڕی واڵ کوژرا، سەرکردە ڕەفاعە کوڕی شەدادە. خواوەند ببەخشێت ئەو کەسەی پەیمانەکەی لەگەڵ پەروەردگار بەسەر دەبات.

دەڵێت: موسەییب کوڕی نەجبەی لەگەڵ چوارسەد سوار نارد و وتی: بڕۆ تا

دەگەیتە یەکەم ئوردووی دوژمن و هێرشیان بکەسەر. ئەگەر ئەنجامی دڵخوازت بەدەست هێنا، لەگەڵ هاوەڵانت بگەڕێرەوە. بەهیچ جۆرێك دامەبەزە و ڕێگە مەدە کەس لەسوپاکەت لەئەسپەکەی بێتەخوار یا پێشڕەوی بکات مەگەر ئەوەی ناچار بێت.

حەمید کوڕی موسلیم دەڵێت: یەکێك لەسوارەکانی موسەییب کوڕی نەجبە بووم. شەو و ڕۆژێك ڕێگەمان بڕی و بەرەبەیان دابەزین، ئالیکمان بەئەسپەکاندا و کەمێك حەواینەوە. دواتر سواربووین، بەیانی داهات، نوێژی بەیانیمان خوێند. موسەیبب سوار بوو، ئێمەیش سوار بووین. باوکی جەویرییەی عەبدی لەگەڵ سەد سوار لەهاوەڵان و عەبدوڵڵە کوڕی عەوف لەگەڵ سەد سوار و حەنش کوڕی باوکی ڕەبیعەی کەنانی لەگەڵ سەد سوار نارد و خۆی لەگەڵ سەد کەس مایەوە. وتی: یەکەم کەستان بینی، بیهێننە لای من. یەکەم کەس کەبینیمان، پیاوێکی بیابان نشین بوو. چەند کەرێکی دەلەوەڕاند و هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

((ئەی مالیك بۆ لای هاورێکانم پەلە مەکە

هێواش ڕێگە ببڕە چوونکە لەئەماندایت)).

دەڵێت: عەبدوڵڵە کوڕی عەوف کوڕی ئەحمەر وتی: ئەی حەمید کوڕی موسلیم، سوێند بەپەروەردگاری کەعبە، ئەمە مژدەیە. دواتر بەپیاوی بیابانشینی وت: لەکام تایەفەیت؟

وتی: لەمناڵەکانی تەغلەب.

وتی: سوێند بەپەروەردگاری کەعبە سەرکەوتن بەدەست دێنن.

دەڵێت: موسەییب کوڕی نەجبە گەیشتە لای ئێمە و لەوتووێژەکەم لەگەڵ ئەو پیاوە ئاگادارم کردەوە، بەکوڕی عەوفی وت: لەوتەکەت کەمژدەی سەرکەوتنت پێبەخشین، شادومان بووم و هەروەها لەوتەکەی حەمید کوڕی موسلیم، هیوادارم مژدەی سەرکەوتنتان هێنابێت. شادوومانی ئەوەیە کردەوەکانتان جێگەی ڕەزامەندی بێت (حەمید) و لەدەستی دوژمن تەندروست بن(موسلیم).

دواتر بەپیاوی بیابانشینی وت: دووری نێوان ئێمە و نزیکترین دەستەی

خەڵکانی شام، چەندە؟

وتی: نزیکترین ئوردوویان، ئوردووی کوڕی زی ئەلکەلاعە کە لەنێوان ئەو و حەسین جیاوازی هەیە چوونکە حەسین بانگەشەی ئەوەی دەکرد سەرکردەی هەمووانە و کوڕی زی ئەلکەلاع دەیوت: تۆ کەسێك نیت سەرکردەی من بێت. نامەیان بۆ عوبەیدالله نووسی و چاوەڕوانی وەڵام بوون. تەنها ئوردووی کوڕی زی ئەلکەلاع یەك میل لەئێوە دوورە.

دەڵێت: پیاوەکەمان ئازاد کرد و بەخێرایی بەڕێکەوتین، سوێند بەخوا لەناکاو لەنزیك ئەوان بووین، هەموویان بێ ئاگابوون، هێرشمانکردە سەر باڵێکی ئوردووەکەیان. نەیانتوانی جەنگێکی ئەوتۆ بکەن و شکستیان خوارد. چەند کەسێکمان کوشت و چەند کەسێکمان بریندار کرد. ژمارەی بریندارەکان زیاتر بوو. ئوردووگاکەیان بەجێهێشت و کەوتە دەستی ئێمە و ئەوەی پێویستمان بوو، هەڵمانگرت.

دەڵێت: موسەییب فەرمانی گەڕانەوەی دەرکرد و وتی: سەرکەوتنتان بەدەستهێنا و تالانیتان دەستکەوت و تەندروست مانەوە، بگەڕێنەوە. گەڕاینەوە بۆ لای سلێمان.

دەڵێت: عوبەیدالله کوڕی زیاد ئاگادار بوویەوە و حەسین کوڕی نەمیری بەخێرایی بۆ لای ئێمە ڕەوانە کرد و لەگەڵ دوانزە هەزار کەس دابەزی. ئێمە لەڕۆژی چوارشەممە، هەشت ڕۆژ بۆ کۆتایی مانگی جومادی الاوەل، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەوان ڕۆشتین، سلێمان، عەبدوڵڵە کوڕی سەعدی وەك فەرمانادەی باڵی ڕاستی سوپاکەی و موسەییب کوڕی نەجبەی وەك سەرکردەی باڵی چەپی سوپاکەی دانا و خۆی لەناوەڕاستی سوپاکە وەستا. حەسین کوڕی نەمیر هات و سوپاکەی ئامادە کردبوو. جەبلە کوڕی عەبدوڵڵەی وەك فەرماندەی باڵی ڕاستی سوپاکەی و ڕەبیعە کوڕی موخاریقی وەك فەرماندەی باڵی چەپی سوپاکەی دیاریکردبوو. دواتر بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئێمە هاتن و کاتێك نزیکبوونەوە، داوایانکرد بۆ خەلافەتی عەبدولمەلیك کوڕی مەروان بەیعەتیان لەگەڵ ببەستین و ملکەچی فەرمانەکانی ئەو بین. ئێمەیش داوامان کرد عوبەیدالله

کوڕی زیاد ڕادەستی ئێمە بکەن تا لەقەرەبووی یەکێك لەهاوەڵەکانمان بیکوژین و عەبدولمەلیك کوڕی مەروان لەسەر کار لاببەن و کەسانی بنەماڵەی کوڕی زوبەیر، سەرزەمینی ئێمە بەجێبێڵن. دواتر خەلافەت بەبنەماڵەی پێغەمبەر(د.خ) بسپێرن. بەڵام ئەئەوان ڕازی بوون نەئێمە.

حەمید کوڕی موسلیم دەڵێت: باڵی ڕاستی سوپاکەی ئێمە هێرشیکردە سەر باڵی چەپی سوپاکەی ئەوان و شکستیاندان. هەروەها باڵی چەپی ئێمە هێرشیکردە سەر باڵی ڕاستی ئەوان. سلێمان لەگەڵ کەسانی هاوڕێی، هێرشیبرد. شکستمان پێهێنان و گەشتینە ئوردووگاکەیان. سەرکەوتن لەئێمە بوو تا ئەوەی بەهۆی داهاتنی شەو، جیابووینەوە. گەڕاینەوە لەکاتێکدا پاشەکشیمان پێکردبوون.

دەڵێت: ڕۆژی دواتر کوڕی زوئەلکەلاع لەگەڵ هەشت هەزار جەنگاوەر هات کە عوبەیداللە کوڕی زیاد بۆ هاوکاری سوپاکەی ڕەوانەی کردبوو. پەیامیدابوو، سەرکۆنەی کردبوون و وتبووی: هاوشێوەی کەسانی نائاگا بوون، ئوردووگا و پێگەکەتان لەدەستدا، پەیوەستی سوپاکەی حەسین کوڕی نەمیر ببە و سەرکردەی هەمووان ئەوە.

دەڵێت: بەرەبەیانان بۆ جەنگی ئێمە هاتن و ئێمە ڕووبەڕوویان بووینەوە. بەدرێژایی ڕۆژ جەنگاین، جەنگێك کەس هاوشێوەی نەبینیوە و تەنیا لەکاتی نوێژ دەستمان لەجەنگ هەڵدەگرت و شەوانە جیا دەبووینەوە. سوێند بەخوا ژمارەیەکی زۆر لەسوپاکەی ئێمە و ئەوان بریندار بووبوون.

دەڵێت: سێ کەس لەناو سوپاکەی ئێمە شەڕکەرانیان هاندەدا: ڕەفاعە کوڕی شەدادی بەجلی و سوحەیر کوڕی حوزەیفە و باوکی جەویرییەی عەبدی. ڕەفاعە لەباڵی ڕاست کەسانی هاندەدا و لەو ناوچەیە دوور نەدەکەوتەوە. ڕۆژی دووەم، سەرەتای ڕۆش باوکی جویرییە بریندار بوو و لای بارەکان مایەوە. سوحەیر بەدرێژایی شەو لەناو ئێمەدا دەگەڕا و دەیوت: بەندەکانی خوا، بەڕەزامەندی خواوەند دڵخۆش بن، سوێند بەخوا هەرکەس لەدیداری هاوڕێیان و ڕۆشتن بۆ ناو بەهەشت و جیابوونەوە لەئازاری دنیا و نەفسی خراپەکار دوور نەبێت، دەبێت

کەسێکی دەست ئاوەڵا بێت و بەدیداری خواوەند شادوومان بێت.

دەڵێت: بەو شێوەبوو تا بەیانی بوویەوە و کوڕی نەمیر و ئەدهەم کوڕی موحریزی باهلی لەگەڵ دە هەزار کەس بۆ جەنگی ئێمە هاتن و ڕۆژی سێیەم (هەینی) تا نیوەڕۆ بەدژواری جەنگاین. دواتر ژمارەی سوپای شام زیادیکرد و لەهەموو لاکانەوە هێرشیانکردە سەرمان. کاتێك سلێمان کوڕی سەرد دژواری بارودۆخی سوپاکەی بینی، دابەزی و فەرمانیدا: ئەی بەندەکانی خوا، هەرکەس دەیەوێت زووتر بۆ پێشگای خواوەند بگەڕێتەوە و لەگوناحەکەی تۆبە بکات و پەیمانەکەی بباتەسەر، لەدەوری من کۆببێتەوە. دواتر کالانی شمشێرەکەی شکاند. ژمارەیەکی زۆر لەگەڵی دابەزین و کالانی شمشێرەکانیان شکاند و لەگەڵ سلێمان ڕۆشتن. ئەسپەکانیان بەجێما و پیادە لەگەڵ دوژمن ڕووبەڕووبوونەوە. سوپاییەکان دابەزین و بەشمشێری ڕووت، هێرشیانبرد. سوارەکانیش هێرشیانکردە سەر سوارەکان و پاشەکشێیان پێکردن. جەنگ بەردەوام و ژمارەیەکی زۆریان لەسوپای شام کوشت و بریندار کرد. کاتێك حەسین کوڕی نەمیر، بوێری و خۆڕاگری ئەوانی بینی، پیادەکانی ڕەوانە کرد تا بەتیر هێرشیان بکەنەسەر. سوارەکان و پیادەکان دەوریان گرتن. سلێمان کوڕی سەرد کوژرا. یەزید کوڕی حەسینی تیرێکی بۆ هاویشت و لەپێی خست، دووبارە هەستایەوە بەڵام توانای نەمابوو و بەیەکجاری کەوت.

دەڵێت: کاتێك سلێمان کوڕی سەرد کوژرا، موسەییب کوڕی نەجبە ئاڵاکەی بەدەستەوە گرت و بەسلێمانی وت: ئەی براکەم! خوا بتبەخشێت، هاوشێوەی کەسێکی خواپەرەست جەنگایت و ئەرکەکانی خۆت بەئەنجام گەیاند. هەنووکە کاتی ئەوەیە ئێمە ئەرکی خۆمان جێبەجێ بکەین.

ئاڵاکەی بەدەستەوە گرت و هێرشی برد. دوای کەمێك جەنگان گەڕایەوە. دووبارە هێرشیبرد و جەنگا و گەڕایەوە. بەردەوام هێرشی دەبرد و دەگەڕایەوە تا ئەوەی سەرئەنجام کوژرا.

قوروە کوڕی لەقیت دەڵێت: کۆیلەی موسەییب کوڕی نەجبەم لەمەداین بینی کە لەگەڵ شەیس کوڕی یەزیدی خارجی بوو. گفتوگۆمان دەستپێکرد و ئاماژەمان

بەجەنگی عەین ئەلوەرددا.

بێژەر دەڵێت: ئەم پیرە لەموسەییب کوڕی نەجبە دەدوا و دەیوت: سوێند بەخوا هەرگیز کەسێکم بوێرتر لەو و دەستەکەی نەبینیوە. لەڕۆژی عەین ئەلوەردە بینیم بوێرانە دەجەنگا و باوەڕم نەدەکرد کەسێك تا ئەو ئەندازەیە بەتوانا بێت و بتوانێت زیان لەدوژمن بدات. چەندین کەسی کوشت. تا ئەو کاتەی کوژرا، هۆنراوەی دەخوێندەوە و دەجەنگی.

عەبدوڵڵە کوڕی عەوف دەڵێت: کاتێك موسەییب کوڕی نەجبە کوژرا، عەبدوڵڵە کوڕی سەعد ئاڵاکەی بەدەستەوە گرت، وتی: دوو برای من بوون (دەستەیەك لەوان بەڵێنەکانیان بردەسەر و شەهید بوون) و دەستەیەك لەوان چاوەڕێن و بەهیچ جۆرێك نەگۆڕاون.

دواتر لەگەڵ ئەزدییەکانی هاورێی، پێشڕەوی کرد. ئەوان لەدەروی ئاڵاکەی بوون. سوێند بەخوا لەو کاتەدا سێ سوار هاتن. عەبدوڵڵە کوڕی خوزەلی تایی و کەسیر کوڕی عەمرۆ موزنی و سەعر کوڕی باکوی سەعری حەنەفی کە لەگەڵ سەعد کوڕی حوزەیفە و سەد و حەفتا کەس لەخەڵکانی مەداین بەڕێکەوتبوون و ڕۆژی بەڕێکەوتن ئەوانی سوار لەسەر ئەسپە کلك کوڵە لەڕەکان ناردبوو، وتبووی: بەخێرایی مەنزڵەکان ببڕن و پەیوەستی هاوەڵانی ئێمە بن، مژدەیان پێبدەن بۆ لای ئەوان بەڕێکەوتووین تا بەهێزیان بکەین. هەروەها لەبەڕێکەوتنی خەڵکانی بەسرە ئاگاداریان بکەنەوە.

پێنج ڕۆژ دوای ئەوەی سەعد کوڕی حوزەیفە لەمەداینەوە بەڕێکەوتبوو، موسەنا کوڕی مەخریبەی عەبدی و سێسەد کەس لەخەڵکانی بەسرە بەڕێکەوتبوون و گەشتبوونە شاری بەهرسیر. سەعد کوڕی حوزەیفە پێش ئەوەی لەمەداین بەڕێکەوێت، لەبەڕێکەوتنی ئەوان ئاگادار بووبوویەوە.

دەڵێت: سەیری ئێمەیان کرد و کاتێك کوژرانی هاوەڵانی خۆیان و بریندارەکانی ئێمەیان بینی، گریان و وتیان: لەم بارودۆخەدان! انا لله و انا الیه راجعون.

دەڵێت: سوێند بەخوا شتی ناخۆشیان بینی. عەبدوڵڵە کوڕی نوفەیل وتی: بۆ ئەمە هاتووین. دوای ئەوە جەنگاین و زۆری نەخایاند موزنی کوژرا و حەنەفیش

ڕمی بەرکەوت و لەناو کوژراوەکاندا کەوت بەڵام دواتر هەستا و خۆی ڕزگار کرد. تاییش ڕمی بەرکەوت و لووتی شکا. بوێرانە دەجەنگی و هۆنراوەی دەخوێندەوە.

دەڵێت: ڕەبیعە کوڕی موخاریقی هێرشێکی قورسی کردە سەر ئێمە و بوێرانە ڕووبەڕووی بووینەوە. دواتر لەنێوان ئەو و عەبدوڵڵە کوڕی سەعد شمشێرەکان بەرزکرانەوە و کاتێك نەیانتوانی بەشمشێر یەکتر لەپێ بخەن، پەلاماری سەروملی یەکیاندا و هەردووکیان کەوتنە سەر زەوی. دواتر هەستان و دووبارە شمشێر وەشاندن دەستییپێکردەوە. برازاکەی موخاریق کوڕی ڕەبیعە هێرشیکردە سەر عەبدوڵڵە کوڕی سەعد و ڕمێکی لەقوڕگی چەقاند و خوێنی ڕشت. عەبدوڵڵە کوڕی عەوف کوڕی ئەحمەرسش هێرشیکردە سەر ڕەبیعە کوڕی موخاریق و بەڕم لێیدا بەڵام نەکوژرا. عەبدوڵڵە جارێکی دیکە هێرشیکردەسەر، بەڵام هاوەڵانی ڕەبیعە بەڕم پەلاماریاندا و سەرئەنجام لەپێکەوت و هاوەڵانی ئەویان بردەوە.

دەڵێت: خالید کوڕی سەعد کوڕی نوفەیل دەیوت: ڕەبیعە کوڕی موخاریق، بکوژی براکەم، نیشان بدەن. هێرشیکردەسەر و شمشێری بەرز کردەوە. ڕکەبەرەکەی باوەشی پیاکرد و کەوتنە سەر زەوی. هاوەڵانی ڕەبیعە هێرشیانبرد، ئێمەیش بەهەمانشێوە. ئەوان زیاتر لەئێمە بوون و توانییان ڕەبیعە ڕزگار بکەن و هاورێکەی ئێمەیان کوشت و کەس لای ئاڵاکە نەمایەوە.

دەڵێت: دوای ئەوەی شاسوارەکانی ئێمەیان کوشت، عەبدوڵڵە کوڕی واڵمان بانگکرد بەڵام ئەو لەتەنیشت ئێمە سەرقاڵی جەنگ بوو. ڕەفاعە کوڕی شەداد هێرشی برد و پاشەکشێی پێکردن. دواتر عەبدوڵڵە بەرەو ئاڵاکە هات کە عەبدوڵڵە کوڕی خازمی کەسیری هەڵیگرتبوویەوە و بەکوڕی واڵی وت: ئاڵاکەت وەریگرە.

وتی: ئاڵاکە بگرە، خوا بتبەخشێت، منیش هاوشێوەی تۆم.

وتی: ئاڵاکەت بگرە چوونکە دەمەوێت بجەنگم.

وتی: ئەم کارەیش وەك جیهاد وایە و پاداشتی هەیە.

دەڵێت: هاوارمان کرد: ئەی باوکی عێززە، خوا بتبەخشێت، گوێڕایەڵی سەرکردە بە.

دەڵێت: چەند ساتێك ئاڵاکەی ڕاگرت و دواتر کوڕی واڵ ئاڵاکەی لێوەرگرت.

باوکی سەڵتی تیمی لەیەکێك لەپیرەکانی تایەفە کەئەو ڕۆژە هاوڕێی کوڕی واڵ بووە، دەگێڕێتەوە: عەبدوڵڵە کوڕی واڵ پێی وتین: هەرکەس ژیانێکی دەوێت، خەمی بەدواوە نەبێت، بەجەنگ دژی ئەم ستەمکارانە خۆی لەپەروەدگار نزیك بکاتەوە، خوا بتانبەخشێت، بۆ پێشەوە، بەرەو بەهەشت. ئەمە لەکاتی ئێواریدابوو. دواتر هێرشی برد و ئێمەیش لەگەڵ ئەو هێرشمان برد. سوێند بەخوا چەند کەسێکمان لەوان کوشت و پاشەکشێمان پێکردن. دواتر لەهەمو لاکانەوە هێرشیان کردەسەرمان و پاشەکشێیان پێکردین تا گەڕاینەوە بۆ شوێنی یەکەمی خۆمان.

دەڵێت: شەو، ئەدهەم کوڕی موحریزی باهلی لێپرسراویەتی جەنگی گرتەئەستۆ و لەگەڵ سوارەکان و پیادەکان، هێرشی کردەسەرمان و عەبدوڵڵە کوڕی واڵ کوژرا.

فەروە کوڕی لەقیت دەڵێت: لەڕۆژگاری فەرمانڕەوایەتی حەجاج کوڕی یوسف لەئەدهەم کوڕی موحریزی باهلیم بیست ئەو کاتەی قسەی لەگەڵ دەستەیەك لەخەڵکانی شام دەکرد، دەیوت: هێرشم کردە سەر یەکێك لەسەرکردەکانی عێراق، کەسێك بوو پێیان دەوت عەبدوڵڵە کوڕی واڵ و ئەم ئایانەی دەخوێندەوە:

((و لا تحسين الذين قتلوا فى سبيل الله امواتا، بل احياء عند ربهم يرزقون. فرحين بما أتاهم الله من فضله و يستبشرون بالذين لم يلحقوا بهم من خلفهم، الا خوف عليهم و لاهم يحزنون. يستبشرون بنعمة الله و فضل، و ان الله لا يضيع اجر المؤمنين.[١١]

واتاکەی: ئەو کەسانەی لەڕێگەی خوادا کوژراون، بەمردوو مەزانە، بەڵکو زندوون و لای پەروەردگار ڕۆژی و ژیان بەسەر دەبەن. بەوەی خواوەند لەبەخششی خۆی پێی بەخشیون، شادوومانن و لەچارەنووسی ئەو کەسانەی داوتر دێت و هێشتا پەیوەستیان نەبوون، دڵخۆشن. نەدەترسن و نەخەمبار دەبن. بەنیعمەت و بەزەیی خواوەند و ئەوەی خواوەند پاداشتی باوەڕداران لەبیر ناکات، شادومانن)).

---

[١١] - آل عمران. ئایەی ١٦٩و١٧٠و١٧١

دەیوت: بەچاوی خۆم بینیم و بەخۆم وت ئەمانە ئێمە بەناباوەڕ دەزانن و گومان دەکەن هەرکەس لەوان بکوژین، شەهیدە، هێرشمکردەسەر و بەدەستی چەپ گورزێکم لێدا و دەستیم بڕی و کەمێك دوورکەوتمەوە و پێم وت: وا بزانم حەز دەکەی بۆ لای کەسەکانی خۆت بگەڕێیتەوە.

وتی: بەهەڵەدا چوویت، حەزم نەدەکرد ئەمە دەستی تۆ بێت، مەگەر ئەوەی قرتاندنی پاداشتێکی هاوشێوەی دەستی خۆمی بێت.

وتم: بۆ؟

وتی: بۆ ئەوەی گوناحەکەی لەئەستۆی تۆدا بێت و پاداشتەکەی بۆ من.

دەیوت: تووڕە بووم و سوار و پیادەکانم لەدەوری خۆم کۆکردەوە و هێرشمانکردە سەر خۆی و هاوەڵانی. بەڕم لێمدا و کوشتم. دواتر وتیان: ئەو یەکێك لەشارەزایانی عێراق بووە و بەردەوام سەرقاڵی نوێژ و ڕۆژوو بووە و فەتەوای بۆ کەسانداوە.

عەبدوڵڵە کوڕی غەزییە دەڵێت: کاتێك عەبدوڵڵە کوڕی واڵ کوژرا، بینیمان عەبدوڵڵە کوڕی خازم لەتەنیش ئەو کوژراوە، سەرەتا گومانمان کرد ڕەفاعە کوڕی شەدادی بەجلییە. یەکێك لەمناڵەکانی کەنانە بەناوی وەلید کوڕی غوسن بەڕەفاعەی وت: ئاڵاکەت هەڵگرە.

وتی: نامەوێت.

وتمان: انا لله، بۆ؟

وتی: با بگەڕێینەوە، بەو هیوای لەڕۆژێکی دیکە و بەهێزێکی زیاترەوە بتوانین ڕووبەڕوویان ببینەوە.

دەڵێت: عەبدوڵڵە کوڕی عەوف کوڕی ئەحمە هاتەپێش و وتی: سوێند بەخوا لەناومان دەبەن، ئەگەر بگەڕێینەوە، شوێنپێمان هەڵدەگرن و پێش ئەوەی بتوانین دوور بکەوینەوە، هەموومان لەناو دەبەن. ئەگەر کەسێك لەئێمە ڕزگاری بێت، بیابانئشینەکان و گوندییەکان دەیگرن و بەهۆیەوە خۆیان لەدوژمنان نزیك دەکەنەوە و دەست بەستراو دەکوژرێت. سوێندت دەدەم بەخوا ئەو کارە مەکە، هەنووکە هەتاو بەرەو ڕۆژئاوا دەڕوات و شەو نزیکبۆتەوە، سوار لەسەر

ئەسپەکانی خۆمان دژیان دەجەنگین و بەمشێوەیە دەتوانین خۆمان بپارێزین و کاتێك تاریکی دابێت، سەرەتای شەو سوار ئەسپەکانی خۆمان دەبین و غاردەدەین و دەڕۆین و ڕێگە دەبڕین و دەرفەتمان دەبێت هەرکەس بریندارەکانی خۆی هەڵبگرێت یا چاوەڕوانی هاورێکەی بکات و دە بیست کەس پێکەوە بەڕێکەون و بزانن بەرەو کوێ دەڕۆن. ئەگەر بەوشێوە بێت تۆ دەڵێت، دایك لای منالەکەی ناوەستێت و کەس ڕێگەی خۆی نازانێت کەبەکوێ دەگات و بۆ کوێ دەڕوات و تا بەیانی هەموومان کوژراو دەبین یا ئەسیر.

ڕەفاعە کوڕی شەداد وتی: بۆچوونەکەت گونجاوە. دواتر ڕوویکردە پیاوی کەنانی و وتی: ئالاّکە هەڵدەگریت یا لێتی وەربگرم.

کەنانی وتی: ئەوەی تۆ دەتەوێت، نامەوێت، دەمەوێت بۆ پێشگای پەروەردگار بگەڕێمەوە و پەیوەستی برادەرانم بم، تۆ زیوی دنیات دەوێت و هیوای ژیانت لەسەردایە و ناخوازیت لەجیهان دابڕێیت، سوێند بەخوا هیوادارم بەمەبەستەکانت بگەیت.

دەڵێت: ئالاّکەی گەڕاندەوە و مەبەستی پێشڕەوی کرد. کوڕی ئەحمەر پێی وت: خوا بتبەخشێت، ماوەیەك لای ئێمە بجەنگە وخۆت بەکوشتن مەدە. بەردەوام سوێندیدەدا و سەرئەنجام ڕێگەی پێشڕەوی لێگرت.

سوپای شام دەنگیان بەرز کردەوە و وتیان خواوەند لەناوی بردن، پێشڕەوی بکەن و پێش تاریکبوون، بەتەواوی شکستیان پێبێنن. پێشڕەوییان دەستپێکرد بەلاّم ڕووبەڕووی بەرگرییەکی بوێرانە بوونەوە، لەگەڵ شاسوارەکان دەجەنگان و پیاوی لاواز لەناویاندا بوونی نەبوو، نەیانتوانی شکستیان پێبێنن و تا تاریکبوونی هەوا، ئاگری جەنگێکی قورسیان هەڵگیرساند. دوای شەو، پیاوی کەنانی کوژرا و محەممەدی کوڕی کەمناڵێکی کەم تەمەن بوو، وتی: ئەی خەڵکی شام، کەس لەخەڵکی کێندە لەناو ئێوەدا هەیە؟

چەند کەس هاتنە پێش و وتیان: بەڵێ، ئێمە هەین.

وتی: ئەمە برازای خۆتانە، هەڵیبگرن و بیگەڕێننەوە بۆ لای کەسەکانی لەکوفە. من عەبدوڵڵە کوڕی عەزیزی کێندیم.

وتیان: تۆ ئامۆزای ئێمەیت و لەئەماندایت.

وتی: سوێند بەخوا خوازیاری ڕۆشتن بۆ شوێنی کوژرانی براکانم.

دەڵێت: کوڕ بەدوای باوکدا دەگەڕیا و باوك پێی وت: کوڕم، ئەگەر شتێك پێش بەرەستینی خوا دەبوو، تۆ بوویت.

شامییەکان کاتێك گریانی کوڕەکەیان بەدوای باوکیدا بینی، سوێندیاندا و بەزەییان بەخۆی و کوڕەکەیدا هاتەوە تا ئەو جێگەی دەستیان بەگریانکرد. دواتر لەو شوێنەی کەسەکانی لەوێبوون، دوورکەوتەوە و لەکاتی شەو هێرشیکردە سەر سوپای شام و جەنگی تا کوژرا.

موسلیم کوڕی زەحری خەولانی دەڵێت: شەو، کورەیب کوڕی زەیدی حومەیری ڕوویکردە ئەوان، ئاڵای خەڵکی بەلقای بەدەستەوە بوو. نزیکەی سەد کەسێکی لەگەڵدا بوو. سەبارەت بەمەبەستەکەی ڕەفاعە گفتوگۆیان دەکرد. حومەیری کەسانێکی لەحومەیر و هەمەدان لەدەوری خۆی کۆکردەوە و وتی: بەندەکانی خوا، بۆ پێشگای خواوەند بگەڕێنەوە، سوێند بەخوا هیچ شتێك جێگەی ڕەزامەندی پەروەردگار و تۆبە ناگرێتەوە. بیستوومە دەستەیەك لەئێوە دەخوازن بگەڕێنەوە بۆ ئەو جیهانەی لێوەی هاتوون، ئەگەر بۆ ئەو جیهانە بگەڕێنەوە بۆ ئامێزی گوناحەکان دەگەڕێنەوە، بەڵام سوێند بەخوا پشت ناکەم دوژمن تا هاوشێوەی براکانم دەکوژرێم.

دەڵێت: کەسانی دەوروبەری وەڵامی بانگەوازەکەیان دایەوە و وتیان: بۆچوونی ئێمەیش هاوشێوەی تۆیە. ئاڵاکەی بەدەستەوە گرت و ڕۆشت. کوڕی زوئەلکەلاع وتی: سوێند بەخوا ئەمە یا ئاڵای حومەیرە یا هەمەدان. لێیان نزیکبوویەوە و پرسیاریکرد و پێیان وت: وتی: ئێوە ئەمانتان هەیە.

بەڵام هاورێکەیان وتی: ئێمە لەدنیا ئەمانمان بوو، بەدوای ئەمانی ئاخیرەت دەگەڕێین.

دەڵێت: ئاگری جەنگیان هەڵگیرساند و کوژران. دەڵێت: سوحەیر کوڕی حوزەیفەی موزنی لەگەڵ سی کەس لەخەڵکانی موزەینە بەڕێکەوت و پێی وتن: لەمەرگ لەڕێگەی خوا مەترسن چوونکە بۆ پێشگای ئەو دەگەڕێنەوە، بەرەو ئەو

جیهانـەی لێـوەی هـاتوون، مەگەڕێنـەوە چـوونکە پایـەدار نییـە. خوازیـاری بەدەسـتهێنانی پاداشـتی خـوایی بـن، ئـەوەی لای پـەروەردگارە، لەهـەموو شـتێك باشترە.

دەڵێت: پێشڕەوییان کرد و جەنگان و کوژران.

دەڵێـت: کاتێـك تـاریکی داهـات، سـوپای شـام بـۆ ئوردووگاکانیـان گەڕانـەوە. ڕەفاعـە سـەیری ئـەو کەسـانەی کـرد لەپێکـەوتبوون، هـەروەها بـەناو برینـدارەکانـدا گەڕا و ئەوانی تەسلیم بەکەسەکانیان کردەوە. دواتر لەگـەڵ سـوپاکەی، بەدرێـژایی شەو ڕێگـەی بـڕی و بەرەبـەیانان لەتـەنینیر بوو، لـەخابور گـوزەری کـرد و پردەکـان بڕی. لەدوای خۆی هەموو پردەکانی وێران دەکرد.

دەڵێت: بەرەبەیانان حەسین کوڕی نەمیر کەسی نارد و دەرکـەوت سـوپای کوفـە ڕۆشتووە، کەسی بەدوای ئەواندا نەنارد و بەخێرایی لەگەڵ سـوپاکەی بەڕێکـەوت. ڕەفاعە، باوکی جویریییەی عەبدی لەگەڵ حەفتا سوار لەپشتەوە دانابوو تا بەرگری لەسـوپاکە بکـەن و ئەگـەر ببیـنین بـاری کەسـێك کـەوتووە یـا کاڵایـەکیان لەسـەر ڕێگەدی، هەڵیبگرنەوە و باسی بکات و ئەگەر کەسێك خۆی بـەخاوەنی زانـی، بـۆی ڕەوانە بکاتەوە.

ئـەو کارەیـا کـرد و لەبیابانـەوە گەیـشتنە قرقیـسیا. زەفـەر وەك جـاری پێـشوو، خواردن و ئالیك و پزیشکی بۆ ناردن، وتی: تا ئەو کاتەی دەخوازن لێرە بمێننـەوە و لەهاوکارییـەکانی ئێمـە کـەڵك وەربگـرن. سـێ ڕۆژ مانـەوە و دواتـر هـەرکامیان توێشوو و ئالیکی پێویستی هەڵگرت.

دەڵێــت: ســەعد کــوڕی حوزەیفــە هــات و گەیــشتە هیــت. بیابانــشینەکان ڕۆشـتنەلای و لـەو بەڵایـەی بەسـەر سـوپای کوفـەدا هـاتبوو، ئاگاداریـان کـردەوە. سەعد گەڕایـەوە و لەسـەندوا چـاوی بەموسـەنا کـوڕی مەخریبـەی عەبـدی کـەوت و لەڕووداوەکە ئاگاداری کردەوە. لەوێ مانەوە تا هـەواڵی نزیکبوونـەوەی ڕەفاعـەیان پێگەیشت و کاتێك لەگوندەکە نزیکبوویـەوە، بەرەو پیری چوون. سڵاویان لەیـەك کرد، گریان و سەبارەت بەمـەرگی براکانیـان دەدوان. شـەو و ڕۆژێـك لـەوێ مانـەوە. دواتر خەڵکی مـەداین، ڕێگـەی مـەداینیان گرتەبـەر و خـەڵکی بەسـرە بـەرەو بەسـرە

بەڕێکەوتن و خەڵکانی کوفە، بەردو کوفە. بۆیان دەرکەوت موختار لەزینداندایە.

عەبدولڕەحمان کوڕی یەزید دەڵێت: ئەدهەم کوڕی موحریزی باهلی، هەواڵی سەرکەوتنەکەی بۆ عەبدولمەلیک کوڕی مەروان برد.

دەڵێت: عەبدولمەلیک ڕۆشتەسەر مینبەر، سپاسی خواوەندی کرد، وتی: بەلآم دواتر، خواوەند، یەکێك لەسەرکردەکانی عێراق، سلێمان کوڕی سەرد و سەرکردەی تاریکی کوشت، بزانن سەری موسەییب کوڕی نەجبە بەشمشێرەکان لەتوپەت کرا و هەروەها دوو گومڕاکەری ئەوان: عەبدوڵڵە کوڕی سەعدی ئەزدی و عەبدوڵڵە کوڕی واڵی بەکری کوژران و دوای ئەوان، کەس بوێری خۆڕاگری یا بەرگری ناکات.

باوکی میخەنەف دەڵێت: موختار نزیکەی ١٥ ڕۆژ لەزیندان مایەوە. دواتر بەهاوەلآنی خۆی وت: بۆ ئەو پیاوەی بۆ جەنگ ڕۆشتووە، دە ڕۆژ کەمتر لەیەك مانگ بژمێرن، دواتر هەواڵێکی مەترسیدارتان پێدەگات، ڕووداوێکی تۆقێنەر و گورزێکی کوشندە و لەناوبەر. ئەوسا کێ پیاوی ئەم کارەیە.؟ من. حاشای لێمەکەن، من پیاوی ئەو کارەم.

ئەبان کوڕی وەلید دەڵێت: کاتێك ڕەفاعە کوڕی شەداد لەعەین ئەلوەرد گەڕایەوە، موختار لەزیندانەوە نامەیەکی بۆ نووسی:

بەلآم دواتر: دەسخۆش بۆ ئەو دەستەی کاتێك ڕۆشتن، خواوەند پاداشتێکی گەورەی بۆ دیاریکردن و کاتێك گەڕانەوە، ڕەزامەندی خوای لێکەوتەوە. سوێند بەپەروەردگاری کەعبە، کەس لەئێوە هەنگاوێکی هەڵنەگرت مەگەر ئەوەی پاداشتی خواوەند لەبەرامبەریدا لەهەموو سامانی دنیا گەورەتر بوو. سلێمان ئەرکەکانی خۆی بەجێگەیاند و خوا لێی خۆش بێت، کەسێك نەبوو بەهۆیەوە سەرکەوتن بەدەست بێنن، ئەمیر فەرمانی پێدراوە و ئەمانەتداری باوەڕدار و سەرکردەی سوپا و بکوژی دوژمنان و تۆڵەستێنی خوێن لەبکوژەکان، منم. ئامادە و دڵخۆش بن، مژدەتان لێبێت پێشنیاری گەڕانەوە بۆ کتێبی خوا و سوونەتی پێغەمبەر(د.خ) و تۆڵەسەندنەوەی بنەماڵەی پێغەمبەر(د.خ) و بەرگریکردن لەناتەوانەکانتان پێدەکەم والسلام.

باوکی زوهەیری عەبەسی دەڵێت: کەسان بەمشێوەیە سەبارەت بەموختار دەدوان و عەبدوڵڵە کوڕی یەزید و ئیبراهیم کوڕی محەممەد ئاگادار بوونەوە و موختاریان گرت.

حەمید کوڕی موسلیم دەڵێت: کاتێك بۆ گەڕانەوە ئامادە بووین، عەبدوڵڵە کوڕی غەزییە، لەسەر سەری کوژراوەکان وەستا و وتی: خوا بتانبەخشێت، ئێوە ڕاستیتان هێنا و خۆڕاگربوون و ئێمە درۆمان کرد و هەڵاتین.

دەڵێت: کاتێك ڕۆشتین و بەیانی بوویەوە، عەبدوڵڵە کوڕی غەزییە و بیست کەسی دیکە دەیانویست بۆ جەنگی دوژمن بگەڕێنەوە. ڕەفاعە و عەبدوڵڵە کوڕی عەوف و دەستەیەك لەکەسانی دیکە هاتن و وتیان: سوێند بەخوا بەم کارە ژمارەی ئێمە کەم مەکەنەوە، تا ئەو کاتەی کەسانی وەك ئێوە لەناو ئێمەدا بن، تەندروست و پارێزراوین. بەردەوام گفتوگۆیان لەگەڵ کرد و سوێندیاندا و سەرئەنجام پەشیمانیان کردەوە جگە لەیەکێك لەخەڵکانی موزەینە بەناوی عوبەیدە کوڕی سوفیان کەهات و کاتێك لێی بێئاگا بوون، ڕۆشت و ڕووبەڕووی شامییەکان بوویەوە و سەرئەنجام کوژرا.

حەمید کوڕی موسلیمی ئەزدی دەڵێت: ئەم پیاوە موزنییە، هاوڕێم بوو، کاتێك دەیویست بڕوات، سوێندمدا، وتی: سەبارەت بەکاروباری دنیا، داوای هەرچی بکەیت، ئەرکی سەرشانمەوە و دەبێت جێبەجێی بکەم، بەڵام ئەمە، لەڕێگەی خوا و لەپێناو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو دەیکەم.

دەڵێت: ڕۆشت و ڕووبەڕووی دوژمن بوویەوە و کوژرا.

دەڵێت: سوێند بەخوا هیچ شتێك زیاتر لەگێڕانەوەی چۆنیەتی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو لەگەڵ دوژمن بۆ من خۆشتر نییە.

دەڵێت: عەبدولمەلیك کوڕی جەز کوڕی حەدرجانی ئەزدیم لەمەککە بینی و گفتوگۆمان کرد. بیری ئەو ڕۆژە کەوتینەوە، وتی: سەرسوڕهێنەرترین شت لەجەنگی عەین ئەلوەردە دوای شکستی سوپای کوفە ئەوە بوو کەسێك هات و بەشمشێرەکەی هێرشیکردە سەر من و ڕووبەڕووی بووینەوە.

عەبدولمەلیك دەڵێت: گەشتمە لای، لەسەر زەوی کەوتبوو، هۆنراوەیەکی

دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( من لەخوا بۆ لای خوا هەڵدیم

خواوەندا بەنهێنی و ئاشکرا بەدوای ڕەزامەندی تۆ دەگەڕێم)).

دەڵێت: پرسم: لەکام قەومی؟

وتی: لەمناڵەکانی ئادەم.

وتم: کام تایەفە؟

وتی: ئەی خاپورکەرانی حەرەمی خوا، نامەوێت ئێوە بناسم و بمناسن.

دەڵێت: سلێمان کوڕی عەمرۆ ئەزدی ڕووبەڕووی بوویەوە. یەکێك لەبەهێزەکانی سوپای شام بوو.

دەڵێت: یەکتریان بریندار کرد.

دەڵێت: دواتر چەندین کەس هێرشیانکردەسەر و خوێنیان ڕشت.

دەڵێت: سوێند بەخوا کەسم بەهێزتر لەو نەبینیوە.

حەمید کوڕی موسلیم دەڵێت: کاتێك ئەمەی بۆ باس کردن، فرمێسك لەچاوەکانم هاتەخوار.

عەبدولمەلیك وتی: مەگەر پەیوەندی خزمایەتی لەنێوان ئێوەدا بوو؟

وتم: نا یەکێك لەخەڵکانی موزێر و هاوڕێ و برادەری من بوو.

وتی: هیوادارم چاو بەگریان نەتبینم، بۆ، بۆ پیاوێکی موزێری دەگریت کەوەك کەسێکی گومڕا کوژرا؟

وتم: نا، سوێند بەخوا وەك کەسێکی گومڕا نەکوژرا، وەك باوەڕدارێکی ڕاستین کوژرا.

وتی: خواوەند لەیەك نزیکتان بکاتەوە.

وتم: ئامین. خواوەند تۆیش لەحەسین کوڕی نەمیر نزیك بکاتەوە.

دواتر هەستام. ئەویش هەستا.

یەکێك لەو هۆنراوانەی لەمبارەوە وتراوە، هۆنراوەی ئەعشای هەمەدانییە کە لەو ڕۆژگارەدا دەیانشاردەوە:

((هەرچی لەبیر بکەم

بەردەوام پشكی پیاوی براوپێكراو
بیر دێنمەوە
كەخوپارێزانە پشتی بەخوا بەست
و لەپێشگای خواوەند تۆبەی كرد
چاوی لەدنیا پۆشی و وتی: پشتگوێم خست
و تا زیندووم بۆ لای دنیا ناگەڕێمەوە
و لەگەڵ دەستەیەكی فراوان بۆ جەنگی كوڕی زیاد ڕۆشت
لەگەڵ كەسانێكی باوەڕدار و خۆپارێز
ڕۆشتن و بەپێشنیاری كوڕی تەڵحە ڕازی نەبوون
و گوێیان لەوتەكانی فەرمانڕەوا نەگرت
لەعەین ئەلوەردە ڕووبەڕووی سوپا بوونەوە و
بەشمشێری برەڕ لێیان دەكوشتن
شامییەكان لەهەر چوارلاوە هێرشیان كرد
لەگەڵ ژمارەیەكی زۆر هاوشێوەی شەپۆلی دەریا
زۆری نەخایاند سەركردەكانیان لەناوچوون
و تەنیا چەندین دەستە ڕزگاری بوو
خەڵكی خۆڕاگر لەپێكەوتن و نها
بای سەبا و ئەسپەكان بەسەر ئەواندا گوزەر دەكەن
ئەگەر كوژرا، كوژران، مەرگێكی ڕێزدارانەیە
و هەركەس ڕۆژێك گرفتاری بەلاّ و كارەسات دەبێت.
هۆنراوەیەكی دووروودرێژە))

## کوژرانی سلێمان کوڕی سەرد و ئەو کەسانەی لەعەین ئەلوەردە لەگەڵ ئەودا کوژرا، لەمانگی ڕەبیع الاخر بوو.

لەم ساڵەدا مەروان کوڕی حەکەم، فەرمانی بەخەڵکی شامدا لەگەڵ دوو کوڕەکەی، عەبدولمەلیك و عەبدولعەزیز وەك جێگرەکانی بەیعەت ببەستن و ئەوانی کردە جێنشینی خۆی.

## هۆکاری ئەوەی مەروان دوو کوڕی کردە جێگرەوەی خۆی

عەوانە دەڵێت: کاتێك عەمرۆ کوڕی سەعید کوڕی عاس، ئەشدەق، مەسعەب کوڕی زوبەیری تێکشکاند کە لەلایەن عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیری برای بۆ فەلەستین ڕەوانە کرابوو، بۆ لای مەروان گەڕایەوە. لەو کاتەدا مەروان لەدیمەشق و دەسەڵاتی بەسەر شام و تیفدا سەپاندبوو. مەروان ئاگادار بووبوویەوە کەعەمرۆ دەڵێت: دوای مەروان خەلافەت بەمن دەدرێت و دەیوت مەروان بەڵێنی خەلافەتی پێداوە. مەروان، حسان کوڕی مالیك کوڕی بەجدەلی بانگکرد و پێی وت دەیەوێت بۆ دوو کوڕەکەی عەبدولمەلیك و عەبدولعەزیز وەك جێگرەکانی خۆی بەیعەت وەربگرێت و لەوتەکانی عەمرۆ کوڕی سەعد ئاگاداری کردەوە.

دەڵێت: حسان وتی: من ئەرکی عەمرۆت لەسەر شان لادەبەم. شەو کاتێك خەڵکان لەدەوری مەروان کۆبوونەوە، حەسان هەستا و وتی: لەئارەزووی هەندێکەس ئاگادار بووینەتەوە، هەستن و لەگەڵ عەبدولمەلیك و عەبدولعەزیز وەك جێگرەکانی مەروان بەیعەت ببەستن. کەسان هەستان و بەیعەتیان بەست.

لەم ساڵەدا مەروان کوڕی حەکەم لەسەرەتای مانگی ڕەمەزان لەدیمەشق مرد.

## چۆنیەتی مەرگی مەروان

باوکی ئەلحوەیرس دەڵێت: کاتێك معاویە کوڕی یەزید، باوکی لەیلی، وادەی مەرگی نزیکبوویەوە، نەیویست کەس وەك جێگری خۆی دەستنیشان بکات، حسان کوڕی مالیك دەیویست دوای معاویە کوڕی یەزید، خەلافەت بەخالید کوڕی

یەزیدی بسپێرێت. حسان، خاڵی یەزید، باوکی خالید بوو، دواتر بەیعەتی لەگەڵ مەروان بەست چوونکە دەیویست بەمشێوەیە خەلافەت بەخالید کوڕی یەزید بگات.

دەڵێت: کاتێك حسان بەیعەتی لەگەڵ مەروان بەست و خەڵکی شامیش بەیعەتیان کرد، کەسانێك بەمەروانیان وت: دایکی خالید بکەرە هاوسەری خۆت تا پێگەی کەم بکات و چاوی تەماح نەبڕێتە خەلافەت. مەروان دایکی خالیدی وەك هاوسەر هەڵبژارد کەکچی باوکی هوشام کوڕی عوتەبە بوو. ڕۆژێك خالید ڕۆشتە لای مەروان، ژمارەیەکی زۆر لەوێ ئامادەبوون. خالید لەنێوان دوو ڕیزەوە دەدات. مەروان وتی: سوێند بەخوا کەسێکی نەزانە، وەرە ئەی کوڕی ژنێك کە قوونی تەرە. سووکایەتی پێدەکرد بۆ ئەوەی لای خەڵکانی شام پێگە و ڕێزی لەدەست بدات.

دەڵێت: خالید بۆ لای دایکی گەڕایەوە و لەم بەسەرهاتە ئاگاداری کردەوە. دایکی وتی: با ئاگادار نەبێت کەبۆ منت گێڕاوەتەوە، ئەرکی ئەو لەکۆڵ تۆ دەکەمەوە.

دەڵێت: مەروان هاتە لای و پرسی: خالید سەبارەت بەمن هیچی بەتۆ وت؟

وتی: خالید سەبارەت بەتۆ شت بڵێت! ڕێزی تۆ لای خالید زیاتر لەوەیە سەبارەت بەتۆ بدوێت. مەروان باوەڕی کرد.

دەڵێت: دایکی خالید چەند ڕۆژێك چاوەڕێ بوو. ڕۆژێك کەمەروان لای ئەو خەوتبوو، سەرینی خستەسەر دەمی و کوشتی.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەوتەی واقدی مەرگی مەروان لەمانگی ڕەمەزان و لەدیمەشق و لەتەمەنی شەست و سێ ساڵیدا بوو.

بەڵام هوشام کوڕی کەلبی دەڵێت: کاتێك مرد، تەمەنی شەست و یەك ساڵ بوو. بەوتەیەك حەفتا و یەك ساڵ و بەوتەیەك هەشتا و یەك ساڵ بوو.

نازناوەکەی باوکی عەبدوڵڵەیە، ئەو کوڕی حەکەم کوڕی باوکی عاس کوڕی ئومەییە کوڕی عەبد شەمس بوو. دایکی، ئامینە کچی عەلقەمە کوڕی سەفوان کوڕی ئومەییەی کەنانی بوو.

مـەروان دوای ئـەوەی وەك خەلیفـە بەیعـەتیان لەگـەڵ بەسـت، نـۆ مـانگ ژیـا و بەوتەیەك دوای بەیعەت، دە مانگ سێ ڕۆژ کەمتر ژیا.

مـەروان پـێش مـەرگی خـۆی دوو سـوپای ڕەوانـە کـرد: یـەکیان بـۆ مەدینـە بەسـەرکردایەتی حـەبیش کـوڕی دەلجـە و یـەکیان بـەرەو عێـراق بەسـەرکردایەتی عوبەیداللە کوڕی زیـاد. عەبدوڵلـە کوڕی زیـاد لەجـەزیرە دابـەزی و لـەوێ لەمـەرگی مـەروان ئاگـادار بوویـەوە و سـوپای کوفـە ڕووبـەڕووی بوویـەوە (پێشتر ئامـاژەماز پێدا). بەخواسـتی خـوا، دواتـر ئامـاژە بەبەسـەرهاتی عوبەیداللـە کـوڕی زیـاد تـا سەرەمەرگ دەدەین.

## لەمساڵەدا حەبیش کوڕی دەلجە کوژرا

بەڵام حـەبیش کـوڕی دەلجـە وەك لەگێڕانـەوەی عەوانـە کـوڕی حەکەمدا هـاتووە، بەڕێکـەوت و گەیـشتە مەدینـە کـەجابر کـوڕی ئەسـوەد کـوڕی عـەوف بـرازای عەبـدولرەحمان کـوڕی عـەوف بەنوێنەرایـەتی کـوڕی زوبـەیر، کـارگوزاری شـارەکە بوو. جابر لەبەرابەر سوپاکەی حەبیش هەڵات. دواتر حـارس کـوڕی بـاوکی ڕەبیعـە برای عومەر کوڕی باوکی ڕەبیعە (شـاعیری بـەناوبانگی عـەرەب) کە لەلایـەن کـوڕی زوبەیرەوە، فەرمانڕەوایەتی بەسرەی دەکـرد، سـوپایەکی بەسـەرکردایەتی حـەنیف کـوڕی سـەجەڤ تـەمیمی بـۆ جـەنگی حـەبیش کـوڕی دەلجـە ڕەوانـە کـرد. کاتێـك حـەبیش لـەهاتنی سـوپاکە ئاگـادار بوویـەوە، لەمەدینـەوە بـۆ ڕووبەڕووبوونـەوە بەڕێکەوت. عەبدوڵلە کوڕی زوبەیر، عەیاش کوڕی سەهل کوڕی سـەعدی ئەنساری وەك کارگوزاری مەدینە ڕەوانە کرد و فەرمانییێدا شوێنپێی حەبیش هـەڵبگرێت تـا ئەو کاتەی پەیوەستی سوپاکەی بەسرە دەبێت. عـەیاش بـەخێرایی شـوێنیانکەوت و لـەڕەبزە پێیـان گەیـشتەوە. هـاوەڵانی کـوڕی دەلجـە پێیـان وت: لەجەنگدا پەلـە مەکە.

بـەڵام کـوڕی دەلجـە وتـی: تـا لەشـەکردانەکەیان نـەخۆم، دانابـەزم. تیرێکـی نەناسراو هات و کوشتی. مونزەر کوڕی قەیسی جوزامی و بـاوکی عوقـاب کۆیلـەی ئەبوسوفیانیش لەگەڵ ئەودا کـوژران. لـەو ڕۆژەدا یوسـف کـوڕی حەکـەم و حـەجاج

کوڕی یوسف لەگەڵ کوڕی دەلجە بوون و لەسەر وشترێك ڕزگاریان بوو. نزیکەی پێنسەد کەس لەوان پەنای بۆ مەدینە برد. عەیاش وتی: لەسەر فەرمانی من تەسلیم بن و کاتێك تەسلیم بوون، سەری هەموویانی پەڕاند. سوپاکەی حەبیش بۆ شام گەڕایەوە.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: ئەو کەسەی لەجەنگی ڕەبزە، حەبیش کوڕی دەلجەی کوشت، یەزید کوڕی سیای ئەسواری بوو کەتیرێکی هاویشت و ئەوی کوشت. کاتێك هاتنە ناو مەدینە، سوار لەسەر ئەسپێکی سپی بوو، جلوبەرگی سپی لەبەردابوو و زۆری نەخایاند جلەکانی ڕەش بوو لەبەر ئەوەی خەڵکێکی زۆر دەستیان لێدەدا و بۆنیان پیا دەڕژاند.

ئەبو جەعفەر دەڵێت: لەم ساڵەدا تاعوونێك کە بەتاعوونی جارف بەناوبانگە، لەبەسرە دەرکەوت و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکانی بەسرەی کوشت.

مەسعەب کوڕی زەید دەڵێت: کاتێك تاعوون بڵاوبوویەوە، عوبەیداڵڵە کوڕی عوبەیداڵڵە کوڕی مەعمەر، فەرمانڕەوای بەسرە بوو، دایکی بەهۆی تاعوونەوە مرد و کەسیان نەدۆزییەوە جەنازەکەی هەڵبگرێت و سەرئەنجام چوار بیابانئشینیان بەکرێ گرت و جەنازەکەیان بەخاك سپارد. لەم ساڵەدا پێگەی خەواریجی بەسرە بەرز بوویەوە و نافیع کوڕی ئەزرەق لەوێ کوژرا.

## کوژرانی نافیع کوڕی ئەزرەقی خاریجی

محەممەد کوڕی زوبەیر دەڵێت: عوبەیداڵڵە کوڕی عەبدوڵڵە، براکەی عوسمان کوڕی عەبدوڵڵەی لەگەڵ سوپایەك بۆ جەنگی نافیع کوڕی ئەزرەق ڕەوانە کرد و لەدولاب جەنگ ڕوویدا. عوسمان کوژرا و سوپاکەی شکستی خوارد.

وەهب دەڵێت: خەڵکی بەسرە سوپایەکیان بەسەرکردایەتی حارسە کوڕی بەدر ڕەوانە کرد و کاتێك ڕووبەڕووی خەواریج بوویەوە، بەهاوەڵانی خۆی وت:

(( خواردن و ئاو هەڵبگرن

و بۆ کوێ دەخوازن بڕۆن)).

معاویە کوڕی قورە دەڵێت: لەگەڵ کوڕی عوبەیس ڕۆشتین و ڕووبەڕووی

حەمریج بووینەوە. کوڕی ئەزرەق و دوو یا سێ کوڕی ماخوز کوژران. کوڕی عوبەیدیش کوژرا.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: هوشام کوڕی کەلبی لەگێڕانەوەی باوکی موخاریقی راسبی، بەسەرهاتی کوڕی ئەزرەق و کوڕەکانی ماحوز بەشێوەیەکی دیکە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێگەی مافیع بەرز بوویەوە و خەڵکی بەسرە بەو کێشەی بەهۆی مەسعود کوڕی عەمرۆ، لەنێوان رەبیعە و تەمیم سەریهەڵدابوو، سەرقاڵ بوون. ژمارەی سوپاکەی کوڕی ئەزرەق زیادی کرد و ڕوویکردە بەسرە و لەپردەکە نزیکبوویەوە. عەبدوڵڵە کوڕی حارس، موسلیم کوڕی عوبەیس کوڕی کورەیز و خەڵکانی بەسرەی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەوان رەوانە کرد. موسلیم بەڕێکەوت و کوڕی ئەزرەق لەبەسرە و سەرزەمینی بەسرە دوورکەوتەوە و لەسەرزەمینی ئەهواز لەشوێنێك بەناوی دۆلاب دابەزی. دوو سوپا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی یەك، ڕیزیان بەست و لەدوولاوە هێرش دەستپێکرد. موسلیم کوڕی عوبەیس، حەجاج کوڕی بابی حومەیری وەك فەرماندەی باڵی ڕاست و حارس کوڕی بەدری تەمیمی غەدانی وەك فەرماندەی باڵی چەپی خۆی دەستنیشانکرد. کوڕی ئەزرەقیش، عوبەیدە کوڕی هیلالی یەشکوری وەك فەرماندەی باڵی ڕاست و زوبەیر کوڕی ماحوزی تەمیمی وەك فەرماندەی باڵی چەپ دیاریکرد. جەنگ دەستپێکرد و شمشێرەکان کەوتنەکار. ئاگری جەنگ سات لەدوای سات گەرمتر و خۆشتر دەبوو. موسلیم کوڕی عوبەیس، فەرماندەی سوپای بەسرە کوژرا. نافیع کوڕی ئەزرەقی سەرکردەی خەواریجیش کوژرا. خەڵکی بەسرە، حەجاج کوڕی بابیان وەك سەرکردە هەڵبژاردە و دووبارە ڕوویان لەگۆڕەپانی جەنگ کرد. حەجاج کوڕی بابیش کوژرا. عەبدوڵڵە کوڕی ماحوزی سەرکردەی خەواریجیش کوژرا. دواتر خەڵکی بەسرە رەبیعە ئائەجزەمنی تەمیمیان وەك سەرکردە هەڵبژارد و دووبارە جەنگیان دەستپێکردەوە و بەردەوام بوون تا تاریکی باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشا و دوو سوپا کە لەیەك بێزار و شەکەت بووبوون جیابوونەوە و لەم کاتەدا دەستەیەکی تازە، کەبەشداری جەنگ نەبوون، بۆ هاوکاری خەواریج هاتن و هێرشیان کردە سەر خەڵکانی عەبدولقەیس و شکستیاندان. سەرکردەی سوپای

بەسرە، ڕەبیعە کوژرا و حارس کوڕی بەدر ئالاّی سوپای بەسرەی بەدەستەوە گرت. سوپاییەکان ڕۆشتبوون و ئەو لەپشت سەریانەوە و بەمەبەستی پارێزگاریکردن لێیان دەجەنگان و سەرئەنجام ئەوانی لەناوچەیەکی ئەهواز دابەزاند.

یەکێك لەشاعیرەکانی خەواریج لەمبارەوە دەڵێت:

((ئاخ جەرگم، نە لەبرسا و نە لەتینوویەتی

ئاخ جەرگم لەعەشقی دایکی حەکیم

ئەگەر منی لەجەنگی دۆلاّب دەبینی

ڕم وەشاندنی پیاوێکی دەبینی کە

لەجەنگ پاڵەوان بوو

ئەو بەرەبەیانەی بەکر کوڕی وائیل لەئاو نغرۆ بوو

و ئەسپەکانمان بەرەو تەمیم غارپێدا

یەکەم سەرکەوتنی ئێمە لەلای عەبدولقەیسەوە بەدەست هات

و پیرەکانی ئەزد کاتێك دەکەوتنە ناو ئاوەکە

ڕیسوا بووبوون))

کاتێك خەڵکی بەسرە لەم ڕووداوە ئاگادار بوونەوە، ترسان. لەم کاتەدا کوڕی زوبەیر، حارس کوڕی عەبدوڵڵە کوڕی باوکی ڕەبیعەی نارد کەهات و عەبدوڵڵە کوڕی حارسی لەسەر کار لابرد. دواتر خەواریج بەرەو بەسرە گەڕانەوە. لەم کاتەدا موهەلیب کوڕی باوکی سەفرە هات، فەرمانڕەوای خوراسان بوو. ئەحنەف بەحارس کوڕی باوکی ڕەبیعە و کەسانی دیکەی وت:، نا، سوێند بەخوا لەناو بردنی خەواریج تەنیا بەدەستی موهەلیب دەکرێت. گەورەکانی خەڵك ڕۆشتن و قسەیان لەگەڵ کرد تا لێپرسراویەتی جەنگ دژی خەواریج بگرێتە ئەستۆ.

موهەلیب وتی: ئەو کارە ناکەم، سەروەری باوەڕداران فەرمانی خوراسانی بۆ نووسیوم و فەرمانەکەی پشتگوێ ناخەم.

کوڕی ڕەبیعە بانگیکرد و لەگەڵی دوا بەلاّم هەمان وەلاّمی دەستکەوت. دواتر بۆچوونی کوڕی باوکی ڕەبیعە و خەڵکانی بەسرە بەو شێوە بوو کە لەزمانی کوڕی

زوبەیرەوە بنووسن:

(( بەناوی خواوەندی بەخشندەی میهرەبان

لە عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر بۆ موهەلیب کوڕی باوکی سەفرە سڵاو لەتۆ. سپاسی خوا دەکەم کەجگە لەو خوایەك نییە.

بەڵام دواتر: حارس کوڕی عەبدوڵڵە نامەی بۆ نووسیم و ڕایگەیاند لەسەر دەستی خەواریجی بێدین، سوپای موسوڵمانان شکستی خواردووە لەکاتێکدا ژمارەیان فراوان بووە و ئاگادار بوومەتەوە خەواریج بەرەو بەسرە بەڕێکەوتوون. من فەرمانی فەرمانڕەوایەتی خوراسانم بۆ نووسیت و کاتێك باسی خەواریجیان کرد بەباشی دەزانم لێپرسراویەتی جەنگ دژی ئەوان بگریتە ئەستۆ و هیوادارم بەختی تۆ، بۆشارەکەت پیرۆز و سەرکەوتنی بەدواوە بێت. پاداشتی ئەمە، لەڕۆشتن بۆ خوراسان زیاترە. بوێرانە هێرشیان بکەسەر و لەگەڵ دوژمنانی خوا و خۆت بجەنگە و بەرگری لەماڵ خۆت و خەڵکانی شارەکەت بکە چوونکە لەسنووری ئێمە، خوراسان و ناوچەکانی دیکە، لەدەستی تۆ دەرناچێت. و دووبارە سڵاو لەتۆ.

دەڵێت: نامەکەیان پێدا و کاتێك خوێندییەوە، وتی: سوێند بەخوا ناڕۆم مەگەر ئەوەی بەدەستی دێنم تایبەت بەخۆم بێت. لەخەزێنە، سامانێکم بخەنە بەردەست تا هاوڕێ و سوپاکەمی پێ بەهێز بکەم و بتوانم لەسوارەکان و سەرکردەکان بەخواستی خوم هەڵبژێرم.

دەڵێت: خەڵکانی بەسرە ڕەزامەندی خۆیان نیشاندا.

وتی: لەلایەن پێنج ناوچەی بەسرەوە، نامەیەك لەمبارەوە بۆ من بنووسن. هەموویان نووسیان جگە لەمالیك کوڕی موسەممەع و دەستەیەك لەبەکر کوڕی وائیل. موهەلیب کینە و ڕقی ئەوانی لەدڵ گرت.

ئەحنەف و عوبەیدالڵە کوڕی زیاد کوڕی زەبییان و گەورەکانی بەسرە بەموهەلیبیان وت: کاتێك خەڵکی بەسرە بەداواکەت ڕازی بوون، گرنگ نییە مالیك کوڕی موسەممەع و شوێنکەوتەکانی بەداواکەت ڕازی بن. مەگەر مالیك دەتوانێت دژایەتی هەموو خەڵکان بکات؟ مەگەر ئەو مافەی هەیە؟ ئەی پیاو، بڕیار بدە و بۆ

جەنگی دوژمنان بەڕێکەوە.

دەڵێت: موهەلیب ئەو کارەی کرد و پێنج سەرکردەی بۆ پێنج ناوچەکە دەستنیشان کرد: عوبەیداللە کوڕی زیاد کوڕی زەببیانی وەك سەرکردەی بەکر کوڕی وائیل، حورەیش کوڕی هیلالی سەعدی وەك سەرکردەی مناڵەکانی تەمیم دیاریکرد. خەورایج هاتن و لەپردی بچووك نزیکبوونەوە. سەرکردەکەیان عوبەیداللە کوڕی ماحوز بوو. موهەلیب لەگەڵ گەورەکان و شاسوارەکان ڕووبەڕوویان بوویەوە و لەپردەکە دووریخستنەوە. ئەمە یەکەمجار بوو خەڵکانی بەسرە توانییان پاشەکشێیان پێبکەن لەکاتێکدا بەتەواوی لەشارەکە نزیکبووبوونەوە. خەواریج بۆ لای پردی گەورە پاشەکشێیان کرد. موهەلیب سوپای ڕازاندەوە و لەگەڵ سوار و پیادەکات بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەوان ڕۆشت. خەواریج کاتێك نزیکبوونەوەی سوپاکەی موهەلیبیان بینی، قۆناغێکی دیکە پاشەکشێیان کرد. موهەلیب بەهەمانشێوە پاشەکشێی پێدەکردن تا گەیشتنە یەکێك لەمەنزڵگەکانی ئەهواز بەناوی سەلی وسەلبەری و لەوێ مانەوە.

دەڵێت: کاتێك حارسە کوڕی بەدری غەدانی ئاگادار بوویەوە کەموهەلیب کوڕی باوکی سەفرە، سەرکردایەتی جەنگ دژی ئەزاریقەی گرتۆتەدەست، بەکەسانی هاوڕێی وت:

(( خواردن وئاو هەڵبگرن بۆ کوێ دەخوازن بڕۆن چوونکە موهەلیب بوو بەسەرکردە)).

ئەو کەسانەی لەگەڵیدابوون، ڕوویانکردە بەسرە و حارس کوڕی عەبدوڵلە ئەوانی بۆ لای موهەیب نارد. کاتێك موهەلیب لەنزیك خەواریج دابەزی، خەندەکی لێدا و پادگانەکانی دروستکرد و سیخوڕەکانی نارد و کێشکچی دانا. سوپا لەدۆخی ئامادەباشی و جەنگاوەران لەژێر ئالآکانی خۆیان بوون و بەپێی ناوچەکانی شار لەسەر خەندەکەکان پیاوەکانیان جێگیر کردبوو کەئەگەر خەواریج مەبەستی هێرشی لەناکاویان بکردایە، ڕووبەڕووی سەنگەرێکی بەهێز دەبوون و دەگەڕانەوە بێ ئەوەی کەس ڕووبەڕوویان ببێتەوە. کەس دژی ئەوان نەجەنگابوو لەموهەلیب سەختگیرتر و بوێرتر بێت.

عەبدوڵڵە کوڕی عەوف دەڵێت: یەکێك لەخەواریج پێی وتم: خەواریج، عوبەیدە کوڕی هیلال و زوبەیر کوڕی ماحوریان لەکاتی شەودا و لەگەڵ دوو دەستەی گەورەدا بۆ ئوردووگاکەی موهەلیب ڕەوانە کرد. زوبەیر لەلای ڕاستی ئوردووگاکەوە هات و عوبەیدە لەلای چەپ. تەکبیریان وت و دەنگیان بەرز کردەوە بەڵام کاتێك بینیان سوپاکەی موهەلیب لەئامادەباشی تەواودایە، نەیانتوانی هێرشیان بکەنەسەر و کاتێك مەبەستی گەڕانەوەیان کرد عوبەیدالڵە کوڕی زیاد کوڕی زەببیان وتی: کاتێك بانگمان بکەن، وەڵام دەدەینەوە. ئەی جەهەنەمییەکان بەیانی دەڕۆنە جەهەننەم چوونکە جێگە و شوێنی ئێوەیە.

وتیان: ئەی خراپەکار، جەهەنەمییان بۆ تۆ و کەسانی وەك تۆ داناوە، جەهەننەمماڵی ناباوەڕانە و تۆ ناباوەڕیت.

وتی: دەبیستن: هەموو کۆیلەکانم ئازاد بن ئەگەر ئێوە بڕۆنە بەهەشت تەنانەت ئەگەر هەموو ئاگرپەرەستەکانی نێوان سەفوان تا دوورترین ناوچەی خوراسان کەخوشك و دایك و کچی خۆیان دەکەنە هاوسەر، بچنە بەهەشت، ئێوە ناچن.

عوبەیدە وتی: ئەی خراپەکار بێدەنگ بە، تۆبەندەیەکی ستەمکاریت و هاودەستی شەیتان.

کەسان بەکوڕی زەببیانیان وت: خوا بتبەخشێت، وەڵامی ئەو خراپەکارەت دایەوە و ڕاستییەکانت هێنایە سەرزمان.

دەڵێت: موهەلیب سوپاکەی ڕازاندەوە و بەپێی ڕیزبەندی ناوچەکان ئەوانی بەڕێکرد. شێوازی وەستانیان بەمشێوە بوو: ئەزد و تەمیم باڵی ڕاستی سوپاکەیان پێکدەهێنا، بەکر کوڕی وائیل و عەبدولقەیس باڵی چەپی سوپاکە. کەسانی دەرەوەی شار لەناو دڵی سوپاکەدا بوون. خەواریج، عوبەیدە کوڕی هیلالی یەشکورییان وەك فەرماندەی باڵی چەپ دانا. کەرەستەکانیان لەکەرەستەی خەڵکانی بەسرە باشتر و ئەسپەکانیان ڕەسەنتر و سیلاحی زۆرتریان پێبوو. لەبەر ئەوەی بەردەوام دەگەڕان و لەکرمانەوە تا ئەهوازیان تاڵان کردبوو. زرێکانی سەریان تا سینەی دادەپۆشی. قەڵغانەکانیان بڵند و لەزەوی دەخشا. مەچك بەندی ئاسنینان بەقولابی ئاسنین بەپشتێنەکانیانەوە بەستبوو.

کاتێك دوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە، جەنگێکی قورسیان دەستپێکرد و بەدرێژایی ڕۆژ، هەردوو سوپا خۆڕاگری نیشاندا. سەرئەنجام خەواریج هێرشێکی قورسیانکرد و خەڵکانی بەسرە هەڵاتن بەشێوەیەك دایك ئاوڕی بۆ منداڵەکەی نەدەدایەوە و هەڵاتووان تا بەسرە نەوەستان.

موهەلیب بەخێرایی هات و لەشوێنێکی بەرز ڕێگەی لەهەڵاتووان گرت و وتی: بەندەکانی خوا، لەدەوری مـن کۆببنەوە، کۆببنەوە. دەستەیەك کۆبوونەوە و خەڵکانی عەمانیش هاتن. نزیکەی سێ هەزار کەس دەوری موهەلیبیان گرت.

کاتێك ژمارەی کەسەکانی بینی، شادوومان بوو. سپاسی خوای کرد و وتی: ئەگەری هەیە خواوەند سوپایەکی گەورە پشتگوێ بخات و گرفتاری شکستیان بکات و سەرکەوتن بەسوپایەکی کەم ببەخشێت. سوێند بەخوا ژمارەی ئێوە کەم نییە و من ڕازیم. ئێوە خۆڕاگران و شاسوارەکانی سوپان، حەزم نەدەکرد کەسێك لەتێکشکاوەکان و هەڵاتووان لەناو ئێوە بێت چوونکە تەنیا دەبنە هۆی لاوازی ئێوە. هەرکام لەئێوە دەبەرد لەگەڵ خۆی هەڵگرێت، دواتر هێرش دەکەینە سەر ئوردووگای خەواریج چوونکە لەئێستادا ئاسوودەن و سوارەکانیان شوێن سوپاکەی ئێمە کەوتوون. هیوادارم سوارەکانیان نەگەڕێنەوە و ئێوە بتوانن ئوردووگاکەیان تالان بکەن و سەرکردەکەیان بکوژن.

دەڵێت: ئەو کارەیان کرد. موهەلیب ئەوانی گەڕاندەوە و لەناکاو خەواریج بینیان موهەلیب و موسوڵمانانی هاوڕێی، لەتەنیشت ئوردووگاکەدان. دواتر ڕووبەڕووی عوبەیداللە کوڕی ماحوز و سوپاکەی بوونەوە. جەنگەکە بەمشێوەبوو یەکێك لەهاوەڵانی موهەلیب دەڕۆشتەپێش و بەردێکی دەکێشا بەڕوخساری کەسی بەرامبەردا و بریندار دەکرد. دواتر ڕمەکەی لەجەستەی دەچەقاند و بەشمشێر لێی دەدا. زۆری نەخایاند عوبەیداللە کوڕی ماحوز کوژرا و موهەلیب دەستی بەسەر ئوردوگاکەدا گرت و ژمارەیەکی زۆری لێکوشتن.

ئەوانەی شوێن خەڵکانی بەسرە کەوتبوون، دەگەڕانەوە. موهەلیب سوار و پیادەکانی لەسەر ڕێگەکەیان دانابوو کەئەوانیان دەدزی و دەیانکوشتن. لەکاتی گەڕانەوە، پەرژ و بڵاو بوونەوە و ڕێگەی کرمان و ئیسفەهانیان گرتەبەر. موهەلیب

لەئەهواز مایەوە.

کاتێک خەواریج دەڕۆشتن، پێنج و شەش دەستەیان کەهەرکام ئاگرێکی جیاوازی هەڵکردبوو، لەدەوری ئاگرێک کۆدەبوونەوە. ژمارەیان کەم بوو. بەم شێوەبوون تا لەبەحرەینەوە هاوکارییان پێگەیشت و ڕێگەی کرمان و ئیسفەهانیان گرتەبەر.

دەڵێت: موهەلیب لەئەهواز مایەوە تا ئەو کاتەی مەسعەب کوڕی زوبەیر هاتە بەسرە و حارس کوڕی عەبدوڵڵەی لەسەر کار لابرد.

دەڵێت: موهەلیب کاتێک بەسەر ئەزاریقە سەرکەوتنی بەدەست هێنا، نووسی:

(( بەناوی خواوەندی بەخشندەی میهرەبان بۆ فەرمانڕەوا، حارس کوڕی عەبدوڵڵە

لەموهەلیب کوڕی باوکی سەفرە:

سڵاو لەتۆ، سپاسی خوایەک دەکەم کەجگە لەو خوایەک نییە. بەڵام دواتر، سپاس بۆ خوا کەسەرکەوتنی بە سەروەری باوەڕداران بەخشی و ستەمکارانی لەناو برد و تووڕەیی خۆی بەسەردا باراندن و بەشێوازی جۆراوجۆر ئەوانی کوشت و بڵاوەی پێکردن. فەرمانڕەوا ئاگادار دەکەمەوە لەسەرزەمینی ئەهواز بەناوی سەلی و سەلبری ڕووبەڕووی ئەزاریقە بووینەوە. هێرشمان کردنەسەر. بەدرێژایی ڕۆژ جەنگێکی قورسمان کرد. دەستەکانی ئەزاریقە پێکەوە هێرشیانکردە سەر دەستەیەک لەموسوڵمانان و شکستیان پێهێنان. موسوڵمانان بەشێوەیەک پەرێشان بووم ترسام لەوەی ئەمە سەرئەنجامی ئێمە بێت و کاتێک ئەمەم بینی، ڕۆشتمە سەر بەرزاییەک و کەسانی خۆم بەتایبەتی و موسوڵمانانم لەدەوری خۆم کۆکردەوە. ئەوانەی باوەڕدار و بەدوای ڕەزامەندی خوادا دەگەڕان، لەدەورم کۆبوونەوە و لەگەڵ ئەوان هێرشمان کردە سەر ئوردووگای خەواریج کەسوپا و سەرکردەکەیان لەوێ بوو. هەموو کەسانی ناودارییان لەدەوری سەرکردەکەیان کۆبووبوونەوە. ئاگری جەنگمان هەڵگیرساند و تیربارانمان کرد. دواتر هەردوو سوپا دەستیان بۆ شمشێر برد. خواوەند سەرکەوتنی بەموسوڵمانان بەخشی و ناباوەڕانی لەناو برد. ستەمکاری و سەرکێشی ئەوان لەگەڵ ژمارەیەک

لەکەسەکانی پێشڕەوی دەکرد و خواوەند ئەوەانی لەگۆڕەپانی جەنگدا کوشت. دواتر سوارەکان شوێن هەڵاتووان کەوتن و لەڕێگە و لەناو چاڵەکان و گوندەکان ئەوانیان کوشت. سپاس بۆ پەروەردگار و سڵاو لەتۆ.

دەڵێت: کاتێك نامەکە بەدەستی حارس کوڕی عەبدوڵڵە گەیشت، ڕەوانەی کوڕی زوبەیری کرد و لەمەککە بۆ خەڵکان خوێندرایەوە. حارس بۆ موهەلبی نووسی:

بەڵام دواتر، نامەکەی تۆ کەباسی سەرکەوتنی موسوڵمانانی دەکرد، بەدەستم گەیشت، ئەی برای ئەزدی، شەرەف و ڕێز و گەورەی هەردوو جیهان بۆ تۆ بێت و سڵاو و ڕەحمەتی خوا لەتۆ.

دەڵێت: موهەلیب کاتێك نامەکەی خوێندەوە، پێکەنی و وتی: من بەبرای ئەزدی ناو دەبات وەك بڵێی خەڵکانی کوفە بیابانشینن.

باوکی موخاریقی ڕاسبی دەڵێت: باوکی عەلقەمەی یەحمودی لەجەنگی سەلی و سەلبری، بوێرییەکی چاوەڕوانەکراوی لەخۆی نیشاندا. بەگەنجەکانی ئەزد و کۆیلەکانی یەحمودی دەوت سەرتان بۆ ماوەیەك لەڕۆژ بەکریێ بدەن بەئێمە. گەنجەکان هێرشیان دەبرد و دەجەنگان، دواتر دەگەڕانەوە، پێدەکەین و دەیانوت: ئەی باوکی عەلقەمە، قازانەکان بەکریێ دەگرن.

دەڵێت: کاتێك موهەلیب سەرکەوتنی بەدەستهێنا، سەد هەزار پێبەخشی چوونکە هەوڵەکانی بینیبوو.

دەڵێت: خەڵکی بەسرە پێش موهەلیب داوایان لەئەحنەف کردبوو دژی خەواریج بجەنگێت بەڵام ئەحنەف، موهەلیبی نیشاندابوو وتبووی: ئەو بۆجەنگ دژی ئەوان بەتواناترە. کاتێك موهەلیب ڕازی بوو دژی خەواریج بجەنگێت، مەرجی بۆ خەڵکی بەسرە دانا کەدەستی بەسەر هەر سەرزەمینێکدا گرت بۆ ماوەی سێ ساڵ لەژێر دەستی خۆیدا بێت و سەرکردەکان و کەسانی دیکەی لەگەڵ بێت و هەرکەس بەجێبمێنێت، هیچی بەرنەکەوێت. بەمە ڕازیبوون و بەڵێننامەیەکیان نووسی و نێردەیەکیان بۆ ئاگادار کردنەوەی کوڕی زوبەیر ڕەوانە کرد. کوڕی زوبەیر مەرجەکانی پشتڕاستکردەوە و جێبەجێی کرد. کاتێك

بەداواکەی ڕازیبوون، حەبیبی کوڕی لەگەڵ شەشسەد سوار بۆ جەنگی عەمرۆ ئەلقەنا نارد کە لەپشت پردە بچووکەکەی بەسرە، لەگەڵ شەشسەد سوار ئوردووی لێدابوو.

موهەلیب فەرمانیدا پردێکی بچووک هەڵبەستن. حەبیب لەپردەکە پەڕییەوە و هێرشی کردە سەر عەمرۆ و سوپاکەی و سەرئەنجام سوپاکەی عەمرۆ لەنێوان دوو پردەکە شکستیان خوارد و پاشەکشێیان کرد و ڕێگەی فوراتیان گرتەبەر. موهەلیب لەگەڵ تیژپێکانی سوپاکەی (نزیکەی دوانزە هەزار کەس) و حەفتا کەسی دیکە بەڕێکەوت و گەیشتە پردی گەورە کەعەمرۆ ئەلقەنا لەگەڵ شەشسەد سوار لەوێ ئوردووی لێدابوو. موهەلیب، موغەیرەی کوڕی لەگەڵ سوار و پیادەکان نارد و تیربارانیان کرد، شکستیان خوارد و هەڵاتن و سوارەکان شوێنیان کەوتن. دواتر موهەلیب فەرمانیدا پردەکە هەڵبەستن و لەگەڵ سوپاکەی پەڕییەوە. عەمرۆ ئەلقەنا پەیوەستی کوڕی ماحوز و سوپاکەی بوو لەمەفتەح. کاتێك لەبەڕێکەوتنی موهەلیب ئاگادار بوونەوە، بەڕێکەوتن و هەشت فەرسەخ لەولای ئەهواز ئوردوویان لێدا. موهەلیب پاشماوەی ساڵ مایەوە و خەراجی ویلایەتی دیجلەی کۆکردەوە و بەسەر هاوڕێکانیدا دابەشی کرد. کاتێك خەڵکانی بەسرە ئاگادار بوونەوە، بۆ هاوکاری کردنی هاتن و ئەوانی لەناو ڕیزی سوپاکەیدا نووسی و مانگانەی بۆ دیاریکردن و ژمارەیان بۆ سی هەزارکەس بەرز بوویەوە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەوتەی ئەوان، ئەو جەنگەی بووە هۆی شکستی ئەزاریقە و لەبەسرە و ئەهوازەوە بەرەو کرمان و ئیسفەهان ڕۆشتن، لەساڵی شەست و شەش ڕوویدا.

دەڵێت: کاتێك خەواریج لەئەهواز دەڕۆشتن، ژمارەیان سێ هەزار کەس بوو چوونکە لەجەنگ دژی موهەلیب، نزیکەی حەوت هەزار کەسیان لێ کوژرا.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەم ساڵەدا مەروان کوڕی حەکەم، پێش ئەوەی بمرێت، محەممەدی کوڕی بۆ جەزیرە نارد. ئەمە پێش ڕۆشتنی ئەو بۆ میسر بوو.

لەم ساڵەدا عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر، عەبدوڵڵە کوڕی یەزیدی لەکارگوزاری کوفە دوورخستەوە و عەبدوڵڵە کوڕی موتیعی وەك کارگوزاری شارەکە دەستنیشانکرد.

هەروەها عوبەیدەی کوڕی زوبەیری برای لەمەدینە لابرد و مەسعەب کوڕی زوبەیر وەك فەرمانڕەوای شارەکە دەستنیشانکرد.

هۆکاری لابردنی عوبەیدە وەك واقدی ئاماژەی پێدەدات، ئەوەبوو کەقسەی بۆ خەڵکان کرد و وتی: زانیووتانە لەبەر وشترێك کەبەهاکەی پێنسەد درەم بوو، چی بەسەر قەومێکدا هات؟ ئەویان بەخەملێنەری بەهای وشتر ناو برد. کاتێك کوڕی زوبەیر ئاگادار بوویەوە، وتی: دەبێت لابرێت.

لەم ساڵەدا عەبدوڵڵە کوڕی زوبەیر، بەیت اللە ئەلحەرامی نۆژەن و حوجری پەیوەست کرد.

زیاد کوڕی جیل دەیوت: ڕۆژێك کەکوڕی زوبەیر دەستی بەسەر مەککەدا گرت، لەوێ بووم و بیستم کەدەیوت: دایکم ئەسما، کچی ئەبوبەکر پێی وتم کە پێغەمبەر(د.خ) بەعایشەی فەرمووبوو: ئەگەر لەڕۆژگاری ناباوەڕی خەڵك ماوەیەکی زۆر تێپەڕی نەدەکرد، کەعبەم لەسەر پایەی ئیبراهیم جێگیر دەکرد و حوجرم پەیوەستی کەعبە دەکرد.

دواتر کوڕی زوبەیر فەرمانیدا و هەڵیانکەند و بەردەکانیان دۆزییەوە بەئەندازەی وشترێك. بەردێکیان جووڵاند، بروسکەیەکی لێبەرز بوویەوە، وتی: دەستی لێ مەدەن. دواتر کوڕی زوبەیر کەعبەی دروستکرد و دوو دەروازەی بۆ دانا تا لەیەکێك بڕۆنە ناو و لەیەکێك بڕۆنەدەر.